# ٣٦٥

# ڕۆژ لەگەڵ پێغەمبەر موحەممەد صلى الله عليه وسلم


نووسینی:
نوردان داملا

وەرگێڕانی:
محمد محمد حەمەمیرزا




# ٣٦٥

# ڕۆژ لەگەڵ پێغەمبەر

## موحەممەد(ﷺ)

نووسینی

نۆردان داملا

وەرگێڕانی

محمد محمد حمەمیرزا

RENWEN

ناوی کتێب: ٣٦٥ ڕۆژ لەگەڵ هاوەڵان

ناوی نووسەر: نۆردان داملا

ناوی وەرگێڕ: محمد محمد حمەمیرزا

دیزاین: ناوەندی ڕێنوێن

نۆبەتی چاپ: دووەم ٢٠٢٢

چاپ: ناوەندی ڕێنوێن

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

ژمارەی سپاردن: لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارە (١١٣٦)ی ساڵی (٢٠٢٠)ی پێ دراوە.



**ناوەندی ڕێنوێن**

07511408868 -07501269689

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک - نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

## ناوەڕۆک




**Description**

﷽
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

داوای ڕیکلام مەکە نایکەین🚫

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

## پێشەکیی نووسەر بۆ چاپی کوردییەکەی

خوێنەری زێدە شیرینم!

ئەم کتێبەم کە وا لە دەستی تۆدایە، لە ئێستادا بۆ بیستونۆ زمانی جیهان وەر گێڕدراوە، لە یەکەم ڕۆژی چاپیەوە تا ئەم ڕۆژە منداڵە چاوگەشەکانمان بە خۆشەویستی و تامەزرۆییەوە دەیخوێننەوە. سوپاس بۆ خودا ئەمێستا بە زمانی کوردی لە بەردەستی تۆدایە و سیهەمین زمانی جیهانی تەواو کرد. خودای گەورە کاریگەرتر و پڕخوێنەرتری بکات.

دۆستانی خۆشەویستم!

پێغەمبەری ئازیزمان خۆر و تیشکی ڕێنیشاندانە، بەتەنها بۆ موسوڵمانان نا، بەڵکوو بۆ گشت مرۆڤایەتی پێشڕەو و نموونەی باڵایە. لەنێو گشت کووچە و گۆشەیەکی ژیانیدا جوانییەکی جیاواز حەشار دراوە، وەک خودای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی پێ داوە: ‹نموونەی باڵا›یە سەروەرمان. هەڵبەت هەر وایش دەبێت، چوون قورئانی پیرۆز سەرچاوەی ڕاستی و دروستی و پەرستشە جوانەکانە و ڕێنیشاندەری ئازیزمان بووە و لەسەر زاری خاتوو عائیشەوە: ‹ئەو قورئانێکی بەرجەستەکراو بوو.›

لەم کتێبەدا هەوڵمان داوە گەشتێک بەنێو ڕەوشتی باڵایدا بکەین و ئێمەش هەمان گوتەی ئیمامی ڕەبانی دووبارە دەکەینەوە: ‹من بەم وتانەم هەوڵ نادەم پەسنی جوانیی موحەممەد بدەم و جوانییەکانی نیشان بدەم، بەڵکوو هەوڵم داوە بە باسکردنی ئەو وتەکانم و کتێبەکەم جوان بکەم.›

پێشنیار دەکەم هەر ڕۆژێک چیرۆکێک لەم کتێبە بخوێننەوە، گەر وا بکەن، گشت ڕۆژێکتان لەگەڵ ئەو بەسەر دەبەن! یادی ئەو دەکەن و بانگهێشتی دەکەن بۆ نێو ماڵ و دڵتان! چەند جوانە میوانداریی ئەو میوانە پیرۆزە دەکەن! هاوکات وا هەست دەکەن لە گشت ڕووداوەکاندا لەگەڵیدا بوون و هەستێکی نزیکیتان بۆ دروست دەبێت، چوون بۆ ماوەی ساڵێک بەبەردەوامی لەگەڵیدا دەبن.

هیوادارم لەگەڵ خوێندنەوەیدا بەبەردەوامی سەڵات و سەلام بنێرن بۆ گیانی سەروەر و نزای خێر و چاکەش بۆ نووسەرەکەی لەبیر نەکەن.

لە کۆتاییشدا سوپاس و پێزانینی بێپایانم هەیە بۆ ناوەندی ڕێنوێن و هەموو ئەو کەسانەی ماندوو بوون لە وەرگێڕان و گەیاندنی ئەم کتێبە بە دەستی تۆی ئازیز! لە میهرەبانی و لوتفی خوداوە دەیبینم.

نوردان داملە، نووسەری دوورەدەست و نزیک لە دڵتان، کە هەموو منداڵانی دونیا و تۆی بەتایبەتتر خۆش دەوێت کە پێغەمبەرمان موحەممەدی موستەفات خۆش دەوێت...

پڕ بن لە خۆشەویستی و میهرەبانی و جوانی...

نوردان داملە

نووسەر و لێکۆڵەر

ئینستاگرام: nurdandamlaa

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاسی بێپایان بە پەروەردگاری مەزن، درود و سەڵەوات لەسەر گیانی پاکی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ)، لەسەر خانەوادەو یاران و شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی دوایی.

لە ناوەڕاستی مانگی ئەیلولی ساڵی ڕابردوو ئەم کتێبە پڕ بەهایەم لە ڕێگای برایانی بەڕێزم لە (ناوەندی ڕێنوێن) لە سلێمانی بینی، لە بنەڕەتدا بە زمانی ئینگلیزی نوسراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبی. ئەویش بۆ سەیرکردن و هەڵسەنگاندنی، کە ئەگەر وەربگێڕدرێتە سەر زمانی شیرینی کوردی ئایا لە پرۆسەی پەروەردە و پێگەیاندندا سودێک بە دایبابەکان و نەوەکانمان دەگەیەنێ یان نا، دوای شەن و کەو کردنی، گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە خزمەتێکی گەورە بە جگەرگۆشە و لاوە خوێنگەرمەکانمان دەکات، کە هەردەبێ پێشەنگێکی نمونەیی بێ کە لەژیانیاندا بوونی هەبێت، لەبەرچاویاندا بێت تا شوێنپێی هەڵگرن، چونکە حەزی هەر کەسێ بەتایبەتی منداڵ و مێردمنداڵ و لاوانی خوێنگەرم ئەوەیە نمونەیەکی بەرجەستە ببینن تا ئەو خەون و ئاواتە بەرزانەی کۆششیان بۆدەکەن بە واقیعی لە ژیانیاندا ببینن، هەرئەوەش میتۆدی پەروەردەی دروستە بەتایبەتی لە باوەڕە ئاینی و زانستە مرۆڤایەتییەکاندا، ئینجا بە تەوفیقی خوای گەورە بڕیاری وەرگێڕانمدا، تاکە شتێک کە تێبینیم لەسەری هەبوو ئەوەبوو کە نووسەر سەرچاوەکانی تۆمارنەکردووە، بەلام لە بەدوادچوونی هەندێ ڕووداو و سەرگوزەشتە و موعجیزەدا بۆم دەرکەوت کە هەرچی گواستووەتەوە بێ سەرچاوە نەبووە.

ئەم کتێبە چەند تایبەتمەندییەکی هەیە کە ئەمانەن:

- نوسەر لەم ژیننامەیەدا کە لە توێی (٣٦٥) ڕۆژدایە زیاتر تیشکی خستووەتە سەر ڕۆڵی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) لە گرنگیدانی بە منداڵ و مێردمنداڵ و لاوان لە هەردوو ڕەگەز و پەروەردەکردنیان هەروەک بە ناونیشانەکەیەوە دیارە.

- شێوازی نوسینەکەی زۆر سادە و ئاسانە، دوور لە یاریکردن بە وشەکان، ئەوەش بۆ ئەوەیە تا هەموو کەس بتوانێ لێی تێبگات و منداڵەکانیش بتوانن تێیبگەن، هەربۆیە بە شێوازی چیرۆک دایڕشتووە.

- تیشکی خستووەتە سەر هەندێ موعجیزەی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام لە دیدی گەورەیی ئەو پێغەمبەرە لای خوای گەورە نەک بۆ سەلماندنی پێغەمبەرایەتییەکەی، چونکە قورئانی پیرۆز و ڕەوشتبەرزیی بەڵگەی پەیامدارییەکەی دەگەیەنن نەک موعجیزەکانی.

- سیفەتەکانی خۆشەویستی و دڵسۆزیی و بەزەیی و خاکیبوون و وەفاداریی و لێبوردەیی و ڕاستگۆیی و بەخشندەیی و ئارامگرتن و قوربانیدان و میوانپەزێریی و خۆڕاگریی و نەرمونیانی و جوامێریی و چاونەترسیی و دنیانەویستی و مرۆڤدۆستی و... تادوایی کە لە پێغەمبەردا(ﷺ) بوونیان هەبووە تەواوی سیفەتەکانی هەموو پێغەمبەرانی لە ئادەمەوە تا کۆتایی تێدا کۆبووەتەوە، لێرەشەوە لەگەڵ ئاینە کامڵەکەی کۆتا پەیامی یەکتاپەرستیی و مرۆڤدۆستی دەگەیەنن.

- ئەم کتێبە بەرنامەی ساڵێکە بۆ دایباب و جگەرگۆشەکانیان بۆ تێگەیشتن لە بەشێکی زۆر لە ژیننامەی پێغەمبەر(ﷺ)، بەتایبەت ئەو سیفەتانەی باسکراون، لە هەندێ شوێندا ڕەچاوی ڕیزبەندی مێژوویی نەکردووە، چونکە زیاتر مەبەستی گەیاندنی ئەو چەمکانە بووە. ئێمەش هەر وەک خۆی و بۆ پاراستنی ئەمانەتی ئەدەبی

دەستکاری سەرباس و ڕۆژەکان و ناوەڕۆکمان نەکردووە.

لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە تەوفیقمان بدات بۆ هەر کارێ کە جێگای ڕەزامەندی زاتی پەروەردگارە، بۆ زیندوڕاگرتنی ژیننامەی پێغەمبەری ئازیزمانە(ﷺ)، تا بتوانین لە پرۆسەی بونیاتنانی کۆمەڵگای بەختەوەر لە دنیادا لەسەر ڕێبازە نەمرەکەی بەردەوام بین کە ڕازاوە بێت بەو سیفەتە بەرزانەی پێغەمبەر(ﷺ)، هاوکات ببێتە مایەی ڕزگاربوونمان لە ڕۆژی قیامەتدا تا بە خزمەتی ئەو سەروەرەمان(ﷺ) بگەین بەویستی خوای گەورە.

وەرگێڕ

محمد محمد حمەمیرزا

١١ / ١ / ٢٠٢٠

سلێمانی

## بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان

## لەبیرتان نەچێت...

هەرکات ناوی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هاوەڵە بەڕێزەکانی و ڕابەرە ئاینییە قەدر گرانەکان هێنرا، دەبێت ئەو سیفەت و نازناوانە بدەینە پاڵیان کە شایستەیانن، ئەوەش وەک ڕێزگرتنێک لێیان.

بۆیە پێویستە وەک ڕێز نواندن بۆ پێغەمبەری خوا هەرکات ناوی پیرۆزی هات لەدوای ناوەکەی ئەم دەستەواژەیە دابنێین(ﷺ).

هەروەها دەستەواژەی -خوا لێی ڕازی بێت-لەدوای ناوهێنانی هەر هاوەڵێکی بەڕێز کە ماوەیەک لە ژیانی لە نزیک پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بەسەربردووە یان نیعمەتی هاودەمی و یاوەری پێبەخشراوە.

لە کاتی خوێندنەوەی ئەم کتێبەدا:

خێزانە بەڕێزەکان، پەروەرشکارە خۆشەویستەکان:

ئامانجمان لەم کتێبەدا ئەوەیە منداڵەکانمان ئەو هەستەیان تێدا دروست ببێت هەر وەک بڵێی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووەتە میوانی ماڵەکانمان، تا ئەوانیش کاتێکی بەسود و خۆش لە خزمەتیدا ببەنەسەر کە هەرگیز لەبیریان نەچێتەوە.

ئەم کتێبە بەشێوەیەک ئامادەکراوە کە بتوانرێ ڕۆژانە لێی بخوێنرێتەوە و لە ماوەی یەک ساڵدا تەواو ببێت. هەر بۆیە لە شێوەی ٣٦٥ چیرۆکدا لە ژیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان بە

ڕیزبەندی کاتەکان هەڵبژێردراوە. ئێمەش هانتان دەدەین لەسەر خوێندنەوەی چیرۆکەکان لەگەڵ منداڵەکانتاندا هەر لە یەکەم ڕۆژەوە هەتا ڕۆژی ٣٦٥ مین ڕۆژ، بۆئەوەی خۆیشتان زیاتر شارەزابن بە ژیانی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

جا لەبەرئەوە منداڵان لە شوێنکەوتنی کاتە دوور و چیرۆکە درێژەکاندا تووشی زەحمەت دەبن، ئەوا ڕێنماییتان دەدەینێ کە لە هەر ڕۆژێکدا تەنها یەک چیرۆکی لێ بخوێنرێتەوە، چونکە ئەم شێوازە ڕێگا بە منداڵان دەدات بیر لە چیرۆکەکە بکەنەوە، هەروەها وایان لێدەکات هەست بە زیاتر زانین و جۆش و گەرموگوڕی بکەن بۆ بیستنی چیرۆکی دوای ئەو. لەوانەیە منداڵان لە تێگەیشتنی هەندێ لە دەقەکاندا تووشی نارەحەتی ببن، ئەویش بەهۆی کۆمەڵێ وشەی نوێوە کە پێشتر نەیانبیستبن، جا بەوهۆیەوە هانتان دەدەین خۆتان لە کاتی خوێندنەوەیاندا سەرپەرشتییان بکەن، وەڵامی پرسیارەکانیشیان بدەنەوە تا خۆتان دڵنیابن لە ڕاست و دروستی تێگەیشتنیان لە ناوەڕۆکی چیرۆکەکە.

زیاد لەوە، دەتوانن سود لەو بابەتانە وەربگرن لە چیرۆکەکاندا هاتوون، وەک سیفەتەکانی بەخشندەیی، دڵسۆزیی، میوانپەزێریی، ڕاستگۆیی، سۆزداریی، بەزەیی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵە بەڕێزەکانی هەڵسوکەوتیان کردووە پێیانەوە، ئەو بەها باڵا و ڕەوشتە جوان و بەرزانە بەکاربێنن تا لە منداڵەکانتاندا ڕیشک دابکوتن و ببنە بنەمای شەرعی لەلایان. ئومێدخوازین ئەم کتێبەمان پشکی هەبێت لە دارشتنەوەی بونیادی خوو و عادەت و نەریتی ئەم نەوەیە لە ڕەوشتەکانیدا، ئەویش لە ڕێگای شوێنکەوتنی کەسایەتی ڕاست و دروست و مەزنی پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان(ﷺ).

## ١. موحەممەد(ﷺ) دێتە ئەم جیهانە

زەوی بە گوڵ و جریوەی چۆلەکە و پەپولەکان خۆی ڕەنگین و ڕەنگپۆش کرد، خۆی بە میوەهات و ڕووەکەکان لە هەموو جۆری ڕازاندەوە، سەرەڕێگا و کۆڵانەکان پڕبوون لە تریقە و پێکەنین و دەنگی منداڵان، هاژە و وشەوشی ڕووبارەکان بەرزبوویەوە و دەرودەشت پڕبوو لە شادیی، جیهان لە هەموولایەکەوە بە جۆرەها شێوە پرشنگی دەدا، بەڵام نەداریی و داماوی باڵی کێشابوو بەسەر ژیانی خەڵکیدا، هەموو شوێنێک پڕ بوو لە ڕووداوی نامۆ و سەیروسەمەرە.



خەڵکی ئەو خوایەیان لەبیرچووبوویەوە کە ئەو هەموو جوانییەی پێبەخشیون، نەیاندەپەرست، بەڵکو شتانی تریان دەپەرست، هەیانبوو ئاگری دەپەرست، هەیانبوو خۆری دەپەرست، تەنانەت هەندێکیش ئاژەڵەکانیان دەپەرست، ئەو خەڵکە بە شێوازی خۆیان نوێژیان بۆ چەندین پەیکەر دەکرد کە لە شێوەی بوکەشوشەدا بوون، خۆیان بە دەستی خۆیان لە دارو تەختە و بەرد هەڵیانکۆڵیبوون و پێیان دەوتن بتی بەردین یان تەختە، بەڵام لە واقیعدا ئەوە خوای گەورەیە ئەو هەموو بەرد و ئاگر و تەختە و شتانەی تری بەدیهێناوە، ئەو زاتە ئاژەڵ و خۆری بەدیهێناوە، تەنها و تەنها زاتی اللە شایستەی پەرستنە، لەو سەردەمەدا دەوڵەمەندان هەژارانیان دەچەوساندەوە، خەڵکی حەزیان لە منداڵی مێینە نەبوو، خۆیشیان بە زل دەگرت لە ئاست هەژاراندا، پیر و پەککەوتەکانیان فەرامۆش کردبوو، چارەسەری نەخۆشەکانیان نەدەکرد. بە کورتی و پوختی ڕەگەزی مرۆیی ئەو ڕێز و حورمەتەی نەبوو کە شایانی بوو. هیچ

کەس ڕێزی فەرمان و یاسا خواییەکانی نەدەگرت، بەڵکو لە پشێوی و ئاژاوەیەکی سەرتاسەریدا دەژیان، زۆر زەحمەت بوو جیهان لە هەرچوار لا جوانەکەیەوە خەڵکانێکی ئاوا نەفام و نەزان بگرێتە خۆی کە هیچ جۆرە خۆشەویستی و بەزەییەکییان لا نەبوو.

خوای گەورە هەر لە سەردەمی ئادەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەدرێژایی مێژوو ژمارەیەکی زۆر لە پێغەمبەرانی ڕەوانەکردووە، ئەوانیش هەستاون بە بانگکردنی خەڵکی بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها، بە گرتنەبەری ڕێگای ڕاست، بە ئەنجامدانی کارە چاکەکان، خۆڕازاندنەوە بە ئارامگرتنەوە. بەڵام هەموو جارێ شەیتان لە پاش ماوەیەک ئەو خەڵکەی گومڕا دەکردەوە، ئەوانیش هەموو ئەو فەرمان بە چاکەو ڕێگیریکردنە لە خراپەیان لەبیردەچوویەوە کە پێغەمبەران هێنابوویان بۆیان.

شەش سەد ساڵ تێپەڕی بوو بەسەر هاتنی گەورەمان عیسا پێغەمبەردا(ﷺ). جیهانیش ئامادەباش بوو پێشوازی لە پێغەمبەرێکی تر بکات تا سنورێک بۆ ئەو ستەم و چەوساندنەوەو دڵڕەقییە دابنێ کە بڵاوەیان کردبوو بەنێو خەڵکیدا. کەواتە بەدڵنیایی ئەو دێت و ئاشتی و دادپەروەریی و ئاوەدانی بۆ سەراپای جیهان دێنێ. بەڵام کەی؟

## ٢. کەعبەی پیرۆز، گەوهەری زەوییە

کاتـی دەرکەوتنـی پێغەمبەرەکەمـان نزیکبووبوویـەوە، ئـەوکات سـەرداری مەککە عەبدولموتتەلیب بوو، کە بە زنجیرەی خانەوادەیی دەچێتـەوە سـەر نـەوەی ئیبراهیـم پێغەمبـەر(ﷺ)، بـەم نزیکانـەش دەبێتە باپیـری پێغەمبـەرە خۆشەویستەکەمان. کەعبـەی زۆر خۆشدەویسـت، ئـەوەی لـە توانایـدا بـوو بـۆ پارێزگاریکـردن لێـی پێـی هەسـتا. بەهەمانشێوە میوانداری ئەو خەڵکەی بە جوانی دەکرد کە دەهاتن بۆ تەوافکـردن بـەدەوری کەعبـەدا. ئـەو خانـووە شـەرەفمەندە لای زۆرێک لـە خەڵکـی بـەرزو پیرۆز ڕادەگیرا چونکە یەکەمین شوێنە لـە سەرتاسـەری زەویدا بۆ پەرستشکردن. کەعبە گەوهـەری زەوی بـوو. خـوای گـەورە فەرمانـی بـە یەکەمیـن مـرۆڤ و یەکەمیـن پێغەمبـەری خـۆی ئـادەم(ﷺ) کـرد بـە دروسـتکردنی کەعبـەی پیـرۆز.

لـەو کاتـەوە چەندیـن سـەدە تێپەڕیـن، دیـواری کەعبـە ڕوخابـوو، ئینجـا خـوای گـەورە فەرمانیـدا بـە ئیبراهیـم پێغەمبـەرو ئیسـماعیلی کـوڕی(ﷺ) هەسـتن بـە دروسـتکردنەوەی کەعبـە و پێـی فەرمـوون کـە خەڵکـی لـەو شـوێنەدا کۆدەبنـەوە بـۆ پەرسـتنی خـوای گـەورە، هەروەهـا داوای لێکـردن خەڵکـی بانـگ بکـەن بـۆ حەجکـردن لـەلای کەعبە، بەمشێوەیە حەج بووە زیارەتێکی ئاینی تایبـەت و پەیوەست بـە ئیبراهیـم پێغەمبـەر(ﷺ). ئیتـر لـەو کاتـەوە خەڵکـی بەدرێژایـی مێـژوو ڕێزێکـی گـەورە بـۆ کەعبـە دادەنێـن. بـەڵام دواتـر ئاینـی ئیبراهیـم پێغەمبەریـان(ﷺ) لەبیر خەڵکی چوویـەوەو کەوتنـە پەرستنی بتـەکان، بـەڵام وێـڕای ئـەوە خەڵکـی هـەر بەوشێوەیە مانـەوە کـە ڕێزی

کەعبەیان دەگرت.

خەڵکی لە شوێنانی دوورەوە دەهاتنە شاری مەککەی پیرۆز بۆ سەردانی کەعبە شەرەفمەند. بەڵام ئەو بایەخپێدانەی خەڵکی بەو خانووە پیرۆزە هەندێ کەسی بێتاقەت کردبوو، لە سەرووی هەموو ئەو کەسانەوە کە ڕقیان لە کەعبە بوو کەسێک بوو بەناوی ئەبرەهە، ئەویش فەرمانڕەوای یەمەن بوو، ئەبرەهە ویستی ڕێگیری لە خەڵک بکات لەوەی سەردانی کەعبە بکەن، هەر بۆیە هەستا پەیکەرێکی گەورەی لە یەمەن دروستکردو بەرگی ئاڵتونیی بۆ کرد. دوای ئەوە داوای لە خەڵکی کرد سەردانی پەرستگاکەی بکەن. دەیویست ئەو پەیکەرەی خۆی ببێتە مەڵبەندی پەرستن و جێگای کەعبە بگرێتەوە، چونکە لەو سەردەمەدا پەیکەرەکان شوێنی تایبەت بوون کە هەندێ لە خەڵکی بۆ پەرستشکردن دەرۆیشتن بۆ لایان، بەڵام نە بۆ پێغەمبەران. ماوەیەکی دوورو درێژ تێپەڕی پەیکەرەکەی ئەبرهە هەر نەبووە جێگای گرنگی زۆرێک لە خەڵکی. ئەمەش بووە مایەی ڕق هەستانی و شێتگیر بوو، بڕیاریدا کەعبە وێران بکات، ئینجا کەوتە خۆسازدان بۆ بەجێگەیاندنی ئەو بڕیارەی.

## ٣. خاوەنی کەعبە

ئەبرەهە بە مەبەستی ڕوخاندنی کەعبە، سوپایەکی زۆر گەورەی پێکەوەنا، ئینجا لە سەرلەبەیانی یەکێک لە ڕۆژەکان ڕۆیشت بەرەو کەعبە، سوپاکەی ئەبرەهە پێکهاتبوو لە چەندەها فیلی زەبەلاح کە لە شوێنی دوورەوە هاوەردەی کردبوون، قورەیشیش لە ژیانیدا ئەوانەی نەدیبوو، ئەبرەهە فیلەکانی بە قوماشی ڕەنگاو ڕەنگ ڕازندبووەوە، بەهێزترینیان فیلێکی زەبەلاح بوو کە ناوی نابوو مەحمود، مەحمود کەوتە پێش سوپاکە، لەگەڵ هەر هەنگاوێکیدا زەوی لەژێر پێیدا دەلەرزی، ئەبرهە متمانەی بەوە هەبوو کە مەحمود بە یەک لێدان کەعبە دەڕوخێنێ، کاتێ سوپاکە نزیکبوویەوە لە مەککە، کۆمەڵێ لە سەربازەکانی کەوتنە تاڵانکردنی ماڵ و کەلوپەلی قورەیش، لەو ماڵ و شتانەی کە سوپاکەی ئەبرهە تاڵانیان کرد دوو سەد وشتری عەبدولموتتەلیب بوو، ئەبرەهە خۆی لەسەر گردۆڵکەیەک وەستا کە دەیڕوانی بەسەر کەعبەداو وەک ئەڵماسێکی بریقەدار دەدرەوشایەوە، جا پێش ئەوە بچێتە ناو شارەکەوە، ویستی چاوی بە سەرۆکی مەککە بکەوێت، بەو هۆیەوە ناردی بەدوای عەبدولموتتەلیب دا، پێیوت من تەنها بۆ ئەوە هاتووم کەعبە بڕوخێنم، جا ئەگەر ڕووبەڕووی نەبنەوە ئەوا یەک دڵۆپە خوێن نارێژرێ، ئینجا پرسیاری لێکرد ئەگەر ئەو شتێکی دەوێ لێی با بیڵێ، عەبدولموتتەلیب وتی: (سەربازەکانت دەستیانگرتووە بەسەر دوو سەد وشتری منداو دەمەوێ بیانگێڕیتەوە بۆم)، ئەبرەهە ئەم وەڵام و داوایەی زۆر بەلاوە سەیر بوو، پێیوت: (چاوەڕێی ئەوەم

لێدەکردی داوام لێبکەت کەعبە نەڕوخێنم، بەڵام من وا دەتبینم تەنها شتێ کە بەلای تۆوە گرنگە وشتەکانی خۆتەو هیچیتر، تۆ لای من کەسێکی زۆر خاوەن ڕێزو قەدرگران بوویت، بەڵام ئێستە وادەبینم بەهەڵەدا چووم لەوەی بە گەورەییەکی ڕێزدار بۆت بڕوانم).
عەبدولموتتەلیب لە وەڵامدا وتی: (ئەو خانووە پەروەردگارێکی هەیە ڕێگیری لە ڕوخاندنی دەکات). ئەبرەهە زۆر زۆر تووڕە بوو و قیڕاندی بەسەریداو وتی: (ناتوانێ ڕێگیری لە من بکات)، عەبدولموتتەلیبیش بە دەنگی بەرز وتی: (ئەوە تۆ و ئەوە ئەو). پاشان بڕکە وشترەکانی خۆی وەرگرتەوەو گەڕایەوە بۆ مەککە، ئینجا ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ کەعبەو لە خوای گەورە پاڕایەوە وتی:

(ئەی پەروەردگار، ڕووی داوام تەنها لە تۆیە.....ئەی پەروەردگار، ڕێگیریان لێبکە لەوەی دەستیان بگاتە پیرۆزییەکانت

دوژمنی ماڵەکەی تۆ کەسێکە دوژمنایەتی تۆ دەکات.....ڕێگیریان لێبکەو مەهێڵە ئەم شارەت کاول بکەن).

دوای ئەوە، عەبدولموتتەلیب داوای لە خەڵکی قورەیش کرد شارەکە بەجێبێڵن، خۆیشی لەگەڵیان شارەکەی جێهێشت و چوونە سەر گردۆڵکەیەک کە دەیڕوانی بەسەر مەککەدا، وەها کە لەوێوە دەیانزانی چی لای کەعبەدا ڕوودەدات.

## ٤. تەیرولئەبابیل

ئەبرەهە وایدەزانی لەنێوان ئەو و ڕوخاندنی کەعبەدا هیچ ڕێگیرییەک نیە، بۆیە ڕاستەوخۆ فەرمانی بە سوپاکەیدا بکشێن بەرەو کەعبە، ئا لەو ساتە هەستیارەدا، مەحمود واتە فیلە زەبەلاحەکە کە ئەبرەهە ئومێدی زۆری لەسەر هەڵچنیبوو چۆکی دادا، لەسەر زەوی مۆڵی خوارد، سەربازەکان هەموو هەوڵێکیان خستەگەڕ تا ناچاری بکەن هەستێتەوە سەر پێ، بەڵام بێسود بوو، هەرکات هەوڵیانبدایە ئاراستەی سوپاکە ڕوو بە یەمەن بێت فیلەکە هەڵدەسایەوە، بەڵام هەرکات دووبارە بیانگێڕایەتەوە بەرەو کەعبە فیلەکەش سەرلەنوێ تەختی سەرزەوی دەبوویەوە، هەموو ئەو هەوڵانەی بەخەرجیادا تا هەستێت سەرکەوتوو نەبوون.

لە کاتێکدا ئەبرەهەو سوپاکەی سەرقاڵی هەستانەوەی مەحمود بوون تا بڕوات بەرەو کەعبە، شتێکی زۆر سەیر و نامۆ ڕوویدا، لە ناکاودا هەورێک لە باڵندە ئاسمانیان داپۆشی، بڵاوبوونەوە بەسەر سوپاکەدا، ئەو باڵندانە باڵندەی ئەبابیل بوون، بە دنوک و چڕنوکیان بەردێکی بچوکیان هەڵگرتبوو (گڵمتک)، ئەمەش ڕووداوێکی زۆر سەیر بوو چونکە باڵندەکان بەجۆرێ هەڵسوکەوتیان دەکرد وەک بڵێی فەرمان لە یەک سەرچاوەوە وەردەگرن، لە یەک کاتدا هەستان بە داباریني بەردەکان بەسەر سوپاکەی ئەبرەهەدا، هەرکە بەردەکە دەیدا لە سەربازەکە ڕاستەوخۆ دەکەوتە سەرزەوی، ئەبرەهە تووشی شۆک بوو، لەگەڵ چەند سەبازێکیدا ڕایان کرد، بەڵام لە کاتی ڕاکردنیدا ئەویش هەمان ئەو بەردانە دابارینە سەری و تەختی زەویان کرد، ئا بەمشێوەیە ئەو باڵندە بچوکانە سوپایەکی گەورەو زەبەلاحیان لەناوبرد، خوای گەورە بە قودرەتی بێسنوری خۆی بەنرخترین گەوهەری لەسەر ڕووی زەوی پاراست.

## ٥. شادبوونی جیهان

هێشتا ئامینە سکەکەی دانەنابوو، تەنها ژمارەیەکی کەم لە خەڵکی چاکەخواز و منداڵان نەبێ ئیتر سەراپای جیهان لێوانلێو بوو لە خراپەکاریی، لێرەوە هاتنی سەرکردەیەک تا ڕێنمایی خەڵکی بکات بەرەو ڕێگای چاکەکاریی بوو بووە مەسەلەیەکی زەروری، هاوکات بەختەوەریش لەگەڵ خۆیدا دەستەبەر بکات، خوای باڵادەست بەڵێنی دابوو پێغەمبەر و سەرکردەیەک بنێرێ، هەموو دروستکراوان ئەوەیان دەزانی، جیهان پێویستی بە هاتنی ئەو پێغەمبەرە بوو.

ڕۆژی دوو شەممە، مانگی نیسان، ساڵی ٥٧١ز، ڕووداوە چاوەڕوانکراوەکە ڕوویدا، لەو ڕۆژەدا، شادیی تەواوی دنیای داپۆشی، هۆیەکە چی بوو؟ چی ڕوویدا؟ نوورێکی درەوشاوەو پرشنگدار تەواوی ڕووی زەوی گرتەوە، ئەو میوانە کە دەمێک بوو جیهان چاوەڕێی هاتنی دەکرد دواجار گەیشت. جیهان بەدەم نارەحەتی ئارامگرتنەوە ئۆقرەی لێبڕابوو و چاوەڕێی ئەو هەواڵەی دەکرد، لەو شەوەدا، ئەستێرەیەک لە ئاسمان دەرکەوت، دانایەکی جولەکەش لە مەدینە ئەستێرەکەی بینی و تێگەیشت کە ئەوە ئاماژەیەکە بۆ لەدایکبوونی پێغەمبەرێک، ئەو جولەکەیە بە شەقامەکانی مەدینەدا دەسوڕایەوەو بە دەنگێکی بەرز دەیقڕاند و دەیوت: (ئەی قەومی جولەکە، ئەمشەو ئەستێرەکەی ئەحمەد هەڵهات و تیایدا لەدایکبوو!)، جولەکە بێتاقەت بوون لەو هەواڵە کە بیستیان، چونکە ئەو پێغەمبەرە نوێیە لەناو ئەواندا لەدایک نەبوو، ئەو لە هەموو بەندەکان نزیکترە

لە خوای گەورەوە، گەورەترینی پێغەمبەرانە، پێشترو تا ئەو ڕۆژە هەموو پێغەمبەران باشەی ئەم پێغەمبەرە نوێیەیان وتبوو، هەر لە موساوە تا داود و تا عیسا پێغەمبەر(ﷺ)، هەموویان مژدەی هاتنیان بە خەڵکیداوە!

بەڵێ، ئەو میوانە کە دەمێک بوو جیهان چاوەڕێی هاتنی دەکرد دواجار گەیشت! لە ئایندەشدا تەواوی موسڵمانان گەورەو بچوکیان بە (پێغەمبەرە خۆشەویستەکەمان)ناوی دەبەن. ئێمەش هەر بە هەمان ناو ناوی دەبەین.

## ٦. لەدایکبوونی پێغەمبەرێک

خانوویەک لە مەککەدا هەبوو کە دایکێکی بەختەوەر تیایدا دەژیا ناوی ئامینە بوو، خاتوو ئامینە دڵخۆشترین و بەسۆزترینی دایکانی جیهان بوو، چونکە بووە دایکی منداڵە چاوەڕوانکراوەکە، بەختەوەریی سەراپای ڕوخساری داگرتبوو، وتی بەوانەی کە بەدەوریدا بوون کاتێ ئەم منداڵەی داناوە لە خەویدا نوورێکی بینیوە لێیەوە دەرچووە و کۆشکەکانی شامیی ڕۆشنکردووەتەوە. ئەم منداڵە خەوێکی ئارامی هەبوو و بێئاگابوو لەو جیهانەی بەدەوریدایە، ئەو منداڵە گەورەی پێغەمبەرانە، ئەو کەسانەی لە ژوورەکەدا بەدەوریدا بوون کەوتنە وتنەوەی چەندین دەستەواژەی پیاهەڵدان بەو منداڵە جوان و ئارامەدا.

باوکی ئەم منداڵە ناوی عەبدوالله بووە، بەرلەوە کوڕەکەی ببینێ کۆچی دوایی کردبوو، بەڵام باپیرەی لە ژیاندا مابوو، باپیرەی کەسایەتییەکی بەهێز و خۆشەویست و بەخشندە بوو، ناوی عەبدولموتتەلیب و سەرۆکی مەککە بوو، دراوسێکان ڕاستەوخۆ ڕۆیشتن بۆ لای عەبدولموتتەلیب و مژدەی هەواڵی لەدایکبوونی نەوەیەکیان پێداو پێیانوت: نەوەیەکی جوانی پێبەخشراوە کە قورەیش پێشتر لە وێنەی ئەم منداڵەی بەخۆیەوە نەدیوە، عەبدولموتتەلیبیش ڕاستەوخۆ ڕووی لە ماڵ کردوو بەخۆشییەکی زۆرەوە منداڵەکەی کردە باوەش، دەیوت: (ئەم منداڵەم پێگەو پایەیەکی دەبێت) ئینجا ناوی نا موحەممەد.

کاتێکیش خاتوو ئامینە سکپڕبووە بە منداڵەکەیەوە خەوێکی بینیبوو، لەو خەوەیدا پێی وترابوو بەو ناوەوە ناوی بنێ. هەر بە بۆنەی لەدایکبوونی ئەو منداڵەوە، باپیرەی هەستا بە سەربڕینی قوربانی بۆی، ئینجا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ گێڕاو هەمووی خەڵکی بەشداربوون تیایدا، خەڵکە هەژارەکانیش بانگهێشت کرابوون. خۆشی و شادی هەموو شوێنێکی گرتەوە، مەککەش بە نوورێکی نوێ هاودەم لەگەڵ لەدایکبوونی گەورەمان موحەممەد دەدرەوشایەوە.

## ٧. حەلیمەی سەعدییە، دایەنی پێغەمبەر(ﷺ)

شاری مەککە شارێکی قەڵەباڵغ بوو، منداڵان بەرگەی کەشوهەواکەیان نەدەگرت، لەبەرئەوە، نەریتی دانیشتوانەکەی وەها بوو کە منداڵە تازە لەدایکبووەکانیان دەبردە لادێ لە دەرەوەی شار، تا دایکێکی شیردەر هەستێ بە بەخێوکردنی، دایکە شیرییەکە بۆ ماوەی چەند مانگێک لە ژینگەیەکی هەوای پاک و خاوێندا منداڵەکەی بەخێو دەکرد.

خاتوو ئامینەو عەبدولموتتەلیبی باپیری بەدوای دایکێکی شیردەردا دەگەڕان تا موحەممەد لە دەرەوەی مەککە بەخێو بکات، عادەت وابوو دایکە شیردەرەکان لە بیابانەوە دەهاتنە مەککەو بەدوای منداڵانێکدا دەگەڕان تا لای خۆیان بەخێویان بکەن، دەرودەشت هەوایەکی پاکو خاوێن و وشکی هەبوو، باشترین شوێن بوو بۆ تەندروستی منداڵەکان. هەندێ لەو ئافرەتانە منداڵیان دەست دەکەوت و دەگەڕانەوە بۆ ماڵی خۆیان لە بیابان، بەڵام عەبدولموتتەلیب هێشتا دایەنێکی بۆ کوڕەزاکەی دەست نەکەوتبوو، زۆربەی ئەو دایەنانە حەزیان لەوە نەبوو موحەممەد بگرنە لای خۆیان چونکە بێباوک بوو، بەڵام ئەگەر بیانبینیایە ئەوا نەیاندەتوانی بێ ئەو بگەڕێنەوە.

ڕۆژێکیان ئافرەتێکی گەنج لە بیابانەوە بە سواری گوێدرێژەکەی لەگەڵ مێردەکەیدا کە سواری وشترێک بوو هاتنە مەککە، کەوتنە گەڕان بەناو شەقامەکانی مەککەدا، منداڵەکەشی لە باوەشیدا دەگریا، چونکە شیری تێدا نەبوو بیداتێ، ئەوەش بەو هۆیەوە بوو کە خۆی

برسی و ماندوو بوو، لە کاتی هاتنیان بۆ مەککە، چەندین زەحمەت و ناڕەحەتیان تووشهات، گوێدرێژەکە ملی ڕێگاکەی نەدەگرت، هەروەها شیری وشترە پیرەکەش وشکی کردبوو، ئا بەمجۆرەو بەو سەختییە زۆرەوە گەیشتنە مەککە، حەلیمە بەناو شەقامەکانی مەککەدا دەگەڕا تا منداڵێکی دەستبکەوێت و ببێتە دایەنی، دواجار، حەلیمە لە کاتێکدا باپیرەو دایکی موحەممەد سەرقاڵی گەڕان بوون بەدوای دایەنێکدا چاوی بە باپیرەی ئەم منداڵە نوێیە کەوت، باپیرە نزیکبوویەوە لە دایەنەکەو پرسیاری لێکرد و وتی: (تۆ لەکوێوە هاتوویت؟) وتی: (من لە بیابانەوە هاتووەم)، ئینجا پرسیاری لێکرد: (ناوت چییە؟) وتی: (حەلیمەی سەعدییە). بە هۆی تەبیعەتە ناسک و ڕێزنواندنەوە باپیرە دڵخۆش بوو، نوقڵانەی خێری لێدا بە ناوەکەی و وتی: (حەلیم و سەعد). ئینجا پێیوت کە کوڕەزایەکی هەیە بەڵام هیچ ئافرەتێک ڕازی نەبووە شیری بداتێ چونکە بێباوکە، داوای لێکرد ئەو ببێتە شیردەری. حەلیمە زۆر دڵخۆش بوو، چونکە نەیدەویست بە دەستی بەتاڵ بگەڕێتەوە بۆماڵەکەی خۆی، حەلیمە ڕازیبوو بە داوای باپیرەی منداڵەکە، پاشان لەگەڵ باپیرەدا چوون بۆ بینینی منداڵەکە.



موحەممەد لەو کاتەدا لەژێر داپۆشەرێکی سپیدا خەوی لێکەوتبوو، هەرکە حەلیمە چووە ژوورەوە بۆنی عەترێکی زۆر خۆش و جوانی بۆنکرد، ڕاستەوخۆ دڵی پڕبوو لە فێنکی و بەختەوەریی، بە دەم سەرنجدان و بەدڵاچوونێکی زۆر زەردەخەنەی بۆ منداڵەکە کرد، ئینجا کردیە باوەش و کەوتە شیرپێدانی، ئای چ ڕووداوێکی لەناکاو بوو!چۆن ئەمە ڕوویدا؟ ئەو بەرلەوە بگاتە ماڵی عەبدولموتتەلیب نەیتوانی شیر بە منداڵەکەی خۆی بدات، چونکە بەهۆی ئەو سەختی و ناڕەحەتیانەوە کە لە ڕێگادا ڕوویان تێکردبوو شیرەکەی وشکبووبوویەوە. بەڵام ئێستە توانی بە ئاسانی لە یەک کاتدا شیر

بە دوو منداڵ بدات، خاتوو ئامینەش ماچی منداڵەکەی ئەوی دەکردو سوعبەتی لەگەڵ دەکرد، ئەو خۆی بە بەختەوەر دەزانی چونکە بۆ دواجار شیردەرێکی دەستکەوت. ئێستە ئیتر پەروەردەیەکی باش پەروەردە دەبێت، بەمجۆرە هەستا بە دابینکردنی پێویستییەکانی ڕۆیشتنی منداڵەکەی بۆ بیابان، کۆمەڵێ دیاری بەنرخیشی بەخشی بە حەلیمە، ئینجا داوای لێکرد کوڕەکەی بپارێزێ.

خاتوو ئامینە دەیزانی خوای گەورە منداڵەکەی دەپارێزێ، بەم باوەڕەوە خواحافیزی لێکردو دۆعای سەلامەتی بۆ خواست.

## ٨. ئەو منداڵەی فەڕ و بەرەکەتی هێنا

موحەممەدی منداڵ بەڕێوە بوو بۆ دەرەوەی مەککە، حەلیمەی دایەن و مێردەکەی هەڵیانگرت و ڕوویانکردەوە ناوچەکەی خۆیان، پرسیاریان لەخۆیان دەکرد ئایا چۆن هەستن بەم سەفەرە، ڕێگاکە دوورو درێژە، گوێدرێژەکەش لاوازە، وشترەکەش شیری تێدا نیە، کەوتنە ڕێکردن و بیریان سەرقاڵ بوو، پاش ماوەیەک ڕێکردن وچانێکیان دا.

جا بۆئەوەی منداڵە شیرەخۆرەکان نەخۆش نەکەون، کە دەبوا بڕێکی زۆر شیر بخۆنەوە، دەبوو حەلیمە خواردنێکی باش بخوات، بەڵام ئایا لەم گەشتەیاندا چۆن شیر و خواردن دەستبخەن؟ ئەگەر بهاتایە وشترە پیرەکە بڕێک شیری بدایە ئەوا حەلیمە زۆر دڵخۆش دەبوو.

بەم مەبەستە مێردەکەی حولەیمە ڕۆیشت تا وشترەکە بدۆشێ، کاتێک ویستی بیدۆشێ ئەوەی کە بینی بە چاوانی بڕوای پێنەکرد، سەیریکرد شیر لە گوانەکانی دێتەدەر، ئەوکات زوو بەزوو کەوتە دۆشینی، ئەو دەفرەی کە پێی بوو پڕبوو لە شیر، ئینجا بە خۆشییەکی زۆرەوە بانگی خێزانەکەیی کرد: (ئەی حەلیمە! سوێند بەخوا من وادەتبینم کە شنەیەکی پیرۆزت وەرگرتووە، ئەی نابینی ئەمشەو کە ئەم منداڵەمان وەرگرت کەوتینە چ خێرو بەرەکەتێک؟).

حەلیمە بە هیواو ئومێدێکی زۆرەوە سەیرێکی موحەممەدی منداڵی کردو وتی: (منیش هەر ئەوە ئاواتمە). ئەوەندە شیریان خواردەوە تا تێریان خوارد، ئینجا هەردوو منداڵەکەیان سەرلەنوێ

لەسەر پشتی وشترەکە قایمکرد، بە ئومێدو دڵخۆشییەکی زۆرەوە درێژەیاندا بە سەفەرەکەیان.

لە ڕێگادا، ڕووداوێکی تری لەناکاو ڕوویدا، ئەو گوێدرێژە کە بە نارەحەتییەکی زۆر گەیشتە مەککە، سەرلەنوێ هێزو تواناو چالاکی بۆ گەڕایەوە. هەوڵیدەدا بە خێراترین کات و ئەوەندەی لە توانایدایە میوانەکە بگەیەنێتە شوێنی مەبەست. ئای ئەمە چەندە نایابە کە لەیەک ساتدا هەموو شتێک گۆڕدرا، کتوپڕ شیری حەلیمە چەند قات زیادی کرد، وشترە پیرەکە کەوتە شیردان، گوێدرێژە لاوازەکەش هێزو توانای بۆ گەڕایەوە، ئەمە هەموو مانای چییە؟ گومانی تێدا نیە هەموو ئەم گۆڕانکارییانە بەهۆی موحەممەدی منداڵەوە بووە، کە دواتر دەبێتە پێغەمبەر، لە کاتێکدا هیچ کەس ئەوەی نەدەزانی.

حەلیمەو مێردەکەی بەبێ هیچ نارەحەتییەک گەیشتنەوە ماڵی خۆیان، ئێستە ئیتر موحەممەدی منداڵ بۆ ماوەیەک لە بیاباندا ژیان دەباتەسەر.

## ٩. ماڵی حەلیمە

ماوەیەکی زۆر بوو ئاسمانی بیابان هەورێکی بەخۆیەوە نەدیبوو کە بارانی لەگەڵ خۆیدا هەڵگرتبێ، وشکەساڵی بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەوامبوو، بەڵام لەبەرئەوەوە کە باران واتە ژیان، خەڵکی هەر چاویان لە ئاسمان بوو و بە ئومێدی بارینی باران بوون، ژیانی ئاژەڵانیش لەسەر ئاوە، بەبێ ئاو، چارەنووسی هەمووی برسێتی و لاوازبوونە، شیر نادەن، خەڵکیش هەر بەهەمانشێوە پێویستییان بە بارانە، ئەویش بۆ خواردنی گۆشت و ئاو و شیر خواردنەوە، چونکە ئەوان هەر بارانیان هەبوو، بەبێ باران خۆراکیان دەستناکەوێت، منداڵان دەیاننالاند بەدەست برسێتییەوە، ڕوخساریان زەرد هەڵگەڕابوو. ئای دەبێ خەڵکی چەندە دڵخۆشبن ئەگەر باران ببارێتە سەریان، بەڵام ئەوا ڕۆژان تێدەپەڕن و ئەو ئاواتەیان هەر نایەتەدی.

تاکە ماڵێک لەناویاندا هەبوو کە جیاواز بوو و وەک بڵێی بەهەشتە، ماڵی نوێی موحەممەدی منداڵە، ماڵی حەلیمەی سەعدیەیە، ئەو ماڵە بە پێچەوانەی هەموو ماڵەکانی تری ئەو بیابانە لە خۆشی و هەرزانی و لەناو فەڕو بەرەکەتدا دەژیا. لە کاتێکدا هەموو ئاژەڵەکانیتر دەیاننالاند بە دەست برسێتیی و بێ شیرییەوە، ئاژەڵەکانی حەلیمە چوست و چالاک بوون، شیرێکی زۆریان دەدا، منداڵەکانیشی حاڵیان لە منداڵەکانیتر باشتر بوو، ڕوخساریان لەبەرئەنجامی برسێتیی زەرد هەڵنەگەڕابوو، بەڵکو بەهێزو دڵخۆشبوون، حەلیمە هۆکاری ئەو گۆڕانکارییانەی باش دەزانی، گومانی تێدا نیە کە موحەممەدی منداڵ هۆکار بووە بۆ هاتنی ئەو فەڕو بەرەکەت و بەختەوەرییە.

## ١٠. مەڕەکانی حەلیمە

ئـەو دایەنانـەی کـە پێشـتر ڕازینەبـوون ببنـە دایەنـی موحەممـەد هەستییان بە سەرسوڕمانێکی زۆر کرد، مەڕەکانی حەلیمەیان بینی قەڵـەون و گوانیان پڕ لـە شیرە، ئـەو ئافرەتانـە بـە شـوانەکانیان دەوت: (بـەڵا لێتانـدا ئـەوە بـۆ ئێـوەش وەک شـوانەکەی حەلیمـە مـەڕەکان ناڵەوەڕێنن؟)، مەڕەکانی حەلیمە ئەوەنده قەڵـەو بوون بە زەحمـەت ڕێیـان دەکرد و گوانیـان شـیریان لێدەچۆڕی.

تەنانـەت شوانەکانیش هەمان سەرسوڕمانیان لا دروست بووبوو، چونکـە ئەوانیش بڕکـە ئاژەڵەکانیان بـۆ هەمـان ئـەو لەوەڕگایانـە دەبرد، بـەڵام مەڕەکانیـان هـەر شـیریان نـەدەدا، چـوون بـۆ لای حەلیمـەو پرسـیاری ئـەو هۆکارەیـان لێکرد، ئەویـش وتـی مەسـەلەکە پەیوەندی بە لـەوەڕگاوە نیە، بەڵکو ئـەوە بەرەکەتی خوایە، لـە ڕێگای گەڕانەوەمـان لـە مەککـەوە هەمـوو شـتێک سـەرلەنوێ دەسـتپێکردەوە، شـوانەکان لـە گوفتارەکـەی حەلیمـە تێنەگەیشـتن، بۆیـە هـەر بـە دۆشـدامانەوە بڵاوەیـان لێکـرد.

پەروەرشکارەکە زیاتر لە جاران شڵەژاو ترسی لێنیشت، یەکێک لە دوو جولەکەکە وتی: (ئەمە ئەو منداڵەیە کە دەبێتە خاتەمی پێغەمبەران، نیشانەکانی دەقاو دەقن لەگەڵ نیشانەکانی خاتەمی پێغەمبەران کە لە کتێبەکانی ئێمەدا هاتوون). ئینجا وتیان: (ئەو نیشانەیەش کە بەناوشانیەوەیە مۆری پێغەمبەرایەتییە). دوو جولەکەکە سوپاسی ئوم ئەیمەنیان کردو ڕۆیشتن، ئا بەمجۆرە یەکەمین نیشانەکانی پێغەمبەرێتی لە مەدینە کەوتنەڕوو، ئایا موحەممەد ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەیە؟ هەر هەمووان حەزیان لەوە بوو ئەوە بزانن، چونکە بینینی سەرچاوەی دڵخۆشییەکی گەورە بوو، خۆشویستن و هەوڵدانیش بۆ نزیکبوون لێیەوە بەهەمانشێوە بوو.

چۆن ڕێیکردووەو چۆن قسەیکردووە، خاتوو ئامینەش تا دەهات دڵخۆشتر دەبوو بە کوڕەکەی.

لەو ڕۆژانەشدا نەخۆشی تاعون لە مەککە بڵاوبووبوویەوە، ئامینەش لەوە دەترسا نەخۆشییەکە منداڵەکەی قوتبدات، حەلیمەش هەر هەستی بە هەمان دڵەڕاوکە دەکرد، بۆیە پرکێشی کردو وتی: (کوڕەکەمم بۆ بگێڕنەوە با بیبەینەوە بۆ لای خۆمان، ئێمە لەم نەخۆشییەی مەککە لێی دەترسین).

خاتوو ئامینەو عەبدولموتتەلیبی باپیرەی ڕەزامەندییان دا لەسەر مانەوەی منداڵەکە لای حەلیمەی سەعدییە بۆ ماوەیەکی درێژتر، ئەوەش وەک پارێزگاریکردنێ لە سەلامەتبوونی، ئەوکات، حەلیمە زۆر دڵخۆشبوو، وا هەستیکرد وەک بڵێی هەمووی دنیای دەستکەوتووە، ئینجا بە هەموو هێزی موحەممەدی منداڵی لە باوەش گرت و گەڕایەوە بۆ بیابان.

## ١٢. سێبەرێک لە هەور

موحەممەد لەنێو برا شیرییەکانیدا بە خێرایی گەورە دەبوو، ئەو منداڵانەی شیری یەک دایک دەخۆن دەبنە برای شیری، با لە دوو باوکی جیاوازیش بن، هەرکات براکانی موحەممەد بڕۆیشتنایە بۆ لەوەڕاندنی مەڕەکان، موحەممەد لە ماڵەوە بە تەنیا دەمایەوە، خۆی دەیویست لەگەڵیان بڕواتە دەرەوە بۆ گەڕان بەنێو لەوەڕگاکان و بۆ بینینی گوڵ و گوڵزار، بۆ خۆراکدان بە بەرخەکان و یاریکردن لەگەڵیاندا، ڕۆژێکیان بە خاتوو حەلیمەی وت کە بڕواتە دەرەوە، ئەویش بە عادەتی خۆی لە ترسی ئەوە نەبادا گەرمای ببێت ڕێگای نەدەدا بڕوات لەگەڵیان، بەڵام کاتێ زانی کە بەو نەڕۆیشتنە خەفەت دەخوات، نەیتوانی بەرگە بگرێ و ناچار ڕێگایدا بۆ ڕۆژی دواتر لەگەڵ براکانیدا بڕواتە دەرەوە، موحەممەدیش بەو ڕێگاپێدانە زۆر دڵخۆش بوو.

موحەممەد لەگەڵ هەڵاتنی خۆردا لەخەو هەستاو لەگەڵ برا و خوشکە شیرییەکەیدا عەبدوڵڵە و شەیما چووە دەرەوە، لە کاتێکدا کە حەلیمە خەریکی ڕێکخستنی بوو، کەوتە ئامۆژگاریکردنی کوڕو کچەکەی کە ئاگایان لێی بێت و پارێزگاری لێبکەن، نەهێڵن بەدرێژایی ڕۆژ لەبەر خۆردا بێت.

شەیما بەڵێنی بە دایکیدا چاودێری بکات و لە خەمی موحەممەددا بێت، پاشان هەرسێکیان چوونەدەرەوەو بەدوای مەڕەکانەوە دەستیان گرتبوو بەیەکەوە، لە کاتێکدا کە موحەممەد بەنێو کێڵگەکاندا دەڕۆیشت، کەوتە بیرکردنەوە لە ئاسمان و خۆر و زەوی کە چۆن

بەو جوانییە دروستکراون، کێ دروستیکردوون؟ ئەوە خوای بەدیهێنەرە کە بە جوانترین شێوە دروستیکردوون. موحەممەد هەتا زیاتر بیری بکردایەتەوە خۆشەویستی بۆی زیاتر دەبوو.

کاتێک تینی گەرمایی خۆر زیاتر بوو، هەورێکی سپی زۆر بچوک لەسەر موحەممەد دەرکەوت، بووە سێبەر بۆی، بە هەر لایەکدا بڕۆیشتایە ئەو هەورە دەبووە چەتر بۆی، هەرگیز لێی جیانەدەبوویەوە، بەڵام شەیمای خوشکە شیرییەکەی پەڵە هەورەکەی بینی و سەری سوڕما کە چۆن ئاوا بەدوای براکەیەوەیە، کاتێ بۆ ئێوارە گەڕانەوە بۆ ماڵ، شەیما ڕووداوەکەی بۆ دایکی گێڕایەوە، بەڵام دایکی لەوەی کە گوێبیستی بوو لای سەیر نەبوو، بەڵکو پێی دڵخۆشبوو چونکە ئەویش پێشتر کاتێ موحەممەد منداڵێکی شیرەخۆرە بووە ئەو پەڵە هەورەی بینیوە، ئەوکات بۆی دەرکەوت کە ئەم منداڵە منداڵێکی جیایەو بەدڵنیایی کە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێتە پیاوێکی مەزن، لەسەر ئەوە سوپاسی خوای گەورە کرد.

## ١٣. دوو کەس بە پۆشاکی سپییەوە

لە ڕۆژێکی تری خۆردا، موحەممەد جارێکیتر لەگەڵ براو خوشکە شیرییەکانیدا ڕۆیشت بۆ لەوڕاندنی مەڕەکان. لە کاتێکدا کە مەڕەکان لە لەوەڕگاکەدا دەسوڕانەوە، ئەو لە نزیکییانەوە دانیشتبوو و چووبووە بیرکردنەوەیەکی قووڵ، عەبدوللەی برای لەژێر سێبەری درەختێکدا لە خەوێکی قووڵدا بوو، کتوپڕ، دوو کەسی نەناسراو بە پۆشاکی سپییەوە لەپێش موحەممەدوە دەرکەوتن، لە دوورێکەوە چاویان تێبڕیبوو، پاشان هاتنەلای و بە زەردەخەنەیەکی درێژەوە سەلامیان لێکرد، ڕوخسارو ڕواڵەتیان ئەوەی لێدەخوێنرایەوە کە دوو کەسی بەسۆزو بەزەیی بن.

یەکێکیان سینییەکی ئاڵتونی لە نێو هەردوو دەستیدا هەڵگرتبوو، سینییەکە تا لێوارەکانی پڕبوو لە بەفر،

موحەممەد بە سەرسوڕمانەوە سەیری ئەو دوو پیاوەی دەکرد کە وردە وردە نزیک دەکەونەوە لێی. بە ئەسپایی بێئەوەی هیچ جۆرە ئازارێکی پێبگەیەنن ڕایانکێشایە سەرزەوی و بە بەفرەکە سنگیان شۆرد، کاتێ تەواوبوون دیار نەمان، موحەممەد ترسی لێنەنیشت و هەستی بە تۆقین نەکرد.

ئا لەو کاتەدا، عەبدوللە لە خەوەکەی بەئاگاهاتەوە و هەموو ئەوەی بینی کە ڕوویدا، بە خێرایی خۆی گەیاندەوە ماڵ و دەیوت: (فریای برا قورەیشیەکەم بکەون، دوو پیاو هاتن ڕایانکێشاو سنگیان لەتکرد).

خاتوو حەلیمە زۆر شڵەژاو بە ڕاکردن خۆی گەیاندە موحەممەد، هیچ شتێکی لە لای منداڵەکە نەبینی، بەڵام ڕوخساری زەرد هەڵگەڕابوو. حەلیمە لێی پرسی: (کوڕەکەم چیت لێقەوماوە؟) موحەممەدیش چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە.

ئیتر لەو کاتەوە موحەممەد کە لە تەمەنی چوار ساڵیدا بوو وا دەکەوتە پێشچاو کە لە هەموو منداڵەکانیتر سیماو ویقاری زیاتر بوو، بەڵام خاتوو حەلیمە لەدوای ئەو ڕووداوە شڵەژاویی و دڵەڕاوکەی زیاتر بوو چونکە دەیزانی منداڵێکە جیا لە منداڵانی تره، کەوتە وتوویژ لەگەڵ مێردەکەیدا، بڕیاریاندا بیگێڕنەوە بۆ دایکی ئەویش لە ترسی ئەوە نەبادا تووشی خراپەیەک ببێت.

کاتێ گەیشتنە مەککە، خاتوو حەلیمە هەموو ئەوەی کە ڕوویدابوو گێڕایەوە بۆ خاتوو ئامینە، بەڵام ئامینە بەلایەوە سەیر نەبوو بەڵکو پێیوت: (ئەم کوڕەم پێگە و پایەیەکی دەبێت)، ئینجا دیارییەکی زۆری بەخشی بە خاتوو حەلیمە، عەبدولموتتەلیبیش زۆر دڵخۆشبوو بە کوڕەزاکەی کە بە پەروەردەیەکی باش پەروەردە بووەو گەڕاوەتەوە بۆ باوەشی، بۆیە بڕیاریدا ئاهەنگێکی بۆ بگێڕێ، موحەممەد بەمجۆرە سەرلەنوێ گەڕایەوە بۆ مەککە، خاتوو حەلیمە کردیە باوەش و بۆ دواجار ماچیکرد، ئەویش هەر دڵخۆشبوو کە بە ساغ و سەلامەتی گێڕاویەتەوە بۆ لای دایکی. ئیتر لێرە بەولاوە ئەم منداڵە نایابە لە مەککە لەگەڵ خاتوو ئامینەی دایکیدا دەبێت.

## ١٤. لەگەڵ دایکیدا

موحەممـەد منداڵێکی سـاغ و سـەلیم و جـوان بـوو، ژیانـی بیابـان سـودی زۆری پێگەیاند، بەهـۆی ئـەو ژیانـەوە گـەورە بـوو بـە بێئـەوەی تووشـی هیچ جۆرە نەخۆشییەک ببێت، تا ئەوەتا ئێستـەش دەگەڕێتەوە بۆ باوەشـی گـەرمـی دایکـی، بـە گـەڕانـەوەی، ماڵەکـە پڕبـوو لـە نـوور و دەدرەوشـایەوە، هـەر هەمـووان زۆر زۆریـان خۆشدەویسـت، هـەر لـە دایـک و باپیرەیـەوە تـا دەگاتـە مـام و پورەکانـی. موحەممـەد و بچوکتریـن مامـی کـە نـاوی عەبباس بـوو تەمەنیـان لەیەکـەوە نزیـک بـوو، پێکـەوە یارییـان دەکـرد و تەبـا بـوون.

موحەممـەد لـە ئیشـوکاری ماڵدا هـاوکاری دایکـی دەکـرد، چونکـە بەپـەرۆش بـوو دڵـی ڕابگرێ و ڕزاییکات و مانـدووی نـەکات، منداڵێکـی زۆر بەئـەدەب بـوو، دایکـی سـەری سـوڕمابوو لـە بایەخدانـی بـە پاکوخاوێنـی، زیـاد لـەوەش کەسـێکی ڕاسـتگۆ بـوو ڕقـی لـە درۆکـردن بـوو.

منداڵانـی مەککـە ئەوانیـش هـەروەک منداڵانـی بیابـان زۆریـان خۆشدەویست، کێبڕکێیان بوو لەسـەر یاریکـردن لەگەڵیدا، موحەممـەد هیـچ جیاوازییەکـی نەدەخست لەنێوان هاوڕێکانیدا، بەڵکو هاوڕێیەتـی هەموویانـی دەکـرد، ئیتـر دەوڵەمەنـد بووبـن یـان هـەژار، جـوان یـان ناشـیرین بووبـن چوونیـەک سـەیری کـردوون.

## ١٥. بێتاقەتی باوکی بوو

موحەممەد لە ماوەیەکی کورتدا لە مەککە ناوبانگی دەرکرد، ڕەوشتجوانیی و ڕێزگرتنی لە کەسانیتر بووبووە مایەی بەدڵاچوونی ئەوانەی کە چاویان پێکەوتبوو.

ئێستە موحەممەد تەمەنی بووەتە شەش ساڵ، لەو ماوەیەدا ژیانێکی بەختەوەرانەی لە ماڵی خۆیان لە مەککە بەسەر برد، تام و چێژی بەلەزەتی لە سۆزی دایکی وەرگرت ئەویش لەدوای دابڕانێکی زۆر لێی.

ڕۆژێکیان خاتوو ئامینە بڕیاریدا کوڕەکەی لەگەڵ خۆی ببات بۆ بینینی خزمانی خۆی لە شاری مەدینە، ویستی بیانناسێ و سەردانی گۆڕی باوکیشی بکات، لەو گەشتە دوورو تولانییەیاندا ئوم ئەیمەنی پەروەرشکاریان لەگەڵ خۆیاندا برد، موحەممەد زۆر گەرموگوڕ بوو بۆ گەشتەکە، دەیویست چاوی بە خاڵوانی بکەوێت و بچێتە سەر گۆڕی باوکیشی، بە سواری وشترێک کەوتنەڕێ و بە شەو و بە ڕۆژ ڕێگەیان بڕی.

لەدوای چەند ڕۆژێک گەیشتنە شاری مەدینە، مەدینە شارێکی جوانی پڕ لە باخ و بێستان و سەوزی و میوەهات بوو، کاتێ موحەممەد گەیشتەجێ خاڵوانی گرتیانە باوەش و ماچیانکرد، بۆ یەکەمجار بوو بیبینن، لەدوای ئەوە خاتوو ئامینە کوڕەکەی برد بۆ سەردانی گۆڕی باوکی، باوکی موحەممەد کەسێکی زۆر چاک بووە، مردبوو بەرلەوە چاوی بە کوڕە بچوکەکەی بکەوێت، هەر ئەمەش بوو کە خاتوو ئامینەی زۆر بێتاقەت کردبوو.

موحەممەد بە بینینی گۆڕی باوکی زۆر خەمبار بوو. کێ دەزانێ کە ئەگەر لە ژیاندا بوایە چەندەی خۆشدەویست! موحەممەدیش ڕێزی زۆری لێدەگرت و لە هەموو شتێکدا گوێڕایەڵی دەبوو، منداڵەکە بێدەنگێ کەوتە گریان، دایکی بە سۆزو میهرێکەوە گرتیە باوەش، فرمێسکەکانی سڕی و بەوپەڕی سۆزەوە نێوچاوانی ماچکرد، ئینجا شوێنەکەی جێهێشت.

لە کاتێکدا کە موحەممەد باوکی لەدەستداوە، ئەمەش کارەساتێکی کەم نیە بەڵام ئەوەی زانی کە دەبێت ئارامبگرێ، ئەو واقیعە قبوڵبکات.

## ١٦. ڕۆژانێک کە لەبیر ناچن

منداڵانی مەدینە موحەممەدیان زۆر خۆشدەویست، ئەوە یەکەمجارە منداڵی لەوشێوەیە ببینن، ئەوانیش کۆمەڵە منداڵێکی چاکبوون، بەڵام موحەممەد جیاواز بوو، کەسێکی بەئەدەب و زیرەک و بە بەزەیی بوو لەگەڵ هەمواندا، هەموو هاوڕێ نوێیەکانی لە دەوری کۆبوونەوە، لەگەڵ خۆیان بردیان بۆ گەڕان بە شاری مەدینەدا.

زۆر تەبابوو لەگەڵ عونەیزەی خاڵۆزایدا، هەموو ڕۆژێ بەیەکەوە یارییان دەکرد، ماڵی خاڵۆی لە کۆشک دەچوو.

حەوشەی ماڵەکە حەوزێکی گەورەی تێدابوو، موحەممەد لەماوەی چەند ڕۆژێکی کەمدا فێری مەلەوانی بوو، هاوڕکانیشی هێنا تا لەگەڵیدا مەلە بکەن و زۆر لایان خۆشبوو، سواری ئەسپ دەبوون، فێری تیرئەندازی بوون، لەگەڵ یەکتریدا بڕاوبڕکێیان دەکرد، مەدینەش لەگەڵ ئەنجامدانی هەموو ئەو یارییانەدا جوانتر دەبینرا، دانیشتوانی شارەکە بە خۆشییەکی زۆرەوە میوانداریيەکی باشی موحەممەد و خێزانەکەیان کرد، ئەو ڕۆژانە خۆشترینی ئەو ڕۆژانە بوون کە موحەممەد لە منداڵیدا بەسەریبردن، ئەو ڕۆژانە هەر لە دڵیدا دەمێننەوە چونکە دەبنە یادەوەری منداڵێتی کە لەبیرناکرێن.

## ١٧. هەواڵی دڵخۆشکەر

موحەممەد لە مەدینە زۆر دڵخۆشبوو، ئەو شارەی زۆر خۆشدەویست، وا هەستیدەکرد ڕۆژەکان لە ماڵی خاڵۆیدا بەخێرایی تێدەپەڕن، ڕۆژێکیان لە حەوشەی ماڵەکەدا لەگەڵ ئوم ئەیمەنی پەروەرشکاری دانیشتبوو، دوو جولەکە تێپەڕین بەلایاندا، موحەممەدیان بینی، زۆر بەوردی کەوتنە سەرنجدانی، وەک بڵێی یەکێ کەسێک بدۆزێتەوە کە بەدوایدا بگەڕێ، موحەممەد بێتاقەت و بێزاربوو لەو حەزی سەیرکردنەیان، خێرا چووە ژوورەوە، ئەوکات ئەوانیش پرسیاریان لە ئوم ئەیمەن کرد کە: (ئەو منداڵە ناوی چییە؟) پەروەرشکارەکە نەیدەناسین، بۆیە هەستی بە شڵەژان و دڵەڕاوکە کرد و ترسی لەوەبوو ئازاری پێبگەیەنن. لێی پرسین: (بۆ دەپرسن؟) وتیان: (هیچ ترست نەبێت، بەلام لە منداڵێک دەچێت کە بەدوایدا دەگەڕێین، بۆیە ئێمە پرسیارت لێدەکەین، ناوی چییە؟ نامانەوێ ئازاری پێبگەیەنین). پەروەرشکارەکە قەناعەتیکرد بە نیەت پاکییان، ئینجا وتی: (ناوی موحەممەدە). ئەوانیش ڕاستەوخۆ دڵخۆشی لە چاوانیانەوە دەرکەوت. زەردەخەنیەکیان بۆ یەکتری کرد، وەک بڵێی زۆر لەوەوە نزیکە ئەو منداڵە بێت کە بەدوایدا دەگەڕێین. بە پەروەرشکارەکەیان وت: (بێزەحمەت دەتوانی بانگی بکەیت؟) ئوم ئەیمەنیش بانگیکرد، هەردوو جولەکەکە کەوتنە سەرنجدانی موحەممەد، پاشان مۆڵەتیان خواست سەیرێکی پشتی بکەن، نیشانەیەک بە پشتی موحەممەدەوە هەبوو، هەردوو پیاوەکە بە جووتەو بە جۆش و خرۆشەوە وتیان: (بەڵێ، خۆیەتی)،

پەروەرشکارەکە زیاتر لە جاران شڵەژاو ترسی لێنیشت، یەکێک لە دوو جولەکەکە وتی: (ئەمە ئەو منداڵەیە کە دەبێتە خاتەمی پێغەمبەران، نیشـانەکانی دەقـاو دەقن لەگەڵ نیشـانەکانی خاتەمی پێغەمبـەران کـە لـە کتێبەکانـی ئێمـەدا هاتـوون). ئینجـا وتیـان: (ئـەو نیشـانەیەش کـە بەناوشـانیەوەیە مـۆری پێغەمبەرایەتییـە). دوو جولەکەکـە سوپاسـی ئـوم ئەیمەنیـان کـردو ڕۆیشـتن، ئـا بەمجـۆرە یەکەمیـن نیشـانەکانی پێغەمبەرێتـی لـە مەدینـە کەوتنـەڕوو، ئایـا موحەممـەد ئـەو پێغەمبـەرە چاوەڕوانکراوەیـە؟ هـەر هەمـووان حەزیـان لـەوە بـوو ئـەوە بزانـن، چونکـە بینینی سـەرچاوەی دڵخۆشـییەکی گـەورە بـوو، خۆشویسـتن و هەوڵدانیـش بـۆ نزیکبـوون لێیـەوە بەهەمانشـێوە بـوو.

## ١٨. مردنی دایکی

موحەممەد لە مەدینە چەندین هاوڕێیەتی نوێی بونیاتنا، لە ڕۆژانێکی پڕ لە دڵخۆشی و گەشاوەییدا ژیا، کاتی گەڕانەوەی بۆ مەککە هاتەپێش، باپیرەو خزمەکانیتری چاوەڕێی گەڕانەوەی بوون، خواحافیزی لە خزمانی مەدینە کرد، لەگەڵ دایک و پەروەرشکارەکەیدا کەوتنەڕێ.

چەند ڕۆژێ بە شەو و بە ڕۆژ لە بیابانی وشکدا ڕێگەیان بڕی، بەڵام دایکی هەستی بە لاوازی و ماندویەتی دەکرد، لەدوای چەند ڕۆژێ لە گەشتەکەیان، دایکی کتوپڕ نەخۆشکەوت، ناچاربوون لە گوندی (ئەبوا) وچانێکی حەوانەوە وەربگرن، کاتێ گەیشتنە ئەوێ دایکی پەکی کەوت، موحەممەد ڕایکرد تا بیگرێتە باوەش، کاتێکی زانی پلەی گەرمی زۆر بەرزبووەتەوە، کەوتە هاتن و چوون و هەوڵیدەدا یارمەتییەک بدۆزێتەوە، بەڵام خاتوو ئامینە بەتەواوەتی وزەی لێبڕابوو، هەناسەی لاواز بوو بوو، موحەممەد دایکی لە باوەشیدا ڕاکێشا، لەوە تێگەیشت کە زۆر نەخۆشە، موحەممەد بێدەنگی دایە گریان. خاتوو ئامینە کەمێ چاوەکانی هەڵبڕی و بە دەنگێکی کز داوای ئاوی کرد، کوڕەکەی کەمێ ئاوی پێدا، بە وردی و بۆ ماوەیەک چاوی بڕییە کوڕەکەی و هەردوو دەستی ناسکی موحەممەدی گرت بەدەستییەوەو بۆ دواجار باوەشی بە کوڕەکەیدا کرد، پاشان ئەم جیهانەی بەجێهێشت.

خەڵکی دێی ئەبوا هاتن بۆ یارمەتیدانی، گۆڕێکیان بۆ هەڵکەنی، خوای گەورە ئەو کەسانەی خۆشدەوێت کە خۆشیان دەوێ، لە کاتی تەنگانەو تاقیکردنەوەکاندا یارمەتیان دەدات، جا لەبەرئەوە موحەممەد خوای گەورەی زۆر خۆشدەویست خوای گەورەش بەردەوام یارمەتی دەدا، لە ساتە زۆر سەختەکاندا هێزو ئارامگرتنی پێدەبەخشی.

## ١٩. موحەممەد لە سایەو سێبەری باوەگەورەیدا

موحەممەد بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بە یاوەری ئوم ئەیمەنی پەروەرشکاری دەستیکردەوە بە گەشتەکەی، خاتوو ئامینەیان لە گۆڕەستانی ئەبوا جێهێشت، لەدوای گەشتێکی تولانی و زەحمەت گەیشتنەوە مەککە، دەنگوباسی مردنی خاتوو ئامینە لە مەککە بڵاوبوویەوە، هەمووی خەڵکی بۆی خەمباربوون، ئێستە موحەممەد بووەتە کوڕێکی بێ باوک و دایک، باوەگەورەی توند گرتییە باوەش و بڕیاریدا لە ئێستە بەرەوژوور ببێتە خەمخۆری کوڕەزا بچوکەکەی و گرنگی تەواوەتی پێبدا، ئەم باپیرەیە کەسێکی چاک و بەخشندە بوو، حەزی لە چاکەکردن بوو لەگەڵ هەموو خەڵکیدا، هیچ دوودڵ نەبوو لەوەی خواردن دابەشبکات بەسەر هەژاران و نەداراندا، تەنانەت بیریشی لەو ئاژەڵانە دەکردەوە کە لە چۆڵەوانییەکاندا دەژیان، خواردنی بۆ دەبردن.

باوەگەورەی موحەممەد بۆ ئەو لە یەک کاتدا بووبووە دایک و باوک و باپیرە، بۆ هەرکوێ بڕۆیشتایە دەیبرد لەگەڵ خۆی، هەرگیز لێی دوورنەدەکەوتەوە.

تەمەنی موحەممەد هێشتا شەش ساڵی تێنەپەڕاندبوو، بەڵام منداڵێکی پێگەیشتوو بوو، هەوڵیدەدا نەبێتە بار بەسەر خزمەکانیەوە، بەڵکو ئەوەی لە توانایدا بوو بیکات تا نەبێتە مایەی ناڕەحەتکردنیان، مام و پورەکانی هەستیان بەمە کردبوو، بۆیە هەوڵیاندا گرنگی زیاتری پێبدەن، پورە بچوکەکەی صەفیەو مامە بچوکەکەی حەمزە بووبوونە هاوڕێی، ئا بەمجۆرە خوای گەورە قەرەبووی ئەو ئارامگرتن و ڕەوشتجوانییەی بۆ کردەوە، لە خێزانێکدا بوو هەموویان زۆریان خۆشدەویست.

## ٢٠. نزا و پاڕانەوەی باوەگەورەی

عەبدولموتتەلیب پاڵپشتێکی هەبوو لەبەردەم کەعبەدا دایدەنا، جگە لە خۆی کەسیتر لەسەری دانەدەنیشت، بەڵام زۆر دڵخۆش دەبوو کاتێ موحەممەد دادەنیشت لەسەری، ئەگەر یەکێک بیویستایە لایبات لەسەری باپیرەی نەیدەهێشت و پێی دەوت: (لێیگەڕێن چونکە ئەم کوڕەم پێگەو پایەی دەبێت). بەهەمانشێوەش جگە لە موحەممەد کەسیتر نەدەچووە ژوورەکەی عەبدولموتتەلیب، باپیرەی نانی لەگەڵیدا دەخوارد، هەتا موحەممەد نەهاتایەتە سەر سفرە ڕێگای بە کەسیتر نەدەدا دەست بە خواردن بکات، کوڕەزاکەشی هەموو ئەو خۆشەویستییەی دەبینی کە باپیرەی پێیداوە، بۆیە لە ژیانێکی بەختەوەریی و دڵئارامیدا دەژیا.

ڕۆژێکیان، عەبدولموتتەلیب وشترەکەیی ونکردبوو، گەڕا بە هەموو شوێنێکدا بەڵام هەر نەیدۆزییەوە، موحەممەدیش حەزی نەدەکرد باپیرەی بە خەمباری ببینێ، هەربۆیە ئەویش چووەدەرو بەدوای وشترەکەدا دەگەڕا، ماویەکی زۆری پێچوو هەر نەگەڕایەوە بۆ ماڵ. هەموو گومانیان وابوو کە ئەویش ونبووە، باپیرە لەبەر کوڕەزاکەی بە جیددی تووشی شڵەژان و دڵەڕاوکێ بوو، نەیدەزانی چیبکات، کەوتە گەڕان بەدوای موحەممەد دا. دواجار ترس و نەتواناییەکەی پاڵی پێوەنا ڕووبکاتە کەعبە، دەستەکانی بەرزکردەوەو لە خوای گەورە پاڕایەوەو وتی: (ئەی پەروەردگار، کوڕەکەمم بۆ بگێڕەرەوە). ئەوەندە فرمێسکی ڕشت تا ڕیشی تەڕ بوو، بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییە ئاسۆ، لەو ساتەدا لە دوورەوە

شەبەنگێکی بینی کە دەهاتە پێش. ئەوە ئەوە! بەڵێ، ئەوە ئەوە! ئەوە کوڕەزا خۆشەویستەکەیەتی دەگەڕێتەوەو وشترە ونبووەکەشی پێیە، موحەممەد وشترەکەی دۆزییەوەو هێنایەوە بۆ باپیرەی، باپیرەی ڕایکرد بۆ لای و بە توندی باوەشی پێداکرد، پاشان پێیوت: (کوڕە خۆشەویستەکەم! ئای چەندە ترسم لێنیشت بۆت! لێرە بەدواوە هەرگیز لەبەر چاومدا دوورنەکەویتەوە، بە تەنها نەڕۆیت بۆ هیچ شوێنێک. ئیتر لەو ڕۆژەوە، عەبدولموتتەلیب نەیهێشت موحەممەد هەرگیز لێی دووربکەوێتەوە. بەمشێوەیە لە سەلامەتی و دڵئارامیدا لەژێر پارێزگاری باپیرەیدا ژیانی دەگوزەراند، هەمووان خۆشیاندەویست و هەڵسوکەوتی تایبەتیان لەگەڵدا دەکرد، بەڵام ئەم مەسەلەی گرنگیپێدانە بە هیچ جۆر نەیبرد بە ئاقاری خراپداو خۆیی لێبگۆڕێ.

## ٢١. ئەو منداڵە کە پادشاکان چاکەیان دەوت

عەبدوامووتتەلیب بەو سیفەتە کە گەورەی قورەیشە، ناچاربوو ماوەیەک مەککە بەجێبێڵێ، ڕۆیشت پیرۆزبایی لە پادشایەک بکات کە تازە بە تازە تاجی پادشایی نابووە سەری. بەڵام نەیتوانی موحەممەد لەگەڵ خۆی ببات، چونکە گەشتەکە تولانی و ماندوکەر بوو، جگە لەوەش ئەو چاوپێکەوتنە مەسەلەیەکی فەرمییەو نەدەگونجا بەو بۆنەیەوە منداڵ لەگەڵ خۆی ببات.

لەگەڵ شاندێک لە پیاوماقوڵانی مەککە کەوتنەڕێ، بەڵام بیری هەر لای کوڕەزاکەی بوو، لەدوای سەفەرێکی زەحمەت و ماندوکەر دواجار گەیشتنە شوێنی مەبەست، پادشاکە پێشوازییەکی گەرمی لێکردن، ڕێزێکی زۆری نواند بۆ عەبدولموتتەلیب، بۆ چەند ڕۆژێ لە کۆشکەکەی خۆیدا پێشوازی و میوانداری کرد.

ڕۆژێکیان پادشا بانگهێشتی عەبدولموتتەلیبی کرد و پێیوت: (ئەی عەبدولموتتەلیب، من لە زانستی خۆم شتێکت پێدەڵێم ئەگەر تۆ نەبویتایەو کەسێکیتر بوایە نەم دەدرکاند بۆی، بەڵام وادەبینم تۆ شایانی ئەوەیت، بۆیە ئاگادارت دەکەم پێی و با لات پارێزراو بێت تا خوا خۆی مۆڵەت دەدات، چونکە خوای گەورە فەرمانی خۆی جێبەجێ دەکات، من لە زانستی شاراوەو لەو کتێبە شاراوەدا کە لای خۆمان پاراستومانەو نەمانهێشتووە کەسیتر ئاگادار بێت پێی چونکە هەواڵێکی مەزنەو زۆر زۆر گرنگە). عەبدولموتتەلیب قسەکەی بەلاوە سەیر بوو، ئینجا وتی: (ئەی پادشای بەڵێن بێ نەهێنی بپارێزم و تۆش مژدەبەخش بە، ئەو هەواڵە چییە؟) پادشاکە کەسێکی چاک

و دانا بوو، کتێبی زۆری خوێندبووەوە، لە وەڵامدا وتی: (هەرکات منداڵێک لە توهامە لەدایکبوو، کە نیشانەیەک بەناوشانییەوەیە، ئەوا ئەو دەبێتە ڕابەر تا ڕۆژی قیامەت، ئەم کاتە کاتی لەدایکبوونیەتی یان بە فیعلی لەدایکبووە، باوک و دایکی دەمرن، باپیرەو مامەی بەخێوی دەکەن، ئێمە چەندینجار ئەو هەواڵەمان بینیوە، خوای گەورە بە ڕۆژی ڕۆشنا بە ئاشکرا دەینێرێ، لە ئێمەش پشتیوانی دەبێت، ئەوانەی لایەنداری دەبن شکۆمەند دەبن، دوژمنانیشی زەلیل و سەرشۆڕ دەبن، شوێنە پایەدارو نەختینەکانی زەوی ڕزگار دەکات، خەڵکی فەرمانڕەواکان فڕێدەدەنە لاوە، ئاینەکان دەکوژێنێتەوە، بتەکان دەشکێنێ، پەروەردگار دەپەرستێ، گوفتاری ئەو هەمووی دانایی و جیاکەرەوەیە، فەرمانی جیددی و دادگەرە، فەرماندەکات بە چاکەو کاری پێدەکات، ڕێگیری لە خراپە دەکات و پوچەڵیدەکاتەوە). لە کاتێکدا کە پادشاکە قسەی دەکرد، عەبدولموتتەلیب هەستی بە خۆشییەکی زۆر دەکرد، چونکە ئەو نیشانانە هەمان ئەو نیشانانەن کە لە کوڕەزاکەیدا هەن، نابێ ئەو کوڕە جگە لە موحەممەدی کوڕەزای ئەو کەسێکیتر بێت، پادشاکە هەموو شتێکی دەزانی، بە جوانی سەیری عەبدولموتتەلیبی کردو پێیوت: (سوێند بە کەعبەی پایەدار، بە نیشانەکان و دیاربوونی، تۆ ئەی عەبدولموتتەلیب بەبێ درۆ باپیرەی ئەوی!).



عەبدولموتتەلیب هەستی دەکرد کە کوڕەزاکەی ڕۆژێ لە ڕۆژان دەبێتە خاوەنی پێگەو پایە. کاتێکیش گوێبیستی ئەو گوفتارەی پادشاکە بوو هەستی بە متمانەو دڵنیایی زیاتر کرد، پێیوت: (ئەی پادشا، من کوڕێکم هەبوو زۆرم خۆشدەویست... خێزانەکەشی ئافرەتێکی بەڕێزی ناو قەومەکەی خۆی بوو... منداڵێکی هێنا کە نیشانەیەک بە ناوشانییەوەیە هەموو ئەو نیشانانەی تێدایە کە تۆ باستکردن، باوک و دایکی مردن و من و مامەکەی بەخێوی دەکەین).

پادشاکە دڵخۆشبوو چونکە لە گومانەکەیدا بە هەڵەدا نەچووە، ئینجا ئامۆژگاری عەبدولموتتەلیبی کردو وتی: (کەواتە کورەکەت بپارێزە، وریابە لەوەی جولەکە دەستیان بیگاتێ چونکە ئەوان دوژمنی ئەون، خوای گەورەش ڕێگایان نادات دەستیان بیگاتێ).

پادشاکەو عەبدولموتتەلیب لەو قەناعەتەدا بوون ئەو منداڵە هەر موحەممەدە، پادشاکە کۆمەڵێ دیاری بەنرخی بە عەبدولوموتتەلیب بەخشی بەرلە گەڕانەوەی، باپیرەش زۆر لە تامەزرۆی گەیشتنەوە بوو بە کورەزاکەی و حەزیدەکرد بە زووترین کات چاوی پێبکەوێت، لەدوای گەشتێکی تولانی و ماندوکەر، دواجار گەیشتەوە مەککە، باوەشی بە موحەممەدا کردو ماچیکرد، ئیتر لە ئێستە بەدواوە زیاتر لە جاران گرنگی پێدەدا.

## ٣٢. بە زەبەلاحی نەمایەوە

عەبدولموتتەلیب، باپیرەی موحەممەد، لای زۆرینەی دانیشتوانی مەککە کەسایەتییەکی خۆشەویست بوو. سەراپای ژیانی خۆی لە کاری چاکەو یارمەتیدانی دانیشتوانی شارەکەی بەسەربردووە، ئەوەی لە توانایدا بوو کردی تا خەڵکی مەککە ئاسودەبن و لە هیچیان کەم نەبێ، دەربارەی موحەممەدیش کە تامی تاڵی بێباوکی و تەنیایی چەشتووە، ئەوا باپیرەی وەک کێوێکی زەبەلاح وابوو و موحەممەد پاڵی پێوەدەدا. بەڵام بە تێپەڕبوونی کات عەبدولموتتەلیب توانای هەستانەوەی لەسەر جێگاکەی نەمابوو ئەویش بەهۆی نەخۆشییەوە کە لە جووڵەی خستبوو، کاتی ئەوە هاتبوو ئەم جیهانە بەجێبێڵێ. ئەو خۆیشی ئەوەی دەزانی بەڵام تاکە خەمێک کە هەیبوو، ترسی ئەوەبوو لەدوای مردنی موحەممەدی بچوک بە تەنها بمێنێتەوە. چونکە پێشتر دایبابی لەدەست دابوو و ئایا لەدوای لەدەستدانی باپیرەشی چی بەسەردێت؟ باپیرە هەموو کوڕ و کوڕەزاکانی خۆی بانگهێشت کردو لای خۆی کۆیکردنەوە، موحەممەد پێشتر باپیرەیی بە نەخۆشی نەدیبوو، عەبدولموتتەلیب بە دەنگێکی کز قسەی دەکرد، دەقاو دەق وەک دەنگی خاتوو ئامینە وابوو لە پێش مردنی، ئەوکات موحەممەد تێگەیشت کە خەریکە باپیرەی لەدەست بدات، لێرەوە دایە قوڵپەی گریان، ئەگەر باپیرەی مرد ئەو چیبکات و چارەی چییە؟ لە کاتێکدا ئەو لەم بیرکردنەوەیەدا بوو، باپیرەی بانگیکردو بە دەنگێکی نزم پێیوت: (کوڕەکەم، کاتی ئەوە هاتووە ئەم جیهانە بەجێبێڵم. کاتێک من دەڕۆم، مامەکانت سەرپەرشتیت دەکەن، پێمبڵێ

حەزدەکەیت لەگەڵ کامیاندا بژیت؟) موحەممەد چەندین مامەی هەبوو، هەموویان زۆریان خۆشدەویست، بەڵام موحەممەد ئەبو تالیبی لە هەموویان زیاتر خۆشدەویست. موحەممەد چووە باوەشی ئەبو تالیب و ئەویش هەردوو باڵی هێنا بەدەوریدا، باپیرە زۆر دڵخۆشبوو بەمە، چونکە دەیزانی کە ئەبو تالیب باشترینیانە بتوانێ سەرپەرشتی بەخێوکردنی موحەممەد بکات، لە کاتێکدا لەسەر جێگای مردن ڕاکشابوو وتی: (ئەی ئەبو تالیب! موحەممەد لای تۆ بەجێدێڵم، ئایا بەڵێنم دەدەیتێ زۆر بە بەباشی گرنگی پێبدەیت و بەخێوی بکەیت؟) ئەبو تالیب وەڵامیدایەوەو وتی: (باوکە لێی مەترسە موحەممەد دەبەم بۆ ماڵی خۆم و وەک منداڵەکانی خۆم ئاگام لێی دەبێ. بەڵێنت دەدەمێ کە بیپارێزم لە هەموو ئازارو خراپەیەک). باپیرە دڵنیابوو بەو گوفتارەی ئەبو تالیب و بۆ ماوەیەکی زۆر هەر سەیری کوڕەزاکەیی دەکرد، ئینجا بە خەیاڵێکی ئاسودەوە دنیای بەجێهێشت، لەو کاتەدا، موحەممەدی منداڵ کە ڕۆژێک دێ دەبێتە پێغەمبەری خۆشەویستمان هێشتا تەمەنی هەشت ساڵان بوو.

خێرا هەواڵی مردنی باپیرەی بڵاوبوویەوە، خەمباری سەراپای شاری مەککەی گرتەوە، خەڵکی لە هەموو لایەک و ناوچەکانەوە هاتن تا پرسەو سەرەخۆشی خۆیان بگەیەنن، بازاڕو کۆگا بازرگانییەکانی مەککە بۆ چەند ڕۆژێ داخران، بەڕاستی گەورەی مەککە مرد، موحەممەدیش هەندێجار هەنسکی هەڵدەدا، یان خۆی دەشاردەوەو لە سوچێکەوە بە بێدەنگ دەگریا. لەدوای تەواوبوونی ڕێوڕەسمی بەخاکسپاردن ئەبو تالیبی مامی کردیە باوەش و فرمێسکەکانی سڕی، چونکە لێرە بەدواوە دەبێتە باوکی ئەو منداڵە تاقانەیە.

## ٢٣. لە ماڵی ئەبو تالیب

ئەبو تالیب خانوویەکی بچوکی هەبوو، لەگەڵ خێزانێکی گەورەدا تیایدا دەژیا، بەڵام سنگفراوانییەکەی جێگای هەمووانی تێدا دەبوویەوە. بۆیە هەر بەمشێوەیە دڵ و ماڵەکەی بۆ موحەممەد کردەوە.

موحەممەد بوو بە یەکێک لە ئەندامانی ئەو ماڵ و خێزانە، فاتیمەی ئامۆژنی هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵیدا دەکرد، موحەممەدیش بە هەمانشێوە ڕێزو خۆشەویستی بۆ ئەو هەبوو، ئەو ژنە ئەم منداڵە بە ڕەوشت و زیرەکەی هەروەک یەکێک لە منداڵەکانی خۆی خۆشدەویست، لە پێش ئەوە سەری منداڵەکانی خۆی شانە بکات سەری موحەممەدی دادەهێنا، بەرلەوە نانبدات بەوان نانی بە موحەممەد دەدا، منداڵەکانیش هەستییان بە ئیرەیی نەدەکرد چونکە ئەوانیش هەر موحەممەدیان خۆشدەویست، موحەممەد لەناو ئەو ماڵەدا هەستی بە بەختەوەرییەکی زۆر دەکرد، خوای گەورە بە مامەیەک قەرەبووی باوکی بۆ کردەوە، بە ئامۆژنێک قەرەبووی دایکی بۆکردەوە، ئەبو تالیب بۆ هەر شوێنێک بڕۆیشتایە ئەوی دەبرد لەگەڵ خۆیدا.

ئەبو تالیب بەبێ موحەممەد هیچ شتێکی نەدەکرد، هەتا پێشتر هەواڵی موحەممەدی نەزانیایەو بانگی نەکردایە بۆ سەر سفرەو لەگەڵی دانەنیشتایە خۆیشی دانەدەنیشت، کە موحەممەدیش لەگەڵیاندا دادەنیشت هەموو هەستییان بە تێری دەکرد، بەڵام لە حاڵی ئامادەنەبوونیدا کەس تێری نەدەخوارد.

موحەممەد هەتا دەستی نەشۆردایە لەسەر سفرەی خواردن دانەدەنیشت، لە پێش ئەوە دەستبکات بە خواردن دەیوت (بسم الله). فووی لە خواردنەکە نەدەکرد، بەڵکو چاوەڕێی دەکرد تا کەمێ سارد دەبوویەوە، هەمیشە پارووی بچوکی دەناو لەبەرخۆیەوە دەیخوارد، تا کەسانی لە خۆی گەورەتر دەستیان نەکردایە بە خواردن دەستی بۆ خواردن نەدەبرد، بەڕاستی کەسێکی زۆر بەئەدەب بوو.

مامەو ئامۆژنی دەیانویست تا ئەوپەڕی حەوانەوەو خۆراکی ساغ و سەلامەتی بۆ دابین بکەن، ئەوەی لەتوانایاندا بوو ئەنجامیاندەدا. موحەممەدیش لە ژیانێکی زۆر ئارام و حەوانەیەکی باشدا لەوماڵەدا ژیانی بەسەر دەبرد. مامەو ئامۆژن و منداڵەکانیانی خۆشدەویست هەروەک ئەندامێکی ئەو خێزانە بێت، وەک بڵێی ئاسمان خۆشەویستی و بەرەکەت دەبارێنێ بەسەریاندا، ماڵە بچوکەکەی ئەبو تالیبیش بڕێکی زۆری لەو فەڕو بەرەکەتە بەرکەوت، خوای گەورە بەشی پێویستی خانەوادەکە خۆراکی پێبەخشیبوون، لەدوای ئەوە کە موحەممەد بووە ئەندامێکی ئەو خێزانە ئیتر ڕوخساری منداڵەکانی بە خۆشی و شادیی دەدرەوشانەوە.

## ٢٤. بارانبارین

بارانبارین لە مەککە دواکەوتبوو، زەوی وشک هەڵگەڕابوو، ڕووەک و درەختەکان لە تینویەتیدا قرچەڵ بووبوون، کانیاوەکان وشکیان کردبوو، منداڵان سەریان نابووە نەخۆشی، مەڕو ماڵات لە تینواندا دەمردن. لەدوای مردنی عەبدولموتتەلیب ئەبو تالیبی کوڕی بووە گەورەی مەککە، خەڵکیش زۆر متمانەیان پێی هەبوو، خۆشیاندەویست و ڕێزیان لێدەگرت، هاتنەلای و پێیانوت: (وا ڕۆژان تێدەپەڕن بێئەوەی هیچ بارانێ ببارێت، منداڵەکانمان برسیانەو مەڕو ماڵاتمان تینویانە، ڕووەکەکانیش بەهەمانشێوە لە کێڵگەکاندا وشکبوون، ئەگەر بێتو حاڵ بەمجۆرە بەردەوام بێت تووشی کارەساتێکی سەخت و ڕاستەقینە دەبین، ئایا نایێت لەگەڵمان تا نوێژە بارانە بکەین؟ ئەبو تالیب ڕاستەوخۆ داواکەی قبوڵکردن، ئەویش هەر بیری لە هەمان مەسەلە دەکردەوە، ئەی جگە لەوە چیبکات؟ چونکە هەر خوای گەورە خۆی باران دەنێرێ، ئەگەر بیەوێ دەینێرێ و ئەگەر نەیەوێ ناینێرێ.

ئەبو تالیب لە پێش ئەوە بڕوات بۆ نوێژەبارانە بیری لەوە کردەوە کەسێکی چاکەخواز لەگەڵ خۆی ببات. بەڵام ئایا ئەو کەسە جگە لە موحەممەدی برازای کێیترە، ڕاستەوخۆ چووە لای و داوای لێکرد لەگەڵیدا بڕوات، بەمشێوەیە پێکەوە چوون بۆ کەعبە، ئەبو تالیب لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە لەوێ کۆبووبوونەوە لە خوای گەورە پاڕانەوە تا هۆزەکەی لە تینویەتی ڕزگار بکات، خاکیان ئاوبدات، تا زەوی سەرلەنوێ ببوژێتەوەو سەوز ببێ، تا ئاژەڵان تینویەتیان

بشکێ، موحەممەدیش هەردوو دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوە، لە خوای گەورە پاڕایەوە بارانیان بۆ ببارێنێ، خەڵکی چاویان بڕییە ئاسمان، هەر هەموو بێدەنگێ چاوەڕێی ئاسمانیان دەکرد، لە کتوپڕدا، هەورێکی باراناوی ڕووی لە کەعبە کرد، وەک بڵێی فەرمانێکی لە هەمان سەرچاوەوە پێگەیشتووە، هەورە باراناوییەکە چەند دڵۆپێ بارانی باراندە سەر هەردوو دەستە بچوکەکەی موحەممەد، دڵۆپەکان یەک بەدوای یەکدا دەهاتنە خوارەوە، ئینجا زۆرترو خێراتر دەبوون تا بووە بارانێکی خوڕەم و سەراپای مەککەی گرتەوە، خەڵکی لەخۆشیدا لەبەر بارانەکەدا وەستان تا هەموو پۆشاکەکانیان تەڕبوو. بەڕاستی پاڕانەوەکەی موحەممەد گیرابوو.

خۆڵی زەوی هەروەک منداڵێکی برسی بارانەکەی هەڵمژی، گژوگیا ڕووایەوە، گوڵەکان کرانەوە، ئاژەڵ و مەڕو ماڵات تینویەتیان شکا، منداڵانیش ئەوەندەیان خواردەوە تا تێرئاو بوون، بەختەوەریی باڵی کێشا بەسەر هەموو خەڵکیدا.

## ٢٥. کوڕەکە یارمەتی مامی دەدات

ڕۆژان تێپەڕین، موحەممەدیش تەمەنی گەیشتە دە ساڵ، هەر لە ماڵی مامیدا دەژیا، مامی بە لێبڕانەوە هەوڵی دەدا بەشی پێویستی خۆراک بۆ خێزانەکەی دابین بکات، بەڵام موحەممەد کاتێ مامی خۆی دەبینی کە چەندە زەحمەت دەکێشێ و لەپێناو حەوانەوەی خێزانەکەیدا بە هەموو شێوەیەک قوربانی دەدا، ئەوکات کەوتە گەڕان بەدوای دۆزینەوەی شێوازێکدا تا لەو ژیانە زەحمەتەیدا هاوکاری مامی بکات.

ڕۆژێکیان، بیرۆکەیەک هات بە خەیاڵیدا، کە دەتوانێ مەڕەکانی مامی بەخێو بکات، بەم ڕێگایە ئیتر ئەبو تالیب ناچار نابێت کرێی شوان بدات، بەم پێیە موحەممەد یارمەتی دەدات و بەشدار دەبێت لە پەیداکردنی داهاتی خێزانەکەدا، بۆیە هات بیرۆکەکەی خۆی خستە بەردەم مامی، بەڵام مامی لە سەرەتاوە داواکەیی پێ قوبوڵ نەبوو، بەڵام موحەممەد هەوڵێکی زۆریدا تا قەناعەتی پێبکات، دواجار سەرکەوتوو بوو و ئەوەی بۆ چووە سەر، کەچی ئەمجارەیان، فاتیمەی خێزانی مامی بیرۆکەکەی قوبوڵ نەدەکرد، چۆن دەبێت ئەوان ڕێگا بەو کوڕە بچوکەیان بدەن ببێتە شوان لە کاتێکدا کە زیاتر لە منداڵەکانی خۆیان دەیانپاراست لەوەی بچێتە دەرەوە بۆ لەوەڕاندنی بڕکە ئاژەڵەکەیان، هەرگیز نابێت ڕێگابدەن بەدرێژایی ڕۆژ بچێتە بەر خۆری گەرمی بیابان، بەڵام موحەممەد هەر پێداگر بوو لەسەر بیرۆکەکەی خۆی کە دواجار بە زیرەکی و شیرین گوفتاری خۆی توانی قەناعەت بە ئامۆژنیشی بکات.

لێرە بەدواوە، ئیتر مەڕ دەلەوەڕێنێ، موحەممەد هیچ شەرمێکی لە ئیشەکەی نەدەکرد، چونکە ڕقی لە بێکاری بوو، پێیناخۆشبوو بەبێ ئەنجامدانی کارێک تەنهاو تەنها هەر دابنیشێ، چونکە ئەو لەسەر چوست و چالاکی خۆی ڕاهێنابوو، لێرە بەدواوە هەموو بەیانییەکی زوو لە خەو هەڵدەستێت و بڕکە مەڕەکە دەباتە لەوەڕگا، کاتێک ڕانەکە لە لەوەڕگادا دەسوڕایەوە ئەویش دەکەوتە تێڕامان لە هەموو ئەوەی بەدەوروبەری و بە سەریەوەیە، زۆر سەری سوڕمابو، ئەو خوایەی بەدڵا چووبوو کە ئاسمانی دروستکردووەو بە خۆر و ئەستێرەکان ڕازاندوویەتەوە، ڕووی زەوی بە هەزاران جۆر گوڵی ڕەنگاوڕەنگ ڕازاندووەتەوە، سەرنجی لە کێو و لە بەرد و ڕووەکەکان دەدا کە خوای گەورە هەموویانی دروستکردووە، هەوڵیدەدا لە گەورەیی بەدیهێنەر تێبگات.

بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان، موحەممەد سکاڵای لە هیچ شتێک نەبوو، بەڵکو بۆی ڕەخسابوو هەموو ئەو جوانییە ببینێ کە بەدەوریدایە، خەڵکی خۆشدەویست و ئەوانیش ئەویان خۆشدەویست، خۆشەویستی موحەممەد لەدڵیاندا شوێنی خۆی کردبووەوە.

## ٣٦. خوای گەورە موحەممەدی لە بتپەرستیی پاراست

زەیدی کوڕی حاریسە -کارگوزاری پێغەمبەری خوا- دەڵێ: (ژمارەیەک بتی زۆر بە دەوری کەعبەدا هەبوون، لەنێویشیاندا بتێک هەبوو لە مس دروستکرابوو پێی دەوترا (ئیساف) یان (نائیلە)، هاوەڵگەران هەرکات بە دەوری کەعبەدا سوڕیان بخواردایە بە نیەتی بەرەکەت جەستەی خۆیان دەهێنا بەو بتەدا، ڕۆژێکیان منیش لەگەڵ گەورەکەم موحەممەدی کوڕی عەبدوللە کە ئەوکات گەنج بوو بە دەوری کەعبەدا دەسوڕامەوە). کاتێک تێپەڕیم بە لای بتەکەدا بە نیەتی بەرەکەت وەرگرتن خۆمم تێساوی، موحەممەد بۆ جاری دووەم پێیوتم: ((ئەی ڕێگیریم لێنەکردی؟!)).

زەید دەڵێ: سوێند بەو کەسە کە ڕێزی لە (موحەممەد) گرتووە و قورئانی بۆ ناردووەتە خوارەوە، لە منداڵییەوە تا ئەو کاتەی خوای گەورە ئەو ڕێزەی لێگرت کە لێی گرت و کردی بە پێغەمبەر هەرگیز دەستی لە بت نەداوە.

## ٢٧. موحەممەد چاوی بە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نوفەیل دەکەوێ

ڕۆژێکیان موحەممەد لە خوارووی بەلدەح (شوێنێکە لە حیجاز لە مەککەوە نزیکە) چاوی بە زەیدی کوڕی عەمروی کوڕی نوفەیل کەوت، ئەوەش پێش ئەوەبوو وەحی بۆ بێتە خوارەوە، خوانێک هێنرا بۆ موحەممەد(ﷺ)، بەڵام ڕەتیکردەوە لێی بخوات، زەیدی کوڕی عەمرویش وتی: من لەو خواردنە ناخۆم کە ئێوە لەسەر بتەکانتان سەری دەبڕن، جگە لەو خواردنە کە ناوی خوای لەسەر هێنرابێت شتیتر ناخۆم.

زەیدی کوڕی عەمروی کوڕی نوفەیل لەسەر ڕەویەی ئاینی ئیبراهیم بوو(ﷺ)، ڕەخنەی لە قورەیش دەگرت لەو گیاندارانەی کە سەریان دەبڕین، دەیوت: ماڵات خوا دروستیکردووە، لە ئاسمانەوە ئاوی بۆ باراندووە، لە زەوییەوە ڕووەکی بۆ ڕواندووە، کەچی دواتر بە غەیری ناوی خواوە سەریدەبڕن!! ئەوەش وەک نکولیکردنی لەو کردەوەیەیان، بۆ بە گەورە ڕاگرتنی خوای گەورە بوو.

لەبەرئەوە کاتێ لەبارەی چارەنووسی زەیدی کوڕی عەمروی کوڕی نوفەیل پرسیار لە پێغەمبەر(ﷺ) کرا فەرمووی: ((ڕۆژی قیامەت لەسەر یەکتاپەرستی و بە تەنها وەک ئوممەتێک زیندوودەکرێتەوە)). ئەمەش وەک پاداشتێ بۆ مانەوەی لەسەر ئاینی یەکتاپەرستی ئیبراهیمی لەکاتێکدا هەموو ئەو خەڵکەی بەدەوریدا بوون هاوەڵگەربوون و بتیان دەپەرست.

بەرلەوە وەحی بێتە خوارەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی کوڕی عەمروی کوڕی نوفەیل مرد، بەڵام سەعیدی کوڕی گەیشت بە پێغەمبەرو(ﷺ) بە بانگەوازەکەی، موسڵمانبوو و بووبە یەکێک لە مژدەپێدراوانی بەهەشت!

## ٢٨. فرمێسکی موحەممەد

سـاڵان بەخێرایـی تێدەپەڕیـن و موحەممەدیـش لـە ماڵـی مامـی خۆشەویستیدا گەورە بوو، ئێستە تەمەنی دازدە ساڵە، لەو ڕۆژانەدا، ئەبو تالیبی مامی خۆی ئامادە دەکرد گەشت بکات بۆ شام، بارە کەلوپەلی نابوو لە وشترەکان تا لەوێ بیفرۆشێ و ڕزقی خێزانەکەی دابین بکات، موحەممەد بە نیەتەکەی مامی زانی، زۆر دڵگران بوو، ئایا دواتر چی ڕوودەدات؟ ئایا لە مامەی دووربکەوێتەوە ئەویش لە دوای ئەوە کە باوک و دایک و باپیرەیی لەدەستداوە؟ چاوانی پڕبوون لە فرمێسک، کاتێک مامەی ئامادەباش بوو بۆ گەشتکردن، موحەممەد بە بێدەنگی کەوتە هەنسکدان، هەرچەندە هەوڵیدەدا خەمبارییەکەی بشارێتەوە بەڵام هەر نەیدەتوانی لە تێڕوانی مامی بۆی خۆی قورتار بکات، لێرەدا ئەبو تالیب نزیکبوویەوە لێی، پرسیاری لێکرد: (کوڕەکەم بۆ دەگریت؟) موحەممەد سەری دانەواندو چاوی سووربووەکانی خۆی سڕی، لە کاتێکدا کە ڕەشۆی وشترە بارهەڵگرەکەی بەدەستەوە گرتبوو وەڵامیدایەوەو وتی: (ئایا مامە تۆیش هەر بەجێمدێڵی؟). کاتێ ئەبو تالیب ئەم قسەیەی بیست دڵی لە خۆشەویستی برازاکەیدا توایەوە، چۆن دەتوانێ بە چاوی فرمێسکاوییەوە بەجێیبێڵێ؟ ئینجا بڕیاریدا لەگەڵ خۆی بیبات بۆ شام، داوای لێکرد ئەویش خۆی حازر بکات بۆ گەشتەکە، کاتێ کوڕە مامەکانی موحەممەد بەمەیان زانی ناڕەزاییان دەربڕی و ئەو بیرۆکەیەیان ڕەتکردەوە. بە ئەبو تالیبیان وت: (ڕێگاکە مەترسیدارو زەحمەتە، تۆ ناتوانیت بیبەیت لەگەڵ خۆت بۆ شام، موحەممەد

بەرگەی ئەم سەفەرە ناگریێ، لەوانەیە نەخۆشیش بکەویێ). بەڵام ئەبو تالیب هەموو نارەزاییەکانی پشتگوێخست، موحەممەدی خستە سەر پشتی وشترەکەو هەردووکیان دڵخۆشبوون بە سەفەرەکە. لەنێو کاروانێکی گەورەدا ڕۆیشتن بەرەو شام، موحەممەد لەدوای مامیەوە لەسەر پشتی وشترەکە دانیشتبوو، خۆر تیشکی گەرم و سوتێنەری خۆی بە هەموو لایەکدا دەنارد، کاروانەکە جاریێ بە ئاسانی ڕێی دەکردو جارێکیش بە هێواشی دەڕۆیشت ئەویش کاتێ سمی وشترەکان لە لمی بیاباندا نوقم دەبوون، بەڵام هەورێکی زیوینی جوان باڵی بەسەریاندا کێشابوو و سێبەری بۆ کاروانەکە کردبوو، هەروەها هەورێکی بچوک لەسەر وشترەکەی موحەممەد دەسوڕایەوە، کاروانچییان تووشی هیچ جۆرە نارەحەتییەک نەهاتن، بەڵکو بە سوک و ئاسانی ڕێیان دەکردو دەچوونە پێش، بە فەزڵی خوای گەورە لەژێر سێبەری هەورەکەدا گەشتێکی جوانیان بەڕێکرد.

## ٣٩. ئەو منداڵە کە لە ڕێگادا چاوەڕوانی گەیشتنی دەکرێ

کاروانچییان لە بیابانی پان و بەرفراواندا بە هێواشی ڕێیان دەکرد، شەو و ڕۆژ بەڕێوە بوون، کاتێ هەستییان بە ماندوبوونێکی زۆر کرد، بڕیاریاندا ماوەیەک لە (بوصرا) بحەوێنەوە، لە وشترەکانیان بێنە خوارەوەو کەمێ بەپێ بڕۆن، بوصرا شارۆچکەیەکی جوانی پڕ لە دارو درەخت بوو، ئاوەکەی سازگار و کەشو هەوای وزەبەخش بوو، کاروانچییان لە نزیک پەرستگایەکی ئەو شارۆچکەیە برێ حەوانەوەیان وەرگرت.

لەنێو ئەو پەرستگایەدا خواپەرستێکی بەساڵاچوو هەبوو بەناوی (بەحیرە)، خواپەرستەکە هەموو ڕۆژێ دەچووە سەربانی پەرستگاکە، چاوەڕێی هاتنی کاروانچییە هاتووەکانی دەکرد، هەر کاروانێک بەلایدا تێپەڕی بکردایە لە نزیکەوە بە چاوانی دەیپشکنی، وەها دەهاتە پێشچاو وەک بڵێی چاوەڕێی گەیشتنی ڕێبوارێکی گرنگی دەکرد، بەپێی ئەو کتێبانەی کە لە پەرستگاکەدا خوێندبوویەوە، لەو ڕۆژانەدا کۆتا پێغەمبەر دەگاتە ئەوێ، جووەکانیش هەر بەهەمانشێوە چاوەڕێی هاتنی ئەو پێغەمبەرە بوون، بەحیرە هەستی بە حەزی ناساندنی دەکرد، زۆر بە پەرۆش بوو بیبینێ، لەو کتێبانەدا کە خوێندبوونیەوە ئەوەی بینیبوو کە ئەو پێغەمبەرە لەو ڕۆژانەدا بە بەردەم پەرستگاکەیدا تێدەپەڕێ، هاتنەکەشی نزیکبووەتەوە.

لەو بەیانییەدا، خواپەرستەکە سەرلەنوێ ڕۆیشتە سەربانی پەرستگاکە، لە کتوپڕدا نێوچاوانی ڕۆشن بوویەوە، وەها دەبینرا وەک بڵێی ئەو کەسەی دۆزییەوە کە بەدوایدا دەگەڕا، کاروانچییەکان

لە دوورەوە دەرکەوتن، هەورێکی سپی بەسەر کاروانەکەوە بوو، بەحیرە بەردەوام دەیڕوانییە ئەو هەورە کە لەگەڵ کاروانچییەکاندا دەجوڵا، وەها هاتە پێشچاوی وەک بڵێی کاری ئەوەیە کەسێک لەنێویاندا لە تیشکی سوتێنەری خۆر دەپارێزێ، پرسیاری لەخۆی دەکرد ئایا نۆ بڵێی ئەو پێغەمبەرە لە کتێبەکانیاندا هاتووە لەنێو ئەوانەدا بێت. لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاروانچییان جۆش و خرۆشی بەحیرە تا دەهات زیاتر دەبوو، دڵی بە پەلە کەوتە لێدان، بەوپەڕی گرنگییپێدانەوە کەوتە چاوێریکردنیان.

هەر بەوجۆرە کاروانچییان نەخشەیان کێشابوو، بۆ ماوەیەک لە تەنیشت پەرستگاکەوە حەوانەوە، لێگەڕان وشترەکانیان هەندێ ئاوبخۆنەوە، بڕیاریاندا نانبخۆن و بحەوێنەوە، بەحیرەش لەسەر پەرستگاکە بە پەلە هاتەخوارەوە، ئینجا ڕۆیشت بۆ لای کارونچییان و بانگهێشتی کردن لای ئەو نانبخۆن، لەم ڕێگایەشەوە هەموو ئەوانە دەبینێ لەناو کاروانەکەدان، ئارامی لێبڕابوو و هەر چاوەڕێی بینینی پێغەمبەری چاوەڕوانکراوی دەکرد.

کاروانچییان میواندارییەکەیان قوبوڵکرد و چوونە لای، لە کاتێکدا ئەوان سەرقاڵی نانخواردن بوون، بەحیرە زۆر بەوردی سەیری دەکردن، بەڵام لە بێبەختی ئەو نەیتوانی ئەو کەسە بدۆزێتەوە کە بەدوایدا دەگەڕا، ئەو کەسەی لە کتێبەکاندا باسیکراوە نیە لەنێوان ئەوانەدا، بە خەم و پەژارەیەکەوە چووە دەرەوە، بەڵام کاتێ سەیری وشترەکەی کرد ئەوەی کە بینی بە چاوی بڕوای پێنەکرد، چونکە هەورەکە هەر لە جێگای خۆیدا بوو و سێبەری بۆ کەسێک دەکرد کە لە دەرەوەی میوانەکانییەوە بوو.

خێرا گەڕایەوە بۆ ناو پەرستگاکەو پرسیاری لە میوانەکانی کردو وتی: (ئەی قەومی قورەیش، ئایا هیچ کەس لە ئێوە لەم دەعوەتەم دواکەوتووە؟) کاروانچییەکان وتیان: (بەڵێ، تەنها یەک

کەسمان دواکەوتووە، ئەومان لەبەر کەم تەمەنی جێهێشت)، بەحیرە وتی: (من هەمووتانم بانگکردووە، ئەویش بانگبکەن با ئامادەی ئەم نانخواردنە بێت). خێرا ئەبو تالیب هەستا تا موحەممەدیش بێنێتە سەر خوانەکە.

موحەممەد لەگەڵ مامیدا هاتە ناو پەرستگاکە. ئەم منداڵە کێیە؟ ئایا دەکرێ ئەو ساتە هەستیارە بێت کە دەمێکە خواپەرستەکە چاوەڕوانیەتی؟ هەردوو چاوی بەحیرە لەخۆشیدا ڕۆشنبوونەوە، هەردەبێ ئەم منداڵە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە بێت!

## ٣٠. دڵخۆشبوونی بەحیرە

بەحیرە توانی لەنێو کاروانچییەکاندا موحەممەد بناسێ، کاتێ ئەم منداڵە بە ڕوومەتی گەش و جوانی چووە ژوورەوە، بەحیرە شڵەژاو دەلەرزی.

موحەممەد بە ئەتەکێت و ئەدەبێکی بەرزەوە چووە ژوورەوە، لەو جێگایەدا دانیشت کە بۆی دیاریکرابوو، کەوتە خواردنی ئەو خواردنەی بۆ دانرابوو، بەحیرەش هەر سەرنجیدەدا، هەتا ئەوکات کە نانخواردنەکەی تەواوکرد، لەدوای ئەوە، بە ئەسپایی لێی نزیکبوویەوە تا لە نزیکەوە بۆی بڕوانێ، نیشانەکانی منداڵەکە تەواو لەو نیشانانە دەچوو کە لە کتێبەکاندا هەبوون، ڕوومەتی دەدرەوشایەوە وەها کە وترابوو، خواپەرستەکە چەند پرسیارێکی ئاراستەکردو موحەممەدیش وەڵامیدایەوە.

زیرەکیی و ئەدەب و سەنگینی و ڕێزو کەشخەیی...ئەمانە هەموو لە نیشانەکانی ئەو بوون، باشترینی سیفەتەکان لە موحەممەدا کۆبووبوونەوە، جا ئەگەر بێتو مۆری پێغەمبەرێتی لەنێو شانیدا هەبێت ئەوا ئیتر هیچ گومانێک لای ئەو خواپەرستە نامێنێتەوە، داوای لە موحەممەد کرد تا سەیرێکی پشتی بکات، بەڵێ! مۆری پێغەمبەرایەتی وەها کە کتێبەکان باسیان لێکردووە بە تەواوەتی بوونی هەیە، ئێستە ئیتر بەتەواوەتی دڵنیابوو، ئەوە موحەممەدی موستەفایە کە لە هەموو شوێنێک چاوەڕوانی دەکرێ، خواپەرستەکە هەوڵیدا ئەو جۆش و خرۆشەی بشارێتەوە، ئینجا پرسیاری لە ئەبو تالیب کرد و وتی: (ئەم کوڕە چییە لەگەڵتدا؟)، ئەبو تالیب لەبەر

برازاکەی ترسی لێنیشت، لەبەرئەوە ڕاستی پێنەوت، بەڵکو وتی: (ئەوە کوڕمە). خواپەرستەکە وەڵامەکەی بەلاوە سەیر بوو و وتی: (نابێ باوکی ئەم منداڵە لە ژیاندا بێت).

ئەوکات ئەبو تالیب دەرکی بەوەکرد کە بەحیرەی خواپەرست نابێتە مایەی زیانگەیاندن بە موحەممەد، بۆیە پێیوت: (ئەو برازامە لە کاتێکدا ئەو لە سکی دایکیدا بووە باوکی مردووە). ئینجا چەمییەوەو چپاندی بە گوێی ئەبو تالیبدا وتی: (ڕاستدەکەیت، ئەمە گەورەی جیهانیانە، ئەمە پێغەمبەری پەروەردگاری جیهانیانە، خوای گەورە ڕەوانەی دەکات و دەبێتە ڕەحمەت بۆ جیهانیان، ئێوە کاتێ دەتانڕوانی بەسەر عەقەبەدا هیچ درەخت و بەردێک نەما سوژدەی بۆ نەبات، ئەوانیش بۆ پێغەمبەر نەبێت سوژدە بۆ کەسیتر نابەن، منیش بە مۆری پێغەمبەرێتیدا دەیناسم کە لە خوارووی کڕکڕاگەی نێوشانییەوە وەک سێوێک بەدیار دەکەوێ). ئینجا داوای لێکردن نەیبەن بۆ ناو ڕۆم، چونکە ڕۆمەکان ئەگەر بیبینن ئەوا بە نیشانەکانیدا دەیناسنەوەو دەیکوژن!

گوفتارەکەی بەحیرە لەسەر ئەبو تالیب زۆر کاریگەربوو، ئاشکرایە کە نایەوێت موحەممەد تووشی هیچ جۆرە زیانێک ببێ، بۆیە هەموو توانای دەخاتەگەڕ تا بیپارێزێ. هەربۆیە گێڕایەوە بۆ مەککەو نەیبرد بۆ شام.

بەحیرەی خواپەرست شەرەفی ئەوەی پێبەخشرابوو کە پێغەمبەری ناوبراو لە کتێبە ئاسمانییەکاندا ببینێ، بەوەش دڵخۆش بوو کە نەیهێشت تووشی زیان و ئازاردان ببێت.

## ٣١. هیدایەت تەنها لای خوایە نەک لای خەڵک

لەدوای هۆشدارییەکەی بەحیرەی خواپەرست، ئەبو تالیب ئیتر هەرگیز ڕێگای بە برازاکەی نەدەدا لەبەرچاوی ون ببێت، بۆ هەر لایەک بڕۆیشتایە دەیبرد لەگەڵ خۆیدا، ڕۆژێکیان ئەبو تالیب لەگەڵ برازاکەیدا چوو بۆ گەشتێک، دەیانویست لە بازاڕی (زیلمەجاز) کە دەکەوێتە ناوچەیەکی دوور هەندێ شمەک بفرۆشن.

لە کاتی گەشتەکەیاندا، ئەبو تالیب هەستی بە تینویەتییەکی سەخت کرد، هیچ ئاویان پێنەمابوو، لە نزیکیشیانەوە ئاو نەبوو، ئا لەو ساتەدا، موحەممەد هاتەوە بیری کە لە توانایدایە شتێک بکات، چونکە برازاکەی لە هەر شوێنێک بووبێت ئیتر خەڵکی ئەو شوێنە هەستییان بە برسێتی و تینویەتی نەکردووە، بۆیە بە دەنگێکی نزم پێیوت: (کوڕەکەم من تینوومە)، موحەممەد ئاوڕیلێدایەوەو سەیرێکی کرد، لێوەکانی مامەی لە سەختی تینویەتی وشکبووبوونەوە، ئەبو تالیب ئەوەی زانی کە موحەممەد ئەوەی لەتواناییدا بێت دەیکات تا ئاو بدۆزێتەوە، بەڵام ئەوە چۆن ئاسان دەبێ لە کاتێکدا ئەوان وان لە ناوەڕاستی بیاباندا؟ موحەممەد لەسەر وشترەکەی هاتە خوارەوەو بەپێ کەوتە ڕێکردن و لە خوای گەورە دەپاڕایەوە، هەرکە پاژنەی پێی کەوت لە زەوی ڕاستەوخۆ ئاو وەک کانیاو لەژێر پێیدا هەڵقوڵا، ڕوخساری ئەبو تالیب درەوشایەوەو بە سەرسوڕمانەوە سەیرێکی برازاکەیی کرد، موحەممەدیش دەفرێکی بۆ پڕکرد لە ئاو و پێشکەشی کرد.

ئەبو تالیب لە ئاوەکەی خواردەوە تا تێرئاو بوو و تینویەتییەکەی

نەما، ئەو پەی بەوەبردبوو کە برازاکەی کەسێکی مەزنە، بەڵام وێڕای ئەو هەموو بەڵگەو موعجیزانە کە بینینی لێی هێشتا هەر باوەڕی بە بانگەوازەکەی نەکرد لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندەها جار ئەو داوایەی لێکرد، کۆتا شت لەسەر ئەبو تالیب ئەوەبوو لە نەخۆشی مردنیدا وتی کە ئەو لەسەر ئاینی عەبدوامووتتەلیبی باوکیەتی، واتە لەسەر پەرستنی بتەکانە! ئەوکات خوای گەورە بە موحەممەد پێغەمبەری فەرموو: ﴿ إِنَّكَ لَا تَهْدِي مَنْ أَحْبَبْتَ وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يَهْدِي مَن يَشَاءُ ۚ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ ﴾ (القصص: ٥٦)

## ٣٢. موحەممەدی ئەمین

موحەممەد گەورە بوو و حیسابی منداڵی بۆ نەدەکراو لە منداڵی دەرچوو بوو، لە ماوەی ئەو ساڵانەدا کە لە ماڵی مامیدا بەسەریبردن بووبووە گەنجێکی بەویقار، موحەممەد کەسێکی باڵا مامناوەند بوو، قژی ڕەش و چڕو لول بوو، برۆکانی پەیوەست بوون، برژانگەکانی درێژبوون، ڕیشی نێوان دوو شانی داپۆشیبوو، چاو ڕەش بوو، ڕوخساری ڕوومەتی جوان بوو، ددانەکانی وەک مرواری سپی بوون، هەمیشە دەم بە زەردەخەنە بوو، جگە لە گوفتاری جوان خەڵکی شتێکیتریان لێ نەدەبیست.

موحەممەد هەرگیز جنێوی بە کەس نەدەدا، بەڵکو لە هەموو شتێکدا بەدوای خێرو چاکەدا دەگەڕا، کەسێکی زمانپاراو بوو، ئەم سیفەتانەش وایان لێکردبوو ببێتە جێگای بەدڵاچوونی هەمووی خەڵکی، قورەیش زۆریان خۆشدەویست، چێژیان لە کۆڕو دانیشتنەکانی وەردەگرت، ئەو لە منداڵێتییەکی سەختدا ژیا، بەڵام گەورە بوو تا بە ڕاستگۆیی و ڕەوشتی بەرزی ببێتە پێشەنگی هەمووی خەڵکی، ناوبانگی لە سەرتاسەری مەککەدا بڵاوبوویەوە، کەوتە سەر زمانی هەموو کەس و خەڵکی دەماودەمیان دەکرد بە سیفەتە بەرزەکانی وەک ڕەوشتجوانی و حەزکردنی بە یارمەتیدانی خەڵکی، ئیتر بەهۆی ئەو سیفەتانەوە بووبە کەسایەتییەکی متمانەپێکراو، خەڵکیش شتە بەنرخەکانی خۆیانیان لا دادەنا چونکە ئەمانەتی دەپاراست، لە هەموولایەک باس باسی موحەممەد بوو، لەبارەیەوە دەیانوت: (موحەممەد درۆزن نیە، بەڵکو کەسێکە

شایستەی متمانە پێبەخشینە). زۆریان خۆشدەویست، ئەوەندە متمانەیان پێی هەبوو ناویاننابوو بە (موحەممەدی ئەمین). ئەو موحەممەدی ڕاستگۆیە کە هەرگیز درۆ ناکات و ناپاکی بەرانبەر بە کەس ناکات، موحەممەدی خۆشەویست و بەڕێز، خاوەنی گوفتاری شیرین کە بە شتانی باش و وەسفی جوان نەبێت باسی کەس ناکات، ئەو موحەممەدە کە پارێزگاری لە ژیانی خەڵکی و لە شتە بەنرخەکانیان دەکات، ئیتر ئەوانە هاوڕێکان یان ناحەزەکانی بووبن لای ئەو چوونیەک بووە.

بوونی لە مەککە بووبووە مایەی هەستکردنی قورەیش بە ئاسایش و ئارامی و خۆشەویستی و متمانەو دڵسۆزیی. هەر بە بوونی موحەممەدی ئەمین لە نێوان ڕۆڵەکانیدا شاری مەککەش هەستی بە هەمان ئارامی دەکرد.

## ٣٣. گوڵەباخەکەی مەککە

لە مەککەدا ئافرەتێکی ڕەوشتبەرز دەژیا، خاوەنی پێگەو پایەو ماڵ و سامان بوو، ناوی خاتوو خەدیجە بوو، زۆر دەوڵەمەند بوو، چونکە کاری بازرگانی لەگەڵ شارەکانی تردا دەکرد، بەوە ناسرابوو کە ئافرەتێکی چاکەکارو بەخشندەیەو حەزی لەوەبوو یارمەتی کەسانیتر بدات.

لەو ڕۆژانەدا، زۆر پێویستی بە کەسێک بوو کاڵاکانی ببات بۆ شام و لەوێ بیانفرۆشێ، هەربۆیە دەگەڕا بەدوای کەسێکی ڕاستگۆ و گورج و گۆڵ و متمانەپێکراودا، ڕۆژێکیان عاتیکەی پوری موحەممەد کە هاوەڵێکی نزیکی خەدیجە بوو، بە خاتوو خەدیجەی وت: (کەسێک دەناسم دەتوانێت گرنگی بدات بە بازرگانییەکەی تۆ، کەسێکی لەو ئەمانەتپارێزتر نادۆزیتەوە). خاتوو خەدیجە پرسیاری لێکرد و وتی: (ئەوە کێیە؟)، عاتیکە وتی: (ئەوە برازاکەمە) (موحەممەدی ڕاستگۆیە). ڕوخساری خەدیجە بەو هەواڵە گەشایەوەو وتی: (بەڵێ وایە)، بەڕاستی هەواڵی ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزیم بیستووە، دەی کەواتە با کۆببینەوە لەگەڵیداو بازرگانییەکەمی ڕادەست بکەم).

موحەممەد و خەدیجە دوورە خزمایەتییەک کۆیدەکردنەوە، بەڵام پێشتر نەیبینیبوو، ئەوکات کەسێکی نارد بەدوای موحەممەددا و بانگیکرد بۆ ماڵەکەی خۆی تا لە نزیکەوە بیناسێت. کاتێ خاتوو خەدیجە لە چاوەڕوانی میوانەکەیدا بوو، هەستی بە شڵەژان دەکرد، چونکە تا ئەو ڕۆژە هەر ئەوەی لە خەڵکی بیستبوو کە چاکەی موحەممەدیان وتووە.

خاتوو خەدیجە فەرمانی بە کارگوزارەکانیدا ماڵەکە پاکوخاوێن بکەن و ڕێکوپێکی بکەن، هەروەها
داوای لێکردن پێشوازییەکی جوانی لێبکەن، بڕیاریدا میوانداریيەکی باشی بکات و لە چاوەڕوانی کردنیدا ئارامی لێبڕابوو.

## ٣٤. خەدیجە دیارییە بەنرخەکەی دۆزییەوە

دواجار، لەدوای چاوەڕوانییەکی زۆر ئەو میوانە گەیشت کە خەدیجە بەوپەڕی ئارامگرتنەوە چاوەڕێی دەکرد، ئەو موحەممەدە کە خەدیجە لەبارەی ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزییەوە زۆری لەسەری بیستبوو، هەر لە یەکەم چاوپێکەوتندا، موحەممەد بە زەردەخەنەو کامڵی و ئەتەکێتی میوانداریی خۆی نیشتەجێی سەر تەختی دڵی خەدیجە بوو، سەلامی کرد، ئەویش مۆڵەتی چوونەژوورەی دا، خاتوو خەدیجە ڕاستەوخۆ چووە ناو باسەکەو داوای لێکرد کاڵاکەی ببات بۆ شام و بازرگانی پێوە بکات، ئاگاداریکرد کە بۆیە ئەوی هەڵبژاردووە چونکە لەسەر ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزیی موحەممەد زۆری بیستووە.

پاشتریش باسی هەموو ئەو کاڵایانەی بۆ کرد کە دەیانبات بۆ شام، چاوپێکەوتنەکە بە ڕێکەوتن کۆتاییهات. موحەممەد ڕاستەوخۆ داواکەی خەدیجەی پەسەند کرد. خەدیجە سەرنجیدایە سیفەتەکانی ئەم پیاوە جیاو ناوازەیە، کە خاوەنی دوو چاوی گەش و ڕوخسارێکی ڕووناککەرەوەو گوفتارێکی ڕاستگۆیانە بوو. کەسی لەمجۆرە نابێ مرۆڤێکی ئاسایی بێت! بەڵام هەموو ئەو بیرو خەیاڵانەی لای خۆی بە نهێنی هێشتەوە، کەسی ئاگادار نەکرد پێی، بڕیاریدا کەمێک ئارامبگرێ و بە باشی بیر لە مەسەلەی ئەم پیاوە بکاتەوە.

ئامادەکارییەکان بۆ گەشتەکە کۆتاییان هات، کاتی ڕۆیشتن هاتەپێش، موحەممەد حازر بوو کاڵاکان بەرەو شام ببات، لەپێش ڕۆیشتنی کاروانەکە، خاتوو خەدیجە داوای لە (مەیسەرە)

ی کارگوزاری کرد یاوەری موحەممەد بێت و بە گوێیدا چپاند کە: (موحەممەد هەرچیت لێ داوا دەکات بەگوێی بکە، سەرپێچی فەرمانی مەکە، هاوکات لەماوەی گەشتەکەدا چاودێری هەموو هەڵسوکەوتەکانی بکە، کاتێکیش گەڕانەوە هەرچیت لێبینیوە بۆم بگێرەرەوە). مەیسەرە زۆر باش گوێی گرت بۆ هەر وشەیەک کە خەدیجەی خاتوونی ڕایسپارد پێی.

مامەکانی موحەممەد و پورەکان و هەموو خزمەکانی هاتن بۆ خواحافیزی کردن لێی، چونکە گەشتەکەی دوورو تولانییە، زۆر بەلایانەوە سەخت بوو ئەو ماوە زۆرە دووربکەوێتەوە لێیان. کاتێ کاتی ڕۆیشتن هاتەپێش، موحەممەد لەگەڵ ئەندامانی تری کاروانەکە مەککەی بەجێهێشت.

شەو شەوێکی ڕووناک بوو وەک بڵێی خۆر لە بیابانێکی پان و پۆڕدا پرشنگی خۆی دەدا، هەروەها ڕۆژ گەرم و تیشکداربوو، مەیسەرە ئەوەی لە توانایدا بوو کردی بۆ ئەوەی موحەممەد هەست بە حەوانەوە بکات، لەدوای گەشتێک کە سێ مانگی خایاند، گەیشتنە شاری بوصرا کە نزیکبوو لە شامەوە، لەوێ بازاڕێکی گەورە دامەزرێنرا بوو، کاروانچییان دابەزین و هەریەکەو کەلوپەلی خۆی لەسەر ڕاخەرێک بڵاوەپێکرد، موحەممەدیش لەژێر درەختێکی زەیتونەدا دانیشت.

## ٣٥. پێغەمبەر لەژێر درەختێکدا

موحەممەد لە بوصرا لەژێر درەختێکی زەیتونـدا دانیشت و کەوتە تێڕامان و بیرکردنەوە لە دەوروبەر، ئەو ساڵانێک لەمەوبەر لەگەڵ مامیدا هاتووەتە ئێرە، لەو پەرستگا بچوکەدا چاوی بە قەشە بەحیرە کەوتووە، لەو ڕۆژگارەدا ئەم منداڵێکی بچوک بوو، بەڵام ئێستە تەمەنی بیست و پێنج ساڵە، ئەمجارەش قەشەیەکی بینی کە لەپشتی پەنجەرەی پەرستگاکەوە دەڕوانێ، بەڵام ئەو بەحیرە نەبوو، چەندین ساڵ تێپەڕیوە بەسەر ڕووداوی یەکەمداو مەعلوم ئەو ئێستە مردووە، ئەم قەشە نوێیە ناوی (نەستورا) بوو، نەستورا نەیتوانی چاوی لە موحەممەد کە لەژێر درەختێکدا دانیشتووە دووربخاتەوە، وەها دەردەکەوت وەک بڵێی ساڵانێکی دوورو درێژە دەیناسێت، دواجار، لە پەرستگاکەی هاتەخوارەوەو ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ لای مەیسەرەو پرسیاری لێکردو وتی: (ئەو پیاوە کێیە؟)، مەیسەرە وتی: (پیاوێکی قورەیشیەو خەڵکی مەککەیە)، نەستورا سەری سوڕماو وتی: (هەرگیز جگە لە پێغەمبەر هیچ کەسێتر لەژێر ئەو درەختەدا دانەنیشتووە!). ئەمجارەیان مەیسەرە هەواڵەکەی لا سەیر بوو، بەڵام نەستورا، قسەکەی خۆی دووبارە کردەوەو وتی: (ئەو پیاوە پێغەمبەرە، ئەو خاتەمی پێغەمبەرانە).

مەیسەرە زۆر دڵخۆشبوو، ئینجا لە خۆیی دەپرسی ئایا دەکرێ ئەم کاروانچییە هەر بەڕاستی پێغەمبەر بێت؟ چونکە گومانی تێدا نیە هەرچی دەکات هەمووی لە سۆزو بەزەیی و داناییەوەیە، مەیسەرە لە کاریگەری قسەکە لەسەری هەستی بە تەزوویەک

کرد بە جەستەیدا تێپەڕ دەبێت...بڕوای بەوە نەدەکرد تا ئەو ئاستە نزیک کەوتبێتەوە لە کەسێکی ئاوا گرنگی هاوشێوەی ئەو. ئینجا هەستی بە جۆش و خرۆشێکی گەورە کرد چونکە نهێنی کەسێکی ئاوا مەزنی زانیوە، بۆیە کەوتە پرسیارکردن و کەشماڵکردنی ئەو شتە سەیرانە کە ئەم گەشتە لە هەناویدا شاردوویەتیەوە.

## ٣٦. هەورێک بۆی دەبێتە سێبەر

موحەممەد لەگەڵ مەیسەرەدا شەو و ڕۆژ بەڕێگاوە بوون، دواجار گەیشتنە شام، مەیسەرە پێشتر سەفەری ئاوا تولانی بە ئاسانی نەبڕی بوو. بەدرێژایی کات چاوی لەسەر موحەممەد بوو، سەرنجیدەدایە هەموو ئەو کردەوانە ئەم پیاوە نایاب و قەشەنگە دەیکات، موحەممەد چووە دڵی مەیسەرە، تەنها بەو جوانییەوە نەوەستا کە دەوری موحەممەدی داوە، بەڵکو حەزیدەکرد ئەو بۆ هەر لایەک دەڕوات لێی جیانەبێتەوە، موحەممەد شمەکەکانی خەدیجەی فرۆشت و پارەیەکی باشی دەستکەوت، هاوڕێکەی زۆر سەری سوڕما لەو بازرگانییە سەرکەوتووە، لە کاتێکدا ئەمە یەکەمینجارە بازرگانی وەها بکات، لەدوای ئەوە کارەکانیان تەواوکرد، کەلوپەل و خواردن و پێویستییەکانیان لە وشترەکان بارکردو ئامادەی گەڕانەوە بوون.

کەشو هەوا زۆر گەرم بوو، وەک بڵێی بارانێکی ئاگرین بەسەر لمی بیاباندا دەباری، مەیسەرە تاو تاو سەیرێکی ئاسمانی دەکرد، ئەو لەگەڵ ئەو گەرمایەدا ڕاهاتبوو، بەڵام لە موحەممەد دەترسا، ڕێکنەکەوتووە پێشتر پێستی بە تیشکی خۆر بسوتێ. بەڵام بەدڵنیایی کە خوای گەورە لەم گەشتە تولانییەدا دەیپارێزێ.

مەیسەرە هەستی بەخۆی دەکرد کە لە ناو ئەو بیابانە ڕووت و بێدەنگەدا دەستەوسانەو هیچی پێناکری، بەڵام لەکاتێکدا کە کاروانەکە بە زەحمەتێکی زۆر ڕێی دەکرد، موعجیزەیەک ڕوویدا، کاتێکی زانی هەور لە ئاسمان کۆبوویەوە، سێبەرێکی لەسەر سەری

موحەممەد دروستکرد، هەورەکە لەگەڵ کاروانەکەدا ڕێی دەکردو کاروانچییانی بە تەنها نەهێشتەوە، مەیسەرە سەرنجی لە هەموو شت دەدا، سەیرێکی موحەممەدی کرد، هەورەکە بەسەریانەوە بوو وەک بڵێی وەها فەرمانی پێکراوە، بەڵام کاروانچییانیتر ئەوەیان نەبینی کە ڕوویدا.

جا وێڕای هاتنی ئەو سەرما چاوەڕواننەکراوە کە لە کەشو هەوادا ڕوویدا، مەیسەرە هەر نەیدەتوانی چاوەڕوانی بکات بەڵکو دەیویست بگاتەوە جێ و خەدیجە ئاگادار بکات بەوەی کە ڕوویداوە.

## ٣٧. مەیسەرە خاتوونەکەی ئاگادار دەکات بە نیشانەکانی

کاتێ گەڕانەوەی کاروانەکە لە شامەوە نزیک مەککە بوویەوە، خەدیجە هەموو بەیانییەک لەسەر سەربانەکەیەوە لە دوورەوە دەیڕوانییە ئاسۆی ڕێگاکە، ڕۆژێکیان سەرلەنوێ چووەوە سەر بانەکە، چاوی بڕییە ڕێگاکە، چاوانی بە دڵخۆشی بریقەیان دەدا، لە دوورەوە ئەو دوو کاروانچییەی بەدیکرد کە چاوەڕێی دەکردن، موحەممەد و مەیسەرەی کارگوزاری، هەروەها کاروانچییەکانی تریش، خەدیجە کاتێ بۆ دەرکەوت کە کاڵاکەی بە قازانجێکی چەند قات فرۆشراوە، زۆر دڵخۆشبوو، لە پاداشتی ئەوەدا وشتر و دیارییەکی زۆری بە موحەممەد بەخشی، ئینجا خواحافیزی لە میوانەکەی کرد، ئازادی کرد تا بگەڕێتەوە ماڵی خۆی. لەدوای ئەوە کە موحەممەد ڕۆیشت، خەدیجە مەیسەرەی بانگکرد، پرسیاری لێکرد لەوەی لەو گەشتەدا ڕوویداوە، مەیسەرە قسەکانی قەشەکەی بۆ گێڕایەوە، هەروەها ئەو هەورە کە چۆن بەدوایەوە بووەو بووبووە سێبەر بۆی و لە تیشکی خۆر دەیپاراست، ئینجا ئەو ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزییەی کە پێیەوە بینیویەتی، هەرکات مەیسەرە ناوی موحەممەدی بهێنایە زەردەخەنەیەکی دەکرد و هەردوو چاوی لە خۆشیدا بریقەیان دەدا، ئای کە پێیخۆشبوو قسە لەبارەیەوە بکات، ئەو ئەوەی لێبینی و شتانی زۆر لێیەوە فێربوو، بەدرێژی هەموو چاکەکانی موحەممەدی لەو سەفەرەدا بۆ خەدیجە گێڕایەوە، درێژەیدا بە باسی سۆزو بەزەیی و ڕەوشتجوانییەکەی، هەر هەموو سیفەتەکانی یەک بەدوای یەکدا بۆ خەدیجە باسکرد، هەروەها ئەوەی لە نەستۆرا بیستبووی

لەسەری گێڕایەوە بۆی، خەدیجە لەدوای هەموو ئەوەی لەسەری بیستی زیاتر موحەممەدی بەدڵاچوو. خەدیجە خزمێکی دانای هەبوو ناوی وەرەقە بوو، ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ لای و ئەو باسانەی لە مەیسەرەی بیستبوو بۆی گێڕایەوە.

وەرەقە دڵخۆشبوو بەوەی گوێبیستی بوو، ئینجا وتی: (ئەی خەدیجە ئەگەر ئەمەی تۆ دەیگێڕیتەوە ڕاستبێت، ئەوا موحەممەد دەبێتە پێغەمبەری ئەم ئوممەتە، من ئەوەم دەزانی ئەم ئوممەتە پێغەمبەرێکی چاوەڕوانکراوی دەبێت، ئەم سەردەمەش کاتییەتی).

خەدیجە زۆر دڵخۆشبوو، کەواتە بەدڵنیایی کە گومانەکەی ڕاست دەرچوو، ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە چاوەڕوانی هاتنی دەکرێ، بەڵام هیچ کەسی ئاگادار نەکرد بەو هەواڵە، زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد کە چاوی پێیکەوت و لە نزیکەوە ناسی.

## ٣٨. ئاواتی خەدیجە

خاتوو خەدیجە ئافرەتێکی بێوەژن بوو، تەمەنی چل ساڵ بوو، زۆر کەس دەهاتنە داوای و داوای هاوسەرگیرییان لێدەکرد، بەڵام ئەو هەموویانی ڕەتکردەوە، خەدیجە بیری لە هاوسەرگیری نەدەکردەوە، بەڵام کاتێ موحەممەدی بینی و لە نزیکەوە ناسی ڕای خۆی گۆڕی، چونکە نەیتوانی ڕەوشتجوانییەکەی، ئەو ڕووناکییەی کە ڕوخساری پێی دەدرەوشایەوە لەبیر بکات، هەروەها سەرسامبوو بە گوفتاری شیرین و داناییەکەی و بە ڕەفتارو ئەدەبی بەرزی. لای ئەو ئەم پیاوە جگە لەوە کە پێغەمبەرێکە شتێکیتر نیە.

خەدیجە لە ناخی دڵییەوە ئاواتی ئەوە بوو ئەو تەمەنەی کە ماویەتی لەگەڵ ئەودا بیباتەسەر، ببێتە خێزانی، ئاواتی بوو بەتەنیشتییەوە بوەستێ، هەرکات بەو هۆیەوە پێویستی بەو بوو بە هەموو توانای یارمەتی بدات و پشتگیری لێبکات. خەدیجە ئامادەبوو قوربانی بە هەموو شتێک بدات، هەردەبێ ئەم هاوسەرگیرییە جێبەجێ ببێت، بەڵام چۆن؟

## ٣٩. هاوسەرگیریی

خاتوو خەدیجە هاوڕێیەکی هەبوو ناوی (نەفیسە) بوو، زۆر متمانەی پێی هەبوو، جاروبار کۆدەبوونەوەو دەیاندایە ڕازی قسەی خۆیان، ڕۆژێکیان خەدیجە دڵی خۆی بۆ نەفیسە کردەوە، ئاگاداریکرد کە حەزدەکات شوو بکات بە موحەممەد، نەفیسە ئەم هەواڵەی زۆر پێخۆشبوو، بۆیە بڕیاریدا ئەوەی لە توانایدایە بیکات بۆ ئەوەی ئەو هاوسەرگیرییە بە ئەنجام بگات. ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ لای موحەممەد، سڵاولی لێکردو هەواڵی ساغ و سەلامەتی و باری ژیانی لێپرسی، دوای ئەوە پێیوت: (ئەی موحەممەد، چی ڕێگیریت لێدەکات لەوەی هاوسەرگیری بکەیت؟) موحەممەد پێشبینی وروژاندنی ئەو پرسیارەی نەدەکرد، زەردەخەنەیەکی کرد، پاشان وەڵامیدایەوە کە: (هیچم بەدەستەوە نیە تا هاوسەرگیریی بکەم).

نەفیسە دەستوبرد پێیوت: (ئەگەر قەناعەتت هەبێت و بانگهێشت بکرێی بۆ لای جوانیی و سەروەت و سامان و پایەو شکۆمەندی و لێهاتوویی ئایا نایەیت بەدەمیەوە؟)، موحەممەد پرسیاری لێکرد: (ئەوە کێیە؟)، وتی: (خەدیجە). وتی: (جا ئەوەم چۆن بۆ دەکرێ؟)، وتی: (لەسەر من). موحەممەد وتی: (کەواتە دەیکەم).

نەفیسە هەموو ئەو وتووێژەی نێوان خۆی و موحەممەدی بۆ خەدیجە گێڕایەوە، ئەویش زۆر زۆر دڵخۆشبوو، داواکەی موحەممەدی بەوپەڕی شادییەوە پەسەندکرد، پاشان ناردییە لای موحەممەدو پێیوت: (ئەی ئامۆزا، من لەبەر خزمایەتی حەزم بە تۆیە، لەبەر سیفەتەکانت لەناو قەومەکەتدا، تۆ کەسێکی مامناوەندی

لە قەومەکەتدا، مرۆڤێکی کامڵی، ئەمانەتپارێزی، ڕەوشتجوانی، ڕاستگۆیت).

هەواڵەکە بە خێرایی بە مەککەدا بڵاوبوویەوە، کە هەردوولا ڕەزامەندییان داوە، دەوترا: ئاشکرایە ئەم هاوسەرگیرییە هاوسەرگیرییەکی مەزنە.

## ٤٠. هاوسەرگیریی دوو کەسایەتی چاک و پاک

خەدیجە زۆر دڵخۆشبوو و دڵی پڕبوو لە شادیی، لێرە بەدواوە ئیتر بە هەمیشەیی لەگەڵ موحەممەد دا دەبێت، شتانێکی زۆر لێیەوە فێردەبێت، دەستوبرد ئامادەسازی کرا بۆ ڕێوڕەسمی گواستنەوە کە لە ماڵی خاتوو خەدیجەدا دەبێت. خەدیجە فەرمانیدا حەیوان سەرببڕدرێ، خواردن ئامادە بکرێت. خزمەکانی خۆی بانگهێشت کرد بۆ ئاهەنگەکە.

موحەممەدیش لەگەڵ مام و پورەکانیدا هاتن بۆ ماڵی خەدیجە، ئەبو تالیبی مامی زۆر دڵخۆشبوو بەو هاوسەرگیرییە، لەبەردەم ئامادەبووانـدا وەستاو وتی: (سوپاس بۆ ئەو خوایە کە ئێمەی کردووەتە نەوەی ئیبراهیم...پاشان ئەم برازایەم، موحەممەدی کوڕی عەبدوڵلە، ئەگەر بکێشرێ بە هەر پیاوێکیتر ئەوا تای تەرازووی ئەم قورسترە ئەویش بە پێگەو پایەو جوامێری و چاکەو ژیرییەکەی، جا ئەگەر لە سەروەت و ساماندا کەمدەست بێت ئەوا سامان سێبەرێکی ڕۆیشتووە، لەمپەرو زڕە، موحەممەد ئەو کەسەیە کە خۆتان دەزانن خزمایەتی چۆنە، داوای خەدیجەی کچی خوەیلیدی کردووە، مارەیی حازرو قەرزی دوازدە ئۆقیەو نیو ئاڵتونە، سوێند بەخوا پاشتر هەواڵێکی گرنگی دەبێ و ئەرکێکی موبارەکی لەسەرشانە).



ئامادەبووان دڵخۆشبوون، وەرەقە کە ئامۆزای خاتوو خەدیجە بوو ئەویش هەر ئامادەبوو. هەستایە سەرپێ و مۆڵەتی خواست قسە بکات و وتی: (سوپاس بۆ ئەو خوایە کە کردووینەتە ئەوەی باستکرد، چاکەی لەگەڵ کردووین بەوانەی کە ژماردنت، ئێمە

گەورەی عەرەب و ڕابەرینی، ئێوەش شایانی هەموو ئەوەن کە هەتانە و هیچ هۆزێک نیە نکولی لە فەزڵی ئێوە بکات، هیچ کەس شانازی و شکۆمەندیتان ڕەتناکاتەوە، دەی کەواتە ئەی گرۆی قورەیش ئێوە شایەت بن وا من خەدیجەی کچی خوەیلیدم مارەکرد لە موحەممەدی کوڕی عەبدوڵڵە).

هەمووان دڵخۆشبوون و نان و ئاویان خوارد و خواردەوەو قسەوباسیان کرد، بەمشێوەیە خەدیجە کە تەمەنی چل ساڵ بوو بووە خێزانی موحەممەد کە تەمەنی بیست و پێنج ساڵ بوو، خەدیجە هەمیشە چاوەڕوانی ئەوەبوو بگات بە کەسێکی وەک ئەو، ئەوەشی بە چاکی بۆ دەستەبەر بوو، هەردووکیان زۆر بەختەوەر بوون بەو هاوسەرگیرییە جوانە، چاکترینی ئافرەتانی قورەیش شوو دەکات بە چاکترینی پیاوەکانی، هەر بەم هۆیەوە، هەموو هاوڕێیان و خزمان ئەوەیان بەدی کرد کە ئەم دوو کەسە گونجاون بۆ یەکتری، لە کاتێکدا ئاسمان لە دەرەوە بارانی دەباراند، خۆشی و شادی سەراپای ئەو ماڵە بەختەوەرەی گرتەوە.

## ٤١. شەش منداڵ لە یەک ماڵدا

شادیی و بەختەوەریی و خۆشەویستی باڵیکێشا بەسەر ماڵی ئەو دوو کەسە ڕاستگۆ و ڕەوشتبەرزەدا، موحەممەد و خاتوو خەدیجە، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ یەکتریدا لەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێزگرتندا بوو، هەر ئەمەش بووە مایەی ئەوە شادیی و خۆشیی بۆ ساتێکیش لە ماڵەکەیان دوورنەکەوتەوە.

بە تێپەڕبوونی کات، خوای گەورە شەش منداڵی پێبەخشین، سەرەتا قاسم و دوای ئەویش زەینەب، پاشان ڕوقیە و دواتر ئوم کولسوم ئینجا فاتیمەو دواجاریش عەبدوڵلە، شەش منداڵ هەریەکەیان لەویتریان شیرینتر بوو، بە خۆشی ئەوانەوە ماڵی موحەممەد و خەدیجە بووە کانیاوێک لە خۆشی و شادیی و گەشاوەیی.

ئەو منداڵانە لەسەر ڕەوشتجوانی و خۆشەویستی گەورەبوون و پەروەردەکران، ئەوان وەک خاتوو خەدیجەی دایکیان چاکەکار بوون، وەک موحەممەدی باوکیان ڕاستگۆ و ئەمیندار بوون. هەرگیز درۆیان نەکردووە، لە ڕێزی کەسانیتریان کەمنەکردووە، بەردەوام دڵخۆش و دەم بە زەردەخەنە بوون، لەناو هۆزەکەیاندا کەسانێکی جیاو ناوازە بوون، هەرکەس چاوی پێیان کەوتبێ وتوویەتی: (ئەوانە بە حەتمی منداڵی موحەممەدن و جگە لەو نین).

موحەممەد بووبە بازرگان، کاڵاکانی خەدیجەی دەبردو لە دەرەوەی مەککە دەیفرۆشتن، بەمەش قازانجێکی زۆری دەکرد، ئینجا دەگەڕایەوە بۆ شارەکەی، خەدیجە بەهۆی بازرگانی موحەممەدەوە

سەروەتی زیادیکرد، بەڵام ئەوان ڕاهاتبوون لەسەر یارمەتیدانی هەژاران، خۆیان دەگەڕان بەدوای نەداران و چاکەیان لەگەڵیان دەکرد، جا لە کاتێکدا کە زۆر دەوڵەمەند بوون، بەڵام ئەوان هەر ژیانێکی سادەو ساکاریان لا خۆش و پێباش بوو.

هەرچەندە ماڵەکەیان وەک ماڵەکانی تری مەککە وابوو، بەڵام ئەم ماڵە لەوان جیاوازتر بوو، ئەو ماڵێکی پاکوخاوێن و فێنک بوو، ئەمەش بووبووە مایەی سەرسوڕمان و بەدڵاچوونی هەر کەسێک کە دەهاتە ناوی.

## ٤٢. مردنی قاسم و عەبدوالله

منداڵەکانی موحەممەد و خەدیجە خۆشەویستی هەمووان بوون. چونکە منداڵی ئەو پیاوەن کە دواتر دەبێتە پێغەمبەر. هەموو منداڵان حەزیاندەکرد یارییان لەگەڵدا بکەن، چووبوونە دڵی هەموو خەڵکەکە، ئەو شەش منداڵە کە لەو ماڵە فێنکەدا دەژیان سوپاسی خوای گەورەیان دەکرد لەسەر ئەو ژیانە بەختەوەرەیان. ئەوان لە باوکییانەوە فێری ئەوە بووبوون کە بەردەوام سوپاسی خوای گەورەی دەکرد، ئەو لە منداڵییەوە فێری ئارامگرتن بوو، لەبەرئەوە سوپاسکردنی بۆ پەروەردگارەکەی بێسنور بوو، مەعلوم ئەویش وەک هەمووی خەڵکیتر هەردەبێ لە ژیانێکی پڕ لە شیرینی و تاڵیدا بژی.

بە تێپەڕبوونی ساڵان، موحەممەد هەر دوو کوڕەکەی قاسم و عەبدوالڵەی یەک لەدوای یەک لەدەستدا، بەڵام وەک حاڵەتی سروشتی خۆی کە لە نارەحەتییەکاندا لەسەری ڕاهاتبوو بە مردنیان ئارامی گرت، خەدیجەی هاوسەریشی لە کاتێکدا زۆر ئازاری پێگەیشت بە لەدەستدانیان بەڵام بەهەمانشیوە خاوەنی ئارامگرتنێکی گەورە بوو، هەردوو هاوسەر زۆر خەمبار بوون بە مردنی دوو کوڕەکەیان و شیوەنێکی تاڵیان بۆ کردن، بەڵام هەرگیز ناشکوریان نەکرد، ئەوان دەیانزانی ئەو دوو کوڕە بێگوناهەیان لە بەهەشتدا دەبن و لەسەر ئەوە سوپاسی خوای گەورەیان کرد.

هەردوو هاوسەر ئەو بۆشاییەی کە قاسم و عەبدوالڵە بەجێیانهێشت بە خۆشویستنی کچەکانیان پڕیانکردەوە، ئەوەی لە

تواناياندا بوو بۆئەوەی پەروەردەيەكی چاكيان بكەن كرديان و خۆشەويستی و سۆزێكی بێسنوريان پێبەخشين.

بەمجۆرە ئەو كچانە لەسەر ڕەوشتی جوانی هەردوو هاوسەر گەورەو پەروەردەكران، لە هەركوێ بووبن هەر خۆشی و شادیی و گەشاوەييان بڵاوكردووەتەوە.

## ٤٣. زەیدی کارگوزار

زەید کاتێ لەگەڵ دایکی چوو بۆماڵی خاڵی منداڵێکی تەمەن هەشت ساڵ بوو، بەڵام دزو چەردە هێرشیان هێنایە سەر ماڵەکەو زەیدی بچوکیان ڕفاند، تا لە بازاڕی کۆیلەکاندا بیفرۆشن. زەید دەستیکردە گریان و شین و هاوارو هەستی بە خەفەت و ترسێکی ئێجگار زۆر دەکرد، کەس نازانێ لە ئێستە بەولاوە چی بەسەردێ، نازانێ ئایا چ پیاوێک دەیکڕێ و ناچاری دەکات لای ئەو وەک کارگوزار کاربکات؟ هەرکات بیری لەوە بکردایەتەوە فرمێسکی زۆری دەڕێژا، بەڵام دزەکان هەر بردیان بۆ بازاڕی کۆیلەکان و بێبەزەییانە فرۆشتیان، ئەو پیاوەی کە کڕی هێنایەوە بۆ مەککە.

ئەو پیاوە جگە لە حەکیم ناوێ کەسێکیتر نەبوو، ئەو برازای خاتوو خەدیجە بوو، ئیتر لە ئێستە بەولاوە زەید لە ماڵێکی تەواو غەریبدا کاردەکات. ڕۆژێکیان خاتوو خەدیجە هات بۆ سەردانی حەکیم، زەید خەدیجەی زۆر خۆشویست، ئەویش زەیدی زۆر خۆشویست، ئەوکات حەکیم بڕیاریدا زەید وەک دیارییەک ببەخشێ بە خەدیجە، ئا بەمشێوەیە خەدیجە زەیدی لەگەڵ خۆی هێنا بۆ ماڵەکەی خۆی، کاتێ زەید چووە ناو ئەو ماڵە، نوورێکی بینی کە لە ڕوخساری پیاوێکی دەم بە زەردەخەنەو بەبەزەییەوە پرشنگ دەدا، ئەویش بەسۆزێکەوە دەستیهێنا بەسەری زەیدا، ئەو پیاوەش موحەممەد بوو.

موحەممەد ڕاستەوخۆ زەیدی خۆشویست، لە ماڵەکەی خۆیدا وەک زڕ کوڕێکی پێشوازی لێکرد. نەک وەک کۆیلەیەک. لەو ڕۆژەوە زەید کەوتە ناو ماڵێکی سۆزدارو ئارامەوە، هەستی بە حەوانەوەو ئاسودەیی دەکرد چونکە موحەممەد بووەتە باوکی، خەدیجەش بووەتە دایکی.

## ٤٤. دۆزینەوەی منداڵە ونبووەکە

زەید لە ژیانێکی بەختەوەریی و ئاسودەییدا لە ماڵی موحەممەد و خەدیجەدا ژیانی دەبردەسەر. بەڵام ماڵە باوک و کەسوکاری زۆر نارەحەت بوون بۆی، چونکە نەیاندەزانی لەکوێیە، زۆر بەدوایدا گەڕان، پرسیاریان لە هەموو خەڵکی دەکرد.

ڕۆژێکیان، هەندێ کەسانی غەریب هاتنە مەککە، ئەوانە لە خێڵی زەید بوون، کاتێ ڕۆیشتن بۆ زیارەتی کەعبە، منداڵەکەیان بینی و گورج ناسیانەوە، ئینجا کاتێ گەڕانەوە چوونە ماڵی باوکی و خەبەری زەیدیان پێدان، باوک و دایکی زۆر زۆر دڵخۆشبوون کە دۆزیویانەتەوە، هەر خێرا باوک و مامی بە هەڵەداوان ڕوویان لە مەککە کرد، کاتێ پرسیاریان بۆ کرد بۆیان مەعلوم بوو کە لە ماڵی موحەممەد دەژی، ڕۆیشتن بۆ لای، باوکەکەی بە موحەممەدی وت: (ئەی موحەممەد ئێوە خەڵکی خاکی پیرۆزی خوای گەورەن و دراوسێی ماڵەکەی ئەون، ئازاری کارەساتبار لادەبەن و نان دەدەن بە دیل، کوڕەکەی من کۆیلەی تۆیە، ئەو چاکەیەمان لەگەڵدا بکە بیکەرە پیاوەتی بەسەرمانەوە ئازادی بکە. چونکە تۆ کوڕی گەورەی قەومەکەی خۆتی و ئێمەش چیت بوێ و حەزت بەچیبێت بۆ ئازادکردنی بۆت جێبەجێ دەکەین (واتە ئەو بڕە پارەیەی دەتەوێت لە بری ئازادکردنیدا داوای بکەیت دەتدەینێ). موحەممەد وتی: (لەو چاکترتان دەدەمێ). باوکەکە وتی: (چییە؟)، موحەممەد وتی: (پێیبڵێن، سەرپشکی بکەن، ئەگەر ئێوەی هەڵبژارد ئەوا بەبێ ئەوەی هیچ شتێک لەبری ئازادکردنی بدەن بیبەنەوە، بەڵام ئەگەر

منی هەڵبژارد ئەوا وازی لێبێنن، باوکی زەید ئەم پێشنیارەی لا پەسەندبوو، زەید بانگکراو موحەممەد پرسیاری لێکرد: (ئەی زەید ئایا ئەمانە دەناسی؟) زەید وتی: (بەڵێ، ئەوە باوکمەو ئەوەش ماممە)، ئینجا موحەممەد وتی: تێگەیشتین کە بەڕاستی دەیانناسی و ئەگەر ئەوان هەڵدەبژێری ئەوا لەگەڵیان بڕۆرەوە، ئەگەر منیش هەڵدەبژێری ئەوا من ئەوەم کە دەزانی). زەید وتی: (من هەرگیز کەسیتر بەسەر تۆدا هەڵنابژێرم، تۆ بۆ من لە جێگای باوک و مامی).

باوکی زەید زۆر ئەم وەڵامەی بەلاوە سەیربوو. بەلام زەید ئاوڕی لە باوکیدایەوەو وتی: (من هەرگیز لەم پیاوە جیانابمەوە). لەدوای بیستنی ئەو وەڵامە باوکی زەید بڕیاریدا کوڕەکەی لەو جێگایەدا بەجێبێڵێ کە تیایدا هەست بە بەختەوەری دەکات، لە داهاتووشدا هەرکات بیەوێ دەتوانێ سەردانی بکات).

## ٤٥. کامەرانیی زەید

زەید باوکی ئاگادارکرد کە حەزدەکات لای موحەممەد بمێنێتەوە، باوکیشی ڕێزی لە بڕیاری کوڕەکەی گرت، کاتێ باوکی زەید و مامی خۆیان حازرکردبوو بۆ گەڕانەوە بەبێ ئەو، موحەممەد دەستی زەیدی گرتوو بەسۆزێکەوە سەیری دەکرد، هەموویان چوونە گۆڕەپانی مەککەو لەوێ موحەممەد دەستی زەیدی بەرزکردەوەو لەبەردەم خەڵکەکەدا وتی: (ئەی قوریشییەکان شایەت بن، ئەم زەیدە کوڕی منەو میراتیم لێدەبات و میراتی لێدەبەم). موحەممەد بەو ڕاگەیاندنە خەڵکی ئاگادارکرد کە زەیدی کردووەتە کوڕی خۆی، ئای زەید بەم هەواڵە چەندە دڵخۆش و شاد بوو، باوکی زەید بە سەرسوڕمانێکی زۆرەوە سەیرێکی زەید و موحەممەدی کرد. پێشتر کوڕەکەیی هەرگیز نەدیوە بەوشێوەیە شادمان بێت.

باوکەکە ئیتر هەستی بە خەم و پەژارە نەدەکرد، بەڵکو بەویست و ڕەزامەندی و دڵنیاییەوە گەڕایەوە بۆ ناوچەکەی خۆی، کاتێ گەیشتەوەماڵەکەی خۆی هەواڵی بە ژنەکەیدا لەوەی کە ڕوویداوە، دایکەکەش بەهەمانشێوە زۆر دڵخۆشبوو چونکە کوڕەکەی لە دەستانێکی ئەمیندایە، ئارامی ڕوویتێکرد چونکە هەرکات خۆی بیەوێت دەتوانێ بڕوات سەردانی بکات.

ئێستە زەید بووەتە کوڕی موحەممەد و خەڵکیش لەسەر ئەو بنەمایە لایان پەسەندبوو، بە سەرسوڕمانەوە بۆیان دەڕوانی، هەروەها ئەو شادمانی و بەختەوەرییەی کە دەورەیداوە لایان سەیر بوو، بەردەوام ئەو ڕووداوە دەهاتەوە بیریان و لەنێوان خۆیاندا نەوە لەدوای نەوە دەیانگواستەوە.




# Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel

**Description**

بسم الله الرحمن الرحيم
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

داوای ڕیکلام مەکە نایکەین🚫

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

## ٤٦. عەلی لە ماڵی موحەممەد دا

موحەممەد هەمیشە گرنگی بە خزمەکانی دەداو بەپەرۆشبوو لەسەر حەوانەوەو ئاسودەبوونیان. بەتایبەتی ئەبو تالیبی مامی کە زۆری خۆشدەویست، ماوەی ئەو چەندین ساڵە کە لە ماڵی ئەودا بەسەریبرد زۆر جێگای بایەخپێدان و چاودێری و سۆزو نازکێشان بوو لەلایەن مامی و ئامۆژنیەوە.

لەو ماوەیەدا، ئەبو تالیب بە قۆناغێکی سەختدا تێدەپەڕی، منداڵی زۆری هەبوو، نەیدەتوانی وەک پێویست بەخێویان بکات، ئەو منداڵە نەدارانە ڕۆژێ تێریان دەخواردو ڕۆژێ برسیبوون، موحەممەد هەموو ئەوەی بە وردی دەزانی، بیری لەوە دەکردەوە ڕێگایەک بدۆزێتەوە کەمێ باری سەرشانی مامی سوک بکات، بۆیە بڕیاریدا یەکێک لە منداڵەکانی بگرێتە لای خۆی و بەخێوی بکات، ئینجا مەسەلەکەی لای مامی درکاند، پێشنیاری دایە کە با عەلی بگرێتە ئەستۆی خۆی، جا بەوهۆیەوە کە ئەبوتالیب موحەممەدی زۆر خۆشدەویست نائومێدی نەکرد، ڕازیبو عەلی بداتێ.

عەلی کوڕێکی جوانخاس و زیرەک و جەستەپڕ بوو، کاتێ منداڵان لە کۆڵان و جادەکان دەیانبینی دەترسان لێی، عەلی چاکەویستانی خۆشدەویست و دەیپاراستن، خراپەکارانی دەترساند، کەسێکی زمانپاراو بوو، حەزی لە خوێندنەوە بوو، چێژی لە دەستخستنی زانیاری وەردەگرت، ئیتر لێرە بەدواوە لە ماڵی موحەممەد دا لەگەڵ شەش منداڵدا دەژی، بەڵام لەوە گرنگتر ئەوەیە کە لەگەڵ موحەممەدا دەژی.

موحەممەد عەلی ئامۆزای زۆر خۆشدەویست، هەڵسوکەوتی چاکی لەگەڵدا دەکرد، بۆ ڕۆژێکیش هەستی بریندار نەکرد، هەروەک منداڵێکی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا دەکرد، ئەویش هەروەک زەید، بەلام عەلی، بڕیاریدا هەرگیز موحەممەد بەجێنەهێڵێ، بەتایبەتی کە شتانێکی زۆر لێیەوە فێردەبێت. ئابەمجۆرە ژیانی نوێ لەو ماڵە جوانەدا دەستیپێکردو دەگوزەرا. هەمیشە بیری لە موحەممەد دەکردەوەو باسیدەکرد، قەت لێی دوورنەدەکەوتەوە، ژیانی ئەو خێزانە بەشێوەیەک بوو هەروەک بڵێی خۆشەویستی و بەختەوەریی لە ئاسمانەوە دادەبارێتە سەر ماڵی موحەممەد و خەدیجە.

منداڵانی ئەو ماڵە ئەوەندە لە بەختەوەریی و خۆشیدا دەژیان هەر ڕۆژێک کە تێدەپەڕی ئەوان زیاترو زیاتر بە چاوی درەوشاوەو دڵی پڕ لە خۆشەویستیی جوانتر و گەشاوەتر دەبوون.

## ٤٧. پەیمانی فوزول

چەند خێڵێکی قورەیش کە ئەمانە بوون: بەنو هاشم، بەنو موتتەلیب، ئەسەد کوڕی عەبدولعزی، زوهرەی کوڕی کلاب، تەمیمی کوڕی مورڕە، لە ماڵی عەبدوالله کوڕی جودعان کۆبوونەوە، پەیمانیاندا هەر ستەملێکراوێ لە دانیشتوانی مەککە کە ستەمی لێبکرێ و هەر ستەملێکراوێکی تریش جگە لە خەڵکی مەککە لەوانەی کە دێنە ناوی پشتگیریی لێبکەن و نەهێڵن ستەمی لێبکەن، ببنە هاوکاری لەسەر ئەو کەسەی ستەمیلێکردووە تا ئەو کاتەی مافەکەی بۆ دەگەڕێتەوە. قورەیش ئەم بەڵێننامەیان ناونا بە پەیمانی فوزول.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: ((لەگەڵ مامەکانمدا لە ماڵی عبدالله کوڕی جودعان ئامادەی پەیماننامەیەک بووم، ئەو پەیماننامیەو ئامادەبوونم تیایدا لە وشترێکی سور کە هەمبێت پێمخۆشتر بوو، ئەگەر لە سەردەمی ئیسلامیشدا بانگهێشت بکرێم بۆی هەر دەچم بەدەمیەوە)).

چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بە ڕێزدارترینی ڕەوشتەکانەوە ڕەوانەکراوە، ئەمەش هەر دەچێتە ڕیزی ئەو ڕەوشتانەوە، ئاینی ئیسلامیش دانیناوە بە زۆرێک لەو چاکانەدا، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ڕێنماییمان دەکات بۆی کە دەفەرموێ: ((من ڕەوانەکراوم تا ڕەوشتە ڕێزدارەکان تەواوتر بکەم)).

پاشان وەڵامیدایەوە: (ئەوە مەسەلەیەکە لەپێش ئەمڕۆوە نەمبیستووە، من بڕیار لەسەر مەسەلەیەک نادەم تا بە ئەبو تالیب نەڵێم). جا لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بۆ نەهاتبوو کە بانگەوازەکەی ڕابگەیەنێت، عەلی مەسەلەکەی شاردەوەو کەسی لێ ئاگادار نەکرد، پاشان بەدرێژایی شەو بیری لەو ئاینە نوێیە دەکردەوە کە ئامۆزاکەی بانگیدەکات بۆی، دواجار، بڕیاری خۆیدا، بۆ بەیانی ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێیوت: (ئەی موحەممەد، دوێنێ چ داوایەکت لێکردم؟) پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامیدایەوە کە: ((داوام لێکردی شایەتومان بێنی و بڵێیت: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله، باوەڕ بە لات و عوززا نەکەیت و خۆت بەری بکەیت لە هاوەڵگەران و بتەکان)). ئالەوێدا عەلی شایەتومانی هێنا، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو کە عەلی باوەڕی هێنا بە ئیسلام. عەلی بووبە یەکەمین منداڵی موسڵمان لە مێژوودا.

بینیایە کە هاتوون بۆ چاککردنەوەی بینایەکە شێت و هار دەبوو، سەری بەرزدەکردەوەو دەنگێکی سامناکی لێدەردەچوو. خەڵکەکە تۆقین و نەیاندەزانی چیبکەن. ماوەی چەند ڕۆژێکی زۆر بەمشێوەیە هەر لە چاوەڕوانیدا بوون.

بەدڵنیایی کە خوای گەورەو زاناو بەتوانا توانایی هەیە لەسەر پاراستنی کەعبە لەو مارە گەورەیەو لەوانەی کە نیەتی خراپیان هەیە، ڕۆژێکیان مارەکە لە کونەکەی هاتەدەرەوەو لەژێر تیشکی خۆردا دەکشا. لەکتوپڕدا هەڵۆیەکی زەبەلاح لە ئاسمان بەتەنیشت کەعبەوە دەرکەوت، بە دوو باڵە گەورەکەی کەوتە سوڕانەوە بەسەر کەعبەدا، لەدوای سوڕانەوەی بە ئاسماندا دابەزی و مارەکەی گرت و فڕی بۆ شوێنێکی دوور.

بەمجۆرە مارەکە بە فەرمانی خوای گەورە هاتەدەرەوە، خەڵکی لایان سەیر بوو و دڵخۆشبوون، بە یەکتریان دەوت: (ئێمە تکاکارین خوای گەورە ڕازی بێت بەوەی کە ویستوومانە کەعبە دروستبکەینەوە، کرێکاری شارەزامان هەیە، تەختەی کەشتییەکەشمان هەیە، خوای گەورەش ڕزگاریکردین لە مارەکە!). ئەوکات خەڵکی مەککە قۆڵیان لێهەڵماڵی و بەدڵخۆشییەکی گەورەوە دەستیانکرد بە نۆژەنکردنەوەکە.

## ٤٩. بەردە ڕەشەکەی کەعبە

خۆشی و شادی سەراپای مەککەی گرتەوە، دواجار نۆژەنکردنەوەی کەعبە تەواو بوو، کاتی ئەوە هات بەردە ڕەشەکە (الحجر الأسود) بخرێتەوە جێگای خۆی، لەڕاستیدا ئەم بەردە لە بەهەشتەوە هاتووە، لەبەرئەوە، هەر خێڵێک باوەڕی وابوو دەبێت شەرەفی دانانەوەی بەردە ڕەشەکە لەلایەن سەرۆکی ئەوەوە بێت، کاتێک نەتوانرا بگەنە ڕێکەوتن، ناکۆکییەکی گەورە دروستبوو، کرێکارەکان وتیان: (ئێمە بەردە ڕەشەکە دەخەینەوە شوێنی خۆی لە دیوارەکەدا!).

ئا لەوێدا کەسێکی دانای بەساڵاچوو هەبوو کە لەوێ دەژیا، بیریکردەوە کە پیاهەڵشاخان و ناکۆکی لەسەر دانانەوەی بەردە ڕەشەکە دەبێتە هۆی وێرانکردنی، ئەوکات پێشنیاری کردو پێیوتن: (گوێڕادێرن بۆم، وەرن با ناوبژیوانێک دیاری بکەین ئەم مەسەلەیەمان بەشێوەیەک بۆ چارەسەر بکات کە هەموولایەک ڕازیبن پێی. لەسەر هەرکەسێ ڕێکەوتین با ئەو کەسە بەردە ڕەشەکە بخاتەوە جێگای خۆی، ئەگەر ڕای منیشتان دەوێ ئەوا دەڵێم با یەکەم کەس کە لەو دەرگایەوە دێتە ژوورەوە ئەو بکەینە ناوبژیوان و کێشەکە چارەسەر ببێت).

هەموویان پێشنیارەکەیان قوبوڵکرد، گورج پیاهەڵشاخان و دەمەقاڵە کۆتاییهات، هەمووان چاویان بڕییە دەرگاکە، ئایا دەبێ یەکەم کەس کە دێتە ژوورەوە کێبێت؟ لەپاش ماوەیەکی کورت، کەسێک لە دوورەوە دەرکەوت، هەموو ئامادەبوان بە جۆش و

خرۆشەوە کەوتنە پرسیارکردن ئایا دەبێ کێبێت، کاتێ ناوبژیوانی چاوەڕوانکراو نزیکبوویەوە، زەردەخەنە کەوتە سەر ڕووی هەمووان، بەدڵنیایی کە خوای گەورە ڕەوانەیکردووە بۆیان، هەموویان دڵخۆشبوون و پێکەوە بەدەنگی بەرز هاواریان کرد: (ئەو ئەمیندارە، ڕازین بە ناوبژیوانییەکەی).

موحەممەد هات و بە زەردەخەنەیەکەوە سڵاوی لە هەموان کرد، جا لەبەرئەوە لەو دواییانەدا لە دەرەوەی مەککە بووبوو نەیدەزانی چی ڕوویداوە، ئەوانیش ئاگاداریان کرد بە مەسەلەکە، ئینجا داوای پۆشاکێکی کردو لەسەر زەوی ڕایخست، پاشان بەردە ڕەشەکەی خستە ناوەڕاستی پۆشاکەکە، هەموو ئامادەبووان بە سەرسوڕمانەوە سەیریان دەکرد، دوای ئەوە بانگی ئەو سەرۆک خێڵانەی کرد کە ناکۆک بوون، ئەوانیش هەریەکەیان لەلایەکەوە بە دەستەجەمعی چمکێکی پۆشاکەکەیان گرت و پێکەوە بەردە ڕەشەکەیان بەرزکردەوە تا گەیاندییانە کەعبە، ئینجا موحەممەد خۆی هەڵیگرت و خستییەوە جێگای خۆی. ئابەمشێوەیە هەموو خێڵەکان بەشداربوون لە گێڕانەوەی ئەو بەردە پیرۆزەدا بۆ شوێنی خۆی، مەسەلەکە بە ڕەزامەندی هەمووان چارەسەرکرا.

ئیتر لەو ڕۆژەوە، ئەو بەردە پیرۆزە هەر لەو شوێنەدایە کە موحەممەد(ﷺ) دایناوە، هەرکەس تەوافی کەعبەی پیرۆز بکات دەتوانێ دەستبدات لە بەردەکەو ناوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێنێ، ئەوانەش کە ماچیدەکەن و بۆنی دەکەن دەزانن کە بەردەوام هەمان بۆنی خۆشی لێدێ.

## ٥٠. نوورێک شەوەزەنگ ڕۆشندەکاتەوە

موحەممەد ئێستە تەمەنی چڵ ساڵە، ڕووداوی زۆر زۆری بینی و شارەزاییەکی بەرفراوانی بەدەستهێنا، بەڵام بارودۆخی خەڵکی زۆر بێتاقەتی کردبوو، هەرکات بیری بکردایەتەوە لەو ستەمە، لەو شتە پڕوپوچانە، لەو بیروباوەڕە هەڵانە، لەو کینەو ڕقەبەرایەتیانە کە بەسەر ڕووی زەویدا بڵاوبوووبوونەوە زۆر ئازاری پێدەگەیشت، بەو هۆیەوە، دواجار بڕیاریدا لەو کۆمەڵگایە دابڕێ و کەنارگیری بکات، حەزی بەوە دەکرد بە تەنها بێت، هەربۆیە کێوی (نوور) ی هەڵبژارد، کە لە دەرەوەی مەککە بوو، هەمووجار دەڕۆیشت بۆ ئەوێ و لە ئەشکەوتی (حەڕا) دەمایەوە، دادەنیشت و بیری دەکردەوە، سێیەکی ئەو ماوەیە کە دەمایەوە تێیدا بیری لە خوای گەورە دەکردەوەو هەستی بە ئاسودەیی دەکرد، زۆرجاریش خاتو خەدیجەی خێزانی دەهاتە خزمەتی و خواردن و ئاوی بۆ دەهێنا.

ڕۆژێکیان، موحەممەد سەرلەنوێ ڕۆیشت بۆ ئەشکەوتی حەڕا و چەند ڕۆژێک مایەوە، بەوپەڕی دڵئارامییەوە پەرستشی بۆ خوای گەورە دەکرد، ، شەوێک لە شەوان، هەستیکرد هەموو شتێک لە دەوری گۆڕاوە، ئارامی باڵیکێشاوە بەسەر ئەو ناوەدا، باڵندەکان بێدەنگ بوون، هەروەک بڵێی هەموو بەدیهێنراوەکان هەناسەیان لە خۆیان بڕیوەو نقەیان لێوە نایەت، با جوڵەی نەماوە، گەڵای درەختەکان لە شنەشن کەوتوون، وەک بڵێی زەوی چاوەڕێی ڕووداوێکە ڕووبدات، ئەو ڕۆژە ڕۆژی دوو شەممە بوو، بەرەبەیان لە هاتندا بوو، کتوپڕ، نوورێک لە ئەشکەوتەکەوە دەرکەوت، لە

بروسکە دەچوو، هەموو شتێکی ڕۆشنکردەوە، تەنانەت سوچە زۆر تاریکەکانی ئەشکەوتەکەش ڕۆشنبوونەوە.

ئا لەو ساتەدا، فریشتەیەک لە شێوەی مرۆڤدا دەرکەوت، ئەو فریشتەیە جبرەئیل بوو، یەکێک لە فریشتە هەرە گەورەو ڕێزدارەکانە، لەنێو ئەو نوورە ڕۆشنکەرەوەیەدا بە موحەممەدی وت: (بخوێنە!) موحەممەدیش کە هێشتا هەر لەژێر قورسایی ئەو بەرکەوتەیەدا بوو، کە ترس سەراپای جەستەی داگیرکردبوو، دەلەرزی...وتی: (من خوێندەوار نیم). جبرئیل بە توندی باوەشی پێداکردو گوشی بەخۆیەوە، ئینجا بەریداو پێیوت: (بخوێنە!)، موحەممەد وتی: (من خوێندەوار نیم).

جبرەئیل(ﷺ) بۆ جاری دووەم باوەشی پێداکردەوەو گوشی بەخۆیەوە، ئینجا بەریداو پێیوت: (بخوێنە!) موحەممەد سەرلەنوێ وتی: (من خوێندەوار نیم)، دواجار جبرەئیل بۆ جاری سێیەم باوەشی پێداکردەوەو گوشی بەخۆیەوەو ئینجا بەریداو ئەم ئایەتە پیرۆزانەی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە بەسەریدا: ﴿ٱقْرَأْ بِٱسْمِ رَبِّكَ ٱلَّذِى خَلَقَ، خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ مِنْ عَلَقٍ، ٱقْرَأْ وَرَبُّكَ ٱلْأَكْرَمُ، ٱلَّذِى عَلَّمَ بِٱلْقَلَمِ، عَلَّمَ ٱلْإِنسَـٰنَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾ (العلق: ١ - ٥)



موحەممەد لە ترساندا دەلەرزی، ئێستە ئیتر چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆز دابەزینە سەری، بەدوای جبرەئیلدا(ﷺ) کەوتە وتنەوەی ئایەتەکان و بە دڵ و بە ئەقڵ و بە زمانی لەبەری کردن، ئا **لەو ساتە هەستیارەدا موحەممەد ئەرکی پەیامداریی پێسپێردرا**، لێرە بەدواوە ئیتر پێویستە ستەمکردن کۆتایی پێبێت، موحەممەد(ﷺ) پێشڕەوی مرۆڤایەتی بکات و بیانبات بەرەو ڕێگای ڕاست، کە دەبێتە مایەی بەختەوەریی هەتا هەتایی، موحەممەد(ﷺ) بووبە پێغەمبەر، هەموو ئەو نیشانانەی ئاماژەیان دەدات بەو پێغەمبەرایەتییە بوونە شتێکی دڵنیاکەرو هیچ گومانی تێدا نەما، ئەم هەواڵە زەوی پڕکرد لە بەختەوەریی و ڕازاوەیی و خۆشی.

## ٥١. هەڵوێستی خاتوو خەدیجە

کاتێ بۆ بەیانی خۆر یەکەمین تیشکی خۆی ڕەوانەی مەککە کرد، موحەممەد(ﷺ) لە ئەشکەوتەکە هاتەدەرەوە، هاتەدەرەوەو ئارەقی لێدەچۆڕا، لە بەرئەنجامی ترس و هەڵچوونی زۆر و هاوکات دڵخۆشیی هەڵدەلەرزی.

لە هەمانکاتدا هەستێکی نایاب و قەشەنگی بۆ هات، وەک بڵێی هەموو بەدیهێنراوەکان پیرۆزبایی بە پێغەمبەربوونی لێدەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەمجارە لەناکاودا بە تەواوەتی دەستەویەخەی هەموو ئەوە بووەوە کە دەیبیست و دەیبینی، کتوپڕ، گوێبیستی دەنگێکی ئاسمان بوو، سەری بەرزکردەوەو سەیرێکی ئاسمانی کرد، ئەمجارەیان جبرئیلی وەک فریشتەیەک، لەسەر شێوەی ڕاستەقینەی خۆی بینی، کە شەش سەد باڵی هەیە، ئەو فریشتەی وەحییە هەموو ئاسۆکەی داپۆشیبوو.

دوای ئەوە، جبرەئیل(ﷺ) دیار نەما، ئینجا موحەممەد(ﷺ) بە خێرایی لەسەر کێوی نوور هاتەخوارەوە، ڕاستەوخۆ گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، خاتو خەدیجە چاوەڕێی ئەوەی نەدەکرد کە لەو کاتەدا بگەڕێتەوە، هەرکە بینی کە ترساوەو شڵەژاوە بەلایەوە زۆر سەیر بوو، خەدیجە ویستی هۆکارەکە بزانێ، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) توانای قسەکردنی نەبوو، ، بینی هەڵدەلەرزێ، نەیویست بە پرسیارلێکردن ئەوەندەی تر بێزاری بکات، پێغەمبەر(ﷺ) چووە ژوورەوەو دەیوت: (داپۆشن! داپۆشن!).

خەدیجە هاوکاریکرد تا لەسەر جێگاکەی ڕاکشا، بە پێخەف

داپۆشی، بۆ ماوەیەک ڕاکشا، پاشان دوای ئەوە کە بیروهۆشی هاتەوە سەرخۆی، ئەوەی کە ڕوویدابوو لێی گێڕایەوە بۆ خەدیجە، ئینجا وتی: (بەڕاستی زۆر ترسام).

خەدیجە کەوتە ئاسانکردنی ئەوەی بەسەر پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هاتبوو، چونکە بەڕاستی ئەو ئەرکەی کە خراوەتە سەرشانی ئەرکێکی ئێجگار مەزن بوو، شتێکی سروشتییە لەو بارەدا هەست بە ترس بکات. خاتو خەدیجە پێیوت: (نە بەخوا هەرگیز خوای گەورە تۆ نائومێدو ڕیسوا ناکات، تۆ کەسێکی سیلەی ڕەحم بەجێدێنی، برسی تێردەکەیت، نەدار پۆشتە دەکەیت، میوانپەزێری، هاوکاری لەسەر بەجێگەیاندنی هەق و ڕاستی). لێرەدا بەهۆی ئەو هاوکارییەی کە خاتو خەدیجە پێشکەشیکرد تۆقینەکەی نەماو هاتەوە سەرخۆی.

## ٥٢. خۆر لە کتوپڕدا هەڵدێت

نوورێکی نوێ هەڵهات بەسەر مەککەدا، ئێستە ئیتر ئەو ساتە هەستیارو گرنگە هات کە چەندین ساڵ بوو خەدیجە چاوەڕوانی دەکرد، ئەو پێشبینییەکی وردی هەبوو کە مێردەکەی دەبێتە پێغەمبەر، خەدیجە لە بیری ئەوەدا بوو کەسێک بەشدار بکات کە یەکەمجار ئەو هەواڵەی پێبگەیەنێ، هات بەخەیاڵیدا ئامۆزا داناکەی خۆی کە ناوی وەرەقە بوو ئاگادار بکات، وەرەقە ئێستە چووەتە ساڵەوەو نابینایە، بەڵام هێشتا لە توانایدایە لەو ڕووداوانە بگات کە بەدەوریدا دەگوزەرێن، خەدیجە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) چوو بۆ سەردانی وەرەقە چونکە تاکە کەسێک بوو کە دەتوانێ ئاگاداری بکات بەوەی کە ڕوویداوە.

پێغەمبەر(ﷺ) هەموو ئەو ڕووداوەی کە بەسەری هاتبوو گێڕایەوە بۆ وەرەقە، ئەو دانا بەساڵاچووە گوێی بۆ ڕادێرابوو، مژدەی خۆشی لەسەر ڕوومەتی دەرکەوت، بەڵام هەر چاوەڕوانیکرد تا پێغەمبەر(ﷺ) قسەکانی خۆی تەواوکرد، ئینجا پێیوت: (ئەمە هەمان ئەو ئاینەیە کە خوای گەورە دایبەزاندووەتە سەر موسا).

موحەممەد کاتێ گوێبیستی ئەم گوفتارە بوو کە لە زاری کەسێکی داناوە دێتەدەر ئیتر هەستی بە حەوانەوە کرد، چونکە وەرەقە بەپێی ئەزموون و شارەزایی قسەی دەکردو لەو کتێبانەوە وەریگرتبوو کە خوێندبوونیەوە، ئەم پیاوە بەساڵاچووە ئەمەشی وت کە: (خۆزگایە من زیندوو دەبووم تا ئەوکات کە قەومەکەت دەرتدەکەن، پێغەمبەر(ﷺ) ئەم قسەیەی بەلاوە سەیربوو بۆیە

## ٥٤. شادبوون بە فێربوونی نوێژ

لەو قۆناغەدا، پێغەمبەرایەتی موحەممەدی پێشەوامان(ﷺ) بە نهێنی مایەوە، پێغەمبەری خوا کەسی ئاگادار نەکرد بەو نهێنییەی خۆی جگە لەو کەسانە نەبێت کە متمانەی تەواوی پێیان هەبوو، هۆکارەکەش ئەوەبوو هێشتا فەرمانی ڕاگەیاندنی پێغەمبەرایەتی لە خوای گەورە پێنەگەیشتبوو.

یەکەمین کەسێک کە بانگیکرد بۆ سەر ئیسلام خەدیجەی خێزانی بوو، ئەویش هەر لە سەرەتاوە باوەڕی پێهێنا، ڕاستەوخۆ شایەتومانی ((أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله))ی هێنا، بەم پێیە بووە یەکەمین ئافرەتی موسڵمان، بەڵکو یەکەمین کەسی موسڵمان لەدوای پێغەمبەری خوا(ﷺ). ئەو پشتگیرییە گەورەیەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە هاوسەرەکەیەوە بەدەستیهێنا زۆر دڵخۆشی کرد.

ڕۆژێکیان، جبرەئیل(ﷺ) لەسەر ئەو کێوە کە دەڕوانێت بەسەر مەککەدا لە شێوەی مرۆڤدا هاتەخوارەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری ئەو نوێژە بکات کە خوای گەورە فەرزیکردووە لەسەر موسڵمانان، لە سەرەتادا، جبرەئیل پاژنەی پێی کوتا بە زەویدا، ئینجا کانیاوێک ئاو لەژێر پێیەکانیدا هەڵقوڵا، جبرەئیل(ﷺ) بەو ئاوە دەستنوێژی شۆری، پاشان پێغەمبەریش وەک ئەو دەستنوێژی گرت، چونکە پێویستە موسڵمان خۆی پاکبکاتەوە تا بتوانێ نوێژەکەی بکات، لەدوای ئەوە، جبرەئیل پێغەمبەری خوای(ﷺ) فێری چۆنێتی نوێژکردن کرد، ئینجا پێکەوە نوێژیان کرد، دوای ئەوە ئیتر فریشتەی وەحی دیارنەما.

پرسیاری لێکردو فەرمووی: ((ئایا ئەوان دەرمدەکەن؟)) وەرەقە بەو حیکمەتەی کە پێیەوە ناسرابوو وتی: (بەڵێ، چونکە هەرگیز کەسێک نەهاتووە بە شتێک لە شێوەی ئەوە بێت کە بۆ تۆ هاتووەو ئازار نەدرابێت، ئەگەر تا ئەو ڕۆژەت من لە ژیاندا بم، بەدڵنیایی کە پشتگیری و سەرخستنێکی گەورەت بۆ دەکەم).

جیهان پێشتر تا ئەو ڕۆژە ژمارەیەکی زۆر لە پێغەمبەرانیان بۆ هاتبوو کە پەیامی خوای گەورەیان بۆ مرۆڤایەتی هێنابوو، هەستاون بە هیدایەتدانی خەڵکی بەرەو ڕێگای هەق و ڕاستی، فەرمانیان بە خەڵکی داوە کە خۆیان لە گوناهەکان بەدوور بگرن، هەروەها هەموو پێغەمبەران(ﷺ) هەواڵیان بە قەومەکانیان دابوو کە دواجار موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) ڕەوانە دەکرێ، ئەمەش هۆکارێ بوو کە وای لە وەرەقە کردبوو لەوپەڕی دڵخۆشیدا بوو بە هاتنی موحەممەد، ئینجا نێوچاوانی پێغەمبەری خوای(ﷺ) ماچکرد.

شادمانیی وەرەقە لەوەی کە بەخزمەت کۆتا پێغەمبەر(ﷺ) گەیشتووە بە ڕوونی لە ڕوخسارە بەتەمەنەکەیدا دەرکەوت.

فَكَبِّرْ، وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ، وَالرُّجْزَ فَاهْجُرْ، وَلَا تَمْنُن تَسْتَكْثِرُ، وَلِرَبِّكَ فَاصْبِرْ ﴾ (المدثر: ١ - ٧ )

ئیتر لەو ساتە بەدواوە کات بۆ کات فریشتەی وەحی دەهاتە خزمەتی پێغەمبەرو ئەویش لەسەر بینینی ڕاهاتبوو، لێرەوە ترسی نەما، لەرزین و موچڕکەی کەمبوویەوە، هەمووجار جبرەئیل(ﷺ) چەند ئایەتێکی دەهێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دڵی پێغەمبەریش پڕ دەبوو لە ئارامیی و دڵنیایی و تا دەهات ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ڕوخساری پیرۆزی بە نووری وەحی دەدرەوشایەوە.

## ٥٣. هاتنەوەی جبرەئیل(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو ئەرکەی پێسپێردرا تا سنورێک بۆ ئەو خراپەکاریی و ستەمانە دابنێ کە ڕووی زەوییان داپۆشیبوو، لەو پێناوەدا، دەبێت بە شەو و بە ڕۆژ کاربکات، ئەگەر بیویستایە دەیتوانی ژیانێکی پڕ لە حەوانەوە و خۆشگوزەرانی بەسەر ببات، ئەو خاوەنی پیشەیەکی سەرکەوتووانە بوو، خاوەنی هاوسەرێکی گوێڕایەڵ و دەوڵەمەند و خاوەن پێگە و پایە و زیرەک بوو، بەڵام ئەو موحەممەدە(ﷺ) ویستی وابوو هەموو ئەوانە لەپێناو ڕەزامەندی خوای گەورەدا بەگەڕ بخات.

ئەمە لە سەرەتای بوونی بە پێغەمبەر بوو، لە کاتێکدا بە بازاڕدا ڕێیدەکرد، گوێی لە دەنگێک بوو، دەنگەکە لە ئاسمانەوە هات، دەنگێکی جوان و خۆش بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیرێکی سەرەوەی کرد، جبرەئیلی بینی لە نێوان ئاسمان و زەویدایە، هەر لەسەر ئەو شێوەیەی کە خوای گەورە دروستیکردووە، شەش سەد باڵی هەیە، هەموو ئەو بۆشاییەی داگرتبوو، سیمایەکی تا ئەوپەڕی جوان و بە هەیبەتی هەبوو، بەجۆرێکی وەها کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ترساندا لەسەر هەردوو ئەژنۆ چۆکی دادا.

پاشان هەستایەوە، سەرلەنوێ کەوتەوە لەرزین و گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی، هەرکە گەیشتەوە ماڵ ڕاستەوخۆ بانگی خەدیجەی کردو دەیفەرموو: ((دامپۆشن! دامپۆشن!)).

ئا لەو ساتەدا خوای گەورە لە ڕێگای فریشتەی وەحییەوە ئەم چەند ڕێنمایەی ناردە سەری کە دەفەرموێ: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمُدَّثِّرُ، قُمۡ فَأَنذِرۡ، وَرَبَّكَ

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو، چونکە فێری چۆنێتی نوێژکردن بوو هەر بەو شێوازە کە پەروەردگاری جیهانیان پێی ڕازییە، کاتێ گەڕایەوە بۆ ماڵەکەی خۆی، خاتو خەدیجەی فێری نوێژکرد کە خۆی فێری بووبوو، ئا بەمشێوەیە، هەستان و پێکەوە یەکەمین نوێژیان کرد، لەبەرئەنجامی ئەوەوە هەستییان بە بەختەوەرییەکی ڕۆحی گەورە کرد کە وەسفناکرێ، چونکە مرۆڤ کاتێ نوێژ دەکات ئەوا ڕاستەوخۆ لە پەیوەندی ڕاستەوخۆدایە لەگەڵ خوای باڵادەستدا.

## ٥٥. عەلی یەکەمین منداڵە موسڵمان دەبێت

عەلی منداڵێکی خۆشەویست بوو، لە سەرەتای هاتنەخوارەوەی وەحی هێشتا تەمەنی دە ساڵی تێنەپەڕاندبوو، لە ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەگەڵ منداڵەکانی و زەیدی بچوکدا لە ژیانێکی پڕ لە کامەرانیدا دەژیا، بەڵام عەلی دواتر لەو ماڵەدا هەستی بەجۆرێ لە جۆش و خرۆش دەکرد، سەرنجی دەدایە خەدیجە کە لەوپەڕی بەختەوەریدایە، بریسکەو نوورێکی جیاواز لە چاوانی موحەممەدی ئامۆزایدا بەدیدەکات، واهاتە پێشچاوی کە موحەممەد زیاتر لە جاران لەبیرکردنەوەدایە، بۆ کەمێک نەبێ ئیتر خەوی نیە، عەلی ویستی هۆکاری ئەو گۆڕانکارییە جوانە بزانێت.

ڕۆژێکیان، عەلی شتێکی بینی کە پێشتر نەیبینی بوو، موحەممەد و خەدیجەی هاوسەری بینی کە چەند هەڵسوکەوتێکی نامۆ ئەنجامدەدەن، بە بێدەنگ وەستا و کەوتە سەرنجدانیان، ئای ئەو دیمەنە چەندە جوان بوو! بەنێو چاوانیاندا پەیبرد بە ئاستی دڵخۆشبوونیان بەوەی کە ئەنجامی دەدەن، کاتێک تەواوبوون پرسیاری لێکردن: (ئەی موحەممەد، ئەوە چییە؟) موحەممەدیش سەیرێکی عەلی کرد، بۆی دەرکەوت کە خەریکە بانگی دووەم کەس بکات بۆ سەر ئیسلام.

موحەممەد(ﷺ) فەرمووی: ((ئەوە ئاینی خوای گەورەیە کە هەڵیبژاردووە، پێغەمبەرانی بۆ ڕەوانەکردووە، بۆیە منیش تۆ بانگهێشت دەکەم بۆ لای خوای گەورەو بۆ پەرستنی ئەو ئاینەو بە باوەڕنەکردنت بە لات و عوزا)). عەلی بۆ ساتێک بیریکردەوە،

پاشان وەڵامیدایەوە: (ئەوە مەسەلەیەکە لەپێش ئەمڕۆوە نەمبیستووە، من بڕیار لەسەر مەسەلەیەک نادەم تا بە ئەبو تالیب نەڵێم). جا لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بۆ نەهاتبوو کە بانگەوازەکەی ڕابگەیەنێت، عەلی مەسەلەکەی شاردەوەو کەسی لێ ئاگادار نەکرد، پاشان بەدرێژایی شەو بیری لەو ئاینە نوێیە دەکردەوە کە ئامۆزاکەی بانگیدەکات بۆی، دواجار، بڕیاری خۆیدا، بۆ بەیانی ڕۆیشتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێیوت: (ئەی موحەممەد، دوێنی چ داوایەکت لێکردم؟) پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامیدایەوە کە: ((داوام لێکردی شایەتومان بێنی و بڵێیت: أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً رسول الله، باوەڕ بە لات و عوززا نەکەیت و خۆت بەری بکەیت لە هاوەڵگەران و بتەکان)). ئالەوێدا عەلی شایەتومانی هێنا، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو کە عەلی باوەڕی هێنا بە ئیسلام. عەلی بووبە یەکەمین منداڵی موسڵمان لە مێژوودا.

## ٥٦. دوو منداڵی بەختەوەر

عەلی و زەید دوو منداڵی زۆر خۆشبەخت بوون، هەردووکیان لە ماڵی موحەممەدی پێشەواماندا(ﷺ) دەژیان کە خوای گەورە ڕێزی لێگرتووەو کردوویەتی بە پێغەمبەر. لەدوای عەلی زەیدیش موسڵمان بوو، هەردووکیان دڵخۆشبوون بەوەی کە دوو منداڵی موسڵمانن، ئینجا کەوتنە فێربوونی جوانترین و چاکترین ئاین لەسەر ڕووی زەوی، ئاینی ئیسلام، ئەویش لە خودی پێغەمبەرەوە(ﷺ).

عەلی بۆ ساتێکیش لە پێغەمبەری خوا جیانەدەبوویەوە، بۆ هەرکوێ بڕۆیشتایە لە خزمەتیدا بوو، نوێژی لەگەڵدا دەکرد، زۆر لەزەتی لەو هاودەمییە دەبرد، دایکی بیستی کە هەرگیز لە موحەممەد جیانابێتەوەو بەردەوام نوێژی لەگەڵدا دەکات، جا لەبەرئەوە دایکی شتێکی لەبارەی ئیسلامەوە نەدەزانی، هەستی بە ناڕەحەتی دەکرد، ڕۆژێکیان بە ئەبو تالیبی مێردی وت: (ئاگات لە کوڕەکەت بێت، وا هەستدەکەم کاتێکی زۆر لەگەڵ موحەممەد دا بەسەر دەبات، دەترسم تووشی خراپەیەک ببێت).

ئەبو تالیب پیاوێکی تێگەیشتوو بوو، لە ماڵ دەرچوو و ڕۆیشت تا بزانێ چی دەگوزەرێ، ئەوەی زانی کە موحەممەد و کوڕەکەی پێکەوە چوونەتە دەرەوە، گەڕا بەدوایاندا تا لە دۆڵێکی دەرەوەی مەککە دۆزینەوە کە خەریکبوون نوێژیان دەکرد، بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی تێبڕین و چاودێری کردن، دوای ئەوە کە نوێژەکەیان تەواوکرد، لێیان نزیکبوویەوەو پرسیاری لێکردن: (ئەوە خەریکی چین؟) پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک نەریتی خۆی ئاگاداری کرد بە

ڕاستێتی مەسەلەکەو پێیوت کە نوێژ دەکەن، پاشان بانگیکرد بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، بۆ پەرستنی خوای تاک و تەنها.

ئەبو تالیب باش دەیزانی کە برازاکەی هەرگیز درۆ ناکات، بەڵام لەبەرئەوە کە ڕای خەڵکی لەلای ئەو گرنگ بوو، وەڵامیدایەوە بە: (ئەوەی ئێوە دەیڵێن خراپی تێدا نیە، بەڵام من ناتوانم واز لە ئاینی باوباپیرانم بێنم، ئێوە لەسەر ئاینی نوێی خۆتان بمێننەوە. هەتا من زیندووبم کەس ناتوانێت ئازارتان پێبگەیەنێت).

## ٥٧. ئەبوبەکر، هاوڕێ دڵسۆزەکە

**(زانایان ڕا جیاوازن لەوەی کامیان زووتر موسڵمانبووە، ئەبوبەکر یان عەلی، ئەوەش مەسەلەیەک نیە زیانی هەبێت).**

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێشتا بەشێوەیەکی ئاشکرا دەستی نەکردبوو بە بانگەوازکردن بۆ ئیسلام، بەڵام زۆربەی خەڵکی ئەو هەواڵەیان بیستبوو چونکە کەوتبوونە گواستنەوەی لەنێوان خۆیاندا، ئەوەیان زانی کە بانگەواز بۆ ئاینێکی نوێ دەکات.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هاوڕێیەکی هەبوو خۆشدەویست و متمانەی زۆری پێی هەبوو، ناوی ئەبوبەکر بوو، ئەبوبەکر کەسێک بوو نە درۆی دەکردو نە ئازاری کەسی دەدا، بەڵکو کەسێکی ڕاستگۆ و بەڕێزو ئەمین بوو، هیچ جۆرە ڕق و کینەیەکی لە دڵیدا بەرانبەر بە کەس هەڵنەگرتبوو، هەمیشە ئاشتەوایی دەکرد لەنێوان کەسە ناکۆک و بەشەڕهاتووەکاندا، هەرکات خەڵکی مەککە ڕووبەڕووی گرفتێک ببوونایە داوای ئامۆژگارییان لێدەکرد، لەدوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دووەمین کەسی قورەیش بوو کە لە هەموویان زیاتر ئەمانەتپارێزتر بوو.

ئەبوبەکر کەسێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، زۆربەیجار بۆ بازرگانیکردن سەفەری دەکرد بۆ دەرەوەی مەککە، کاتێ موحەممەد بووە پێغەمبەر(ﷺ)، ئەبوبەکر لە دەرەوەی مەککە بوو، کاتێ گەڕایەوە، دراوسێکانی چوونە لای و پێیانوت: (ئەی ئەبوبەکر مەسەلەکە گەورە بووە، هەتیوەکەی ئەبو تالیب دەڵێ گوایا ئەو

پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، ئەگەر لەبەر تۆ نەبوایە چاوەڕێی ئەومان نەدەکرد، ئێستەش کە تۆ هاتوویتەوە ئەوە تومان بەسە کە چیدەکەیت).

ئەبوبەکر ئەو قسەوباسەی پێ سەیر بوو، ڕاستەوخۆ هەستاو ڕۆیشت بۆ لای هاوڕێکەی، پێغەمبەری خوا بە ڕوویەکی زەردەخەنە ئامێزەوە پێشوازی لێکرد، وا ڕاهاتبوو کاتێ بانگی پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد دەیوت ئەبولقاسم، چونکە کوڕە گەورەکەی پێغەمبەر(ﷺ) ناوی قاسم بوو، پێیوت: (ئەی ئەبولقاسم، کەسوکارتت لەدەستداوە، ئاینی باو و باپیرانت وازلێهێناوە؟ پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی هاوڕێکەیی کردو فەرمووی: ((ئەی ئەبوبەکر، من پێغەمبەری خوام بۆ تۆ و بۆ هەموو خەڵکی نێردراوم، دەی کەواتە تۆش باوەڕ بە خوای گەورە بکە)).



ئەبوبەکر بە خۆشەویستییەکەوە سەیرێکی موحەممەد پێغەمبەری(ﷺ) کرد کە متمانەیەکی زۆری پێی هەبوو، متمانەی ئەبوبەکر بە پێغەمبەر بێسنور بوو، چونکە تا ئەو ڕۆژە درۆیەکی لێنەبیستبوو، جا ئەگەر ئەوەشی بفەرمویێ ئەوا هەر ڕاست دەفەرمویێ و گومانی تێدا نیە، هەر زوو دەستوبرد، وتی پێی: (دەستم بدەرێ، من دەڵێم أشهد أن لا إلـه إلا اللـه وأنّـك رسـول اللـه). پێغەمبەری خوایش(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو بە موسڵمانبوونی هاوەڵەکەی، سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەری.

ئەو کەسانەی ئەبوبەکریان نارد تا موحەممەد لە بانگەوازەکەی بوستێنن زۆر لایان سەیر بوو کاتێ زانیان کە ئەبوبەکر باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، چونکە ئەو دووەمین کەسە کە ئەوان خۆشیاندەویست و متمانەیان پێی هەبوو، وا ئەویش موسڵمان بوو.

## ٥٨. ئیسلامە جوانەکەمان

بازنەی باوەڕداران وردە وردە بەرەو فراوانبوون دەچوو، ئیسلام لەسەر دەستی ئەبوبەکر لەنێو پیاواندا، خەدیجەش لەنێو ئافرەتاندا، عەلی و زەیدیش لەنێو منداڵاندا بڵاوەیکرد.

خەڵکی ئەم ئاینە نوێیەیان زۆر خۆشدەویست، دڵخۆشبوون چونکە ئیسلام هەمووی موسڵمانان بە براو خوشکی یەکتری دەزانی، ئیتر لەمەودوا، خەڵکی لەگەڵ یەکتریدا وەک یەک خێزان پێکەوە دەژین بێئەوەی ئازاری یەکتری بدەن، جگە لەوەش ئیسلام ماقی ئازادیی بە هەموو کەس بەخشیوە، ئیتر ئافرەتان بن یان منداڵان یان گەنج یان کۆیلە بن چوونیەکە، تەنانەت ڕێگانەدراوە ئازاری ئاژەڵانیش بدری، ئیسلام خەڵکی فێرکرد چۆن ڕێز لە کەسە بەتەمەنەکان بگرن، هەروەها خۆشەویستی و سۆزێکی زۆری بە منداڵان بەخشیوە، ئای لە جوانی و قەشەنگی ئەو ئاینە کە فەرمانیداوە بە ئازادکردنی کۆیلەکان، بە ڕێزگرتنی ئافرەتان، بە خۆشویستنی منداڵان.

ئەو سەردەمەش وەک هەموو سەردەمەکانی تر، لەو قۆناغەدا کەسانی خراپەکار هەبوون کە هەژارانیان دەچەوساندەوە، نەدارانیان لە خۆیان دووردەخستنەوە، خاوەن پێویستییەکانیان بە هەل دەقۆستەوە وەک بڵێی ئەوانە کۆیلەی ئەوان بن، ڕێگایان بە خزمەتکارەکانیان نەدەدا بەبێ مۆڵەتی گەورەکانیان هیچ شتێک ئەنجامبدەن، بەڵام خوای باڵادەست دەیەوێت هەموو خەڵکی بەوپەڕی خۆشەویستی و ڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ یەکتریدا

بکەن، بەو هۆیەوە، موحەممەد پێغەمبەری(ﷺ) ڕەوانەکردو ڕایسپارد کە هەستێ بە هیدایەتدانی خەڵکی بۆ سەر ئاینی ئاشتی و خۆشەویستی و برایەتی. هەر هەمووی خەڵکی یەکسانن لەبەردەم خوای گەورەدا، پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بە هەموو هێزو توانای هەوڵی جێبەجێکردن و چەسپاندنی ئەو پرەنسیپانەی دەدا.

## ٥٩. موسڵمانبوونی بیلال

بیلال بەندەیکی ڕەشپێست بوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست و هەر زۆر زوو باوەڕی پێکرد، لەبەردەم ئەو خێرا بڵاوبوونەوەیەی ئاینی نوێدا، بێباوەڕان، ئەوانەی بتەکانیان دەپەرست، زۆر نارەحەتبوون و ئارامیان لێبڕا، هەربۆیە کۆبوونەوەو بەدرێژی و بە وردی کەوتنە تاوتوێکردنی مەسەلەکە، دواجار بڕیاریاندا هەموو ئەوانە بخەنە ژێر ئازارو ئەشکەنجەوە کە باوەڕیان بە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هێناوە، نەیاندەتوانی ئازار بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگەیەنن، چونکە ئەبو تالیب خاوەنی پێگەو کەسایەتییەکی گەورە بوو لەناویاندا.

گەورەکەی بیلال کەسێکی بێباوەڕو هاوەڵگەر بوو، هیچ جۆرە بەزەییەک لە دڵیدا نەبوو، کاتێ زانی کە بیلال موسڵمانبووە، خواردن و خواردنەوەی لێ قەدەغەکرد تا ناچاری بکات لەو ئاینە تازەیە پاشگەز ببێتەوە، بەڵام بیلال نەکەوتە ناو ئەو تەڵەیەوە، ئەوکات، گەورەکەی گوریسێکی بەست بە دەوری ملیداو بەسەر زەویدا ڕایدەکێشا، بیلال توانی بە ئاسانی بەرەنگاری ئەو ئەشکەنجەیە ببێتەوە چونکە خواو پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست. گەورەکەی سەری سوڕماو ئەوەندەیتر ڕقی لێهەڵگرت، ڕۆژێکیان، بیلالی لەسەر لمی سوتێنەری بیابان ڕاکێشاو تاوێرێکی گەورەی خستەسەر سکی، ئینجا، پێیوت: (ناوی لات و عوززا بێنە)، بیلالیش لە تاو ئازاری زۆر لەژێر بەردەکەو گەرماکەدا دەیناڵاند، بەڵام هەر دەیوت: (أحدٌ، أحد). ئا لەو ساتە هەستیارەدا ئەبوبەکر بەوێدا

تیپەڕی، موسڵمانانیش یەکتریان زۆر خۆشدەویست، لەبەرئەوە کاتێ براکەیی بینی کە لەژێر ئازارو ئەشکەنجەدایە، زۆر تورە بوو، ڕاستەوخۆ چووە لای گەورەکەی بیلال و پێیوت: (ئەوە لە خوا ناترسیت بۆ وادەکەیت لەو داماوە؟ تاکەی ئاوا ئازاری دەدەیت؟)، گەورەکەی بیلال وەلامیدایەوەو وتی: (ئەوە تۆ ئاوا تێکدتداوەو خراپتکردووە، دەی ڕزگاری بکە لەوەی دەیبینی).

لەو ڕۆژەدا کۆیلەکان دەکڕدران و دەفرۆشران، کاتێک کەسێک هەڵدەستا بە کڕینی بەندەیەک ئیتر دەبووە گەورەی ئەو بەندەیە، ئالەوێدا ئەبوبەکر پرسیاری لێکرد: (تۆ لەبەرانبەر ئازادکردنی بیلالەوە چیت دەوێت؟). گەورەکەی وتی: (سێ بەندەو بڕێکی زۆر پارە). ئەبوبەکر وەلامیدایەوە: (ئەوەی داوای دەکەیت دەتدەمێ). ئینجا چوو بیلالی لەژێر تاوێرەکەدا دەرهێنا.



پاشان پێکەوە ڕۆیشتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەریش دەستیکردە ملی بیلال و ماچیکرد چونکە ئەشکەنجەی زۆری لەپێناو ئیسلامدا توشبوو، ئەبوبەکر وتی: (ڕزگارمکرد، بۆ هەرکوێ دەیەوێت دەتوانێ بڕوات). ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەوپەڕی خۆشییەوە سەیرێکی بیلالی کرد، بەڕاستی شادمانی بیلال لەو ساتەدا وەسفناکرێ، عومەری کوڕی خەتتاب -لەدوای موسڵمانبوونی- دەیوت: ئەبوبەکر گەورەمانەو گەورەکەمانی ئازادکردووە! مەبەستی بیلال بوو -خوا لێی ڕازی بێت-. لە ئایندەدا پێغەمبەر(ﷺ) ئەرکێکی زۆر گەورە بە بیلال دەسپێرێ، بیلال خاوەنی دەنگێکی زۆر خۆش بوو، بەو هۆیەوە، دەبێتە یەکەمین بانگبێژ کە موسڵمانان بانگدەکات بۆ نوێژکردن، بۆ سەدان ساڵی ئایندەش هەر هەمان بانگدان لە سەرتاسەری جیهاندا بۆ نوێژکردن دەوترێتەوە.

## ٦٠. دە مام و شەش پور

ڕێنماییەکانی قورئانی پیرۆز زۆر جوان و نایابن، خەڵکی بانگدەکەن بۆ چاکەکاریی و جوان هەڵسوکەوتکردن، خوای گەورە تیایاندا مژدەی بەهەشت بە باوەڕداران دەدات، هاوکات ئەو شتە جوانانەیان بۆ وەسفدەکات کە بۆی دروستکردوون، هەروەها ئاگاداریان دەکات کە چەندەی خۆشدەوێن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەوڵیدا بە خێراترین شێوە هەموو ئەوانە بۆ خەڵکی باسبکات، بەڵام لای ئاسان نەبوو بێت قەومەکەی بانگهێشت بکات بۆ سەر ئاینە نوێیەکە، چونکە زۆرێکیان ناڕازی بوون بەوە، جا بۆئەوەی ئەو مەبەستە بەئەنجام بگەیەنێت، پێویستی بە هێزێک و پشتگیریکردن بوو، لەو ڕۆژانەدا، ئەو کەسانەی کە خاوەنی خانەوادەی بەهێزبوون بە ئارامی و ئاسودەیی دەژیان باکیان بە کەس نەبوو، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) خاوەنی دە مامە بوو، ئەگەر هەموو ئەوانە هاوکاری بکەن ئەوا مەسەکە لەسەری زۆر ئاسان دەبێت، بەڵام زۆربەیان کەسانی قیرسیچمەو دڵڕەق بوون، وا ڕاهاتبوون کە هەمیشە قسەی خراپ و ناشیرین لە زاریان بێتەدەرو تاوانیان ئەنجامدەدا، لە سەرووی هەموویانەوە ئەبو لەهەبی مامی بوو. ئەبو لەهەب مانای خۆشەویستی نەدەزانی، بۆ ڕۆژێکیش لە مانای خۆشەویستی نەگەیشتبوو، دڵی لە بەرد ڕەقتر بوو.

بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەمانکاتدا خاوەنی چەند مامەیەکی چاک بوو، یەکێکیان عەبباسی مامی بوو، عەبباس هاوڕێیەکی نزیکی بوو، چونکە هەردووکیان لە یەک نەوە بوون، پێکەوە گەورە

بووبوون، عەبباس موحەممەدی(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، جگە لە عەبباس ئەبو تالیب و حەمزەیش دوو مامی تری پێغەمبەر(ﷺ) بوون کە زۆریان خۆشدەویست، ڕێگایان بە هیچ کەس نەدا بە ڕادەی تاڵەموویەک ئازاری پێغەمبەر(ﷺ) بدات، بە هەموو توانایان بەرگرییان لێکرد، پورەکانیشی بەهەمانشێوە وەک یەکێک لە کوڕەکانی خۆیان هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا دەکرد، زۆر متمانەیان پێی هەبوو، دە مامە و شەش پوری هەبوو! پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاریکرد ئایا کامیان پشتگیری لێدەکەن؟

## ٦١. چاکترین پیاوی قورەیش موسڵمان دەبێ

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەپێناو بەجێگەیاندنی ئەرکەکەی شەو و ڕۆژی دەدایە دەم یەک بێئەوەی بێڵێ یەک سات لە کاتی لەدەستبدات، دەیویست ئەو فەرمانانەی لە خوای گەورەوە پێیدەگات بە زووترین کات بیانگەیەنێت بە خەڵکی، ئەبوبەکری هاوڕێی هاوەڵێکی هەبوو ناوی عوسمان بوو، عوسمان بەوە ناسرابوو کە کەسێکی زۆر بە شەرم و بە حەیا بوو، لە هەمانکاتدا زمانپاراو و سیما جوان بوو، هاوکات کەسێکی بەخشندەش بوو، ئەبوبەکر عوسمانی هاوەڵی بانگهێشت کرد بۆ سەر ئەو ئاینە نوێیە کە موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) هێناویەتی، باسی جوانی و گەورەیی ئیسلامی بۆ کرد، لە ناخی دڵیەوە حەزیدەکرد عوسمان موسڵمان ببێ، ڕۆژێکیان، پێکەوە هاتن بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەریش بە زەردەخەنەو ڕووخۆشییەوە پێشوازی لە عوسمان کرد، ئینجا باسی ئیسلامی بۆ کرد، عوسمانیش زۆر ئەو ئاینە نوێیە چوو بەدڵیدا، ڕاستەوخۆ شایەتومانی هێنا، وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن محمداً عبده ورسوله). چونکە خەڵکی بە وتنی ئەم شایەتومانە دەبنە موسڵمان.

دوای موسڵمانبوونی عوسمان، هەواڵی خەوێکی خۆی بە پێغەمبەر(ﷺ) دا کە لە سەفەرێکیدا بینیبووی، پێیوت: (جارێکیان بۆ ماوەیەک لە دەرەوەی مەککە بووم، کاتێ لە ڕێگادا پشویەکماندا خەو بردینیەوە، دەنگێک هاتە گوێم دیوت: ((ئەی خەڵکینە بەئاگابێنەوە! پێغەمبەرێک هاتووە بۆ مەککە، ناوی ئەحمەدە)). ئەحمەد یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، عوسمان بەردەوامبوو لەسەر

قسەکانی و وتی: (ئەوکات هیچ تێنەگەیشتم، بەڵام کاتێ گەڕامەوە بۆ ئێرە، ئیتر بۆ مەعلوم بوو ئەو پێغەمبەرە تۆیت).

عوسمان لەوپەڕی بەختەوەریدا بوو، وا هەستیدەکرد کە هەمووی دنیای دەستکەوتووە، بەڕاستی ئەقڵ و دڵ و ڕۆحی پڕبوو لە خۆشەویستی ئەو ئاینەو لەو پێغەمبەرەی هێناویەتی. ڕۆژێکیان، مامی بیستبووی کە عوسمان موسڵمانبووە، زۆر زۆر تورە بوو، ئینجا هەستا بەستییەوە بە یەکێک لە کۆڵەکەکانی خانووەکەوە، دواتر پێیوت: (کەواتە، تۆ خواکانمانت وازلێهێناوە و کەوتوویتەتە پەرستنی خوا، تۆ باوەڕت هێناوە بەوەی موحەممەد هێناویەتی، ئەی وانیە؟ بەرت نادەم تا واز لە ئیسلام نەهێنی و نەگەڕێیتەوە بۆ سەر ئاینی باو و باپیرانت).

عوسمان پیاوێکی ئازاو جوامێر بوو، هیچ کەس ناتوانێت ناچاری بکات واز لە باوەڕی تازەی بێنێت، وەڵامی مامەیی دایەوە کە: (سوێند بەخوا هەرگیز واز لە ئیسلام ناهێنم). کاتێ مامەی پەی بەوەبرد کە نایەوێت واز لە ئیسلام بێنێت، وازی لێهێنا بڕوات بەڕێی خۆیەوە، عوسمان وایلێهات کاتەکانی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەسەر ببات، بڕیاریدا هەموو ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەبەر بکات، خوای گەورە لە یەک کاتدا چەند ئایەتێکی قورئانی لە ڕێگای جبرەئیلی فریشتەی وەحییەوە(ﷺ) دادەبەزاندە سەر پێغەمبەر(ﷺ)، قورئان بە یەکجار نەهاتووەتە خوارەوە ئەوەش بۆ ئەوەیە تا هاوەڵان بتوانن وردە وردە لەبەری بکەن، عوسمان کەوتە لەبەرکردنی ئایەتەکان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو بەو هەوڵەی عوسمان دەیدات و بەو ڕەوشتە بەرزەی. عوسمان کەسێکی زۆر بەشەرم و بە حەیا بوو ئەوەش بە ئاستێک بوو کاتێ ئاخاوتنی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد شەرمی دەکرد لەوەی سەیری ناوچاوانیان بکات، لێرەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕوقیەی کچی کردە

هاوسەری ئەم پیاوە ڕەوشتبەرزە، عوسمان بووە زاوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، ئای ئەوە چ شەرەفمەندییەکی گەورەیە! ڕوقیە و عوسمان ژیانێکی بەختەوەریان هەبوو، عوسمان ئەوەی لە توانایدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام درێغی نەکرد. لێرە بەولاوە ئیتر پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتەنها نیە. جگە لە ئەبوبەکری گەورەمان عوسمانیش کەوتە یارمەتیدان و پشتگیریکردنی.

## ٦٢. جوانترینی ناوەکان

بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان، تا دەهات بازنەی خۆشەویستی و برایەتی لە دەوری پێغەمبەری خوا(ﷺ) فراوانتر دەبوو، ئەوەش لەنێوان ئەو کەسانەدا کە دەهاتن بەدەم بانگەوازی ئیسلامەوە، کەسێک هەبوو بە ناوی عەبد عەمرو، یەکێک بوو لە هاوڕێکانی ئەبوبەکر، ئەبوبەکر لەگەڵ خۆی هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئیسلامی پێناساند، ئیتر لەو ساتە بەولاوە بۆ یەک ساتیش لە پێغەمبەر(ﷺ) جیانەدەبوویەوە، گوێبیستی هەر وشەیەک بوو لە زاری پیرۆزی دەهاتەدەر.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزیدەکرد موسڵمانان ناوی جوانیان هەبێت، هەربۆیە ناوی عەبد عەمرو نەچوو بەدڵیدا، چونکە ئەو ناوە هەڵگری واتای بەندایەتیکردنی بۆ مرۆڤەکان تێدایە، لەڕاستیدا تەنها خوای گەورە خۆی شایستەی پەرستنە، بۆیە، ناوی گۆڕی بۆ عەبدوڕەحمان، ڕەحمانیش یەکێکە لە نەوەدو ناوە پیرۆزەکەی خوای گەورە. ئیتر لەوەدوا خەڵکی بەو ناوە نوێیەوە بانگیان دەکرد کە ئاماژەیە بۆ ئاستی خۆشەویستی خوای گەورە بۆ بەندەکانی و بەزەیی زۆری بۆیان.

عەبدوڕەحمان ناوە نوێیەکەی خۆیی زۆر لا خۆشەویست بوو، بە ڕەزامەندییەکی زۆرەوە سەیرێکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد، ئێستە ئیتر ئەو لەگەڵ ناوێک و ئاینێکی نوێدا، بووەتە کەسێکی نوێ.

## ٦٣. مەڕێکی بچوک شیر دەدات

ڕۆژێکیان، عەبدوڵڵەی کوڕی مەسعود کە شوان بوو مەڕەکانی برد بۆ لەوەڕگا، مەڕەکان بە هەڵپە کەوتنە خواردنی گژوگیا، لە کاتێکدا عەبدوڵڵە دانیشتبوو و بێدەنگی چاودێری دەکردن، لەناکاودا، پێغەمبەری خواو(ﷺ) ئەبوبەکری هاوەڵی لەولاوە هاتن، عەبدوڵڵە سڵاوی لێکردن، ئەبوبەکر پێیوت: ((کوڕەکە، ئا لەو مەڕانە ئەوەندە شیرمان بۆ بدۆشە تینویەتیمان بشکێنێ، ڕەگەکانی جەستەمان تەڕبکات))، عەبدوڵڵە وتی: (شتی وا ناکەم، مەڕی من نین، من ئەمینداریانم). کاتێ ئەو وەڵامەی بیسترا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێکرد مەڕێکی نیشانبدات کە هێشتا نەگەیشتبێتە ئاستی شیردان، عەبدوڵڵە گەڕا بەدوای مەڕێکی بچوکداو بۆی هێنا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزیککەوتەوە لە مەڕەکەو بەدەم ناوهێنانی خوای گەورەوە دەستی پیرۆزی دەهێنا بەسەر گوانیدا، عەبدوڵڵە زۆر بە سەرسوڕمانەوە دەیڕوانی و لە دڵی خۆیدا دەیوت جا مەڕی بچوک چۆن شیر دەدات؟ بەڵام زۆری نەخایاند تا گوانی مەڕەکە ئاوساو شیرێکی زۆری لێهاتەدەر، هەموویان لێیانخواردەوە تا تینویەتیان شکا.

لەدوای ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیرێکی گوانی مەڕەکەی کردو پێی فەرموو: ((بێرەوەیەک)). ئەویش هاتەوەیەک و وەک جارانی لێهاتەوە. عەبدوڵڵە لەژێر ئەم بەرکەوتەدا مایەوەو بۆ چەند ڕۆژێ ئەوەی کە بینی لەبیری نەدەچوویەوە، دواجار، گەڕا بەدوای پێغەمبەری خوادا(ﷺ) و دۆزییەوە. پێغەمبەریش بە خۆشییەوە

پێشـوازی لێکـردو بانگهێشـتیکرد بۆسـەر ئیسـلام، لەڕاسـتیدا دەمێک بـوو عەبدواللـە بڕیـاری خـۆی دابـوو، ڕاسـتەوخۆ موسـڵمانبوو، لـە خـودی پێغەمبـەری خـواوە(ﷺ) فێـری قورئانخوێنـدن بـوو، بڕیاریـدا پەڕاوەکـەی خـوای گـەورە لەدڵیـدا لەبـەر بـکات، بەڕاسـتی ئەوپـەڕی بەختەوەریـی ڕاسـتەقینەی لـە نزیکـی پێغەمبـەری خـواوە پێبەخشـرا.

## ٦٤. دروشمی سڵاوکردن لەنێو موسڵماناندا

زۆرجار خوای گەورە سەلامی زاتی خۆی دەنارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەرکات جبرەئیل(ﷺ) بهاتایە بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، سەلامی خوای گەورە دەگەیاند پێی.

جارێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ خەدیجەی هاوسەریدا بوو، جبرەئیل هاتە خزمەتی، بەڵام خەدیجە نەیتوانی بیبینێ، لەدوای ڕۆیشتنی فریشتەی وەحی، پێغەمبەر(ﷺ) بە خەدیجەی فەرموو: ((ئەی خەدیجە، ئەوە جبرەئیلە سەلامی پەروەردگارت پێدەگەیەنێ)).

خەدیجە زۆر زۆر دڵی بەو هەواڵە خۆشبوو، کە خوای گەورە سەلامی خۆی ناردووەتە سەر خەدیجە، ئەمەش بەڵگەی خۆشویستنیەتی بۆی، ئیتر لێرە بەولاوە، بەوپەڕی لەخۆبوردن و دڵسۆزییەکی گەورەوە دەیپەرستێت، ئەویش وەڵامی سەلامەکەی دایەوەو وتی: (خوا خۆی سەلامە، سەلام لەوەوەیە، سەلام لەسەر جبرەئیلیش بێت).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەوڵیدا سڵاوکردن لەنێوان موسڵماناندا بڵاوبکاتەوە، چونکە خوای باڵادەست ویستی وابوو کە موسڵمانان بەو شێوازە سڵاو لەیەکتری بکەن.

بەمجۆرە پێغەمبەر(ﷺ) فێرمان دەکات کە هەرکات بەیەکگەیشتین سەلام لەیەکتری بکەین و بڵێین: (السلام علیکم ورحمة الله وبرکاته)، واتە سەلام لە تۆ و لەو دوو فریشتەیە کە لەسەر هەردوو شانی تۆن، ئینجا کەسی بەرانبەریش بڵێت: (وعلیکم السلام ورحمة الله وبرکاته).

سـەلام لـە هەناویـدا کۆمەڵێ واتـای جوانـی لەخۆگرتـووە، لەوانـە جوانیی، خێرو چاکە، برایەتی، جا بەو هۆیەوە دادەنرێت بە هێمایەکی گرنـک لەنێـوان موسـڵمانانندا، هەرکەسـیش واتـای جوانـی (سـەلام) نەزانێت، ئـەوا لـە چییەتی سـەلام تێناگات، بەڵام ئەوانـەی کە دەیزانن هەوڵدەدەن لـە هەمـوو جێگایـەک بڵاویبکەنـەوە، کاتێ موسـڵمانان لـە شـەقامدا یـان لـە ماڵدا بەیەکدەگـەن، هەندێکیـان سـەلام لـە هەندێکی تریـان دەکـەن، بـەو سـەلامەش ئەو پەیوەندییانـەی نێوانیـان بەهێزترو پتەوتـر دەبێت.

## ٦٥. جوانیی دروشمی بەناوی خوای گەورە (بسم الله)

خـوای گـەورە ئـاوی سـازگاری بـۆ بەدیهێناویـن کـە لـە نێو شاخەکانەوە هەڵدەقوڵێ، لە لق و پۆپی درەختـەکان جۆرەهـا میوەی بەتام و بەلەزەتی بۆ ڕواندووین، زەوی بۆ بەدیهێناوین و نیشتەجێی کردوویـن تیایـدا، بـۆی ڕازاندووینەتـەوە، هەروەهـا جۆرەهـا ڕزق و ڕۆزی پێبەخشـیوین کـە لـە ژمـارە نایـەن. لەبەرانبـەرەوە ئـەوەی لـە ئێمـە دەوێ بیپەرستین و نـاوی زاتـی بهێنین، بـەو هۆیـەوە، هەرگیـز نـاوی پیرۆزی (اللـە) لەسـەر دوو لێوی پێغەمبـەر(ﷺ) جیانەبۆتـەوە لـە هەمـوو بۆنەیەکدا سوپاسـی خـوای گـەورەی دەکـرد لەسـەر ئـەو نیعمەتانـەی پێبەخشـیوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی وا ڕاهێنابوو کە هـەر کارو فەرمانێکی بکردایـە سـەرەتا نـاوی خـوای گـەورەی لەسـەر دەبـرد، لەپێش دەستکردن بە خواردن و خواردنەوە دەیفەرموو (بەنـاوی خوا -بسم اللـە-)، هـەرکات بیویسـتایە بخـەوێ یـان بەیانیـان لەسـەر جێگاکـەی هەسـتایە نـاوی خـوای گـەورەی دەبـرد، یـان هـەرکات بێتـەوە نـاو ماڵەکـەی، بـۆ ساتێکیش بەدیهێنەرەکەیی لەبیر نەدەچوو بەڵکو زۆر لەزەتی دەبرد لە ناوهێنانی، داوای لە موسڵمانانیش کردووە هەمان شـت بکـەن، چونکـە ئـەوە هـەر زاتـی خـوای گەورەیـە ئـەم هەمـوو نیعمەتـەی بەخشـیوە پێمـان، خـوای گـەورە هەروەهـا دەمانپارێـزێ و چاودێریمـان دەکات، تەنانـەت دەزانێـت چەندجـار هەناسـە دەدەیـن، بۆیـە لەبـەر ئـەم هەمـوو هۆیانـە پێویسـتە مـرۆڤ نـاوی ئـەو زاتـە بهێنـێ و سوپاسـی بـکات لەسـەر نیعمەتەکانـی.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووبە پێشەنگی هەمووی خەڵکی، داب و نەریتە جوانەکانی بوونە مایەی بەدڵاچوونی موسڵمانان، بۆیە کەوتنە چاولێکردنی لە هەموو شتێکدا کە دەیکرد، هەرکات بیانویستایە خواردن بخۆن، یان بخۆنەوە یان بخەون یان ڕێبکەن یان ئاخاوتن بکەن دەیانوت بەناوی خوای گەورە، هەرکەسیش باوەڕی بە ئیسلام بهێنایە، خۆی دەڕازاندەوە بە ڕەوشتجوانی و ڕەفتار شیرینی و دڵفراوانیی، موسڵمانان فێربوون بەردەوام سوپاسی خوای گەورە بکەن لەسەر ئەو نیعمەتانەی پێیبەخشیون، چونکە سوپاسکردن واتە ڕێزی ئەو نیعمەتانە دەگرین کە لەزەتیان لێدەبەین. هەروەها فێری ئەوەش بوون کە سوپاسی یەکتریش بکەن، ئەوەیان لا مەعلوم بوو کە ناوهێنانی خوای گەورەو سوپاسکردنی تاکە بەختەوەریی ڕاستەقینەیە.

## ٦٦. یەکەمین بانگەوازکردن

هەواڵی بوون بە پێغەمبەریی موحەممەد(ﷺ) بڵاوبوویەوە، ژمارەی باوەڕداران ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبوو، بەڵام هەموو شتێک بە نهێنی مایەوە، چونکە هێشتا پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی فەرمانی ئاشکراکردنی ئاینەکەی لە خوای گەورەوە پێنەگەیشتبوو، ڕۆژێکیان، جبرەئیل(ﷺ) هات و پێغەمبەری خوای(ﷺ) بە فەرمانی خوای باڵادەست ئاگادارکرد کە: ﴿وَأَنذِرۡ عَشِيرَتَكَ ٱلۡأَقۡرَبِينَ﴾ (الشعراء: ٢١٤)

ئا ئەوەتا فەرمانی چاوەڕوانکراو گەیشت، کاتی ئەوە هات پێغەمبەرایەتی ڕابگەیەنرێ.

## ٦٧. پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر کێوی صەفا

پێغەمبەر(ﷺ) لەدوای ئەوە کە خزمەکانی بانگهێشت کرد بۆ سەر ئیسلام، ئەمجارەیان بڕیاریدا بە ئاشکرا خەڵکی بانگبکات بۆ سەر ئیسلام، ئەویش لە بۆنە گرنگەکانی مەککەدا، عادەت وابوو خەڵکی مەککە دەڕۆیشتنە سەر کێوی صەفاو لەوێ بانگی یەکتریان دەکرد، ڕۆژێکیان، یەکێکیان چووە سەر کێوی صەفاو کەوتە هاوارکردن و دەیوت: ((ئەی زووخێزان، بەئاگایان!)) هەر زۆر زوو خەڵکی ڕوویانکردە ئەو شوێنە تا گوێبیستی ئەوە بن کە دەیەوێ بیڵێ. ئەو پیاوە کێیە لەسەر کێوی صەفا وەستاوە؟ دەیەوێ چی بڵێ؟ ئایا هێرشکراوەتە سەر شارەکە؟ ئایا شەڕ ڕادەگەیەنن؟ خەڵکی بە مەبەستی زانینی ڕوداوەکە بە ڕاکردن ڕۆیشتن. خێرا لە دەوری کێوەکە کۆبوونەوە.

ئەو پیاوەی لەسەر کێوی صەفا وەستابوو کەسێکە کە متمانەیان پێی هەیەو خۆشیاندەوێ، بە سەرسوڕمانەوە هاواریان کرد: (ئەوە چیتە؟) ئەویش بە دەنگێکی لێبڕاوانەو بەرزەوە وتی: ((ئایا ئەگەر ئاگادارتان بکەم کە دوژمن لە بەرەبەیاندا یان لە ئێوارەدا هەڵیکوتاوەتە سەرتان، ئایا باوەڕتان پێنەدەکردم؟ تا ئەو ڕۆژە ڕووینەداوە کە درۆیەکی لێببیستن، هەموویان بە یەکدەنگ وتیان: (بەڵێ). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (من ئاگادارکەرەوەی ئێوەم و سزایەکی سەخت لە بەگوێنەکردن بەڕێوەیە)). لە کتوپڕدا هەر هەموویان بێدەنگبوون، چونکە پێشبینی شتی لەوجۆرەیان نەدەکرد، زۆربەیان لەناخەوە باوەڕیان بەوە هەبوو کە پێغەمبەر(ﷺ)

دەیفەرموو، بەڵام هەندێ لە کەسە دڵڕەقەکان لەدژی وەستانەوە، یەکەمینیان ئەبولەهەبی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، لە تاو تووڕەیی خۆی چاوانی سوورهەڵگەڕابوون، تەنانەت بەردێکی هەڵگرت و فڕێدایە سەر کێوی صەفا، پاشان هاواریکرد و وتی: (بە فەوتان چیت، ئایا بۆ ئەمە بانگتکردووین؟) پێغەمبەر(ﷺ) زۆر ئازاری پێگەیشت لەو ڕەفتارەی ئەبو لەهەب، بەڵام ئەو پێشبینی ڕوودانی ئەو هەڕەشە سەختانەی دەکرد، چونکە ئەو ئەرکەی پێی سپێردرابوو ئەرکێکی مەزن بوو، هێشتا قەومەکەی ڕاستێتی ئەو مەسەلەیەیان نەدەزانی. پێغەمبەر(ﷺ) پەی بەوەبرد کە ئەبو لەهەبی مامی کەسێکی وشک و دڵڕەقە. بۆیە بە چاوێکی بەزەییەوە سەیری دەکرد، پاشان بە دڵئاسودەیی شوێنەکەی جێهێشت چونکە توانی خەڵکی لە تاکو تەنهایی خوا ئاگادار بکات، لەدوای بانگهێشتکردنی خزمەکانی، بۆ یەکەمجار ئا بەوشێوازە، مژدەی ئاینی نوێی دا بەگوێی خەڵکیدا.

## ٦٨. پێغەمبەرێکی زۆر ئارامگر

ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بیرکردنەوەدا ڕۆچوو بوو، مێشکی سەرقاڵبوو بە جێبەجێکردنی ئەو ئەرکەی لە سەرشانیەتی بە باشترین شێوە، پێویستە هەمووی خەڵکی بزانن کە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، لەو کاتەدا لە دەرەوەی مەککە ڤیستیڤاڵێکی گەورە بە ناوی (بازاڕی عوکاز) ڕێکدەخرا، خەڵکی تیایدا شتی جۆراوجۆریان دەکڕی و دەفرۆشت، هەروەها نمایشی بەسەربردنی کاتی خۆشی تیایدا ئەنجامدەدرا، ئەو ساڵە، بازاڕەکە سەرلەنوێ قەڵەباڵغ بوو بوو، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەوێ ئامادەبوو، بۆئەوە هاتبوو ڕێنمایی خەڵکی بکات بۆ لای خوای گەورە، تا ئاگاداریان بکات بە پێغەمبەرایەتییەکەی، بە ژیانی نەمری دوای مردن.

خەڵکی کۆکردەوەو پێی فەرموون: ((ئەی خەڵکینە! بڵێن لا إلە إلا اللە ڕزگار دەبن))، ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون متمانەی زۆریان پێی هەبوو، بەڕاستیش باوەڕیان پێیکرد، ئامادەبوون بانگەوازەکەی قبوڵبکەن. بەڵام لەنێویاندا کەسێک هەبوو کە هەنگاو بە هەنگاو بەدواداچوونی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد، ئەو کەسەش جگە لە ئەبو لەهەبی مامی کەسێکیتر نەبوو، لەناو ئاپۆڕای جەماوەرەکەدا دەرکەوت و وتی: (دووربکەونەوە لێی! دووربکەونەوە لێی!) پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خەمباربوو بەو هەڵسوکەوتەی مامی، بەڵام جگە لە بەزەییهاتنەوە پیایدا چارەیەکیتری نەبوو بیکات، چونکە خوای گەورە فەرمانمان

پێدەدات خۆمان برازێنینەوە بە ڕەوشتی جوان و ئازاری خەڵکی نەدەین. موحەممەد پێغەمبەریش(ﷺ) دەزانێ هەرکەس چاکە بکات دەچێتە بەهەشت، خۆراکی بەهەشت و میوەهاتەکەی و ئەو لەزەتبەخشانە کە تیایدایە پێشتر چاو نەیبینیون، جگە لە چاکەکارانیش کەسیتر بەدەستیان ناهێنێ.

## ٦٩. پێغەمبەرێکی دڵپاک

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی دڵپاک بوو، دەم بە زەردەخەنە بوو، هەمیشە گەشبینی و خۆشەویستی بە دەوری خۆیدا بڵاودەکردەوە، بە سۆزو بە نەرمو ناسکی ئاخاوتنی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، ئازاری دڵی کەسی نەدەدا، بەڵکو ڕقی لە خووی توندوتیژ و دڵڕەقی و فێڵلێکردن بوو، وا ڕاهاتبوو بەردەوام باسی یەکتاپەرستی خوای گەورەی بۆ خەڵکی دەکرد.

لایەنێکی تر لە ڕەوشتبەرزی پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەبوو کە بە سۆزو بەزەییەوە وەڵامی خەڵکی دەدایەوە، تەنانەت با ئازاریشیان بدایە، لێرەوە بەهۆی ئەو سیفەتە باش و عادەتە جوانانەوە کە پێیان دەناسرایەوە، بەردەوام ژمارەی باوەڕداران لە زیادبووندا بوون، بەڵام هەندێ کەس سەغڵەتبوون بەوەی کە خەڵکی لە دەوری کۆدەبوونەوە، یەکێک لەو کەسانە ئەبو لەهەب و ئوم جەمیلی خێزانی ئەبو لەهەب و عوتبەی کوڕی بوون، ئەوانە دراوسێی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، زۆر ئازاریان دەدا، ڕۆژانەماڵەکەیان بەردباران دەکرد، ئوم جەمیل دەچوو لقی دڕکاوی دەهێناو لەبەردەم دەرگای ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دایدەنا، دڕکی دەخستە سەر ئەو ڕێگایەی پیایدا دەڕۆیشت. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان چاوی لە هەموو ئەو کردەوە ناشیرینانە دەپۆشی و ئارامی دەگرت، لە خوای گەورە دەپاڕایەوە تا مامەکەی و خێزانەکەی هیدایەت بدات و باوەڕ بە ئیسلام بێنن.

## ٧٠. کەسانێک جێگای بەزەیین

یەکێک لە هەرە سەرسەختترینی ئەو کەسانەی دژایەتی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد پیاوێ بوو بەناوی عەمر. موسڵمانان نازناوی ئەبو جەهلیان لێنابوو، چونکە دەیانزانی کە چەندە دوژمنی ئیسلام و پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، ئەبو جەهل یەکێک بوو لە کەسە ناودارەکانی مەککە، بەڵام بەوە ناسرابوو کە کەسێکی دڵڕەق و گەوجە، بتەکانی زۆر خۆشدەویست، عادەتی وابوو ڕۆژانە لەبەردەمیاندا بۆ چەند کاتژمێرێ نوێژە خۆیانەو کڕنوشی بۆ دەبردن.

بەڵام ئەو بتانە بێگیانن، ئیتر چۆن لە نوێژکردنی ئەو بۆیان تێدەگەن؟ ئەبو جەهل بەم ڕەفتارەی بووبووە جێگای بەزەیی، دانی بەوەدا نەدەنا کە پێغەمبەری خۆشەویستمان پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، لەبەرئەوە، زۆرجار خۆی دەکردە مایەی هەڵوێستی گاڵتەجاڕیی، بەڵام هەموو ئەوانە وایان لێنەکرد بێتەوە هۆشی خۆی، جارێکیان، لە ماڵ چووەدەرو بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ) دەگەڕاو دەیوت: (هەرکات لە نوێژەکەیدا سوژدەی برد، منیش پێ دەخەمە سەر ملی).

ڕۆیشت بەرەو کەعبە کە ڕق و تووڕەیی لێدەباری، بینی وا پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەریکی نوێژکردنە، هەرکە سوژدەی دەبردو هەڵدەستایەوە بۆنی عەترێکی بۆنخۆشی لێدەهات، بینینی وا پێغەمبەر(ﷺ) خۆشی و شادیی بە دڵ دەبەخشی، بەڵام بێباوەڕیی چاوانی ئەبو جەهلیان کوێر کردبوو، بەهۆی قیرسیچمەیی و گیریییەوە نەیدەتوانی گەورەیی پێغەمبەری خوا ببینێ.

ئەبو جەهل نزیککەوتەوە لە پێغەمبەر(ﷺ)، ئا لەو ساتەدا پێغەمبەر ڕۆیشت بەرەو سوژدەبردن، ئەبو جەهل ویستی پێبخاتە سەر ملی پێغەمبەر(ﷺ) وەها کە خەیاڵی کردبوو، لە کتوپڕدا گەڕایەوە دواوە کە هەردوو دەستی بەرزکردبووەوە وەک بڵێی خۆی لە شتێکی شاراوە کە نابینرێ دەپارێزی! ئینجا پرسیاریان لێکرد، ئەبو جەهل ئەوە چیتە وا پاشەوپاش گەڕایتەوە؟! وتی: لەنێوان من و موحەممەدا چاڵێکی ئاگرین هەیەو تارمایی و چەندین باڵ هەن! پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر ئەبو جەهل نزیک ببایەتەوە لێم ئەوا فریشتەکان پچڕ پچڕیان دەکردو هەریەکێکیان پارچەیەکی دەبرد)).

## ٧١. فرمێسکی فاتیمە

گەوهەرە ڕەشەکەی زەوی، واتە کەعبەی پیرۆز، شوێنێک بوو لێوانلێو بوو لە خۆشی و ئاشتی، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) لەوێ نوێژی دەکرد، کەعبەی پیرۆز بە بوونی موحەممەد(ﷺ) جوانترو درەوشاوەتر بوو، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر حەزی لە نوێژکردن بوو، لەبەردەم خوای گەورەدا هەستی بە حەوانەوەو دڵئارامی دەکرد کە هەمووشتێکی تر لەبیری مرۆڤ دەباتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) بیری دەکردەوە کە زاتی اللە جوانترین و گەورەترین زاتە لە بونەوەردا، لەبەرئەوە باکی بەوە نەبوو کە لە نزیکییەوە دەوتراو ئاوڕی نەدەدایەوە لەوەی بەدەوریدا دەگوزەرا. بەڵکو هەموو بیروهۆشی خۆی دابووە نوێژکردن بۆ بەدیهێنەری ئەم گەردوونە. نوێژکردن بەختەوەرترین ساتەکانی ژیانیەتی، چونکە کاتێ دەچێتە ناو نوێژەوە ئیتر لەبەردەم خوای گەورەدا دەوستێ و بۆ چەندین کاتژمێر دەمێنێتەوە لە خزمەتیدا.

ڕۆژێکیان، ئەبو جەهل لەگەڵ هاوڕێکانیدا هات، کەوتە چاودێریکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بینی کە بە شادمانی و ئارامیی و گەردنکەچییەوە خەریکی نوێژکردنە، هەندێکیان وتیان: (گومانی تێدا نیە ئەوەی ئەوان پێیدەڵێن نوێژکردن شتێکی جوانە، سەیرکەن بزانن موحەممەد کە نوێژ دەکات چەندە بەختەوەرە!).

ئالەوێدا ئەبو جەهل هەستی بە ئیرەیی کرد، هەڵقونی و چووە بەردەم هاوڕێکانی و وتی: (کامتان دەتوانێ ڕیخۆڵەی وشتر لەسەر

سەری دابنێ لە کاتێکدا ئەو لە نوێژکردندایە؟) یەکێک لە هاوڕێکانی بە دڵپیسییەکەوە وتی: (من دەیکەم)، ئینجا بەپرتاو ڕۆیشت و لە پاش ماوەیەک کە هاتەوە ڕیخۆڵەی وشتری بەدەستەوە گرتبوو، موحەممەد(ﷺ) ئاگای لەوە نەبوو کە چی دەگوزەرێ، بەڵکو هەر لە نوێژکردنی خۆیدا بوو، کاتێک چووە سوژدەوە ئەوەی ئەو کەسە پیسە هەڵیگرتبوو بەوپەڕی بێشەرمی و بێئابڕوییەوە خستییە سەر پشتی پێغەمبەر(ﷺ)، هاوڕێکانی دایانە قاقای پێکەنین، ئەوانەی ئەو ڕووداوەیان بینی بە پەلە ڕۆیشتن و فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) ئاگادارکرد بەوەی کە ڕوویدا، وتیان پێی: (ئەی فاتیمە، خێرا بڕۆ! ئەوەتا ئەوانە سەرلەنوێ باوکت ئازار دەکەن). فاتیمە لە ترساندا خێرا ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنە کە بێباوەڕان تیایدا کۆبووبوونەوە، کاتێ گەیشتە کەعبەی پیرۆز، دڵی پەلەپەل لێیدەدا، باوەڕی نەکرد لەوەی کە بە چاوی خۆی بینی، بەپرتاو ڕۆیشت و بەدەم گریانەوە ڕیخۆڵەکانی لەسەر پشتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لابرد. کاتێ پێغەمبەری خوا نوێژەکەیی تەواوکرد، بەوپەڕی سۆزو بەزەییەوە فاتیمەی لە باوەش گرت، بەڵام جگە لەم چەند وشەیە کە فەرمووی ((حسبي الله ونعم الوكيل!)) شتێکی تر لە زاری نەهاتەدەر، پێغەمبەر(ﷺ) ئا بەوشێوەیە بە ئارامگرتن و بە حیکمەتەوە ڕووبەڕووی ئەو ئازار و ناڕەحەتییانە دەبوویەوە کە بەرۆکیان پێدەگرت، هیچ جۆرە ڕق و کینەیەکی بەرانبەر بە کەس هەڵنەگرتبوو.

بەڕاستی ئەو(ﷺ) خێرو چاکەی بۆ هەمووان دەویست، بە دڵپاکی و بە بەزەییەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، بەوشێوەیە فرمێسکەکانی کچەکەیی سڕی، ئینجا شوێنەکەی جێهێشت.

## ٧٢. هاوەڵگەران بە مەبەستی سکاڵاکردن شاندێک دەنێرنە لای ئەبو تالیب

هەر هەموو ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان لە خەڵکی دەویست هیدایەتدانیان بوو بۆ ڕێگای هەق و ڕاستی. لەو پێناوەشدا، ئامادەباش بوو بۆ بەرەنگاربوونەوەی هەموو سەختی و ئاستەنگەکان، بێ دوودڵی خەڵکی ئاگادار دەکرد بە فەرمانەکانی خوای گەورەو بە ڕێگیرییەکانی، ئیتر ئەوان ڕایان هەرچی ببوایە ئەو هەر خەریکی کاری پیرۆزی خۆی بوو، لەبەرانبەرەوە هاوەڵگەران بەبێ وەڕەسبوون و بێ ماندوبوون بەردەوامبوون لە سەغڵەتکردن و بێزارکردنی، بەردەوام هەوڵیاندەدا ئازاری پێبگەیەنن تا وای لێبکەن واز لە پەیامەکەی بێنێ، هەربۆیە هاتن چەندین پلانی فێڵبازانەی یەک لەدوا یەکیان بۆ دانا، لەو ڕۆژانەدا جگە لە یەک کەس لە خزمانی نەبێت ئیتر هیچکامێک لەوان پشتگیریی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەدەکرد، ئەو کەسەش بڕیاریدابوو بە هەر نرخێک بووە بیپارێزێ، ئەو پیاوەش ئەبو تالیب بوو، ئەو مامەیەی کە پێغەمبەر(ﷺ) لە پەنای ئەودا دەژیا، ئەو پیاوە کە خۆشەویست و بەگوێکراو بوو لە مەککەدا.

بێباوەڕان زۆر توڕەبوون لەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بەبێ ترس بەردەوامە لە بانگکردنی خەڵکی بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، کاتێک گەیشتنە ئەو قەناعەتە کە خۆیان ناتوانن سنورێکی بۆ دابنێن، شاندێکیان لە گەورە پیاوانی قورەیش پێکهێنا و چوون بۆ لای ئەبو تالیب، کاتێک گەیشتنە ئەوێ سکاڵایان بردە لای و پێیانوت:

(ئەی ئەبو تالیب، تۆ تەمەنێک و ڕێزێک و پێگەو پایەیەکی گەورەت لەناوماندا هەیە، ئێمە داوامان لێکردی ڕێگیری لەو برازایەت بکەیت بەڵام ڕێگیریت لێنەکرد، سوێند بەخوا ئێمە لەمە زیاتر ناتوانین ئارامبگرین لەسەر ئەوە کە جنێو بە باوباپیرانمان بدات، خەونەکانمان پوچەڵبکاتەوە، عەیب و عار لە خواکانمان بگرێ، دەبا واز بێنێ، ئەگەرنا ئەوا بەتۆشەوە لەگەڵیدا دەکەوینە جەنگەوە تا لایەکمان لەناو دەچێت).

ئەبو تالیب برازاکەیی زۆر خۆشدەویست، لەوە دەترسا شتێکی تووش ببێت، بۆیە بانگیکردو پێیوت: (ئەی برازاکەم، قەومەکەت هاتوونەتە لام ئەوەو ئەوەیان پێوتووم، دەی منیش و خۆیشت بهێڵە، بارێک مەخەرە سەرشانم کە توانای هەڵگرتنیم نەبێت).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە باسەکە زۆر دڵتەنگ بوو، چونکە تا ئەوکاتە مامی لە خۆشی و ناخۆشیدا بە تەنیشتییەوە بوو، خۆشیدەویست و پشتگیری لێدەکرد، پارێزگاری دەکرد، ئێستە چۆن نائومێدی بکات؟ لەولاشەوە چۆن وازبێنێ لەو پەیامە کە خوای گەورەو باڵادەست فەرمانی پێکردووە؟ ئەمە شتێکی مەحاڵە، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەری بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و پاشان فەرمووی: ((من ناتوانم واز لەو کارەم بێنم بۆ ئێوە با تیشکێکیشم لەوە بۆ دابگیرسێنن)). واتە خۆر.

دوای ئەوە ئەبو تالیب بە قەومەکەیی وت: (برازاکەم درۆی نەکرد، بڕۆنەوە!) ئا بەو دەستەواژەیە ئەبو تالیب ئاماژەی بە قەومەکەی دا کە بەردەوام دەبێت لە پاراستن و پشتگیریکردن لە برازاکەی، ئەوانیش ڕۆیشتن و بڵاوەیان لێکرد. هاوەڵگەران بە نائومێدی و سەرشۆڕییەوە گەڕانەوە.

## ٧٣. داوایەکی تەواو بێویژدانانە!

ئەبو تالیب وازی لە پاراستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەهێنا، بەردەوام دەیپاراست لە فێڵ و تەڵەکەکانی بێباوەڕان. قورەیش دەمێک بوو زۆر بیریان لەوە دەکردەوە کە ئەبو تالیب چۆن ناچار بکەن پارێزبەندی خۆی لە برازاکەی هەڵبگرێ.

دواجار، ڕۆژێکیان هاتنە لای ئەبو تالیب و پێیانوت: (بە جوانترین و بەخشندەترین و بەشەهامەتترین گەنجی قورەیشەوە هاتووینەتە لات ئەویش عەممارەی کوڕی وەلیدە، دەیدەین بە تۆ تا ببێتە پشتگیرکارت و میراتییەکەشی بۆ تۆ، لەگەڵ ئەوەشدا لە ماڵ و سامانی خۆشمان شتێترت دەدەینێ، تۆش لەبەرانبەرەوە برازاکەت ڕادەستی ئێمە بکەیت بۆ ئەوەی بیکوژین چونکە دووبەرەکی خستووەتە ناو قەومەکەمان و خەونەکانمانی پوچەڵکردووەتەوە).

کاتێ ئەبو تالیب ئەو داوایەی بیست، زۆر توڕەو شێتگیر بوو، ئایا کێ هەیە جێگای موحەممەد بگرێتەوە؟ هەرگیز ناتوانێت واز لە برازا خۆشەویستەکەی بێنێ با هەمووی دنیاشی بدەنێ، ئابەمجۆرە بە توڕەییەوە هۆشداری پێدان و وتی: (سوێند بەخوا بەویژدان نەبوون لەگەڵمدا، ئایا کوڕەکەی خۆتانم دەدەنێ تا تێری بکەم بۆتان، کوڕەکەی منیش دەبەن تا بیکوژن؟ سوێند بەخوا هەرگیز شتی وا نابێت).

ئینجا موتعەمی کوڕی عەدی وتی: (ئەبو تالیب بەخوا قەومەکەت بەویژدان بوون لەگەڵتدا، هەوڵیاندا تا ڕزگارت بکەن لەوەی پێتناخۆشە، ئیتر بۆچی ناتەوێ شتێکیان لێ وەربگری کە قازانجی

تۆی تێدایە). ئەبو تالیب بە موتعەمی وت: (سوێند بەخوا بەویژدان نەبوون لەگەڵمدا، بەڵام تۆ بۆ عەیبدارکردنی من گەڵەکۆمەکی قەومەکەتت لەسەر من کۆکردەوە، خۆت چی دەکەیت بیکە، کارت بە منەوە نەبێت).

ئیتر لەو ڕۆژە بەولاوە ئەبو تالیب ئەوەندەی لە توانایدا بوو بەدرێژایی ژیانی بەرگری لە برازا خۆشەویستەکەی دەکردو دەیپاراست، دەنگی وشەکانی هەر لە گوێی هاوەڵگەراندا دەنگیان دەدایەوە، بۆیە ئەوانیش پلانەکانیان دواخست و بە ترس و لەرزەوە ئەو جێگایەیان جێهێشت.

## ٧٥. ئەو پیاوەی هەردوو گوێی خۆی داخست!

توفەیل خەڵکی مەککە نەبوو، بەڵام زۆربەیجار بەهۆی بازرگانییەوە سەردانی مەککەی دەکرد، ئەمجارەش بەهەمانشێوە، بە کارێک سەردانی مەککەی کرد. بەڵام پێش ئەوە بگاتە مەککە چەند بێیاوەڕێک پێی گەیشتن، پێیانوت: (ئەی توفەیل، ئەم پیاوە قسەکانی لە جادوو دەچن، دووبەرەکی لەنێوان خەڵکیدا دروستدەکات، ئێمەش ترسمان لەسەر تۆ و لەسەر قەومەکەت هەیە، نە بیدوێنەو نە گوێ لە هیچ شتێکی بگرە). توفەیل لە ئاست ئەو قسانەدا هەستی بە دڵەڕاوکە کرد، ئینجا کەوتە پرسیار ئایا بەڕاست ئەو موحەممەدە جادووگەرە.

هەرکات توفەیل بهاتایەتە مەککە بەپەرۆشبوو لەسەر زیارەتی کەعبەی پیرۆز بەمشێوەیە، هەرکە هاتە ناو مەککەوە ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بەرەو کەعبە، بەڵام ترسی هەبوو لەوەی موحەممەد بیدوێنێ و جادووەکەی خۆی لەسەری جێبەجێ بکات. هەربۆیە لۆکەی ئاخنییە گوێیەکانی، بەمجۆرەش ئیتر نە گوێی لێی دەبێت و نە جادووەکەی کاری تێدەکات، موحەممەد(ﷺ) وەک عادەتی خۆی لە شوێنەکەی خۆیدا دانیشتبوو بە دەنگێکی خۆش قورئانی دەخوێند، توفەیل بە غەیری ویستی خۆی گوێی لێبوو، ئەو ئایەتانە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو ساتەدا دەیخوێندن وایان لێکرد هەستی بە فێنکییەک کرد کە دڵی داپۆشی، ئەوەی کە بیستی زۆر بەختەوەری کرد.

باش باش بیریکردەوەو لە ناخییەوە بەخۆیی وت: (بەخوا خۆ من شاعیرێکی لەبلەبانم، چاک لە خراپ جیادەکەمەوە، دەبێ چی ڕێگیریم لێبکات گوێبگرم لەوەی ئەو پیاوە دەیڵێت! جا ئەگەر ئەوەی کە دەیڵێ چاک بوو ئەوا وەریدەگرم، ئەگەر خراپیش بوو وازی لێدێنم).

بەمجۆرە توفەیل لە سوچێکەوە لێی دانیشت، چاوی بڕییە ئەوەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیکرد. دوای ئەوە کە پێغەمبەر(ﷺ) نوێژەکەیی لە پەنای کەعبەدا تەواوکرد، ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆی، توفەیل لەبەردەمیدا وەستاو وتی: (قەومەکەت ئەوەو ئەوەیان... لەبارەی تۆوە پێوتم، سوێند بەخوا ئەوەندە لەم مەسەلەیەی تۆ ترساندمیان تا هەردوو گوێم ئاخنی بۆئەوەی گوێبیستی گوفتارت نەبم، پاشان خوای گەورە ویستی وەهابوو کە هەردەبێ گوێبیستی گوتەکانت بم، منیش شتانێکی باشم لێت بیست، کەواتە ئەو داوایەی هەتە پێمبڵێ).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگهێشتی توفەیلی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی، بۆی باسکرد کە ئەو پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوی خوای گەورەیە، ئینجا بانگیکرد بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، توفەیل گوتەکانی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چوون بە دڵیدا! لە قوڵایی دڵییەوە باوەڕی هێنا بە موحەممەد کە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوەو جادووگەر نیە. ئاڵەوێدا شایەتومانی هێناو موسڵمانبوو.

## ٧٦. حەمزە، جەنگاوەری بەجەرگ و نەبەز

پێغەمبەرمان(ﷺ) مامێکی چاونەترسی هەبوو ناوی حەمزە بوو، هەرگیز چاوی لە ستەمکردن نەدەپۆشی، ڕۆژێکیان، لە سەفەرێکی ڕاو گەڕایەوە، لە کێوی صەفا دەهاتەوە خوارەوە تیرو کەوانەکەیی بەدەستەوە گرتبوو.

لەو کاتەدا هێشتا موسڵمان نەبوو بوو، بەڵام کەعبەی پیرۆزی خۆشدەویست، هەرکات بگەڕایەتەوە ناو مەککە زیارەتی کەعبەی دەکرد ئینجا دەگەڕایەوە ماڵەکەی خۆی.

ئەمجارەش بە هەمان نیەتەوە هاتەوە، هەرکە گەیشتەوە ناو مەککە، کەنیزەکێک لەسەر شەقامەکە ڕایگرت، ئافرەتەکە زۆر تورە بوو، کاتێ حەمزەی بینی وتی: (ئەی ئەبو عەممارە! تۆ ئەوەت نەبینی کە موحەممەدی برازات لەلایەن ئەبو جەهلەوە بەسەریدا هات؟) حەمزە بە دەنگێکی بەرز وتی: (پێمبڵێ چی لێکردووە؟)، وتی: (ئەبو جەهل بینی کە ئەو لێرادا دانیشتووە ئیتر ئازاری داو جنێوی پێدا، ئەوەی ئەو پێیناخۆشبوو ئەو کردی لەگەڵیدا، بەڵام موحەممەد هیچی بەو نەوت و ڕۆیشت لێی دوورکەوتەوە). حەمزە وتی: (تۆ بە چاوی خۆت ئەوەت بینی؟)، وتی: (بەڵێ، ئەی تا بە چاوی خۆم نەیبینم چۆن چۆنی دەیگێڕمەوە؟).

حەمزە زۆر ڕقی هەستا، ڕاستەوخۆ بەرلەوە بگەڕێتەوە ماڵەکەی خۆی خێرا خۆی گەیاندە ئەبو جەهل، کاتێ گەیشتە لای، کەوانەکەی بەرزکردەوەو بە سەختی کێشای بەسەر ئەبو جەهلدا، خوێن لەسەری فیشقەی کرد، ئینجا بە توڕییەوە پێیوت: (ئایا جنێوی

پێدەدەیت دەوا من لەسەر ئاینەکەی ئەوم و ئەوەی ئەو دەیڵێ منیش دەیڵێم؟ ئادەی ئەگەر دەتوانیت تۆش واملێبکەرەوە). ئەبو جەهل شڵەژاو لە تاو سەختی لێدانەکە ئازاری زۆری پێگەیشت، لەوێدا پیاوانێک لە بەنو مەخزوم هەستان بۆ حەمزەو ویستیان لێیبدەن و لەسەر ئەبو جەهل بکەنەوە، بەڵام ئەبو جەهل وتی: (لە ئەبو عەممارە گەڕێن! بەخوا من جنێوی زۆر پیسم بە برازاکەی داوە).

ئیتر لەم ڕووداوە بەدواوە موسڵمانان بوونە خاوەنی جەنگاوەرێکی بەجەرگ و نەبەز و ئازا و بەهێز، خوای گەورەش هیچ کات وازی لە پێغەمبەرە مەزنەکەی خۆی نەهێناوە بەتەنها بمێنێتەوە.

## ٧٧. جوانیی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز

بێباوەڕان لە ترسی حەمزەی کوڕی ئەبو تالیب سەرلەنوێ کۆبوونەوە، پیاوێکیان تێدابوو ناوی عوتبە بوو، بیرۆکەیەک هات بە خەیاڵیداو وتی: (ئەی قەومی قورەیش، ئایا نەچمە لای موحەممەد بیدوێنم و چەند شتێک بخەمە بەردەستی بەڵکو یەکێکیان قوبول بکات، هەرکامیانی لا پەسەند بوو ئێمە دەیدەینێ تا وازمان لێبێنێ؟) ئەوانەی ئامادەبوون بیرۆکەکەیان پەسەندکرد.

عوتبە هەستا و ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ)، سەرەڕای هەموو ئەو خراپەیەی قورەیش کردیان پێی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو هەر پێشوازییەکی گەرمی لێکرد، عوتبە زوو کەوتە قسەکردن و وتی: (ئەی برازاکەم! تۆ لە ئێمەیت...تۆ شتێکی گەورەت هێناوە کە بووەتە مایەی ئەوە قەومەکەمان دووبەرکی تێبکەوێ، خەونەکانیانت پوچەڵکردووەتەوە، عەیبوعار و ناووناتۆرەت ناوە لە خواکان و ئاینەکەیان، ئەوەی باب و باپیرانیان لەسەری بوون تۆ نکوڵی لێدەکەی، دەی گوێم لێبگرە با چەند شتێکت پێبڵێم، تۆش سەرنجیان بدەرێ و بەڵکو یەکێکیانت لا پەسەند بێت). پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئارامگرتنەوە پێی فەرموو: ((ئەی ئەبو وەلید بڵێ))، وتی: ئەی برازاکەم! ئەگەر ئەوەی تۆ هێناوتە مەبەستت پێی دەستخستنی ماڵ و سامان بێت، ئەوا ئەوەندە ماڵ و سامانت بۆ کۆدەکەینەوە تا لە هەموومان دەوڵەمەندتر بیت، ئەگەر پێگە و پایە و شکۆمەندیت دەوێ، ئەوا دەتکەینە گەورەی خۆمان، بە ئاستێ کە بەبێ ڕای تۆ هیچ مەسەلەیەک

یەکلانەکەینەوە، ئەگەر پادشایەتیت دەوێ، دەتکەینە پادشای خۆمان، یان ئەگەر ئەوەی دەیڵێت ڕایەک بێت و توانات نەبێت بەگوێی خۆت نەکەیت، ئەوا چارەسەری پزیشکیت بۆ دەکەین و ماڵ و پارەی زۆری تێدا خەرجدەکەین هەتا چاکدەبیتەوە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد و فەرمووی: ((ئەی ئەبو وەلید ئەگەر تەواو بوویت؟، ئیتر گوێ لە من بگرە)). ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی بەسەریدا خوێندەوە، کاتێ لە خوێندنەوەکە تەواوبوو عوتبە وەک بڵێی چووەتە جیهانێکی تر، هەستی بە فێنکییەک کرد کە سەراپای جەستەی داپۆشی وەک بڵێی خەوببینێ.

کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆتایی بە خوێندن هێنا بە عوتبەی فەرموو کە ئەو نە شێتە و نە جادووگەر، ناشیەوێ ببێتە پادشایان، بەڵکو خوای گەورە بە پێغەمبەریی ڕەوانەیکردووە تا قورئان فێری خەڵکی بکات و هۆشدارییان بداتێ لە سزای دۆزەخ و مژدەی بەهەشتیش بە باوەڕداران بدات))، پاشان پێیوت: ((ئەبو وەلید ئێستە ئیتر گوێبیستی ئەوە بووی کە پێموتی، ئەوە تۆ و ئەوە ئەو قسانە)). عوتبە جوانیی ئایەتەکان زۆر چوون بەدڵیدا، پێشئەوەی بڕوات بۆ ماوەیەک بێدەنگ دانیشت، هاوڕێکانی لە چاوەڕوانیی کردنیدا ئارامیان لێبڕابوو، کاتێ گەیشتەوە لایان، هاتنە لای و پرسیاریان لێکرد: (ئەی ئەبو وەلید چیت کرد؟).

عوتبە کەوتە گێڕانەوەی باس و خواستەکەی و سەرسوڕمانی پێوە دیاربوو. (من گوێبیستی گوفتارێک بووم سوێند بەخوا پێشتر گوفتاری وام نەبیستووە، بەخوا نە شیعرە و نە جادووە و نە فاڵچییەتیە، ئەی قەومی قورەیش بەگوێم بکەن و حیسابی بکەن لەسەر من، هەقتان نەبێت بەسەر ئەو پیاوەوە و ئەو باوەڕەی ئەو لەسەریەتی. وازی لێبێنن!).

ئەو خەڵکەی بەدەویدا بوون واقیان ورما لێی، عوتبە باسی چیدەکات؟ ئایا ئەمیش موسڵمانبووە؟ چۆن ئاوا لە کتوپڕدا ڕای خۆی گۆڕی؟ ئالەویدا عوتبە وتی: (سوێند بەخوا ئەو گوفتارەی من لێمبیست باس و هەواڵێکی مەزنی تێدایە، ئەگەر عەرب بیپێکن و بیگرنە خۆیان ئەوا هەر ئەوەیان بەسەو ئێشیان بە کەسیتر نابێت، ئەگەر باڵبکێشێ بەسەر عەرەبدا ئەوا دەستەڵاتی ئەو دەستەڵاتی خۆیانە، شکۆمەندی ئەو شکۆمەندییانە، ئێوەش بەختەوەرترین کەس دەبن پێی). گوتەکانی عوتبە جێگای ڕەزامەندی ئامادەبووان نەبوو، بەڵکو وتیان: (بەخوا ئەی ئەبو وەلید بە زمانپاراوییەکەی جادووی لێکردوویت!) ئینجا بڵاوەیان لێکرد، کاتێ عوتبە پەرچەکرداری هاوڕێکانی خۆی بینی، پێیوتن: (ئەمە ڕای منە لەسەری، خۆتان چیتان پێباشە وابکەن)، ئینجا ئەویش ڕۆیشت بەڕێی خۆیەوە.

عوتبە لەو ئایەتانەوە کە گوێبیستییان بوو بۆی دەرکەوت کە موحەممەد پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، بەڵام لە بەدبەختی نەیتوانی قەناعەت بە هاوڕێکانی بکات.

## ٧٨. کێوی صەفا بکە بە ئاڵتون!

ژمارەی باوەڕداران بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە تێپەڕبوونی کات بەردەوام لە زیادبووندا بوون، لەبەرانبەرەوە بێباوەڕان درێژەیان دا بە سەغڵەتکردنی پێغەمبەر(ﷺ)، ڕۆژێکیان، هاتنەلای و وتیان: (ئەی موحەممەد! لە پەروەردگارت بپاڕێرەوە تا کێوی صەفامان بۆ بکاتە ئاڵتون، ئەوکات باوەڕت پێدێنین!)، بێباوەڕان بڕوایان بەوە نەدەکرد کە ئەوە شتێکە و دەکرێ بێتەدی، چونکە لای ئەوان شتێکی مەحاڵ بوو!



بەڵام ئەم کارە بۆ خوای باڵادەست شتێکی ئاسانە، کاتێ هاوەڵگەران ئەو داوایەیان کرد، ویستییان پێغەمبەر(ﷺ) سەغڵەتبکەن، پێغەمبەر(ﷺ) لە نیەتیان تێگەیشت و پرسیاری لێکردن: ((جا وادەکەن؟)). وتیان: (بەڵێ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەردوو دەستی بەرزکردەوە و لە خوای گەورە پاڕایەوە تا داواکەیان جێبەجێ بکات.

خوای باڵادەست پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بەبێ وەڵام نەهێشتەوە، بەڵکو جبرەئیلی فریشتەی بۆ ڕەوانەکرد، جبرەئیل(ﷺ) هات و سڵاوی لە پێغەمبەر کرد و وتی: ((پەروەردگاری بەهێز و شکۆمەندت سەلامت لێدەکات و دەفەرموێ کە ئەگەر دەتەوێ ئەوا کێوی صەفایان بۆ دەکەمە ئاڵتون، بەڵام هەرکەس لەدوای ئەوەوە بێباوەڕ بێت ئەوا سزایەکی وەهای دەدەم هەرگیز سزای هیچ کەسێکی ترم لە دنیادا بەوجۆرە نەدابێ، ئەگەر حەزیش دەکەیت ئەوا دەرگای تەوبە و بەزەییان لەسەر دەکەمەوە)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ماوەیەک بیریکردەوە و بۆی مەعلوم بوو کە هەرچی بکرێ و ڕووبدات ئەوانە هەرگیز پاشگەزنابنەوە لەو ملەجیڕەیان، بۆیە حەزینەکرد هیچ جۆرە کارەساتێک بەسەریاندا بێت، بەڵکو هیواخواز بوو ڕۆژێک بێت ئەوان واز لەو بتپەرستییەیان بێنن، ئینجا بڕیاری خۆی دا و فەرمووی: ((بەڵکو دەرگای تەوبە و بەزەیی خوای گەورەم دەوێ)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئومێدخوازی چاکە بوو بۆ ئەو کەسانەش کە پیلانی گلاویان لە دژی ڕێکدەخست، دەیویست ئەوانیش لەگەڵ باوەڕدارانـدا لە بەهەشتدا ببینێ، چونکە ئەو پێغەمبەری سۆز و بەزەییە.

## ٧٤. وتیان جادووگەرە

بێباوەڕان بەردەوام لە پیلانگێڕیدا بوون، بەڵام لەدوای ئەوە کە ئەبو تالیب چوو بەگژیاندا، پیلانگێڕییەکەیان بە نهێنی هێشتەوە، جار جار لەنێوان خۆیاندا نەبوایە ئیتر ئەو شتەیان لای کەسیتر نەدەدرکاند، وتیان: (وەرن با بەلانیکەمەوە ڕێگیریان بکەین لەوەی خەڵکی تر بانگبکەن بۆ لای ئیسلام. کەچی لەبەرانبەرەوە ژمارەی باوەڕداران تا دەهات زیاتر دەبوون.

پیاوێکی فێڵباز هەبوو ناوی وەلید بوو، موسڵمانان بۆ هەرکوێ بڕۆیشتنایە ئەو بەدوایانەوە بوو، ئیرەیی دەبرد بەو برایەتی و یەکبوونەی کە کۆیکردبوونەوە، ڕۆژێکیان، هاوڕێکانی خۆی کۆکردەوەو پێیوتن: (ئەوا وەرزی حەجکردن نزیکبووەتەوە، خەڵکیش لە هەموولایەکەوە دێن بۆ کەعبە، من دڵنیام ئەو خەڵکە هەواڵی موحەممەد پێغەمبەریان بیستووە، حەتمەن پرسیاری ئەو لە ئێمەش دەکەن، بۆیە پێویستە ئێمە گوفتارمان یەکبخەین، دەبێ بیانترسێنین تا لێی دووربکەونەوە). ئەو پلانەی پلانێکی زۆر گڵاو بوو؟

هاوڕێکانی وتیان: (شتێکی باشە، پێمانبڵێ چی بەو خەڵکە بڵێین؟) وەلید یەکەمجار ویستی ڕاوێژ بەوان بکات، بۆیە پرسیاری لێکردن: (پێشنیارتان بە چییە؟)، یەکێکیان وتی: (با بڵێین جادووگەرە). وەلید وتی: (نەخێر، چونکە ئەو بەردەوام شتانێکی ڕاست و جوان دەڵێ و کەسیش بڕوامان پێناکات. چونکە جادووگەران جاری درۆ دەکەن و جارێکیتر ڕاستی دەڵێن)، ئینجا یەکێکیتریان وتی: (کەواتە با بڵێین شێتە!)، وەلید وەڵامیدایەوە: (نەخێر نابێ چونکە قسەکانی

زۆر زیرەکانـەن و پێیـەوە دەرناکـەوێ کـەم ئەقڵ بێـت)، هاوڕێکـەی وتـی: (دەبـا بڵێیـن شـاعیرە). وەلید ئەمجـارەش هـەر نـاڕازی بـوو و بەرپەرچیدایـەوەو وتـی: (ئێمـە هەمـوو جۆرەکانـی شـیعر دەزانیـن، ئـەوەی ئـەو دەیڵـێ لـە شـیعر ناچێت)، دواجـار بـە وەلیدیـان وت: (دی تـۆ پێمانبڵـێ ئـەی وەڵامـان چیبێـت). وەلیـد وتـی: (گوفتـاری زۆر جوانـەو لـەوە باشـترم نەبیسـتووە).

هاوڕێکانی واقیان وڕمابوو لەوەی وەلید دەیوت، چونکە لە هەرە سەرسـەختترینی دوژمنانـی پێغەمبـەر(ﷺ) بـوو، چۆن ئـا بەوشـێوەیە وەسـفی گوفتـاری موحەممـەد دەکات؟! هەموویـان لێـی ڕاپەڕیـن و وتیـان پێـی: (وەلیدیش بـاوەڕی بـە موحـەممـەد هێنـاوە).

لەڕاستیدا وەلید موسڵمان نەبوو بوو، بەڵام نەیدەتوانی وەڵامێک بدۆزێتـەوە بـڕوای پێبکـرێ، پاشـان وتـی: (چارەیەکـی ترمـان نیـە! بـا بڵێیـن جادووگـەرە، بەڵکـو خەڵکـی بەوشـێوازە لێـی بتەکنـەوە). هاوڕێکانی وەلید دەیانزانی کە موحەممـەد پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، بـەڵام ڕەتیانکـردەوە بـاوەڕی پێبێنـن، ئـەو لەخۆباییبوونەیـان جێگـای بەزەیـی بـوو.

ڕۆژێکیتـر تێپـەڕی بێئـەوەی ڕێگایـەک بدۆزنـەوە بۆ سنوردانان بۆ پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، ئـا بەوشـێوەیە هاوڕێکاتی وەلید جیابوونـەوە تـا پیلانیتـر دژ بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ڕێکبخـەن.

## ٧٩. هەواڵێک لە جبرەئیلەوە(ﷺ)

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە جوانترین شاردا دەژیا، لە مەککەی پیرۆز، قورەیش جارێکیتر کۆبوونەوە، کە تا ئەو ڕۆژە ئەوەی بێباوەڕان لە توانایاندا بوو هەوڵیانداو درێغیان نەکرد تا ڕێگیری لە بڵاوبوونەوەی پەیامەکەی موحەممەد(ﷺ) بکەن، بەڵێنی زۆریان پێدا، لە سەروەت و سامان، لە ناوداریی و شکۆمەندی و پلەوپایە...تادوایی، بەڵام سەرکەوتوو نەبوون لە پاشگەزبوونەوەی لە کارە پیرۆزەکەی.

سەرلەنوێ گەڕانەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەمجارەیان داوایەکی جیاوازیان خستە بەردەمی و وتیان: (بە داوایەکەوە هاتووینەتە لات کە ڕەتیناکەیتەوە!) پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردن: ((ئەوە چییە؟)) وتیان: (تۆ یەک ساڵ خواکانی ئێمە بپەرستەو ئێمەش یەک ساڵ خواکەی تۆ دەپەرستین).

ئای چ داوایەکی ڕیسواکەرو ئابڕوبەرە! پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەپێناو بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام قوربانیدا بە هەموو ئەوەی هەیبوو و لەتوانایدا بوو، خوای گەورە ڕەوانەیکردووە تا خەڵکی فێربکات کە ئەو بتانە تەنها بەردێکی کەڕو کوێرن، تەنها زاتی خوای گەورە خۆی شایستەی پەرستنە، بتەکان خراپترینی خراپەکانن لەم دنیایەدا.

ئەم داوایە زۆر بێتاقەتیکرد، ئا لەو ساتەدا، جبرەئیل(ﷺ) بە سورەتێکی نوێوە هاتە خوارەوە بۆ خزمەتی، چونکە خوای گەورە لێنەگەڕا پێغەمبەرەکەی بە تەنها ڕووبەڕووی بێباوەڕان ببێتەوە.

بەڵکو سورەتێکی ناردە خوارەوە تا بەرپەچی ئەوانی پێبداتەوە، خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿قُلْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْكَـٰفِرُونَ ، لَآ أَعْبُدُ مَا تَعْبُدُونَ ،وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ، وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٌ مَّا عَبَدتُّمْ ،وَلَآ أَنتُمْ عَـٰبِدُونَ مَآ أَعْبُدُ ، لَكُمْ دِينُكُمْ وَلِىَ دِينِ﴾ (الكافرون: ١ - ٦)

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم سورەتەی بۆ خوێندنەوە، بێباوەڕان هەستیان بە سەرسوڕمان کرد، هەر بەوشێوە لەژێر کاریگەری بەرکەوتەکەدا شوێنەکەیان جێهێشت، ئەمە لە کاتێکدا گوێبیستی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز بوون بەڵام هەر پاشگەزنەبوونەوە لەو گیرییەیان، لە کاتێکدا کە ئەوان بە نائومێدی دەرۆیشتن، چەندەها پیاو و ئافرەتی نوێ دەهاتنە ناو ئاینی خوای گەورەوە.

## ٨٠. بەردەوام بڵێ إن شاء الله

قورەیش جۆرەها ڕێگایان بۆ تورەکردن و زەلیلکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەکارهێنا کە ئەقڵت پەسەندیان ناکات، ئەمجارەیان چەندەها پرسیاری نامۆیان داباراند بەسەریدا، هەریەک لەوانە لەوی پێشتری سەختتر و قورستتر بوو، پێیانوت: (ئەگەر وەڵامی پرسیارەکانمان بدەیتەوە ئەوا باوەڕت پێدێنین، بەڵام ئەگەر وانەکەیت، ئەوا ئەوەی پێمانخۆشە دەیکەین لەگەڵتدا).

دوای ئەوە کە پرسیارەکانیان ئاراستەکرد، پێغەمبەر(ﷺ) پێشبینی دەکرد خوای گەورە ئایەتی بۆ دابەزێنێ و هاوکاری بکات لە وەڵامدانەوەیان، ئینجا فەرمووی پێیان: ((سبەینێ وەڵامی پرسیارەکانتان دەدەمەوە)). ئەو گەورەترینی پێغەمبەرانی سەرزەوی بوو، بەڵام لە هەمانکاتدا جگە لە مرۆڤێک شتێکیتر نەبوو، مەعلومیشە کە هەندێجار شتی لەبیر دەچێت یان هەڵە دەکات. کاتێ بەڵێنی پێدان کە بۆ سبەینێ وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە ئەوەی لەبیرچوو بڵێ (إن شاء الله)، بۆ ماوەیەکی زۆر هەر لە چاوەڕوانیدا بوو... بەڵام لەلایەن خوای گەورەوە هیچ جۆرە وەحییەکی بۆ نەهات تا وەڵامی پرسیارەکانیان بداتەوە، لەو ساتەوەختەدا بێباوەڕان لەنێوان خۆیاندا کەوتنە پرسیارکردن لە یەکتری: (ئەوا کاتێکی زۆر تێپەڕی، بەڵام موحەممەد هەر وەڵامی پرسیارەکانی نەداینەوە). پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستی بە نارەحەتی و بێتاقەتییەکی زۆر دەکرد. دواجار خوای گەورە کە زۆری خۆشدەوێ جبرەئیلی(ﷺ) ڕەوانەکردە سەری، بەهۆی ئەوەوە وەڵامی هەر سێ پرسیارەکەی یەک لەدوای

یەک دایەوە. لە کۆتاییدا خوای گەورە بە پێغەمبەرەکەیی فەرموو:
﴿ وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴾ (الکهـف: ٢٣)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو تاقیکردنەوە سەختەدا تێپەڕی چونکە لەو ڕۆژەدا لەبیری چوو بڵێ (إن شاء الله)، بەڵام خوای گەورە لە کۆتاییدا هەر یارمەتی زاتی خۆی بۆنارد! پێغەمبەری خوایش(ﷺ) وەڵامی هەموو پرسیارەکانی دایەوە، ئەوکات بێباوەڕان سەرلەنوێ پەییان بەوەبرد کە ئەمجارەش لە بەزینیدا بەهەڵەدا چوون.

## ٨١. پیلانگێڕیی لە ڕێگای عومەرەوە

دوژمنانـی ئیسـلام سـەرلەنوێ کەوتنـەوە پیلانگێڕان دژ بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ)، کۆبوونەوەیـان کـرد، خراپەکاریـی بـە نێـو چاوانیانـەوە بەدیارکـەوت، دڵەکانیـان وەک بـەرد ڕەق بـوو، شڵەژاوییەکی زۆریـان پێوە دیاربوو، کە ئەگەر مەسـەلەکان لەسـەر ئـەم تـەرزە بەردەوامبێت، ئـەوا ژمارەیەکی زۆر لـە خەڵکی موسڵمان دەبـن، ئـەو دڵڕەقانـەش کەسـایەتییە دیـارەکان و گەورەکانـی مەککـە بـوون، زۆر بێتاقـەت بـوون بـەوەی کەسـێک بەڕوویانـدا بوەسـتێتەوەو بۆڕیان بـدات، موحەممـەد خەڵکی ئاگادار دەکرد کە پەرستنی بتـەکان کارێکـی هەڵەیـە، پێویسـتە تەنهـا خـوای گـەورە بپەرسـتن. ئەمـە چ نەفامییەکـە؟ هاوەڵگـەران گەیشـتنە ئاسـتێک کـە توانایـان نەمابـوو پێغەمبـەری خۆشەویستمان(ﷺ) ببینـن، لەبەرئەوە بڕیاری کوشتنیاندا، ئەبـو جەهـل وتـی: (هـەرکـەس موحەممـەد بکـوژێ مـن سـەد وشـتری سـورکاڵ و ڕەش و هـەزار ئۆقیـە زیـوی دەدەمـێ).

هەموویـان هەسـتیان بـە تـرس و لـەرز دەکـرد، چونکـە کوشـتنی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) شـتێکی ئاسـان نەبـوو، هەموویشـیان ئەوەیـان دەزانـی، چونکـە هـەرکات ویسـتبێتیان بیکـوژن شـتێک هاتووەتـە بەردەمیـان و ڕێگیـری لێکـردوون. ئێسـتەش بۆ ئەنجامدانـی ئـەو کـارە گەورەیەیـان پێویستییان بـە پیاوێکـی ئازاو پاڵـەوان و دەسـتپێشـخەرو هەڵمەتبـەر هەیـە.

کەسـێکی جەسـتە بەهێزیـان تێدابـوو، دیمـەن تـوڕەو سـامناک کـە هەمـووان لێـی دەترسـان، ئـەو پیـاوە کەسـایەتییەکی دیاربـوو، بـە

دادپەروەریی و یەکسانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەمووانـدا دەکرد، هەرکاتیش بیەوێت بڕیار لەسەر مەسەلەیەک بدات کە بیکات کەس ناتوانێت ڕێگیری لێبکات، لە ناکاوێکدا هەموو چاوەکان کەوتنە سەر ئەو کەسایەتییە.

ئـەو پیـاوەش متمانـەی بەخـۆی زۆربـوو، چونکـە هیـچ کـەس نەیتوانیوە لە زۆرانبازیدا زاڵببێت بەسەریدا، هەموویان بە یەکدەنگ وتیـان: (عومـەر دەتوانـێ ئـەوکارە بـکات!). وەک هاندانێکیـش وتیـان: (ئێمـە متمانەمـان بە تۆ هەیە ئەی عومـەر. وەرە بزانین چی لەتواناتدایە بیکەیت). عومـەر شمشـێری لـە کێلان دەرهێنا، خراپەکاریی لە چاوانی دەباری، دڵی پڕبوو لە ڕق و خراپەکاریی، ویستی بە زووترین کات ئەو ئەرکە کۆتایی پێبێنێ.

## ٨٢. عومەر و خوشکەکەی

ئەرقەم پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست و ئامادەبوو لەپێناو سەرخستنی ئیسلامدا قوربانی بە هەموو شتێک بدات، ئەو پیاوێکی بە شەهامەت و بەخشندە بوو، دەرگای ماڵەکەی بۆ موسڵمانان خستە سەرپشت، موسڵمانانیش عادەتیان پێوە گرتبوو کە لە ماڵەکەی ئەودا کۆببنەوەو گوێ لە پێغەمبەری خوا بگرن، بەجۆرێکی وەها کە ماڵەکەی وەک قوتابخانەیەک وابوو!

لەو ڕۆژەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵی ئەرقەم لەگەڵ موسڵماناندا کۆبوویەوە، عومەریش ئەوەی زانی، لەکاتێکدا بە توڕەییەوە ڕێی دەکرد، گەیشت بە نوعەیمی هاوڕێی، نوعەیم موسڵمان بوو بوو، بەڵام هەواڵی موسڵمانبوونی خۆی بە کەس نەدابوو، کاتێ گەیشت بە عومەر، بە دوودڵییەوە لە عومەری پرسی: (ئەی عومەر بۆکوێ دەچی؟) بە توڕەییەکەوە وەڵامیدایەوە کە: (من دەڕۆم موحەممەد بکوژم). نوعەیم زۆر ترساو وتی: (ئەی نەوەی عەبدولموتتەلیب وازت لیدێنن؟)، توڕەییەکەی عومەر ئەوەندەیتر زیادیکردو وەک شێوە پرسیاری وتی : (وادەتبینم بوویت بە شوێنکەوتەی موحەممەد؟).

نوعەیم وتی: (نەخێر بەڵام ئەی عومەر بزانە، بەرلەوە بڕۆیت بۆ لای موحەممەد یەکەمجار لە خانەوادەکەی خۆتەوە دەستپێبکە). عومەر وتی: (کێ؟)، نوعەیم وتی: (فاتیمەی خوشکت و مێردەکەی بوونەتە شوێنکەوتەی موحەممەد)، عومەر بەتەواوەتی شێتگیر بوو، ئایا ئەمە ئەقڵگیرە؟ بڕیاریدا بە خودی خۆی دڵنیابێت لە ڕاستێتی

ئەو هەواڵە. بەپەلە ڕۆیشت بۆ ماڵی فاتیمەی خوشکی.

ئا لەو ساتەدا فاتیمەو سەعیدی مێردی قورئانیان دەخوێند، کاتێ عومەر گەیشتە دەرگای ماڵەکەیان، گوێی لێیانبوو، پێشتر شتی لەوجۆرەی نەبیستبوو، ئەوە نە گۆرانییە، نە شیعرە، بەڵکو شتێکی جیاوازو جوان و خۆشە. عومەر بۆ ماوەیەک وەستاو گوێی لێگرتن، دواجار، نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕوانی بکات، بە توندی تەقەیدا لە دەرگاکەیان، خوشکەکەی زۆر ترسا، لاپەڕە قورئانەکانی شاردەوە ئینجا دەرگاکەی کردەوە، کاتێ عومەری برایی بینی کە لە دەرگاکەدا وەستاوە، لە شوێنی خۆی لە ترساندا وشک بوو، نەیدەزانی چیبڵێ.

## ٨٣. موسڵمانبوونی عومەر

عومەر بەو تووڕەییەوەو بەو نیازەوە ڕۆیشت تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکوژێ. بەڵام لە ڕێگادا ئەوەی زانی کە خوشکەکەی باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، تووڕەییەکەی کڵپەی سەند، ئاراستەی ڕۆیشتنەکەیی گۆڕی و ڕۆیشت بۆ ماڵی خوشکەکەی، ئا لەوکاتەدا فاتیمەو مێردەکەی چەند ئایەتێکی قورئانیان دەخوێند، ئەو وشە نایابانە چوون بەگوێی عومەردا بەڵام نەیتوانی تێبگات بزانێ ئەوانە چین، کاتێ خوشکەکەی دەرگاکەی کردەوەو چووە ژوورەوە، عومەر سەیرێکی دەوربەری کردو پرسیاری لێکرد: (ئا ئێستە چیتان دەخوێند؟) فاتیمە وەڵامیدایەوە: (قسەمان دەکرد)، عومەر بەتووڕەییەکەوە قیڕاندی بەسەریدا: (باوەڕ ناکەم! کەواتە ئەوەی من بیستوومە ڕاستە، ئێوە باوەڕتان بە موحەممەد هێناوە!) بەرلەوە ڕستەکەی تەواو بکات، شەپەزلەیەکی کێشا بە ڕوومەتیدا، ئەویش کەوتە سەرزەوی، بەڵام هەستایەوەو وەڵامی براکەیی دایەوەو وتی: (چیدەکەیت بیکە! من و مێردەکەم موسڵمان بووین و باوەڕمان بە خواو بە پێغەمبەرەکەی هێناوە!) پاشان شایەتومانی هێنا، ئالەوێدا عومەر زۆر شڵەژاو هەستی بە ورووژاندنی مەسەلە دژ بەیەکەکانی ناخی خۆی دەکرد، چونکە ئەوەی لە خوشکەکەیی بیست هەر لەوە دەچوو کە گوێی لێبوو دەیخوێند، ئینجا پێیوت: (ئەو لاپەڕەیەم بدەرێ).

فاتیمە وڵامیدایەوە: (بڕۆ دەستنوێژ بگرە ئینجا بیخوێنەرەوە)، کتوپڕ ڕوخساری عومەری تووڕە گۆڕدرا، هاتەوە سەرخۆی و

نەرمبوویەوە. عادەتی وابوو لەوجۆرە حاڵەتانەدا هاواری دەکردو دەیقڕاند، بەڵام ئێستا، وا دەڕوات دەستنوێژ دەگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ لایان، فاتیمەش ئایەتە پیرۆزەکانی قورئانی پێدا، عومەر کە خوێندنەوەی باشی هەبوو ئەو ئایەتانەی خوێندەوە کە لەم دواییانەدا هاتبوونە خوارەوە، هەستی بە سەرسوڕمان کرد، کاریگەرییەکی زۆریان لەسەری دروستکرد، هەروەها هەستی بە سنگفراوانی و گەشیی کرد کە جەستەیان داپۆشی. ئایا چی بەسەر عومەردا هات کە تا کەمێک لەمەوبەر دەیویست پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکوژێ؟ وا ئێستە بەمجۆرە شمشێرەکەی دەخاتەوە ناو کێلانەکەی.

ڕوخساری عومەر ئاسەواری هیچ جۆرە تورەییەکی پێوە نەما، هەموو هەڵچوونە پێشووەکانی باریانکرد، بیریکەوتەوە کە پێشتر ویستویەتی چیبکات، لە ناخیدا هەستی بە خەجاڵەتی دەکرد، چۆن دەبێت ئازاری کەسێک بدات کە ئەو گوفتارە جوانە بەسەر خەڵکیدا دەخوێنێتەوە؟ فرمێسک لە چاوانی دادەبارین، بەڵام هەر هەوڵیدا پێبکەنێ، لە کاتێکدا کە دەیوت: (ئەمە گوفتاری مرۆڤ نیە) ڕوومەتی لە بەختەوەریدا دەدرەوشایەوە.

پاشان عومەر وتی: (پێغەمبەری خوام نیشانبدەن). ئەوانیش پێکەوە وتیان: (ئەو لە ماڵی ئەرقەمە)، عومەر ویستی زوو بەزوو بە خزمەتی بگات.

## ٨٤. عومەر و پێغەمبەری خوا(ﷺ)

عومەر لەوپەڕی بەختەوەریدا بوو، دڵی پڕبوو لە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەیویست ئەو ڕوخسارە جوانەی ببینێ کە بە نووری خوا دەدرەوشایەوە ئەویش لەدوای ئەوە کە هەر هەستێکی ڕق و کینە لە دڵیدا لەبەرانبەریەوە بوونی نەما. ژمارەیەک لە موسڵمانان لە دەرەوەی ماڵی ئەرقەم خەریکی چاودێری و پاسەوانی پێغەمبەری خۆشەویستمان بوون، کاتێ عومەریان بینی کە بە هەنگاوی بەپەلە بەرەو ڕوویان دەهات و شمشێرەکەی هەڵواسیبوو بە ناوقەدیەوە، ترسان لێی، یەکێک لە پاسەوانەکان چووە ژوورەوەو موسڵمانانی ئاگادارکرد کە ئەوا عومەر هات، ئالەوێدا حاڵەتی شڵەژان ماڵەکەی گرتەوە، بەڵام پێغەمبەرمان(ﷺ) هێمن و لەسەرخۆ و ئاسودە بوو، ئەو ترس و تۆقینەی بەسەر موسڵماناندا هات هێوری کردنەوە، ئینجا بە حەمزەی فەرموو: (حەمزە لێیگەڕێ). عومەر بە پڕچەکی و کەوان و تیرەوە چووە ژوورەوە، ئەوەش سیمایەکی بە هەیبەت و سامناکی زیاتری پێدابوو، چەکەکەی تریشی هەڵواسیبوو بەناو قەدیەوە، هات ڕووبەڕوو لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەستا، زەردەخەیەکی قووڵ ڕوخساری داپۆشی کە ڕەنگدانەوەی ئەو خۆشەویستییە بوو لە دڵیدا جێگیر بوو بوو، چاوانی لە بەختەوەریدا دەدرەوشانەوە، لەبەردم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەستا، بێدەنگی و ئارامی باڵیکێشا بەسەر هەمووانـدا، ئەوانەی لەوێبوون لە چاوەڕوانیدا بوون تا بزانن چی ڕوودەدات، ئالەوێدا، موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) کە پێغەمبەری خۆشەویستییە پرسیاری لە عومەر

کردو فەرمووی: (ئەی کوڕەکەی خەتتاب ئایا کاتی نەهاتووە؟!)

عومەر وتی: (من دەڵێم أشهد أن لا إله إلا الله وأنك رسول الله). موسڵمانان زۆر دڵخۆشبوون و لە خۆشیدا باوەشیان بەیەکتریدا کرد، پێغەمبەریش(ﷺ) لە هەموویان دڵخۆشتر بوو. زۆر حەزیدەکرد کەسێکی ئازاو ڕاستڕەو و ڕاستگۆ و بەخشندەی وەک عومەر موسڵمان ببێت، زۆر لە خوای گەورە پاڕایەوە تا ئیسلام پێی سەربەرزتر بێت، دواجار خوای گەورە پاڕانەوەکەی گیراکرد، بەمشێوەیە عومەر هاتە ڕیزی موسڵمانان کە ئازاترین و بەهێزترین و بە هەیبەتترینی پیاوانی قورەیش بوو، لەپێش ئەمیشەوە ئەبوبەکر و عەلی و عوسمان موسڵمان بوو بوون، عومەر سەرەتا بۆ ئەوە چوو موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) بکوژێ، بەڵام کە گەڕایەوە پیاوێکی تەواو جیاواز بوو، ئا لەو ڕۆژەدا بەختەوەریی سەراپای ماڵی ئەرقەمی گرتەوەو دەنگی الله أكبر لە تەواوی مەککەدا دەنگیدایەوە.

## ٨٥. عومەر موسڵمانبوونی خۆی بۆ قورەیش ئاشکرا دەکات!

عومەر بە موسڵمانبوونەکەی زۆر دڵخۆشبوو، کەسێکی بەهێز و ئازاو چاونەترس بوو، بۆیە بڕیاریدا موسڵمانبوونی بە بێباوەڕانی قورەیش ڕابگەیەنێ، ئینجا پرسیاری کرد: ئایا چ کەسێ لە قورەیشدا هەیە قسەوباس زوو بگوێزێتەوە؟ وترا: جومەیل کوڕی موعەممەری جومەحی، ڕۆیشت بۆ لای و پێیوت: ئەی جومەیل ئایا تۆ زانیوتە من موسڵمان بووم و چوومەتە ناو ئاینەکەی موحەممەد؟ جومەیل خێرا لە شوێنی خۆی هەڵبەزی و بە ڕاکردن خۆی گەیاندە شوێنی کۆبوونەوەکانی قورەیش و یانەکانیان، ئینجا لەسەر دەرگاکەیان وەستاو بە هەموو دەنگی قیڕاندی: ئەی قەومی قورەیش، ئایا نازانن کە عومەری کوڕی خەتتاب بووەتە گاور، عومەریش لە پشتییەوە وەستابوو وتی: درۆ دەکات! بەڵکو من موسڵمان بووم، شایەتومانم هێناوە کە لا إلـه إلا اللـه وأن محمداً عبـده ورسـوله، بێباوەڕانی قورەیش هێرشیان کردە سەری و داباریین بەسەریدا، عومەر بۆ ماوەیەک لەگەڵیاندا بە جەنگ هات تا ماندوو بوو و لەسەر زەوی دانیشت و ئەوانیش هێرشیان کردە سەری، عومەر دەیوت: چی دەکەن بیکەن! لەو کاتەدا عاصی کوڕی وائیلی سەهمی هات ڕزگاریکرد لە دەستیان و پێیوتن: کەسێکە شتێکی بۆ خۆی هەڵبژاردووە، چیتان لێی دەوێ؟ ئەوانیش وازیان لێهێنا.




# Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel

**Description**

﷽
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

داوای ڕیکلام مەکە نایکەین🚫

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

## ٨٦. کۆچی موسڵمانان

لەدوای موسڵمانبوونی عومەر و حەمزە، هاوەڵگەران بازنەی ئابڵۆقەدان و تاساندنی باوەڕدارانیان بەرتەسکتر کردەوە، بە نهێنی دەستگیریان دەکردن و ئەشکەنجەیان دەدان، ئەم کارەش موسڵمانانی زۆر بێتاقەت کردبوو، زۆر ماندووی کردبوون، هەربۆیە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و سکالایای خۆیان گەیاند، ئەویش هەر وەک ئەوان زۆر وەڕەس و بێتاقەت بوو، بەڵام بەئارامگرتنەوە لە چاوەڕوانیدا بوو، پاشان فەرمانی بە موسڵماناندا کۆچبکەن بۆ حەبەشە، بەڵام خودی خۆی(ﷺ) نەیدەتوانی کۆچبکات تا خوای گەورە فەرمانی پێنەدا، بەمشێوەیە، بڕیاریدا بەرەنگاری هەبوو فشارەکان ببێتەوە، مەککە بەجێنەهێڵێ و لە کەعبە دوورنەکەوێتەوە. بەڵام باوەڕداران جگە لە کۆچکردن چارەسەرێکی تریان لەبەردەمدا نەبوو.

موسڵمانان بە نهێنی کەوتنە خۆئامادەکردن بۆ ڕۆیشتن، لە کاروانێکی سەد کەسیدا کەوتنەڕێ، بەلایانەوە نارەحەت بوو مەککەی پیرۆز کە تیایدا لەدایکبوون و تیایدا ژیاون جێبهێڵن، بەڵام ناچاربوون ئەو ڕێگایە بگرنەبەر تا بتوانن بە ئارامی و بە ئاشتی سروتە ئایینییەکانیان ئەنجامبدەن، دواتر بە ماوەیەکی کەم هاوەڵگەران زانیان کە کۆچیانکردووە بۆ حەبەشە، زوو بەزوو خۆیان پڕچەک کردوو کەوتنە شوێنیان، قورەیش پێیخۆش نەبوو دانیشتوانی دەوڵەتانیتر بزانن کە کۆتا پێغەمبەر دەرکەوتووە، چونکە لەوە دەترسان کە ئەگەر بێتو خەڵکی ئەوە بزانن ئەوا بە لێشاو

دەچنەناو ئەو ئاینە نوێیەوە، بەم هۆیەوە هاوەڵگەران هەموو توانای خۆیان بەخەرجدا تا موسڵمانان لە بڵاوبوونەوە بوەستێنن.

زۆری نەخایاند هاوەڵگەران بە مەبەستی وەستاندنی موسڵمانان گەیشتنە حەبەشە، دووانیان چوونە لای نەجاشی پادشای حەبەشە، نەجاشی پادشایەکی گاور بوو بەڵام فەرمانڕەوایەکی دادپەروەر بوو، پشتگیری لە هەق و ڕاستی و ستەملێکراوان دەکرد، لەدوای ئەوە کە شاندەکەی قورەیش دیارییەکانیان پێشکەشی پادشا کرد، پێیانوت: (ئەی پادشا! تاقمێک لە هەرزەکارە خراپەکانمان هاتوونەتە ناو شانشینییەکەی تۆوەو خۆیان پەناداوە، ئاینێکیان هێناوە نە ئێمە دەیناسین و نە ئێوەش، لە ئاینەکەی ئێمە جیابوونەتەوەو نەشهاتوونەتە سەر ئاینەکەی ئێوە، گەورە پیاوانی قەومەکەیان لە باوک و لە مام و لە هۆزەکانیانەوە ئێمەیان ناردووەتە لای ئێوە تا بیانگێڕنەوە بۆیان، چونکە ئەوان باشتر دەزانن کە ئەوانە چ فیتنەیەکیان بەرپاکردووە).



پادشا حەزی بەوەبوو زیاتر ببیستێت و بزانێت، ئایا ئەو ئاینە نوێیە چییە کە باسیدەکەن؟ بەڵام هاوەڵگەران درێژەیان بە قسەکانیانداو وتیان: (ڕادەستی ئێمەیان بکەنەوە ئێمە خۆمان بەرپرسین چییان لەگەڵ دەکەین).

پیاوانی دەوروبەری پادشا بڕوایان بەو بەڵگە بەهێزەیان کرد، بۆیە ڕازیبوون و وتیان: (ئەی پادشا ئەم دوو پیاوە ڕاست دەکەن! چونکە قەومەکەیان بەرچاوڕوونترن پێیان و باشتر دەزانن کە چییانکردووە، کەواتە بیانگێڕەرەوە بۆیان تا خۆیان بزانن بڕیاریان بە چییە بۆیان). بەڵام پادشا کەسێکی دادپەروەر بوو، لەبەرئەوە وای بە باشزانی بە جوانی بیر لە مەسەلەکە بکاتەوە، پەلە نەکات لە بڕیاردانەدا.

## ٨٧. پادشای چاکەخواز

پادشا دڵنیا نەبوو لەو دوو پیاوە کە هاتوونەتە لای و داوای گێڕانەوەی ئەو موسڵمانانەی لێدەکەن کە پەنایان هێناوە تا پادشا بیانپارێزێ، بۆیە هەر زوو تێگەیشت کە دڵی هاوەڵگەران پڕە لە ڕق و کینە، جا چونکە خۆی لەسەر سەرخستنی هەق و ئاشتی ڕاهاتبوو، وتی: (نا سوێند بەخوا ڕادەستی کەسیان ناکەم، تا خۆم بانگیان نەکەم و پرسیاریان لێنەکەم تا بزانم چی بۆ ئەوان باشە، جا ئەگەر وەها بوون کە ئەو دوو پیاوە دەیڵێن ئەوا ڕادەستیان دەکەم پێیان، ئەگەر وایش نەبوون، ئەوا دەیانپارێزم و تا ئەوان لە پەنامدا بن منیش بەجوانترین شێوە پەنایان دەدەم).

دەستوبرد پادشا داوای لە پیاوەکانی خۆیکرد موسڵمانەکان بێنن، کاتێ هاتنە لای پادشا چەند قەشەیەکی گاوریش لەگەڵ پادشا بوون، پادشا پرسیاری لە موسڵمانان کردو وتی: (ئەوە ئەو ئاینە چییە وا داتانهێناوە بۆ خۆتان و بەهۆیەوە دوورکەوتوونەتەوە لە ئاینی قەومەکەتان، نەهاتوونەتە ناو ئاینەکەی من و نە چوونەتە سەر ئاینی قەومەکانی تریش، موسڵمانان لەنێوان خۆیاندا جەعفەری کوڕی ئەبو تالیبیان هەڵبژاردبوو تا وتەبێژی ئەوان بێت، چونکە کەسێکی قسەزان و ڕەوانبێژ بوو، ڕاستەوخۆ وەڵامی پادشای دایەوەو وتی: (ئەی خاوەن شکۆ، پرسیاریان لێبکە ئایا ئێمە کۆیلەین یان ئازادین؟ جا ئەگەر ئێمە کۆیلە بین ئەوا لەگەڵ گەورەکانمان بمانهێڵەرەوەو بماندەرەوە دەستیان).

نەجاشی ئاوڕیدایەوە بەلای دوو نێردراوەکەی قورەیشداو پرسیاری لێکردن: (ئایا ئەوانە کۆیلەی ئێوەن؟)، وەڵامیاندایەوە کە: (ئازادن). جەعفەر وتی: (پرسیاریان لێبکە ئەگەر خوێنێکمان بە ناڕەوا ڕشتووە با تۆڵەمان لێبکەنەوە؟).

نەجاشی ئاوڕیدایەوە بەلای دوو نێردراوەکەداو پرسیاری لێکردن: (ئایا ئەم کەسانە بە ستەم کەسێکیان کوشتووە؟ وتیان: (نەخێر، یەک دڵۆپە خوێنیان نەڕشتووە!)

ئینجا سەرلەنوێ جەعفەر وتی: (پرسیاریان لێبکە ئەگەر ماڵی خەڵکیمان بە ناڕەوا بردووە با ئێستە بۆیان بگێڕینەوە؟)

پادشا بە سەرسوڕمانەوە چاوی بڕییە جەعفەر، زۆر سەرسامبوو بە شێوازی قسەکردنی، بە ئازایەتییەکەی، بە حیکمەتی، ئینجا، لایکردەوە بەلای دوو هاوەڵگەرەکەدا و پرسیاری لێکردن: (ئایا ئەمانە قەرزێکیان لەسەرە؟) شاندەکەی قورەیش واقی وڕماو هەر زوو وەڵامیدایەوە: (نەخێر، هیچ قەرزێکی ئێمەیان لەسەر نیە!). پاشان پادشا پرسیاری لێکردن: (ئەی کەواتە چیتان لێیان دەوێ؟) بە دەنگێکی پڕ لە ڕق و کینەوە وتیان: (وازیان لە خواکانمان هێناوەو باوەڕیان بە موحەممەد کردووە!).

لە کتوپڕێکدا بێدەنگیی باڵیکێشا بەسەر هۆڵەکەدا، هەموو ئەوانەی لە کۆشکەکەدا بوون بە مەبەستی دەستخستنی زانیاری زیاتر سەیرێکیان کردن و هەمووان یەک پرسیار بەبیرو هۆشیاندا هات کە: موحەممەد کێیە؟ ئایا ئاینێکی نوێی هێناوە؟ ئەی ئەو ئاینە کامەیە؟

## ٨٨. بڕیارێکی دادپەروەرانە

نەجاشی لە ناوەڕاستی ئاپۆڕای خەڵکەکەدا بوو، ئاخاوتنی لەگەڵ جەعفەردا دەکرد کە ئازایانە لەبەردەمیدا وەستابوو، جەعفەر باسی ئاینی نوێ و پێغەمبەری نوێی بۆ دەکرد، پادشا بە ڕوونی بۆی دەرکەوت کە جەعفەر پیاوێکی چاک و ڕاستگۆیە، ئینجا پرسیاری لێکرد: (ئەو ئاینە نوێیە چییە کە باوەڕتان پێیهێناوە؟) جەعفەر وەڵامیدایەوە کە: (ئەی پادشا، ئێمە خەڵکانێ بووین بتەکانمان دەپەرست، گۆشتی ئاژەڵی مرداربوومان دەخوارد، خراپەکاریمان ئەنجامدەدا و سیلەی ڕەحممان دەپچڕاند، مانای دراوسێیەتیمان نەدەزانی، بەهێزمان لاوازمانی قوتدەدا، هەر لەسەر ئەو بارە نالەبارە ماینەوە تا خوای گەورە پێغەمبەرێکی لە خۆمان بۆ ڕەوانەکردین، ڕەچەڵەک و ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی و پاکداوێنییەکەی لامان ئاشکران، بانگهێشتی کردین بۆ لای خوای گەورە، تا بە تاک و تەنهای بزانین و بیپەرستین، خۆمان داماڵین لە پەرستنی هەرشتێ جگە لەو خوایە کە پێشتر خۆمان و باووباپیرانمان ئەو بەردو بتانەمان دەپەرست). پادشا لێی پرسی: (پێمانبڵێ بزانین چی فێرکردوون؟) جەعفەر لەدوای ئەو هاندانەی وتی: (فەرمانی پێداوین ڕاستگۆبین، ئەمانەتپارێز بین، سیلەی ڕەحم بەجێبگەیەنین، لەگەڵ دراوسێیاندا باش بین، خۆمان لە قەدەغەکراوەکان بپارێزین، خوێن نەڕێژین، ڕێگیری لێکردووین بەدڕەوشت نەبین و شایەتی درۆ و قسەی خراپ نەکەین، ماڵی هەتیو نەخۆین، خراپەکاری نەدینە پاڵ ئافرەتانی پاکیزە، هەروەها فەرمانی پێداوین تەنها خوای گەورە

بپەرستین و هاوەڵی بۆ دانەنێین، فەرمانی پێداوین نوێژو ڕۆژوو بکەین و زەکات بدەین، ئێمەش بڕوامان پێکردو باوەڕمان پێهێناو بووینە شوێنکەوتەی لەسەر ئەوە کە لە خوای گەورەوە بۆی هاتووە، ئەوەی بۆمان حەڵاڵکراوە لامان حەڵاڵەو ئەوەی لێمان حەرامکراوە لامان حەرامە).

گرنگیپێدانی پادشا تا دەهات زیاتر دەبوو، هەربۆیە وتی: چیتریش؟) جەعفەر وەڵامیدایەوە کە: (پادشا قەومەکەمان هەر ئەوەیان لێهات هەڵیانکوتایە سەرمان و بە سەختترین سزا سزایاندایین تا پاشگەزمان بکەنەوە لە ئاینەکەمان و بمانگێڕنەوە سەر پەرستنی بتەکان، کاتێکیش ستەمیان لێکردین و ژێردەستەیان خستین و تەنگیان پێهەڵچنین و بوونە ڕێگر لەنێوان ئێمەو ئاینەکەماندا، هاتین بۆ وڵاتەکەی تۆ و تۆمان هەڵبژارد بەسەر کەسانیتردا، حەزمان لەوەکرد بێینە پەنای تۆ، ئومێدمان وایە لە پەنای تۆدا ستەممان لێنەکرێت).



پادشا قسەکانی جەعفەر چوونە دڵی، دیسان لێی پرسی: (ئایا شتێک لەوەت پێیە کە پێغەمبەرەکەتان لە خواوە بۆی هاتبێ؟) جەعفەر وتی: (بەڵێ)، لێرەدا چەند ئایەتێکی لە سورەتی مەریەم بۆ خوێندەوە کە باسی عیسا پێغەمبەرو دایکی دەکات(ﷺ). ئەو لە خوێندنەوەدا بوو فرمێسک لە هەردوو چاوی پادشا جۆگەلەیان بەست، تا ڕیشەکەی تەڕبوو، ئەو فرمێسکانە بەڵگەبوون لەسەر باوەڕهێنانی پادشا بە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ).

قەشەکانیش گرنگیپێدانی خۆیانیان نیشاندا، چونکە لە کتێبە پیرۆزەکانیاندا سیفەتەکانی پێغەمبەری خوایان خوێندبووەوە، ئەو سیفەتانە بەتەواوەتی دەقاودەق بوون لەگەڵ سیفەتەکانی پێغەمبەرماندا. فرمێسکی خۆشی لە چاوانی ئەوانیش دباری، وتیان تەواو ئەمە ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەیە، ئەو لە مەککە

سەریهەڵدا. ئالەوێدا پادشا سەیرێکی هاوەڵگەرەکانی کردو وتی: (بڕۆن، نەبەخوا هەرگیز ئەوانە ڕادەستی ئێوە ناکەم).

دوو نێردراوەکەی قورەیش بڕوایان بەوە نەدەکرد کە دەگوزەری، پادشاش هەموو دیارییەکانی ڕادەستکردنەوە و ڕوویکردە موسڵمانەکان وتی: (ئەمەو ئەوەی عیسا هێناویەتی هەردووکیان لە یەک چرای ڕووناککەرەوەوە هاتوونەتە دەر).

ئابەمجۆرە موسڵمانان بە بێوەی و ئارامی لە حەبەشەدا مانەوەو ژیانیان بەسەر دەبرد، ئیسلامیش وایلێهات لە هەموو شوێنێک بڵاودەبوویەوە، خەڵکیش دەیانبیست کۆتا پێغەمبەر کە ناوی موحەممەدە ڕەوانەکراوەو لە مەککە دەژی.

## ٨٩. لەتبوونی مانگ

جارێکی تر هاوەڵگەران هاتن دەورەی پێغەمبەر خوایان(ﷺ) دا، پێداگرییان کرد لەسەر دەرکردنی، پلانی نوێیان بریتی بوو لە داواکردنی مەسەلەیەکی مەحاڵ، بۆئەوەی ئەگەر نەیتوانی بیکات بکەونە لاقرتیکردن پێی.

بەمشێوەیە پێیانوت: (ئادەی مانگمان بۆ بکە بە دوو کەرتەوە، نیوەی لەسەر ئەو کێوە بێت و نیوەکەی تری لەسەر ئەو کێوەی تر). پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردن: ((ئەگەر ئەوە بکەم، ئیتر باوەڕدێنن؟)) وتیان (بەڵێ).



خوای گەورە توانایەکی گەورەی بە پێغەمبەرەکەی دابوو لەسەر بەدیهێنانی موعجیزەکان، ئەویش وەک پێغەمبەرانی تر. ئەگەر بیویستایە ئەوا خوای گەورە ئەوەی بۆ دەکرد، چەندەها کاری سەرسوڕێنەر لەسەر دەستیدا بەویستی خوای گەورە جێبەجێ دەبوون. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) دەویست خەڵکی خۆیان بیربکەنەوەو ژیرانە ڕێگای ڕاستی بدۆزنەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) وەستاو لە خوای گەورە پاڕایەوە ئەو خەڵکە هیدایەت بدات، پاشان داوای لێکرد ئەوەی پێبدات کە ئەوان لێی داوا دەکەن. دوای ئەوە، بە پەنجەی ئاماژەی بە مانگ کرد. مانگی زیوین وەها دەرکەوت وەک بڵێی بەرەو ئەوان دادەبەزێتە خوارەوە. بە پەنجەی ڕاستی هێڵێکی لەسەر مانگ کێشا بەرەو زەوی.

لەو ساتەدا کەس باوەڕی نەکرد لەوەی کە ڕوویدا. مانگ لەتبوو. نیوەی لەسەر کێوەکە نیشتەوەو نیوەکەی تری لەسەر کێوێکەی

تر. بەڕاستی خوای گەورە دوعای پێغەمبەرەکەیی قوبوڵکردو مانگی کرد بە دوو کەرتەوە. ئا لەو ساتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیفەرموو پێیان: ((شایەتومان بێنن، شایەتومان بێنن)).

بێباوەڕان واقیان وڕما، ئەوەی کە ڕوویدا باوەڕیان پێینەکرد، پێشتر بەڵێنیان بە پێغەمبەر(ﷺ) دابوو کە ئەگەر داواکەیان جێبەجێ بکات باوەڕی پێبێنن. ئایا ئێستە چیدەکەن؟ کەوتنە سەیرکردنی یەکتری، ئەمە لە کاتێکدا لێوەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدەم زیکرو سوپاسکردنی خوای گەورەوە دەجوڵان کە لەو موعجیزەیەدا پشتگیری لێکرد، لە کاتێکدا مانگ لەوەدا بوو بگەڕێتەوە دۆخی جارانی، ترس و تۆقین زاڵبوو بەسەر بێباوەڕاندا، وتیان: (موحەممەد جادووی لێکردین!). ئەم موعجیزەیە لە ئاسمانی شەوێکی زیویندا ڕوویدا کە بە ئەستێرەکان ڕۆشن بووبوویەوە. بەڵام بێباوەڕان هەر لەنێو خۆیاندا پرسیاریان لە یەکتر دەکرد ئایا ئەمە خەو بوو بینیان یان چی؟ یان ئەوەیە کە موحەممەد پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە؟

## ٩٠. ئایا ئێوەش مانگتان بینی

مانگ کە بە ئاماژەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووبە دوو کەرتەوە. بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر، هەواڵەکە لە مەککە بڵاوبوویەوە، قسەکان هەر بەدەوری ئەم موعجیزەیەدا دەسوڕانەوە. لە کاتێکدا باوەڕداران باسیان لە جوانی ڕووداوەکە دەکرد، بێباوەڕان دەیانوت هەرگیز ناکرێ ئەوەی کە شەوی ڕابردوو بینیویانە ڕاستییەکی هەبێت بەڵکو ئەوە جادووە، هەندێکیان بە هەندێکی تریانیان دەوت: (با بڵێین جادووی لێکردووین). بەڵام دەیانزانی کە کاریگەری ئەو جادووە ناتوانێت درێژبێتەوە بۆ ناوچە دوورەکان. بۆیە بڕیاریاندا بوەستن تا هەندێ کاروانچی لە شوێنە دوورەکانەوە بگەڕێنەوەو پرسیاریان لێبکرێ ئایا ئەو موعجیزەیەیان بینیوە یا نا؟ بەمشێوە تۆقرەیان لێبڕابوو چاوەڕێی گەڕانەوەی ئەوانیان دەکرد.

هەرکە کاروانچییەکان گەیشتنەوە جێ، بێباوەڕان بە هەڵەداوان بەرەو ڕوویان ڕۆیشتن، پرسیاریان لێکردن ئایا شەوی ڕابردوو شتێکی نامۆیان لە ئاسماندا بەدیکردووە. ئەوانیش دڵنیایان کردن کە مانگ بووە بە دوو کەرتەوە، پاشایانیش یەکی گرتووەتەوە. بە جۆش و خرۆشەوە و بە درێژەپێدانێک کەوتنە باسکردنی ئەوەی بینیبوویان. جا وێڕای ئەوە کە بێباوەڕان ئەوەیان لە کاروانچییەکان بیست بەڵام هەر وەفایان بە بەڵێنەکەیان نەکرد. لەجیاتی ئەوە دەیانوت جادووی موحەممەد گەیشتووەتە ئاسمان. بەڵام وێڕای هەموو ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوامبوو لە پاڕانەوە بۆ بێباوەڕان کە واز لەو ملەجیڕەیە بێنن. دەیویست ئەوانیش بچنە

بەهەشت. لەزەت لە نیعمەتەکانی ببەن، چونکە بەهەشت جگە لە کەسانێ کە خوای گەورەو پێغەمبەریان خشبوویت کەسیتری تێناچێت. کەس شایستەی نیە جگە لە کەسانێ باوەڕیان بە خوای گەورە کردبێ و کردەوەی چاکی لە ژیانیدا ئەنجامبدابێت. پێغەمبەر لەوە لێیان دەترسا پەنجەی پەشیمانی خۆیان بگەزن و سزابدرێن. لەبەرئەوە هەتا هەرچەندە بەرەنگاری پێغەمبەر(ﷺ) ببنەوەو ملەجیڕە بکەن ئەو هەر بە ئارامگرتنەوە چاوەڕێی دەکرد تا ڕۆژێ لە ڕۆژان حەقیقەت ببینن. چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کە بانگەواز بۆ خۆشەویستی و ئارامگرتن و خێرو چاکە دەکات دڵی هیچ جۆرە ڕق و کینەو بوغزو خراپەیەکی تێدا نیە. ئەی ئەو ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) نیە کە خوای گەورە ڕەوانەیکردووە بۆ سەراپای مرۆڤایەتی؟

## ٩١. داماویی و برسێتیی

حەوتەمین ساڵی پێغەمبەرێتی موحەممەد(ﷺ) هاتەپێش، لەماوەی ساڵانی ڕابردوودا، هاوەڵگەران جۆرەها ستەم و چەوساندنەوەیان دژ بە موسڵمانان ئەنجامدا، بەجۆرەها شێواز ئەشکەنجەی موسڵمانایان دەدا، بەردبارانیان دەکردن، لێیاندەدان، دەریاندەکردن، کەچی وێڕای هەموو ئەوانەو هیتریش تاقە موسڵمانێک لە ئاینەکەی پاشگەز نەبوویەوە، لەگەڵ ئەو هەموو چەوساندنەوەیەدا قورەیش نەیتوانی ڕێگیری لە خێرا بڵاوبوونەوەی ئیسلام بکات، ئەمەش بووە مایەی ترس و لەرز لای دوژمنانی ئەم ئاینە.

هاوەڵگەران بڕیاریاندا ئەمجارە شێوازێکی جیاواز تاقیبکەنەوە. گومانیان وابوو دەتوانن پێغەمبەرو(ﷺ) باوەڕداران لە ئاینەکەیان دووربخەنەوە، پلانەکەیان وەهابوو کە پێغەمبەرو خزمانی لە کۆمەڵگای مەککە داببڕن، هیچ شتیان پێنەفرشن و هیچیشیان لێنەکڕن تا بێبەشیان بکەن لە خواردن و خواردنەوە.

هاوەڵگەران تەواوی خەڵکی مەککەیان ئاگادارکرد بە پلانەکەیان، ڕێگیرییان لێکردن لە پێشکەشکردنی هەرجۆرە هاوکارییەک بە پێغەمبەر(ﷺ) و بە خزمەکانی لە بەنو هاشم ئیتر موسڵمانبن یان نا چوونیەکە. خەڵکی مەککە سەریان سوڕما کە ئەو دابڕانە خزمە بێباوەڕەکانی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) گرتووەتەوە، ئەمە بۆ ئەوەبوو تا ئەو شێوازە هیوایەک لای بێباوەڕان دروستبکات کە خێزانەکانی خزمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) داببڕێن لێی، ئەوکات هەرجۆرە پشتگیرییەک لە دەستدەدات، بەتەنهاو بێ پشتیوان دەمێنێتەوە.

لەدوای ئەو بڕیارە، هاوەڵگەران بازرگانیکردنیان لەگەڵ موسڵمانان و لەگەڵ پێغەمبەرو هەموو خزمەکانیدا وەستاند، ڕەتیانکردەوە خۆراک و شمەکیان پێبفرۆشن، نابێ هیچ شتێکیشیان لێوەربگرن، بەم پێیە هەستان بەڵێننامەیەکیان نوسی و هەڵیانواسی بە دیواری کەعبەی پیرۆزەوە، بەمشێوەیە، قێزەونترین دابڕان لە مێژوودا دەستیپێکرد.

تا ئەو کاتە، خزمانی پێغەمبەر(ﷺ) لە ناوچە جیاوازەکانی مەککەدا دەژیان، بەڵام لەدوای ئەو قەدەغەکردنە بڕیاریاندا پێکەوە بژین و یارمەتی یەکتری بدەن، هەربۆیە هەموویان گواستیانەوە بۆ نزیک ماڵی ئەبو تالیب، ئەو جێگایەش پێیدەوتری دۆڵی ئەبو تالیب.

ئیتر لەو ڕۆژەوە، ڕۆژانی چەوساندنەوەو برسێتی دەستییان پێکرد، ڕێگا بە هیچ کەس نەدرا دۆڵی ئەبو تالیب جێبێڵێ، بێباوەڕان قەدەغەی چوونە ناوەوەی خواردنیان بۆ ئەو ناوچەیە کرد، هەر زوو منداڵان کەوتنە کرووزانەوە بەدەست برسێتییەوە، پیرەکان تووشی نەخۆشی بوون، کەسە لاوازەکان ئەوندەیتر لاوازی ڕووی تێکردن، برسییەکان لە سەرە ڕێگاکان کەوتنە کۆکردنەوەی گەڵای درەختەکان و دەیانخواردن، ئاهوناڵەی ئێش و ئازارو چەرمەسەری لەگەڵ هەموو بەیانی و ئێوارەیەکدا لە دۆڵی ئەبو تالیب بەرزدەبوویەوە، ئەوانەی بەوناوەدا تێدەپەڕین گوێیان لە قیژەو کرووزانەوەی منداڵە برسییەکان و ئاهوناڵەی نەخۆش و داماوەکان بوو.

بەڕاستی موسڵمانان گەورەترین ستەمیان لە سەر ڕووی زەوی لێکرا، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) جگە لەوە کە ڕێنمایی بە خزمەکانی و موسڵمانان دەدا ئارامگربن و هیواخوازبن بە کرانەوەی دەرووی خێر لە توانایدا نەبوو شتێکیتر بکات.

## ٩٢. گریانی منداڵە برسییەکان

لەماوەی دابڕانەکەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خزمەکانی خستە ژێربالی خۆیەوە، خاتو خەدیجە بە سروشتی خۆی گەورەترین یارمەتیدەری بوو، هەموو سەروەتەکەیان خەرجکرد بەسەر خزمەکانیاندا، کاتێ هیچیان نەما، بەوپەڕی ئارمگرتنەوە چاوەڕوانی دەرووی خێر بوون.

لەلایەکیترەوە، ئەبو تالیبیش هاوکاری خۆی پێشکەش بە برازا خۆشەویستەکەی کرد، بێباوەڕان پێشبینیان وابوو کە باوەڕداران لەژێر باری قورسی نەبوونی و بێبەشبووندا یەک لەدوای یەک لە پێغەمبەر(ﷺ) دەتەکێنەوە، ئەوکاتیش خۆی بەتەنها دەمێنێتەوەو ئەوانیش بە ئارەزووی خۆیان دەکەونە ئازاردانی، بەڵام کات تێدەپەڕی بێئەوەی هیچ یەک لەو پێشبینییانە بێنەدی.

هەندێ لە بێباوەڕان ئەو بارەیان ڕەتکردەوە کە دەگوزەرا، ڕازینەبوون بەو ستەمەی لە باوەڕداران دەکرا، حەکیم ناوێک یەکێک بوو لەو ناڕازییانە، برازای خاتوو خەدیجە بوو، کە پورەکەیی زۆر خۆشدەویست، غەمبار بوو بەو چەرمەسەری و داماوییەی بەسەر خۆی و بەسەر منداڵەکانیدا دەهات، بۆیە بڕیاریدا شتێک بکات، هەستا بە نهێنی باری وشترێک ئاردی بۆ ناردن.

حەکیم بۆ جارێکیتری تریش ویستی کیسێک ئارد لە تاریکایی شەودا بۆ پورەکەی بنێرێ، بەڵام لەو ساتەدا لە شەقامدا گەیشت بە ئەبو جەهل و ئەویش بە توڕەییەکەوە قیڕاندی بەسەریدا: (ئایا خواردن بۆ خانەوادەی موحەممەد دەبەیت؟ ئەگەر ئەوکارە بکەیت

لەنێو خەڵکی مەککەدا ئابڕوت دەبەم!). ئا لەو کاتەدا کەسێک دای بەلایاندا، ئەو کەسە کەوتە سەرزەنشتکردنی ئەبو جەهل و لۆمەی کردو پێیوت: (چیت دەوێ؟ ئایا ڕێگیری لە پیاوێک دەکەیت کە هەندێ ئارد ببات بۆ پورەکەی؟ بەڵام ئەبو جەهل قسەکەی پشتگوێخست وەک بڵێی هەر نەیبیستبێ، هەر پێداگری کرد لە ڕێگرتن لە حەکیم، ئا لەو ساتانەدا دەنگی کڕوزانەوەی منداڵان لە دۆڵی ئەبو تالیب کەوتە بەرگوێی هەر سێ پیاوەکە، لە کاتێکدا حەکیم هەر دەیویست کیسە ئاردەکە ببات بۆیان، پیاوەکەی تر کەوتە شەڕ لەگەڵ ئەبو جەهل و مشتەکۆڵێکی بەهێزی کێشا بە ڕوومەتیداو ئەبو جەهل کەوتە سەرزەوی، لەنێو ئەو بگرەو بەردەیەدا حەکیم ڕایکرد، سەرکەوتوو بوو لە گەیاندنی ئاردەکە بە پورەکەی.

پلانەکەی ئەبو جەهل و هاوڕێکانی شکستیهێنا، شڵەژان و دۆشدامان زاڵبوو بەسەریاندا، سێ ساڵی ڕەبەق تێپەڕی بەسەر دەستپێکردنی ئەو دابڕانەدا، بەڵام وێڕای ئەو هەموو چەوساندنەوەیە، هیچ یەک لە باوەڕداران ڕووینەکردە یاخیبوون لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بێباوەڕان ئەمجارەش ئومێدیان نەما، شکستیانخوارد لەوەی بتوانن سنور بۆ موسڵمانان دابنێن، هەر لەو کاتەشدا پێغەمبەری خوا بە هیچ جۆر وازی لە پەیامەکەی نەهێنا، بەڵکو بە شەو و بە ڕۆژ بێ بێزاربوون و بێ ماندوبوون بەردەوامبوو، ئازایەتییەکی بێ وێنەی نەخشاند، تا دەهات باوەڕی بە خوای باڵادەست زیاتر دەبوو، بۆ تاقە ڕۆژێکیش نائومێد نەبوو، بەڵکو سەرومڕ درێژەیدا بە بڵاوکردنەوەی ئومێدو کامەرانی لەنێوان موسڵماناندا، بە زمانێکی بۆ خوا صوڵحاو و بە دڵێکی ئارامگر لەسەر تاقیکردنەوە چاوەڕێی کرانەوەی دەرووی خێر بوو لەلایەن خوای گەورەیەوە.

## ٩٣. کرمێکی بچوک کۆتایی بە دابڕان هێنا

بەڵگەنەویستە کە خوای گەورە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) فەرامۆش ناکات بکەوێتە بندەستی بێباوەڕان، مەعلوم وانەیەکی پەندئامێز بە بێباوەڕان دەدات، گیانەوەرێکی بچوک دەنێرێ بۆ یارمەتیدانی پێغەمبەر (ﷺ).

ئەمجارەیان، ئەو بەدیهێنراوە بچوکە بریتییە لە کرمی درەخت، کرمەکە خۆی لەسەر ئەو بەڵێننامەی دابڕانە جێگیرکرد کە هەڵواسرابوو بە دیواری کەعبەوە، وردە وردە کەوتە خواردنی، کرمەکە هەموو بەندەکانی بەڵێننامەکەی خوارد جگە لە دەستەواژەی (خوایە بەناوی تۆوە -باسمک اللّهم-)، ئەو کارە شتێکی نامۆ و سەرسوڕهێنەر بوو، چونکە دەرگای کەعبە بەردەوام داخراوبوو، ڕێگا بە کەس نەدەدرا بچێتە ژوورەوە، کەچی ئەو کرمە بچکۆلەیە هەموو بەندەکانی بەڵێننامەکەی قوتدا، وەک بڵێی لاقرتی بە بێباوەڕان دەکات، هیچ کەس بەوەی نەزانی، بەڵام خوای گەورە لە ڕێگای جبرەئیلەوە(ﷺ) پێغەمبەرەکەیی ئاگادارکرد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) مامی ئاگادارکرد. بەوشێوەیە، ئەبو تالیب بەپەلە ڕۆیشت بۆ لای بێباوەڕان و پێیوتن: (برازاکەم ئاگاداری کردم کە خوای گەورە -مۆرانە- یەکی زاڵکردووە بەسەر بەڵێننامەکەتانداو جگە لە ناوی زاتی خۆی هەموو شتێکی سڕیوەتەوە). بێباوەڕان بە لاقرتییەوە سەیرێکی ئەبو تالیبیان کرد، چونکە باوەڕیان وابوو کە ئەوە شتێکی مەحاڵە، بەڵام ئەبو تالیب دێژەیدا بە قسەکانی و وتی: (با ڕێکەوتنێک بکەین، با بڕۆین بۆ ئەوێ، ئەگەر برازاکەم ڕاستگۆ

بوو ئەوا کۆتایی بە دابڕان و ئابلۆقەدانمان بێنن و ئەگەر وانەبوو ئەوا برازاکەمتان ڕادەست دەکەم). ئەبو تالیب دڵنیابوو کە برازاکەی ڕاستی دەڵێ، چونکە پێشتر ڕۆژێک لە ڕۆژان درۆیەکی لێنەبیستووە، بەوهۆیەوە ئەو داوایەی خستە بەردەمیان.

بێباوەڕان سەریان سوڕما، بەڵام ڕەزامەندییان نواند بەو هیوایە کە ئەبو تالیب پێغەمبەریان(ﷺ) ڕادەست بکات، هەموو پێکەوە ڕۆیشتن بەرەو کەعبە، دەرگا داخراوەکەیان کردەوە، سەیری ئەو تابلۆیەیان کرد کە هەڵیانواسیبوو، کاتێ بینیان کە هەموو بەندەکانی بەڵێننامەکە جگە لە دەستەواژەی (بأسمک اللّهم) بەتەواوەتی سڕاونەتەوە زۆر زۆر سەریان سوڕما، ئینجا کاتێ زانیان کە سەرلەنوێ شکستیانخواردووە هەستیان بە نائومێدی و داڕوخانێکی گەورە کرد.



بەپێی ئەو ڕێکەوتنەیان لەگەڵ ئەبو تالیب، دەبوایە ئیتر قەدەغەکردن و دابڕان کۆتایی پێبێنن، بۆیە ئەو بڕیارەیان ڕاگەیاند، هەموو خەڵکیان لێ ئاگادارکرد، بەوجۆرە موسڵمانان بە خۆشییەکی زۆرەوە گەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان، منداڵان جارێکیتر سکیان تێر بوو، جارێکیتر زەردەخەنە گەڕایەوە سەرلێوی دایکان و باوکان، موسڵمانانیش باوەڕیان بە ڕاستگۆیی پێغەمبەرەکەیان زیاترو زیاتر بوو.

مۆرانە بچوکەکەش ئەرکی سەرشانی خۆی تەواوکردو دیارنەما.

## ٩٤. ناتوانن نووری خوا بکوژێننەوە

بە هاتنی بەهار بەسەر مەککەداو بە تەواوبوونی دابڕان، هەمووان هەناسەیەکیان هەڵمژی، لەو سەروبەندەدا، ژمارەی ئەوانەی باوەڕیان بە ئیسلام دەهێنا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوون، خەڵکی حەبەشەیش لەدوای ئەوە لە موسڵمانانەوە دەنگوباسی پێغەمبەری خواو(ﷺ) ئاینی ئیسلامیان بیستبوو سەردانی مەککەی پیرۆزیان دەکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەردەم کەعبەدا دەوەستاو ئیسلامەتی فێری خەڵکی دەکرد، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزی بۆ دەخوێندنەوە، ئەوانەی بۆ یەکەمجار ئەو ئایەتە پیرۆزانەیان دەبیست، کۆمەڵێ پرسیاریان لێدەکرد، ئەویش(ﷺ) وەڵامی دەدانەوەو زانستیانی تێردەکرد، ڕەوشتی پێغەمبەر(ﷺ) و زانست و نەرمونیانی و لەسەرخۆییەکەی چووبووە دڵی خەڵکییەوە، ئەوە تەنها پێغەمبەرانن بەو شێوەیە هەڵسوکەوت دەکەن، بۆیە لەدوای بینینی بە ئاسانی باوەڕیان بە ئیسلام دەهێنا، دەهاتنە ڕیزی موسڵمانانەوە، بە فرمێسکی شادییەوە باوەشیان دەکرد پێیاندا.

بێباوەڕان کەوتنە پرسیارکردن لەوەی کە دەگوزەرا، سەریان سوڕمابوو لەوەی خەڵکی لە شوێنە دوورەکانەوە دێن و دوای چەند ساتێک گوێگرتن لە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاستەوخۆ باوەڕ بە ئیسلام دێنن، هەر ئەو ڕووداوە بەس بوو بۆئەوەی شێتگیرببن. ئەبو جەهل توانای بەرگەگرتنی نەمابوو، ئەبو جەهل یەکێک لەو کەسانەی کە دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) لە سەرە ڕێگادا وەستاندو پێیوت:

(تۆ هاتی بۆ ئێرە تا گوێی لێبگری بزانیت چیدەڵێ، بەڵام هەرکە چاوت پێی کەوت ئاینەکەی خۆتت گۆڕی! ئەمە گەمژەییەکی ڕووتە)، ئەو پیاوە وا هەستیدەکرد کە گەنجینەیەکی بەنرخی دۆزیوەتەوە، چێژ و لەزەتی دەبرد بەو بەختەوەرییەی کە لە بەخزمەت گەیشتنی ئەو پێغەمبەرە گەورەیەدا(ﷺ) دەستی دەکەوت، بۆیە گوتەکانی ئەبو جەهلی پشتگوێخست، بەزەیی بەو و بە هاوەڵەکانیدا دەهاتەوە، ئینجا پێیوت: (بە هەمان خراپەکردن ڕووبەڕووت نابینەوە)، تەواو وەک مەحاڵبوونی کوژانەوەی خۆر بە فووکردن لێی. نابێت ڕەفتاری ئەبو جەهل و هاوەڵانی ببنە ڕێگرو بڵاوبوونەوەی ئیسلام بوەستێنن، ئەوان تا دوای چەند ساڵێکیتر نەبێت پەی بەوە نابەن، بەڵام ئێستە ئەوا قیرسیچمەیی و گیرییان کوێری کردوون.

## ٩٥. ڕەککانەی زۆرانبازو ویستی خوای گەورە

ڕەککانە زۆرانبازێکی ناوداری زۆر بەهێز بوو، هیچ کەس بۆ جارێکیش نەیتوانیوە بیبەزێنێ، دوو پیاو یان سێ پیاوی پێکەوە دەدا بەزەویدا، زۆر شانازی بەخۆیەوە دەکرد، لە کەس نەدەترسا، ئەم بارەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) عاجز کردبوو، چونکە هەموو ئادەمیزادەکان لەبەردەم خوای گەورەدا لاوازن.

ڕۆژێکیان، ڕەککانە گەیشت بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر بەسۆزێکەوە پێیوت: ((ئەی ڕەککانە تۆ لە خوای گەورە ناترسیت، بۆ نایەێیت ئەوەت قوبوڵبێت بانگت دەکەم بۆ سەری؟)) ڕەککانە بە شانازی بەخۆکردنە بەردەوامەکەیەوە وتی: ئەگەر بمزانیایە ئەوەی تۆ دەیڵێیت هەق و ڕاستییە، شوێنت دەکەوتم)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((ئەی ئەگەر بتدەم بە زەویدا، ئیتر دەزانی کە ئەوەی دەیڵێم هەق و ڕاستییە؟))، ڕەککانە متمانەی بە بەهێزی خۆی هەبوو، وەڵامیدایەوە: (بەڵێ). ئینجا کەوتە ڕاهێنانکردن بە دەمارەکانی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((هەستە با بتبەزێنم)).

کەوتنە زۆرانبازی، زۆری پێنەچوو ڕەککانە درا بەزەویدا، ئایا ئەمە چۆن ڕوویدا لیی؟ چونکە تا ئەو ڕۆژە هیچ کەس نەیتوانیوە زاڵبێت بەسەریدا، زۆری لا سەیر بوو، هەستایەوەو سەرلەنوێ داوای زۆرانبازی کرد، ئەمجارەش هەر درا بەزەویداو پێغەمبەر(ﷺ) زاڵبوو بەسەریدا، سەرسوڕمانەکەی زیاتر بوو، هەموو ئەو شانازیکردنە بەخۆوە کە پێش کەمێک پێیەوە دەبینرا هیچی نەما، بۆ جاری سێیەم ویستی زۆران لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

بگرێ، بەڵام هیچ گۆڕانێک ڕوویندا، چونکە کاتێکی دەزانی تەختی سەرزەوی بووەو سەیری ئاسمان دەکات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زاڵبوو بەسەر ڕەککانەدا وەک بڵێی منداڵێکی بچوک بێت، ئینجا پاڵەوانەکە هەستایە سەرپێ و وتی: (ئەی موحەممەد، بەخوا ئەمە مایەی سەرسوڕمانە، کە تۆ دەمدەی بەزەویدا؟)، لەدوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) سێجار دای بەزەویدا وتی: ئەی موحەممەد! لەپێش تۆوە هیچ کەس پشتی منی نەداوە لە زەوی، ئەوەندەی ڕقیشم لە تۆ بووە ڕقم لە کەسێکیتر نەبووە، وا ئێستە دەڵێم: (أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أنك رسول الله). پێغەمبەریش دڵخۆشبوو بە موسڵمانبوونەکەی.

## ٩٦. پێغەمبەری خوا(ﷺ) مامە خۆشەویستەکەی لەدەست دەدا

لە دەیەمین ساڵی هاتنی وەحی دا، ئەبو تالیب بوو بووە پیرێکی نەخۆش و بەساڵاچوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستیکرد کە مامی لە کۆتا ڕۆژەکانی تەمەنیدا دەژی، ئەبو تالیب بۆ چەند ساڵێکی هەستیار پێغەمبەری خستبووە ژێر سایەی خۆی، سۆزو خۆشەویستییەکی زۆری پێدابوو، بە مەبەستی پاراستن و پشتگیریکردن لێی بەرەنگاری هەموو سەختی و ئاستەنگەکان بوویەوە، بەڵام وا ئێستە لەسەر جێگای نەخۆشییە، باری تەندروستی ئەبو تالیب تا دەهات خراپتر دەبوو، بێباوەڕان ئەو حاڵەی ئەویان بە هەل قۆستەوە، هاتنە لای و پێیانوت: (ئەی ئەبو تالیب، تۆ لە ئێمەی هەروەک خۆشت دەزانی، ئەوا ئەوەش کە دەیبینی گەمارۆیداوی، ترسمان لێت هەیە، خۆت دەزانی چی لەنێوان ئێمەو برازاکەتدا دەگوزەرێ، بانگی بکەو ئەوەی ئەو لە ئێمەی دەوێ لێمانی وەربگرەو بیدەرێ، ئەوەی ئێمەش دەمانەوێ لێی وەربگرەو بماندەرێ، با وازمان لێبێنێت و وازی لێبێنین، با واز لە ئاینەکەمان بێنێ و ئێمەش واز لە ئاینەکەی ئەو دێنین). لەڕاستیدا بێباوەڕان بە هیچ جۆر ڕێزیان لە نەخۆشییەکەی ئەبو تالیب نەگرت.

لەسەر ئەو داواکارییە، ئەبو تالیب ناردی بەدوای برازاکەیدا بێتە لای، بە ناڕەحەتی و زۆر لەخۆکردنەوە پێیوت: ئەی برازاکەم، ئەوانە پیاوماقوڵانی قەومەکەتن بۆ تۆ کۆبوونەتەوە تا چیتدەوێ بتدەنێ و چییاندەوێ بیاندەیتێ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەبەستی

ئەوان تێگەیشت، بە هێمنی و لەسەرخۆییەوە فەرمووی: ((مامەکەم، ئەی بۆ بانگیان ناکەیت بۆ ئەوەی کە خێرو چاکەی تێدایە بۆیان؟))، ئەبو تالیب وتی: (بۆ لای چی بانگیان دەکەیت؟) فەرمووی: ((بانگیان دەکەم تەنها یەک وشە بڵێن ئیتر عەرەب ملیان پێدەدەن و دەبنە خاوەنی وڵاتی عەجەمیش).

ئەبو تالیب حەزی بە زیاتر زانینی واتای ئەو وشەیە کرد، قورەیشیش بەهەمانشێوە هەر بە جۆش خرۆشەوە لە چاوەڕوانی وتنیدا بوون، ئالەوێدا ئەبو جەهل هاتەناو باسەکەو وتی: (بەسەری باوکت دەدتدەینێ و دە ئەوەندەی تریشت دەدەینێ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بڵێن، لا إله إلا الله، وازیش بێنن لە پەرستنی بتەکان و تەنها الله بپەرستن)). بێباوەڕان وەڵامیاندایەوە کە: (ئەی موحەممەد دەتەوێ هەموو خواکان بکەیت بە یەک خوا؟ بەڕاستی سەیریت)، بە سەرسوڕمانێکەوە سەیری یەکتریان دەکرد، پاشان بڵاوەیان لێکرد.

لە کاتێکدا بێباوەڕان بە نەفامی و نەزانی و گیری خۆیان یەک لەدوای یەک پلانی نوێیان دەتەنی، نەخۆشییەکەی ئەبو تالیب زۆری لێسەندبوو، تا بە بێباوەڕی مرد، نەهاتە سەر ئاینی ئیسلام.

پێغەمبەر(ﷺ) بە مردنی مامی زۆر خەمباربوو، چونکە جێگایەکی گەورەی لە ژیانیدا بۆ پڕکردبووەوە، لەدوای مردنی، ئازاردانی بێباوەڕان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) زیاتر بوو، بەڵام پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) بڕیاری یەکلاکەرەوەی دابوو، بڕیاریدابوو بەردەوامبێت لەسەر ئەو ڕێگایەی هەڵیبژاردووە تەنانەت ئەگەر ڕووبەڕووی سەدان سوپای جەنگاوەریش ببێتەوە، یان ئەوەتا پەیامەکەی بەتەواوەتی دەگەیەنێ یان لەپێناویدا دەمرێ.

## ٩٧. مردنی خاتوو خەدیجە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕاهاتبوو بە ئەرێنی هەڵسوکەوت لەگەڵ هەرشتێکدا بکات کە ڕووی تێبکات، سوپاسی خوای گەورەی دەکرد لەسەر هەر شتێک کە بەسەریدا دەهات، ڕووداوە دڵتەزێنەکان بەدوای یەکدا دەهاتن، لەدوای مردنی ئەبو تالیبی مامی خاتوو خەدیجەی هاوسەری نەخۆشکەوت و باری تەندروستی وردە وردە بەرەو خراپتر دەچوو. کاتی ئەوە هات ئیتر ئەم دنیایە بەجێبێڵێ.

خاتوو خەدیجە دایکە دڵپاک و چاکەکەی باوەڕداران بوو، دایکی سۆز و خۆشەویستی بوو، نزیکترین کەس بوو لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، ڕۆژێ لە ڕۆژان ئازاری دەروونی نەداوە یان نەبووەتە مایەی بێتاقەتکردنی، بەڵکو بە هەموو توانای خۆی دڵسۆزی بۆ نواند، یەکەمین کەسێ بوو باوەڕی بە بانگەوازەکەی هێنا، هەموو سەروەت و ماڵ و ژیانی خۆی کردە قوربانی بڵاوکردنەوەی ئیسلام. شەش منداڵی هێنا بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بە جوانی پەروەردەی کردن، هەروەها بە هەمیشەیی بەتەنیشت پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەستاوەو پشتگیری لێکردووە، لەو پێناوەشدا زەحمەت و چەرمەسەری زۆری بەسەردا هات.

ئەو لە کاتێکدا لەپێش هاتنی وەحی بازرگانێکی دەوڵەمەند بوو، بەڵام دواتر لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) دووچاری هەژاری و برسێتی بوویەوە، کەچی ڕۆژێ لە ڕۆژان ناشکوری نەکردو بێزاری دەرنەبڕی، کاتێ لەسەر جێگای نەخۆشیبوو تەنها بیری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکردەوە، زۆر بەلایەوە زەحمەت بوو لێی

دووربکەوێتەوە، بەڵام ئیتر ئەوە مردنەو قەدەری هەموو مرۆڤەکانە، هاوسەرگیرییان بیست و شەش ساڵی خایاند، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) زۆر شت فێربوو، هەتا مردنی هەر دڵسۆزی ڕاستەقینەی بوو.

ڕۆژێکیان، خوای گەورە سڵاوی خۆی لە ڕێگای فریشتەکەیەوە ناردە سەری، پێیڕاگەیاند کە لە بەهەشتدا کۆشکێکی مرواری هەیە. خاتوو خەدیجە زۆر دڵخۆشبوو بەو مژدەیە، ئینجا بە باوەڕێکی پتەو و ئارامگرتنێکی زۆرەوە ئەم دنیایەی جێهێشت.

ئابەمجۆرە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوسەرەکەشی لەدەستدا، بەڵام بە دڵێکی پڕ لە ئارامگرتن و باوەڕەوە شانیدایە ژێر ئەو ڕووداوە سەختە، پێغەمبەر(ﷺ) خەمباری خۆی لەدڵیدا هێشتەوەو دایپۆشی، بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە منداڵەکانی لەخۆگرت، ئەویش وەک هەموو کەسێکیتر هەستی بە دڵتەنگی و خەمباری دەکرد، بە دەستەکانی خۆی(ﷺ) خاتوو خەدیجەی ئەسپەردە کرد، زۆر خەمبار بوو و بۆی گریا، هەموو ئەوانەی تریش کە ناسیبوویان بۆی دەگریان. دوای ئەسپەردەکردنی بۆ ماوەیەک سەیری گۆڕەکەیی کرد، فرمێسک لە چاوانی دادەبارین، پاشان شوێنەکەی جێهێشت و لە خوای گەورە دەپاڕایەوە ئارامی پێببەخشێت. پێغەمبەر(ﷺ) لە ماوەیەکی دیاریکراودا مام و هاوسەرەکەیی یەک بەدوای یەکدا لەدەستدا.

## ٩٨. بێباوەڕان دەستیاندایەوە ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوای مردنی مامی و خەدیجەی هاوسەری زۆر خەفەتی خوارد، ئەوەتا دوو کەسە خۆشەویستەکەی سەر دڵی بەجێیانهێشت، بەڵام هەندێ کەس هەبوون دڵخۆشبوون بەو خەفەتەی، ئەوانە کەسانێک بوون کە لە ئەبو تالیب دەترسان، بە بوونی ئەو خۆیان بەدوور دەگرت لە ئازاردانی پێغەمبەر(ﷺ)، بەڵام ئێستە، گۆڕەپانەکەیان بۆ چۆڵبووە، وا گومانیان برد دەتوانن هەرچییەک بیانەوێت بەبێ چاودێری و ناحەزو لێپرسینەوە بیکەن.

ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڕۆیشت بە ڕێگاداو ئێش و خەفەت دڵی گوشیبوو، بەڵام ئەو بڕیاریدا ئەقڵ و دڵ و زمانی سەرقاڵبکات بە زیکری خوای گەورەوە، ئەو لەو حاڵەتەدا بوو یەکێک لە بێباوەڕان پێی گەیشت، ئینجا وەستاندی، پاشان بڕێ خۆڵی لە زەوی هەڵگرت و بۆی وەشاند، بەجۆرێ کە بە تۆز دایپۆشی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچی نەفەرموو، بەڵکو گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی و کاتێ فاتیمەی کچە بچوکی بەو شێوەیە بینی، دایە قوڵپەی گریان، چونکە ئەو ستەمەی کە لە باوکی دەکرێ تەنانەت لەپێش مردنی دایکیشی زۆر خەفەتی پێدەخوارد، لەو ساتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی فاتیمەی سڕی و دڵنیایی پێدا کە خوای گەورە دەیپارێزێ و سەریدەخات بەسەر دوژمنانی ئاینەکەیدا. خوای گەورە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ فِي ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ ٱلْأَشْهَٰدُ﴾ (غافر: ٥١)

## ٩٩. دەستدرێژیکردنە سەر پێغەمبەر(ﷺ) لە تائیف

پێغەمبەر(ﷺ) لە مەککە بە بارودۆخێکی زۆر سەختدا تێدەپەڕی بەجۆرێ کە نەیدەتوانی بچێتە سەر شەقامەکان، هەرکات بێباوەڕان چاویان پێبکەوتایە سوکایەتییان پێدەکرد، بەردبارانیان دەکردو دەیانچەوساندەوە، هەرکات قورئانی بخوێندایە ئەوان دەکەوتنە فیکەو جرت و چەقەنەو چەپڵەلێدان، دەنگیان بەسەر دەنگیدا بەرزدەکردەوە، هەرکات قسەیەکی بفەرمووایە ئەوان لاساییان دەکردەوە، ئەم حاڵەتانەش زۆر بێتاقەتیان کردبوو.

لەو ڕۆژانەدا، زۆر زەحمەت بوو پەیامی ئیسلام بڵاوبکرێتەوە، لەبەرئەوە بڕیاریدا سەردانێکی تائیف بکات، بۆ ئەوەی خەڵکی ئەو شارە بانگهێشت بکات بۆ سەر ئیسلام، تائیف شارێکی جوان بوو، ڕووبەری سەوزایی زۆری هەبوو، پڕبوو لە باخە ترێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیری لەوە کردەوە کە خەڵکی تائیف باوەڕ بە ئیسلام و بە پێغەمبەرایەتییەکەی دێنن، جا ئەگەر پشتگیری و هاوکاری ئەوانی بەدەستهێنا، ئیتر بێباوەڕانی قورەیش جورئەت ناکەن ئازاری بدەن، بەم پێیەش ئیسلام بڵاودەبێتەوەو بەهێزتر دەبێت، هەربۆیە پێغەمبەری خوا لەگەڵ زەیدا چوو بۆ تائیف.

کاتێ گەیشتنە ئەوێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتە پەیوەندیکردن بە پیاوماقوڵان و کەسایەتییە دیارەکانی تائیفەوە، باسی ئیسلامی بۆکردن و پێیراگەیاندن کە پێغەمبەرێکەو لە خوای گەورەوە نێردراوە. هەروەها بۆی ڕوونکردنەوە کە پەرستنی بتەکان گومڕاییە، بەڵکو بەدیهێنەری ڕاستەقینە تەنها خوای گەورەیە. پاشان داوایلێکردن

باوەڕ بە ئیسلام بێنن و بانگەوازەکەی قوبوڵ بکەن، بەلام وەلامێکی لێیانەوە دەست کەوت کە هەرگیز پێشبینی نەدەکرد، بەڕاستی خەڵکی تائیف سەلماندییان کە لە قورەیش خراپترن، قیڕاندیان بەڕوویداو سوکایەتییان پێکرد، بڕیاریدا زوو بەزوو شوێنەکە بەجێبێڵێ، ئەو هەوڵیدا ڕێنماییەکانی خوای گەورە باسبکات بۆ خەڵکی، بەلام وەلامی ئەوان ئەوەبوو کە: (خێرا ئەم شارە جێبێڵەو بۆکوێ دەڕۆیت بڕۆ، هەرگیز نامانەوێ لە پەنای ئێمەدا بیت)، بەڕاستی بێباوەڕیی چاوانی کوێر کردبوون، ڕاستێتی ئەو پیاوەیان نەدەزانی کە لەبەردەمیاندا وەستاوە، حەزیاننەکرد باوەڕی پێبکەن کە پێغەمبەرێکەو لە خوای گەورەوە ڕەوانەکراوە، بەڵکو لەبەرانبەرەوە بە جنێو و سوکایەتی پێکردن بەڕوویدا وەستان.

دواتر، لەسەر هەردوو لای ڕێگاکە ڕیزیان بەست و کەوتنە بەردبارانکردنی، ئەو ساتانە زۆر تۆقێنەر بوون، بەرد وەک لێزمەی باران دەبارین بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)، هەردوو قاچی پیرۆزی خوێناوی بوون بەجۆرێ نەیدەتوانی ڕێبکات. هەوڵیدا بە زووترین کات شارەکە جێبهێڵێ، لە کاتێکدا خەڵکەکەی چاودێریان دەکردو پێدەکەنین پێی، زەید وەک پاسەوانێکی دڵسۆز کەوتە هاتن و چوون بەدەوری پێغەمبەردا(ﷺ)، هەوڵیدا بە جەستەی خۆی شەرەفمەندترین دروستکراوی خوای گەورە بپارێزێ، کە پێیەکانی خوێنیان لێدەچۆڕا. دواجار، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و زەید چوونە ژێر درەختێکی مێو ئەوەش وەک ڕاکردنێ لەو هێرشە توندو سەختە.

تەنانەت لەو ساتە پڕ لەئێش و ئازارانەدا پێغەمبەر(ﷺ) هەر داوای لێخۆشبوونی بۆ خەڵکی تائیف کرد، مەعلومە خوای باڵادەست پێغەمبەرەکەی فەرامۆش ناکات ببێتە نێچیری ئەو ستەمە، گومانیشی تێدا نیە لە بەرانبەر ئەو قوربانیدانەوە پاداشتی گەورە وەردەکرێ.

## ١٠٠. شادبوونی عەدداسی کۆیلە

ئەو باخەی پێغەمبەری خواو(ﷺ) زەید پەنایان تێداگرت هی دوو برای خەڵکی تائیف بوو، بەزەییان هاتەوە بە میوانە زامدارەکەدا کە لەناو باخەکەیاندا بوو، دەورییەک ترێیان بە عەدداسی کۆیلەیاندا نارد بۆی، عەدداس ترێیەکەی هێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) کە هەستی بە برسێتی و ماندوبوون دەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بەناوی خوا)) ئینجا دەستی برد بۆ ترێکەو کەوتە خواردنی، عەدداس ئەمە یەکەمینجارە لە ژیانیدا ئەو وشە جوانانە ببیستێ، زۆر چوون بەدڵیدا.



پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێبینی عەدداسی کرد، ئینجا پرسیاری لێکرد: ((ئەی عەدداس تۆ خەڵکی چ وڵاتێکی؟))، وەڵامیدایەوە کە: (من خەڵکی نەینەوام)). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (( کەواتە تۆ خەڵکی گوندی کەسە چاکەکەی یونسی کوڕی مەتتا)). ئەمجارە عەدداس زۆرتر لای سەیربوو بۆیە پرسیاری کرد: (تۆ چووزانی یونسی کوڕی مەتتا کێیە؟)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەڵامیدایەوە: (ئەو برامە، پێغەمبەر بووەو منیش پێغەمبەرم)). لە شادمانیدا هەدوو چاوی عەدداس دەدرەوشانەوە، کەواتە ئەو پیاوەی کە لە ڕەفتار و لە سۆزیدا ئەوەندە گەورە دەردەکەوێ پێغەمبەرە؟ ئای ئەمە چەندە جوانە. چمییەوەو تا هەردوو دەست و هەردوو پێیەکانی ماچبکات، ئینجا باوەڕی بە ئیسلام هێنا.

دووبراکە کە خاوەنی باخەکە بوون لە دوورەوە چاودێری خزمەتکارەکەیان دەکرد، کاتێ گەڕایەوە بۆ لایان، هۆشدارییان

دایەو هەڕەشەیان لێکردو وتیان: (نەگبەت ئەوە چیتە وا سەرو دەست و پێیەکانی ئەو پیاوە ماچدەکەیت؟) ئەویش وەڵامیدانەوە کە: (ئەی گەورەکانم، سەرزەوی شتێکیتری تێدا نیە لەو چاکتر بێت، ئەو ئاگاداری کردم بە مەسەلەیەک کە جگە لە پێغەمبەر کەسیتر نایزانێ).

باوەڕهێنانی عەدداس بە ئیسلام تا ڕادەیەک پێغەمبەری خوای(ﷺ) هاندا، چونکە ئەو ئازاردانەی کە خۆی و زەید لەسەر دەستی خەڵکی مەککە تووشیانهات بۆی قەربوو کرایەوە، تا ڕادەیەک خەفەتی سووککردن.

## ١٠١. ویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ماوەیەک لەگەڵ زەیدا لە باخەکەدا حەوانەوە، پاشان گەڕانەوە بۆ مەککە، لە ڕێگادا ساتێک خەفەت دایگرت، پەلە هەورێکی بەسەر سەریەوە بینی، بەوردی چاوی تێبڕی، جبرەئیلی(ﷺ) لەناو پەلە هەورەکەدا بینی، جبرەئیل سەلامی لێکردو پێیڕاگەیاند کە خوای گەورە فریشتەیەکی ناردووەو ڕایسپاردووە ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بیەوێ ئەو دوو کێوە بەرزەکاتەوەو دەیاندات بەسەر خەڵکی تائیف دا.

بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێغەمبەری خۆشەویستی و بەزەییە، ڕۆژێک لە ڕۆژان حەزینەکردووە ئازار بە کەس بگەیەنێت، لەبەرئەوە وەڵامیدایەوە کە: ((بەڵکو تکاکارم خوای گەورە لە پشتی ئەمانە کەسانێک بنێرێ تەنها خوای گەورە بپەرستن و هاوەڵی بۆ دانەنێن)). چونکە پێغەمبەری خۆشەویستمان هەمیشە پشتگیری لە ئاشتی کردووەو هاوکاری خێرو چاکە بووە، حەزینەکرد خەڵکی تائیف لە کاتێکدا ئەوان سوکایەتییان پێکردو بەردبارانیان کرد، لە شارەکەیان دەریان کرد، تووشی هیچ ئازارو زەحمەتێک ببن، ئەو بیریکردەوە ئەوان بۆیە ئەوەیان کردووە چونکە نەیانتوانیوە ئەقڵیان بخەنەگەڕ، پێغەمبەر(ﷺ) حەزیکرد بەڵکو بەلانیکەمەوە منداڵەکانیان بتوانن ڕێگای ڕاستی بگرنەبەر و شوێنکەوتەی بن.

## ١٠٢. شەوی شەوڕەوی و بەرزبوونەوە (ئیسرا و میعراج)

خوای گەورە ویستی شادیی بخاتە دەروونی پێغەمبەرەکەی و دڵنیاداتەوە کە بە ئارامگرتنێکی زۆرەوە بەرەنگاری ئەو هەموو ناڕەحەتی و سەختییانە بووەوە کە ڕوویان تێکرد، هەروەها ویستی جوانی ڕەوشت بەرزییەکەی و پێگەی بەرزی لای خوای گەورە نیشانی بدات.

شەوێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر جێگاکەی خەوتبوو، جبرەئیل(ﷺ) هاتەلای و پێیوت خوای گەورە دەعوەتنامەیەکی بۆ ناردوویت، ئینجا داوای لێکرد هەستێت و دەستنوێژ بگرێ، جبرەئیل گیاندارێکی چوارپێی پێبوو پێیدەوترا (بوراق)، ئەوەندە جوان بوو وەسف نەدەکرا، پێغەمبەر(ﷺ) سواری بوراقەکە بوو و فڕی بە ئاسماندا، ئەو گەشتە شەوانەییە ناونرا ئیسرا.

لە چاوتروسکانێکدا، گەیشتنە قودس، لەو شارە پیرۆزەدا مزگەوتێک هەیە ناوی مزگەوتی ئەقصایە، واتە دوور، ئەو مزگەوتە ناوی وابەستەیە بە ژمارەیەک لە پێغەمبەرانەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوێ گەیشت بە هەموو پێغەمبەران، پێشنوێژی بۆکردن.

دوای ئەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان، نزیککەوتەوە لە خوای گەورەو باڵادەست و گوفتاری لەگەڵدا کرد، ئا لەو شەوەدا پێنج نوێژەکە فەرزکران لەسەر موسڵمانان، لەدوای هەموو ئەوە، موحەممەد پێغەمبەرمان(ﷺ) بە کامەرانی گەڕایەوە سەرزەوی.

ئەو گەشتەش کە پێغەمبەری خوا تیایدا بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان ناوی میعراجە، میعراج واتە بەرزبوونەوە بۆ شوێنێکی بەرز. پێغەمبەر(ﷺ) لە گەشتی میعراجدا دیارییەکی پڕ بەهای هێنا بۆ ئوممەتەکەی و بۆ هەموو موسڵمانانی دوای خۆی ئەویش پێنج نوێژە فەرزەکەیە، ئیتر لەوکاتەوە موسڵمانان ڕۆژی پێنج جار لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستن بۆ نوێژکردن، چونکە نوێژ میعراجی ئوممەتە، گەورەو بچوک تیایدا نزیکدەبنەوە لە خوای گەورە، تەواو وەک ئەو نزیکبوونەوەیە وایە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) کاتێ بەرزکرایەوە بۆ ئاسمان نزیککەوتەوە لە خوای گەورە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو گەشتەیدا شتانێکی زۆری بینی و شەرەفی ئاخاوتنی لەگەڵ خوای باڵادەستدا پێبەخشرا، بۆ یەک ساتیش ڕزگاربوونی ئەوانەی باوەڕیان پێهێناوە لەبیر نەکرد، هەروەها بەردەوامبوونی لە گەیاندنی پەیامی خوا ئیتر تا هەرچەندە لەسەری بکەوێ، بەهەمانشێوە هەوڵدەدات هیدایەتی مرۆڤایەتی بدات بەرەو ڕێگای هەق و ڕاستی، ئەو(ﷺ) لە میعراجدا کۆمەڵە شتانێکی مەحاڵی بینی، بەڵام خوای گەورە ئەو موعجیزەیەی لەپێناو ئەودا هێنایەدی.

## ١٠٣. پێغەمبەر(ﷺ) باسی میعراج دەکات

ڕۆژی دوای ڕووداوی میعراج، چاوانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خۆشی و کامەرانیدا دەدرەوشانەوە، یەکەمجار کچە ئامۆزاکەی خۆی بەناوی ئوم هانیئ ئاگادارکرد، ئوم هانیئیش باوەڕی پێکرد، بەڵام ترسی لەسەری هەبوو نەبادا بێباوەڕان ئازاری پێبگەیەنن، بۆیە پێیوت: (ئەی پێغەمبەری خوا، باسی مەکە لای خەڵکی چونکە بەدرۆزنت دەردەکەن و ئازارت دەدەن). بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەبێ ترس و دوودڵی وەڵامیدایەوە کە: ((سوێند بەخوا بۆیان باسدەکەم)). بەشێک لە بەرپرسیێتی ئەو ئەوەبوو خەڵکی ئاگادار بکات بەوەی کە لەو شەوەدا بینیویەتی، چونکە پێغەمبەرایەتی بە هیچ جۆر مەسەلەیەکی ئاسان نیە، مەعلومیشە هەندێکیان باوەڕی پێدەکەن، پێشبینی ئەوەشی دەکرد کە هەندێکیتریان بەدرۆی بخەنەوە.

بەمشێوەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشت بۆ لای بێباوەڕان، ئاگاداریکردن بە یەک بە یەکی هەموو ئەو مەسەلە جوانانە کە لەو شەوەدا چاوی پێیان کەوتووە، خەڵکی تووشی شڵەژان بوون، داوایان لێکرد ڕاستێتی ئەوەیان بۆ بسەلمێنێ کە دەیڵێ، زۆرێکیش لە بێباوەڕان لاقرتیان پێکردو بەدرۆیان دەخستەوە.

ئالێرەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی ئەو کاروانەی پێدان کاتێ کە ڕۆیشتووە بۆ مزگەوتی ئەقصاو لە ڕێگادا بینیویەتی، ئەو شمەکانەو ڕەنگەکەیان کە لەسەر پشتی وشترەکان بووە بۆی باسکردن، هەروەها هەواڵی پێدان کە ئەو کاروانە بەم نزیکانە

دەگاتەوە مەککە. ئەوانیش کەوتنە چاوەڕوانیکردنی کاروانەکە، کاروان دوای ماوەیەکی کەم گەیشتەوە مەککە، کاتێ قورەیش ڕەنگی ئەو شمەکانەیان بینی لەسەر پشتی وشترەکان بوون سەریان سوڕما لەوەی کە بینیان.

## ١٠٤. ئەبوبەکر، هاوڕێی بەوەفا

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی کە لە شەوی میعراج بەسەریدا هاتبوو بۆ خەڵکی دەگێڕایەوە، باوەڕی خەڵکی پێی تا دەهات بەهێزتر دەبوو، بەڵام بێباوەڕان کەوتنە گەڕان بەدوای هۆکارێکدا تا بەدرۆی بخەنەوەو گاڵتەی پێبکەن. بەو هۆیەوە، پێیانوت کە کەسانێک لەوان سەردانی بەیتولمەقەدیسی کردووە، جا ئەگەر ئەو بینیویەتی ئەوا با وەسفی فلانە شت و فلانە شتی ئەوێیان بۆ بکات، پرسیاری شتانێکیان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کە ئەو دڵنیا نەبوو لە شێوەیان، پێغەمبەر(ﷺ) نەیتوانی بەوردی وەڵامیانبداتەوە، زۆر بێتاقەت بوو، بەڵام خوای گەورە پێغەمبەرەکەی خۆی لەو حاڵەتە سەغڵەتکارەدا ناهێڵێتەوە، ئا لەو ساتەدا، مزگەوتی ئەقصای بەرزکردەوەو خستیە پێشچاوی پێغەمبەرەکەی، ئینجا ئەویش لە کاتێکدا کە سەیری دەکرد وەسفی ئەو شتانەی بۆکردن.

دوای ئەوە کە هاوەڵگەران ئەوەیان بیست وتیان: (بۆ وەسفەکە تەواو پێکای و ڕاستدەکات!) بەڵام دوای ئەوەش هەر باوەڕیان پێنەکرد، هەستان چوونە لای ئەبوبەکر و پێیانوت: (ئایا ئەبوبەکر چیت لەسەر هاوڕێکەت هەیە کە دەڵێ ئەمشەو چووەتە بەیتولمەقدیس و نوێژی تێدا کردووەو گەڕاویشتەوە مەککە)، ئەبوبەکر وتی: (ئایا ئەمەتان لە خودی موحەممەد بیستووە؟) وتیان: (بەڵێ)، ئەبوبەکر وتی: (ئەگەر ئەمەی وتبێ ئەوا ڕاستدەکات، من لەوە زیاتریش بڕوای پێدەکەم، ئەگەر لە هاتن و چوونێکیدا هەواڵی ئاسمانیش بێنێت هەر بڕوای پێدەکەم!).

ئیتر لەو کاتەوە ئەبوبەکر، کە نزیکترین هاوەڵ بوو لە دڵی پێغەمبەرەوە(ﷺ) نازناوی ئەبوبەکری ڕاستگۆی وەرگرت و بەو ناوەوە ناودەبرا، ئەم سیفەتەش مانای دڵسۆزی و ڕاستگۆییە، ئەبوبەکر ئەو هاوەڵەیە کە بۆ ڕۆژێکیش لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) جیانەبووەتەوەو لە ڕێگای هەق لاینەداوە.

## ١٠٥. سوپاسکردنی خوای گەورە

باوەڕداران بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە دەوری پێغەمبەریان(ﷺ) دابوو، زۆر زۆر دڵخۆشبوون کە بەرزکراوەتەوە بۆ ئاسمان، دیارییەکی بۆ هێناون زۆر بەنرخە بۆیان، ئەو دیارییەش نوێژە، کە تیایدا لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستن، سوپاسی دەکەن لەسەر نیعمەت و بەخششەکانی، چونکە تا ئەو ڕۆژە موسڵمانان نەیاندەزانی چۆن نوێژ بکەن، بەڵام لێرە بەولاوە ئیتر ڕۆژانە بە شێوازێکی دیاریکراو، لە کاتی دیاریکراودا پێنج جار نوێژ دەکەن، هەموو جارێکیش لەبەردەم خوای گەورەدا دەوەستن و ئەو پەرستشە ئەنجامدەدەن.

نوێژ بەختەوەرییەکی پێبەخشین کە وەسفناکرێ، باوەڕداران ئەوەی تێدا دەبینن کە بانگهێشتێکە بۆ بەهەشت، میعراجی نهێنییانە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) بەرزبوویەوە بۆ ئاسمان تا بە خزمەت خوای گەورە بگات، هەرکەسیش حەز دەکات ئەوا دەتوانێ لە ڕێگای نوێژکردنەوە بە خوای گەورە بگات.

هاوەڵان بە وریاییەوە گوێیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)ڕادێرا، ئینجا پرسیاری هۆکاری فەرزکردنی نوێژیان لێکرد کە لە ڕۆژێکدا پێنج جار ئەنجامدەدرێ، پێغەمبەر(ﷺ) بە زەردەخەنەیەکەوە وەڵامیدانەوە و فەرمووی: ((ئایا ئەگەر ڕووبارێک لە دەرگای یەکێکتاندا هەبێت، ئەویش ڕۆژی پێنج جار خۆیی پێ بشوات، ئایا هیچ پیسییەکی پێوە دەمێنێ؟))

ئابەمجۆرە باوەڕداران تێگەیشتن کە نوێژ واتە خۆپاککردنەوە لە هەر پیسییەکی ماددی و ڕۆحی و لە هەمانکاتیشدا لە گوناهەکان. چونکە هەرکات نوێژێکی فەرز ئەنجامبدەن ئەوا ئەو گوناهانەی کە کردوویانن دەشۆرێنەوە، زۆریش دڵخۆشن کە خوای گەورە ئەم نیعمەتەی پێبەخشیون.

## ١٠٦. پێغەمبەر(ﷺ) هەرگیز تەسلیم نەبووە

لە ماوەی وەرزی حەج لە مەککە، خەڵکی ڕاهاتبوون لەسەر کردنەوەی پێشانگاکان، زیارەتکارانیش لە دەرەوەی مەککەوە دەهاتنە سەردانی ئەو پێشانگایانە، ئینجا بەرلەوە بگەڕێنەوە بۆ شوێنەکانی خۆیان تەوافی کەعبەی پیرۆزیان دەکرد.

ئەمساڵیش سەرلەنوێ وەرزی حەج دەستیپێکردەوە، مەککەش پڕبوو لەو حاجییانە کە لە شوێنانی دوورەوە هاتبوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێکەڵیان بوو، کەوتە وتووێژکردن لەگەڵیان و باسی ڕێنماییەکانی ئیسلامی بۆ دەکردن، ئەوەی کە دەیفەرموو بووبووە جێگای بایەخپێدانی خەڵکی، بەڵام بێباوەڕان بەدوایەوە بوون و چاودێری هەموو جموجۆڵێکیان دەکرد، دواتر، خۆیان نزیکدەکردەوە لەو خەڵکە کە گوێیان بۆگرتبوو و ئەوەی ئەو دەیفەرموو دەکەوتنە هەڵوەشاندنەوەی.

ئەو ساڵە گروپێک کە پێکهاتبوو لە شەش کەس لە شاری یەسریبەوە هاتن، لە شوێنێکدا وەستان کە پێیدەوترێ عەقەبە، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت بۆ لایان، سەلامی لێکردن، ئینجا پرسیاری لێکردن لەکوێوە هاتوون، ئەوانیش وەڵامیاندایەوە کە: (ئێمە یەسریبین)، داوای لێکردن لەگەڵیان دابنیشێ و قسەیان لەگەڵدا بکات، وا دەبینران کەسانێکی ژیربن و مامەڵەیان ئاسان بێت، ئەوانیش داواکەیان قوبوڵکردو دانیشتن لەگەڵیدا، گوێیان گرت بۆ ئەوەی کە دەیفەرموو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) باسی تاک و تەنهایی خوای گەورەی بۆکردن، باسی پێغەمبەرێتی خۆیکرد، جوانیی ئیسلامی

بۆ باسکردن، لەدوای ئەوە، چەند ئایەتێک لە قورئانی پیرۆزی بۆ خوێندنەوە، ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکترییان دەکرد.

یەکێکیان وتی: (سوێند بەخوا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە جولەکەکان هەواڵیان پێداوین). ئالەوێدا، باوەڕیان بە ئیسلام کردو شایەتومانیان هێنا، دوای ئەوە وتیان: (ئێمە وازمان لە قەومەکەی خۆمان هێناوە، هیچ قەومێک بەڕادەی ئەوان دوژمنایەتی لەنێوانیاندا نیە، بەڵکو خوای گەورە بەهۆی تۆوە کۆیانبکاتەوە، دەچینەوە ناویان و بانگهێشتیان دەکەین بۆ ئەم کارەی تۆ، ئەوەی بەگوێی تۆمان کردووەو لەم ئاینە وەرمانگرتووە دەیخەینە پێشچاوی ئەوانیش، جا ئەگەر خوای گەورە لەسەر ئەم باوەڕەی تۆ کۆیانبکاتەوە ئەوا هیچ کەسێ لە تۆ خۆشەویستتر نیە).

لەسەر ئەم حاڵەتە گەڕانەوەو بەڵێنیان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا ساڵی ئایندەش چاویان پێی بکەوێت.

ئەو شەش کەسە کە چاویان بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوت لە کەسایەتییە دیارەکانی مەدینە بوون، کاتێ ئیشوکاریان لە مەککە تەواوکرد، گەڕانەوە بۆ شارو ماڵی خۆیان، پاشان هەواڵیاندا بە خزمان و هاوڕێکانیان کە گەیشتوون بە کۆتا پێغەمبەر(ﷺ)، باسی جوانیی ئەم ئاینەیان بۆکردن، ئینجا داوایان لێکردن ئەوانیش باوەڕی پێبکەن، ئەم هەواڵە لە سەرتاسەری مەدینەدا بڵاوبوویەوە، دڵی خەڵکی پڕبوو لە خۆشەویستی خواو پێغەمبەرەکەی(ﷺ).

ئیسلام ئا بەمشێوەیە جێگای قوبوڵی خەڵکی مەدینە بوو، ئەمە لە کاتێکدا کە موسڵمانان لە مەککە لەبەردەم ئەشکەنجەو ئازاردانەدا بوون، ئەو کەسانەی لە عەقەبە چاویان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت لە ناخی دڵیانەوە باوەڕیان هێنابوو. بە فەزڵی ئەم ئاینەش ڕزگاریان دەبێت لەو پشێوی و ناڕەحەتییانە کە باڵی کێشابوو بەسەر کۆمەڵگاکەیاندا.

جا ئەگەر بهاتایە بەهۆی ئەو سوکایەتپێکردنانە کە پێغەمبەر(ﷺ) دووچاریان بوو بوو نائومێد ببوایە، نەڕۆیشتایە بۆ عەقەبە، ئەوا ئەو پەرەسەندنە جوانانە ڕوویاننەدەدا. بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) لەپێناو بڵاوکردنەوەی ئەم ئاینە ئەوەی لە توانایدا بوو بە خەرجیدا، بەرگەی زەحمەت و تەنگوچەڵەمەی زۆری گرت، هەر بەو هۆیەوە خەڵکی مەدینە بەرلەوە چاویان پێی بکەوێت باوەڕیان پێهێنا.

## ١٠٧. پەیمانی عەقەبە

ساڵێک تێپەڕی بەسەر چاوپێکەوتنی شەش کەسایەتییە دیارەکەی مەدینە بە پێغەمبەر(ﷺ) لە عەقەبە. ساڵی دواتریش وەک داب و نەریتی ساڵانە پێشانگا لە هەمان شوێن بەرپاکرا، زۆر قەڵەباڵغ بوو، خەڵکانێکی زۆر لە هەموولایەکەوە ڕوویان تێکرد، هەیانبوو شمەکەکەی خۆی دەخستەڕوو، هەیانبوو بۆ گەڕان و کات بەسەربردن، هەیانبوو بۆ بازرگانی هاتبوو، ئەو شەش کەسەش لە مەدینەوە چەند هاوەڵێکی تری خۆیانیان هێنابوو، سەرلەنوێ تامەزرۆی بە خزمەت گەیشتنی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، ئەوەندە چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژەیان دەکرد ئارامیان لێبڕابوو، ئەوان بە هەواڵی خۆشەوە هاتبوونەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەر(ﷺ) زۆر بەورياييەوە هەڵسوکەوتی دەکرد، چاوەڕێی ئەوەبوو شەو بێتەوە لە ترسی ئەوە نەبادا قورەیش بە کارەکەی بزانن، لەبەر شەوقی کزی مانگدا کە دۆڵەکەی ڕوونککردبووەوە، چاوی بەو شاندە کەوت، موسڵمانانی مەدینە شادبوون بە بینینی و خۆشەویستی و لایەنداریی خۆیانیان پێڕاگەیاند، بە پێغەمبەریان(ﷺ) وت کە باوەڕیان بەو و بە ئیسلام هێناوە، چاوەڕوانی ڕێنماییەکانی ئەم ئاینە دەکەن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بەو هەواڵە، دەستیکرد بە گەیاندنی فەرمانەکانی خوای گەورە بە یەک بەیەکیان، فەرمووی: ((وەرن پەیمانم بدەنێ هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن، زینا نەکەن، منداڵەکانتان نەکوژن، بوهتان دروست نەکەن کە لەنێو

دەست و پێتاندا هەڵیبەستن، هەر فەرمانێکی چاکەم پێدان سەرپێچیم نەکەن تیایدا)).

ئەو کۆمەڵەیە کە لە مەدینەوە هاتبوون پێکهاتبوون لە دوازدە کەس، بەڵێنیان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داو وتیان: (ئەوا لەسەر ئەوە بەیعەتمان پێدایت).

لە شەوێک لە شەوەکانی دوای بەیعەتدان بە پێغەمبەر(ﷺ) لە عەقەبە، ڕێکەوتننامەیەکی جوان گرێدرا، خەڵکی مەدینە بەڵێنیاندا ئەم ئاینە لەنێوان ڕۆڵەکانی شارەکەیاندا بڵاوبکەنەوە، داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد کەسێکی شارەزا لەگەڵیاندا بنێری تا پشتگیرو هاوکارییان بکات، پێغەمبەر(ﷺ) موصعەبی کوڕی عومەیری بۆ ئەو ئەرکە دیاریکرد. موصعەب یەکێک بوو لەو هاوەڵانە کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆری خۆشدەویست، بەمشێوەیە ئەو پەیمانە مێژووییە لە عەقەبە بەسترا.

## ١٠٨. موصعەب دەچێتە مەدینە

موصعەبی کوڕی عومەیر پیاوێکی ڕەوشتبەرز و جەستە جوان بوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست و گرنگییەکی زۆریدا بە فەرمانەکەی، پێغەمبەر ئەرکی بڵاوکردنەوەی ئیسلامی لەنێوان خەڵکی مەدینەدا پێسپارد، موصعەب بە خۆشییەوە ئەو ئەرکەی قوبوڵکرد، هەرکە دەستنیشان کرا کە قورئان فێری موسڵمانانی مەدینە بکات ئیتر زوو بەزوو بەبێ وەستان کەوتەڕێ، موصعەب گەنجێکی زۆر شارەزاو زۆر بەڕەوشت بوو، بۆ بینینی ڕۆڵی مامۆستایەتی کەسێکی زۆر گونجاو بوو.

لەدوای سەفەرێکی تولانی و سەخت، موصعەب گەیشتە مەدینە، خەڵکی مەدینە پێشوازییەکی گەرمیان لێکرد. شوێنێکیان بۆ دیاریکرد تا نیشتەجێ بێت تیایدا، موصعەب دەستوبرد کەوتە فێرکردنیان، حاڵەتی ئیسلامەتیکردن و بڵاوکردنەوەی لە مەدینە شتێکی ئاسان بوو، چونکە دوژمنانی لە شێوەی ئەبو جەهل و ئەبو لەهەبی تێدا نەبوو، موصعەبیش توانی هەموو توانای بخاتەگەڕ تا ئەو ئەرکەی پێسپێردراوە بە باشترین شێوە ڕاپەڕێنێ، لەسەر ئەوە زۆر سوپاسگوزاری خوای گەورە بوو.

ڕۆژێکیان، لە حەوشەی یەکێک لەماڵەکاندا دانیشتبوو، ئیسلام و سوننەتی پێغەمبەری(ﷺ) فێری خەڵکی دەکرد، خەڵکیش بەپەرۆشەوە گوێیان لێگرتبوو، پرسیاریان ئاراستە دەکرد، ئەوەی کە خۆیان نەیاندەزانی لەوەوە فێری دەبوون، بۆ

ڕۆژێکیش هەستی بە بێزاری و ماندوبوون نەدەکرد، چەندەها جار جوانی ئیسلام و ڕەوشتجوانی پێغەمبەرو(ﷺ) ئارامگرتنی زۆر و بەسۆزیی و خۆشەویستی پێغەمبەری(ﷺ) زۆر بۆ دووبارە دەکردنەوەو بۆی باس دەکردن، ئا لەو کاتەدا، کەسێک هات کە شمشێرێکی پێبوو، نیشانەی تورەیی پێوە دیاربوو، ئاوڕیدایەوە بەلای موصعەبداو وتی: (چی تۆی هێناوەتە ناومان، دەتەوێ لاوازەکانمان هەڵخەڵەتێنی؟ ئەگەر خۆتت خۆشدەوێ بەدووربە لێمان).

موصعەب کە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فێری ئارامگرتن بووە، ویستی وەک ئەو بە بەزەیی بێت، بە زەردەخەنەیەکەوە سەیری کابرای کردو وتی: (ئەی دانانیشی گوێبگری؟ جا ئەگەر شتەکەت پێباش بوو ئەوا قوبوڵی دەکەیت، ئەگەر پێشت ناخۆشبوو ئەوا ئەوەی تۆ پێتناخۆشە نایکەین).

کابرا زۆر بەلایەوە سەیر بوو، ئەو سوکایەتی بە موصعەب کرد، بەڵام ئەو تورە نەبوو بەڵکو بە بەزەیی و بە ئەدەبەوە هەڵسوکەوتی لەگەڵکرد، کابرا بەئەسپایی شمشێرەکەی لە شانی داگرت و دانیشت. موصعەب باسی ئیسلام و باسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد، کابرا پێشتر باسی لەوجۆرەی نەبیستبوو، هەستی بە فێنکییەک کرد کە دڵی داپۆشی، ئینجا بە موصعەبی وت: (ئەی بۆ شتێک لەو قورئانە ناخوێنیتەوە کە دەڵێی دابەزیوەتە سەر پێغەمبەرەکەت؟)

موصعەب بە دەنگە خۆشەکەی چەند ئایەتێکی قورئانی پیرۆزی خوێندەوە، زۆر کاریانکردە سەر کابراو وتی: (لەوە چاکتر و جوانتر نیە، ئەگەر بتانەوێ کەسێ بێتە ناو ئەو ئاینە چی پێدەکەن؟! موصعەب پێیوت: پێویستە یەکەمجار خۆی بشوات، کابرا خۆی شۆری و پۆشاکی پاکوخاوێنی لەبەرکرد، دوای ئەوە، موصعەب فێریکرد شایەتومان بێنێ.

بەمشێوەیە، ئەو پیاوە کە لەسەرەتاوە ویستی موصعەب دەربکات، نیشانەی دڵخۆشی لەسەر ڕوخساری دەرکەوت، هەستی بە سەغڵەتی کرد لەوەی کە پێش چەند خولەکێک بەرانبەر بە موصعەب کردی، پاشان هەستاو ڕۆیشت.

کابرا چوو یەکێ لە هاوڕێکانی خۆی ئاگادارکرد بەوەی کە ڕوویدا، ئینجا هاوڕێکەی بە هەمانشێوە هات بۆ لای موصعەب، ئەویش ئایەتە قورئانییەکان کاریان تێکردو ڕاستەوخۆ موسڵمانبوو، پاش چەند ساڵێک، ئاینی ئیسلام و موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) بوونە تاکە ئاین و تاکە پێغەمبەری زۆرینەی خەڵکی مەدینە.

## ١٠٩. مژدەیەک لە مەدینەوە

ساڵێک تێپەڕی بەسەر ڕۆیشتنی موصعەب دا بۆ مەدینە، لەو ماوەیەدا شتانێکی باش ڕوویاندا، زۆرێک لە خەڵکی مەدینە موسڵمانبوون. موصعەبیش دوای ئەوە کە ئەرکی خۆی بە سەرکەوتوویی ئەنجامدا، تامەزرۆی گەیشتنەوە بوو بە دیداری پێغەمبەر(ﷺ)، هەروەها ئاگادارکردنی بەو شتانە کە لەوێ گوزەراون، ئەو کەسانەی تریش کە بەبێ دیتنی پێغەمبەر(ﷺ) موسڵمان بووبوون ئەوانیش بەهەمانشێوە هەر حەزیان دەکرد لە نزیکەوە بە خزمەتی بگەن و بیناسن، ویستیشیان بانگهێشتی بکەن بۆ مەدینە.

کاتێ وەرزی حەج سەرلەنوێ گەڕایەوە، حەفتاو پێنج کەس لە موسڵمانانی خەڵکی مەدینە هاتن بەرەو مەککە، چەند کەسێکیان لەخۆیان نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، جا ئەگەر هاوەڵگەران پێیان بزانینایە ئەوا هیچ دوودڵ نەبوون لەوەی ئازاریان بدەن، بەو هۆیەوە، دەبوو وریای خۆیانبن، کاتێ گەیشتن پێغەمبەریان(ﷺ) لە مزگەوتدا بینی، هاتنە خزمەتی و پێیانوت: (ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە ژمارەیەکی زۆرین و لە مەدینەوە هاتووین، حەزدەکەین بێیت لەگەڵمان بۆ مەدینە تا ڕزگارت بکەین لە چەوساندنەوەکانی قورەیش، جا ئەگەر بفەرمووی ئەو مەسەلەیە لەگەڵتدا باسبکەین؟).

پێغەمبەر(ﷺ) داوای کۆبوونەوەکەی پەسەندکردن، هەربۆیە داوایلێکردن سەرلەنوێ بڕۆن بۆ عەقەبە، پیاوەکان بێدەنگی مزگەوتیان بەجێهێشت.

ئەو شەوە شەوێکی زۆر تاریکبوو، موسڵمانانی مەدینە لە درەنگانێکی شەودا چاویان بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوت، لەو دانیشتنەدا پەیمانیاندایە هەروەک چۆن ماڵ و منداڵی خۆیان دەپارێزن بەهەمانشێوە خۆی و خێزانەکەی و منداڵەکانی ئەویش بپارێزن، داوایان لێکرد لەگەڵیان بڕوات بۆ مەدینە.

بەمجۆرە باوەشیان گرتەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بانگهێشتیان کرد بۆ مەدینە، ویستییان لەو کۆمەڵکایە دەربیێنن کە نرخیان نەدەزانی و دەستکۆتا نەبوون لە ئازاردانی، بەڵام یەکێکیان هەستی بەجۆرێ لە ناڕەحەتی دەکرد، هەستایە سەرپێ و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، لەنێوان ئێمەو ئەو کەسانەدا (واتە جولەکە) جۆرێ لە پەیوەندی و هاوپەیمانی هەیەو وا ئێمە دەیبڕین، ئەگەر بتەوێ ئێمە ئەوە دەکەین، بەڵام ئەگەر دواتر خوای گەورە دەستەڵات بە تۆ بدات و بگەڕێیتەوە ناو قەومەکەی خۆت و واز لە ئێمە بێنی ئێمە چیبکەین؟).

پێغەمبەر(ﷺ) وەڵامیدایەوەو فەرمووی: ((خوێنتان خوێنمە، ماڵوێرانیتان ماڵوێرانیمە، من لە ئێوەم، ئێوەش لە منن، دەجەنگم دژ بە کەسێ کە ئێوە لە دژی بجەنگن، ئاشتەواییش لەگەڵ کەسێکدا دەکەم کە ئێوە ئاشتبن لەگەڵیدا)).

ئەم پەیماننامەیە بەمجۆرە گرێدرا، پێغەمبەر(ﷺ) دەستی درێژکرد، موسڵمانانی مەدینەش یەک لەدوای یەک دەستیان خستە ناودەستی و بەڵێنیاندایە بیپارێزن لە هەموو مەترسییەک، تەنانەت با بە ژیانی خۆیشیان بووبێت، بەمجۆرە لە یەکێک لە شەوەکاندا دووەم پەیماننامەی عەقەبە بەسترا. خەڵکی مەدینە بە خۆشی و شادییەوە گەڕانەوەو هەموو گیانیان متمانەو خۆشەویستی بوو بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ١١٠. قورەیش ترسی لێنیشت

دوای ئەوە قورەیش بیستی کە ڕێکەوتن لەنێوان پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمانانی مەدینەدا ئەنجامدراوە ترس شاری مەککەی داگرت. هاوەڵگەران کەوتنە لێکۆڵینەوەو دڵنیابوون لە هەواڵەکە، ڕۆیشتن بۆ لای عەبدوڵڵەی کوڕی ئوبەی کە یەکێک بوو لە گەورەکانی شاری مەدینە، پرسیاری ئەو دەنگوباسەیان لێکرد. عەبدوڵڵە کەسێکی موسڵمان نەبوو، لەبەرئەوە، نەیدەزانی موسڵمانانی مەدینە چییانکردووە، عەبدوڵڵە وتی: (ئەوەی ئێوە دەیڵێن ڕاست نیە، هەرگیز ناگونجێ خەڵکی مەدینە شتێک بکەن و ڕاوێژ بە من نەکەن، ئەوە تەنها چاوڕاوێکە بڵاوبووەتەوە).

دوای بیستنی ئەم گوتەیە، هاوەڵگەران کەمێ حەوانەوە، موسڵمانانیش ئەو ڕێکەوتنەیان بە نهێنی هێشتەوە چونکە هەستییان بە بەرپرسیارێتی دەکرد، لەبەرئەوەی موسڵمانبوونیان بە نهێنی هێشتەوە تا بتوانن بەردەوامبن لە بازرگانیکردن لەگەڵ مەککەدا، هاوکات بە سەلامەتی بێن سروتەکانی حەجیش ئەنجامبدەن.

جا کاتێ موسڵمانانی مەدینە لە سەفەری گەڕانەوەدا بوون بۆ شارەکەیان قورەیش بە ڕاستێتی ڕێکەوتننامە نهێنییەکەی زانی، ڕاستەوخۆ زۆر بەخێرایی ڕۆیشتن بۆ مەدینە، بەڵام موسڵمانان دەمێک بوو مەککەیان جێهێشتبوو، بە فەزڵی ئەو پشتگیری و لایەنداریيە ڕاستەقینەیە کە بۆ پێغەمبەریان(ﷺ) هەبوو خوای گەورە لە ئازاردانی بێباوەڕان ڕزگاریکردن، دوای گەڕانەوەیان بۆ مەدینە، کەوتنە چاوەڕوانیکردن تا موسڵمانان و پێغەمبەرەکەیان(ﷺ) کۆچبکەن بۆ لایان، ئەم چاوەڕوانییە بەجۆرێ بوو ئۆقرەی لێبڕیبوون.

## ١١١. کۆچکردن بەرەو مەدینە

چەوساندنەوەی هاوەڵگەران دژ بە موسڵمانان چەندینجار زیادیکرد، درێغیان نەکرد لە گرتنەبەری هەموو جۆرە شێوازێکی ئازاردانی موسڵمانان، ژیان لە مەککەدا بۆ موسڵمانان بووبووە سەرچاوەی ئازارو بەس، بەردەوام لەلایەن قورەیشەوە کرابوونە ئامانج و سوکایەتی و دەستدرێژیکردن و جنێو و قسەی ناشیرین وتن پێیان بەشیان بوو، هەربۆیە موسڵمانان چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێیانوت ئیتر توانایان نەماوە بەرگەی ئەو ستەملێکردنە بگرن و حەزدەکەن کۆچبکەن بۆ مەدینە، چونکە کۆچکردنیان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر هەلیان بۆ دەرەخسێنێ بە ئاسانی و بە ئازادی کاروباری ئاینەکەیان ئەنجامبدەن.

پێغەمبەری خوا ماوەیەکی زۆر سەرقاڵی بیریکردنەوە بوو، مەعلومیشە کە گواستنەوە بۆ مەدینەو ژیان گوزەراندن تیایدا شتێکی باشە، بەڵام هێشتا خوای گەورە لەوبارەیەوە فەرمانی بۆ نەناردووە، پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی بۆ ڕوونکردنەوە، ئەوانیش کەوتنە چاوەڕوانیکردن بۆ هاتنی ئەو فەرمانە.

چەند ڕۆژێک تێپەڕی، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی بانگکردو پێی فەرموون: ((شوێنی کۆچکردنتانم بینی کە زەوییەکی دارخورماییە...)) مەبەستی مەدینە بوو، پاشان مۆڵەتیدان کۆچبکەن و لە مەدینە لەگەڵ براکانیاندا ژیان بەسەربەرن، مەدینە ئەو زەویەیە کە سەلامەت و ئەمین و ئارامە.

موسڵمانان زۆر دڵخۆشبوون بە هەواڵەکە، چونکە ئیتر لێرە بەولاوە دەتوانن بە ئارامی خوای گەورە بپەرستن و بە ئاشتی بژین، بەمشێوەیە کەوتنە خۆ ئامادەکردنی کۆچکردن و دڵیان لێوانلێو بوو لە ئومێدو لە شادمانی.

بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) جارێکیتر ئاگاداری کردنەوە کە دەبێت ئەم مەسەلەیە بە نهێنی بمێنێتەوە، موسڵمانانیش بە گروپی ژمارە کەم کەم مەککەی پیرۆزیان جێدەهێشت تا بێباوەڕان بەئاگا نەیەنەوە لێیان، لەدوای چەند ڕۆژێک، قورەیش پەی بەوە برد کە موسڵمانان مەککەیان جێهێشتووە، هەربۆیە بڕیاریاندا بڕۆن بەدوایاندا، هەرکەسیان بگرتایە بە زۆرەملێ دیانگێڕایەوە بۆ مەککە، بەمجۆرەش ئەندامانی خێزانەکان پەرت و بڵاوبوون، هەندێکیشیان لێ زیندانیکرا، بەڵام موسڵمانان هەر خۆیان ڕادەست نەکرد، بێباوەڕان ئەوەی لە توانایاندا بوو کردیان تا ڕێگیری لە کۆچکرنی موسڵمانان بکەن، بەڵام ئەوان بەرگرییان کرد، بەرگەی هەموو ناڕەحەتی و ئاستەنگەکانیان گرت، بە پشتیوانی خوای گەورە توانیان درێژەبدەن بە کۆچکردنەکەیان.



بەمشێوەیە بەرەبەیانێکی نوێ لە مێژووی ئیسلامدا دەستپێکرد، ڕووناکی ئاینی نوێ بەسەر کێوەکانی مەدینەدا دەدرەوشایەوە. لە بەرانبەریشەوە مەککە کەم کەم لە دانیشتوانە ڕەسەنەکەی خۆی خاڵیدەبوویەوە، چونکە موسڵمانان دەرگای ماڵەکانیان داخست و منداڵەکانیان گەیاندنە مەدینە، ئیتر لەوێ دەتوانن بە ئاشتی و سەلامەتی یاریبکەن و لەگەڵ خەڵک و منداڵانی ئەو شارەدا کە چاوانیان لەخۆشیدا پرشنگی دەدا و دڵیان پڕبوو لە ئومێد ژیانێکی بەختەوەرانە بگوزەرێنن.

منداڵانی مەدینە بە جۆش و خرۆشەوە لە چاوەڕوانی گەیشتنی برا ئاینییەکانیاندا بوون، لە بچوک و گەورەی مەککە، هەروەها تامەزرۆی گەیشتنی پێغەمبەری خۆشەویستییان بوون کە زوو بەزوو بێتە ناویان.

## ١١٢. دەنگە زوڵاڵەکەی عومەر

لە کاتێکدا موسڵمانان دەستە لەدوای دەستە بە نهێنی مەککەیان جێدەهێشت، یەکێکیان ئازایانەو بەبێ ترس ڕاپەڕی و ڕووبەڕووی هەمووی قورەیش وەستایەوە، ئەویش عومەری فاروق بوو، هێمای ئازایەتی و هێزو دادپەروەری و ڕاستگۆیی، ئەویش خۆی ئامادەکردبوو مەککەی پیرۆز جێبێڵێ، شمشێرەکەیی حازرکردو حەوتجار تەوافی کەعبەی کرد.

هاوەڵگەران نەیانتوانی بوەستن بەڕووی عومەردا، چونکە زۆر لێی دەترسان، عومەر بە دەنگە زوڵاڵەکەی قیڕاندی وتی: (هەرکەس دەیەوێت دایکی سنگی بۆ بکوتێ، هەرکەس دەیەوێت منداڵەکانی بێباوک بن، هەرکەس دەیەوێت ژنەکەی بێوەژن بکەوێت، با بەدوامدا بێت بۆ ناو ئەو دۆڵە).

بێباوەڕان یەک وشە لە زاریان نەهاتەدەر، چونکە دەیانزانی ئەگەر بیانەوێ نەهێڵن بڕوات چییان بەسەردێت، عومەر پێشتر مۆڵەتی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەرگرتبوو، لەگەڵ بیست موسڵمانی تردا مەککەی بەجێهێشت، ئەوانیش گەیشتنەوە بە موسڵمانانی مەدینە، ئیتر لە مەککەدا جگە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ماڵ و منداڵ و ئەبوبەکری هاوەڵ و هاوڕێی و عەلی ئامۆزای و کەسانی داماو و نەخۆش نەبێ کە بێباوەڕان وەک سزایەک لەسەر باوەڕەکەیان بەدیلیان گرتبوون کەسیتر لە موسڵمانان لە مەککە نەمابوو.

خوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی بە موسڵمانان بەخشی، بەڵام هێشتا ئەو فەرمانەی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەدابوو، هەربۆیە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) چاوەڕێی گەیشتنی فەرمانێکی تایبەت بەخۆی بوو.

## ١١٣. پیلانگێڕیی قورەیش

بەپێی ئەو هەواڵانەی دەگەیشتنەوە مەککە، خەڵکی مەدینە پێشوازییەکی بێ وێنەیان لە موسڵمانان کردوو باوەشیان گرتبووەوە بۆیان و هەڵسوکەوتی جوانیان لەگەڵیاندا نواند. هەروەها بەپێی ئەو پێوەرە ڕەوشتییە باڵایانە کە ئاینی ئیسلام گەیاندبووی پێیان، لە ماڵەکانی خۆیاندا پێشوازییان لێکردن و هەموو ئەوەی کە هەیانبوو لە ماڵ و سامان بەشیانکرد لەگەڵیاندا.

ئەو شادیی و دڵئارامییەی کە موسڵمانان کەوتنەناوی بێباوەڕانی شێتگیر کرد، هەرکات بیریان بکردایەتەوە لە ئەگەری کۆچکردنی خودی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێ لە ڕۆژان و گەیشتنەوەی بە موسڵمانان ترس و تووڕەییان زیاتر و زیاتری دەکرد، ئەم بیرۆکەیە ئارامی لێبڕین، هەربۆیە هەستییان بەوە کرد کە دەبێت بەخێرایی شتێک بکەن.

بێباوەڕان بۆ ئەم مەبەستە زوو بەزوو کۆبوونەوەو ژمارەیان گەیشتە نزیکەی سەد کەس، کەوتنە وتوێژ لەسەر ئەوە کە مادامێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێشتا لە مەککەیە دەبێ بزانن چ شتێکی پێبکەن، یەکێکیان وتی: (بەندی بکەن و دەرگای لەسەر دابخەن، تا بمرێ هەروەک چۆن شاعیران لەپێش ئەمەوە مردوون). بەڵام ئەو پێشنیارەیان ڕەتکردەوەو وتیان: (بەخوا ئەگەر بەندی بکەن ئەوا هەواڵەکەی دەگاتەوە هاوەڵانی، ئەوانیش ئەویان لە باوک و دایکیان خۆشتر دەوێ، دوورنیە بێن بەهانایەوەو لە چنگتان دەریبێنن، ئینجا پێیەوە بنازن بەسەرتاندا، ئەوکات گیربخۆن بەدەست خۆتانەوە، وەرن بگەڕێن بەدوای ڕایەکی غەیری ئەم ڕایەدا).

یەکێکیتریان وتی: دەریدەکەین و لێرە نایهێڵین، ئەوکات کاروباری خۆمان چاکدەکەین، بێباکیشین لەوەی بۆ کوێ دەڕوات). کەسێکی بەتەمەن و خراپەکاریان وتی: (ئێوە بەچاوی خۆتان گوفتار جوانییەکەی دەبینن، زمان شیرینی و خۆشدوانییەکەی دەزانن کە چۆن هەژموون لەسەر دڵەکان پەیدا دەکات. ئەگەر بێتو بڕوات، مەعلوم دەچێتە ناو یەکێک لە ناوچە عەرەبەکان و ئەوانیش لێی کۆدەبنەوە، ئینجا بەوان لە وڵاتی خۆتاندا جێتان پێ لێژ دەکات، پاشان ئەوەی خۆی بیەوێت پێتان دەکات، بگەڕێن بەدوای تەگبیرێکی تری غەیری ئەمەدا).

لێرەدا ئەبو جەهل وتی: (من ڕایەکم هەیە وائەبینم هێشتا ئێوە ڕێتان لێی نەکەوتووە)، پێیانوت: (چییە؟)، وەڵامیدایەوە: (لە هەر خێڵێک گەنجێکی بەتوانای گونجاو و لێهاتووی کارامە لەناوماندا بێنین، شمشێرێکی تیژ بدەین بەدەست هەر یەکێکیانەوە، ئینجا پێکەوە هەڵکوتنەسەری و بە یەک لێدان لێیبدەین و بیکوژن. ئەوکات خوێنەکەی دابەشدەبێت بەسەر هەموو خێڵەکاندا، نەوەی عەبد مەنافیش ناتوانن شەڕی هەمووی قورەیش بکەن، ئەوکات ناچار دەبن ڕازیبن بە خوێنبایی، ئێمەش دەیاندەینێ). پیاوە بەتەمەنە خراپەکارەکە وتی: (ئەوە قسەیە کە ئەم پیاوە کردی، ئەمە ڕایەکەو وانازانم ڕای لەمە باشتر هەبێت). بەمجۆرە، ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە پێشنیارەکەی ئەبو جەهلیان پەسەندکرد، زەردەخەیەکی فێڵبازانە کەوتەسەر ڕوومەتیان، بڕیاری کۆتایی هاتە سەرئەوە کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بکوژن.

## ١١٤. کۆچی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی وابوو ڕۆژانە بە بەیانیان یان بە ئێواران سەردانی ئەبوبەکری هاوڕێی دەکرد، بەڵام ڕۆژێکیان بە پێچەوانەی ڕۆژانی تر لە کاتی نیوەڕۆدا تەقەیدا لە دەرگای ئەبوبەکر، ئەبوبەکر لە دڵی خۆیدا وتی: (باوک و دایکم بە فیدای بێت، بەخوا لەم کاتەدا بە کارێکەوە نەبێت نەهاتووە). پاشان پێشوازی لێکردو بەوپەڕی خۆشەویستییەوە بۆی ڕووانی و وتی: (باوک و دایکم بەفیدات بێت ئەی پێغەمبەری خوا). باشترین شێوازی بەکارهێنراو لەو سەردەمەدا بۆ نیشاندانی خۆشەویستی بۆ کەسێکیتر وتنی ئەو دەستەواژەیە بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) مژدەی پێداو فەرمووی: ((من مۆڵەتی دەرچوونم پێدراوە!)).

ئا لەو ساتەدا خەم و خەفەت ڕوخساری ئەبوبەکری داپۆشی، چونکە ئەو ناتوانێ بەرگەی جیابوونەوە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگرێ، بۆیە پرسیاری لێکرد: (هاوەڵت بم باوکم بەفیدات بێ ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)) پێغەمبەر فەرمووی: (بەڵێ). بەمجۆرە خەفەت لەسەر دڵی ئەبوبەکر نەماو فرمێسکی شادی لەسەر ڕوومەتی دەرکەوتن.

پێغەمبەر(ﷺ) دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، لەوێ جبرەئیلی فریشتەی وەحی(ﷺ) بینی، جبرەئیل سەلامی لێکردو ئاگاداریکرد بە پیلانەکەی قورەیش، پاشان وتی: (ئەمشەو لە شوێنی نوستنی جارانت نەمێنیتەوە).

هەرکە ئەوە بیسترا، ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) عەلی ئامۆزای بانگکردو فەرمانی پێدا لە جێگاکەی ئەودا بخەوێ، بە پۆشاکە سەوزەکەی پێغەمبەر(ﷺ) خۆی داپۆشێ، پێیوت کە تووشی هیچ جۆرە خراپەیەک نابێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککە نازناوی موحەممەدی ئەمینی لێنرابوو، چونکە تا ئەو کاتەش خەڵکانی هاوەڵگەرو باوەڕداران چوونیەک، عادەتیان وابوو سەروەت و سامانیان لای ئەو دادەنا، ئەمیندار بوو لەسەر بەنرخترین شمەکی تەنانەت ئەوانەش کە دەیانویست بیکوژن، ئەویش هەستا بە ڕادەستکردنی هەموو ئەو ئەمانەتە بەنرخانە بە عەلی و ئاگاداریکرد بە خاوەنی هەریەک لەو ئەمانەتانە، داواشی لێکرد هەریەک لەوانە بگەڕێنێتەوە بۆ خاوەنەکەی.

هەستیکرد کەوتووەتە بەردەم مەترسی کوشتن لەلایەن هاوەڵگەرانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەر هەستی بە ترس و تۆقین و شڵەژان نەکرد. چونکە وەک هەموو جارێ متمانەی بە خوای گەورەی بێسنور بوو، ئەو هەر لە بنەڕەتەوە ئامادەباش بوو بۆ قوربانیدان لەپێناوی گەیاندنی پەیامەکەیدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئەم حاڵەتە بەدرێژایی شەو دەمایەوەو بەوپەڕی ئارامییەوە نوێژی دەکرد.

## ١١٥. ڕزگاربوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

بە ماوەیەک لەدوای نیوە شەو، ژمارەیەک لە بێباوەڕان بە خۆیان و شمشێریانەوە هاتن، لە هەموو لایەکەوە دەورەی ماڵی پێغەمبەریان(ﷺ) دا، سنگیان بە ڕق و کینەو تورەیی دەکوڵا، کەوتنە چاوەڕوانی کردن تا بەیانی بێت و لە ماڵەکەی بێتە دەرەوە، چونکە بەپێی داب و نەریت، ترسنۆکییە گەر بێت و لە کاتی خەودا کەسێ بکوژێ.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵەوە بوو، ئەوەی جبرەئیل فەرمانی پێکرد بەجێیگەیاند، بە عەلی فەرموو کە لە جێگاکەیدا بخەوێ، ئەوەشی زانی کە بێباوەڕان دەورەی ماڵەکەیانداوە، بەڵام هیچ هەستی بە ترس و بیم نەکرد، چونکە دەیزانی خوای باڵادەست کە ئەوی بە پێغەمبەر ڕەوانەکردووە دیپارێزێ لە ئازاردانی قورەیش. پاشان دەستنوێژی گرت و خواحافیزی لە ئەندامانی خێزانەکەی کرد، دەرگاکەی کردەوە، پاشان لە ماڵ چووەدەرەوە، ژمارەیەک لە هاوەڵگەرانی بینی کە شمشێرەکانیان بەدەستییانەوە گرتبوو، ئەویش(ﷺ) مشتێ خۆڵی لەسەر زەوی هەڵگرت و دای بەسەریاندا و فەرمووی: ((چرو چاوتان خواتەوە)). ئینجا بەنێویاندا تێپەڕی، ئەوەش بە فەرمانی خوای گەورە بوو.

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو فەرمانەی جێبەجێکرد کە جبرەئیل(ﷺ) پێیڕاگەیاند، ئیتر نەبینراو لەبەردەم و بەنێو بێباوەڕاندا تێپەڕی، کەچی ئەوان نیانتوانی ببینن، هەر لەسەر ئەو حاڵەتەیان مانەوەو هەر چاوەڕێی هاتنە دەرەوەیان دەکرد تا ڕۆژ بوویەوە.

ئەبو جەهل بەفیزێکەوە هەستایە سەرپێ و وتی: (موحەممەد دەڵێ گوایا ئەگەر ئێوە شوێنکەوتەی ئەو کارەی ئەوبن ئەوا دەبنە پادشای عەرەب و عەجەم، پاشان دوای مردنتان زیندوودەبنەوە، بەهەشتی وەک بەهەشتەکانی ئوردونتان بۆ دابین دەکرێ، بەڵام ئەگەر ئەوە نەکەن ئەوا سەربڕین لەوەوە بەشتان دەبێ، پاشانیش دوای مردنتان زیندوو دەکرێنەوە، ئاگری دۆزەختان بۆ ئامادەیەو دەسوتێن تیایدا).

پاش ماوەیەک کەڵەشێرەکان کەوتنە خوێندن ئەوەش وەک ئاگادارکردنەوەیەک بە هەڵاتنی بەرەبەیان، ئەو کەسانە کە دەوری ماڵەکەیان دابوو دڵخۆشبوون بە هاتنی بەیانی، ئەبو جەهلیش کەوتبووە قسەکردن لەگەڵ خۆیداو دەیوت: (ئەی خۆر دەی هەڵبێ، ئێمە پەلەمانە)، داوتر پیاوێک تێپەڕی و پرسیاری لێکردن: (ئەوە چاوەڕێی چین لێرە؟)، وتیان: (موحەممەد)، پیاوەکە وتی: (خوا نائومێدی کردن، بەخوا موحەممەد بەسەرتاند تێپەڕی، کەسیشتانی لێدەرنەکرد خۆڵ نەکات بەسەریدا، ڕۆیشت بەدەم کارییەوە، ئیتر ئێوە خەریکی چین؟)، هەموویان دەستیان خستە سەر سەریان، ئینجا لە پەنجەرەکەوە کەوتنە چاودێریکردن، ئەوکات بینیان کە عەلی لەسەر جێگاکەی پێغەمبەرەو خۆی بە پۆشاکە سەوزەکەی داپۆشیوە، وایانزانی پێغەمبەرە(ﷺ)، وتیان: (بەخوا ئەوە موحەممەدە خەوتووە، پۆشاکێکی بوردەی بەسەرەوەیە)، هەر بەوشێوەیە مانەوەو چاوەڕێی هەڵاتنی خۆریان دەکرد.

## ١١٦. لە چاوەڕوانی هاتنی بەیانیدا

بەیانی هات بەسەر بێباوەڕە چەکدارەکاندا، کە بەدەوری ماڵەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) سەرەتاتکێیان بوو، دواجار دەنگی جیرەی دەرگاکە بیسترا کە دەکرایەوە، کەسێکی لێهاتە دەرەوە کە هەرگیز پێشبینیان نەدەکرد، ئەو کەسەش عەلی کوڕی ئەبو تالیب بوو، بێباوەڕان واقیان وڕما، خێرا چوون بەرەو ڕووی و پرسیاری پێغەمبەری خوایان(ﷺ) لێکرد، ئەویش وەڵامیدانەوە کە: (هیچ لەبارەیەوە نازانم)، ئەبو جەهل چووە ژوورەوە بەڵام پێغەمبەری لە ماڵەکەدا نەدۆزییەوە، ئینجا گەڕانەوە بۆ لای عەلی، فشارێکی زۆریان خستە سەر بەڵام نەیانتوانی هیچ زانیاریەکی لێوەربگرن، بێباوەڕان بە هیچ جۆر نەیانزانی پێغەمبەر(ﷺ) چۆن دیارنەماوە، وتیان: (بەدڵنیایی کە لەماڵی ئەبوبەکرە!)، بەپەلە خۆیان گەیاندە ماڵی ئەبوبەکر، تەقەیاندا لە دەرگا، ئەسمای کچی ئەبوبەکر دەرگاکەی بۆکردنەوە، بە ترسێکەوە سەیرێکی کردن، پێیانوت: (ئەی کچی ئەبوبەکر باوکت لەکوێیە؟)، ئەسما وتی: (بەخوا نازانم باوکم لەکوێیە). بەڵام ئەبو جەهل لە زۆر تورەبوونی خۆیدا زللەیەکی کێشا بەرووتی ئەسمادا، ئەویش لە سەختی لێدانەکە کەوتە سەر زەوی و گوارەکانی پچڕان و پژان بە زەویدا، بەڵام وێڕای ئەوەش هەر نهێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و باوکی ئاشکرا نەکرد، ئەوکات بێباوەڕان زانیان کە زانیاریان لەبارەیەوە دەستناکەوێت. کەوتنە گەڕان بە هەموو شوێنێکدا، پرسیاری پێغەمبەر(ﷺ)

و ئەبوبەکریان لە خەڵکی دەکرد، دواجار نائومێدبوون. ئینجا کەوتنە ناردنی کەسانێ بۆئەوەی بە خەڵکی ڕابگەیەنن کە هەرکەس شوێنی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر دەستنیشان بکات ئەوا خەڵاتی دەدەنێ، ئەو کەسانەش کەوتنە هاوارکردن لە جادەکانداو دەیانوت: (ئەی قورەیشییەکان! هەرکەس موحەممەد و ئەبوبەکر بدۆزێتەوە سەد وشتری دەدرێتێ!).

## ١١٧. پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی بەڕێگاوەن بەرەو مەدینە

دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵەکەی چووە دەرەوە، بەدەم زیکرکردنی خوای گەورەوە ڕووی لە ماڵی ئەبوبەکر کرد، پێڵوی چاوانی ئەبوبەکر نەنیشتن و هەر چاوەڕێی پێغەمبەری دەکرد، کاتێ بەیەکگەیشتن، خێرا لە دەرگای پشتەوە چوونە دەرەوە، ئەبوبەکر برێ پارەو خواردنی بۆ سەفەرەکە لەگەڵ خۆی هەڵگرت، ئێستا نزیکەی سێ میل لە مەککەوە دوورن، دەچوون بەرەو کێوی (سەور)، بە هێواشی سەرکەوتنە سەر کێوەکە، جا بۆئەوەی شوێن پێیەکانیان دیار نەمێنێ نەعلەکانیان داکەندو گرتنیان بەدەستییانەوە، لەپێناو گەیاندنی ئەو پەیامەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرگەی هەموو ئەو ناڕەحەتییانەی لەو شەوە تاریکەدا گرت.

لەگەڵ نزیکبوونەوەی بەیانی، لە کێوی سەور ئەشکەوتێکیان دۆزییەوە، بڕیاریاندا بچنەناوی و تا شەو دادێ خۆیان بشارنەوە تیایدا، پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر چوونە ناو ئەشکەوتەکەوە، بەمشێوەیە لەگەڵ هاتنی بەیانیدا ئەوان لە ئەشکەوتەکەدا خۆیان حەشاردا.

## ١١٨. ئەبوبەکر هەموو پارەکەی لەگەڵ خۆی برد تا بیخاتە خزمەتی بانگەواز

ئەسمای کچی ئەبوبەکری صدیق دەڵێ: کاتێک پێغەمبەر خوا(ﷺ) ڕۆیشت و باوکیشم چوو لەگەڵیدا، ئەبوبەکر هەموو ئەو پارەیەی هەیبوو لەگەڵ خۆی هەڵیگرت، کە پێنج تا شەش هەزار درهەم بوو، بردی لەگەڵ خۆی، ئەبو قوحافەی باپیرم دواتر هاتە ماڵمان کە چاوەکانی لەدەست دابوو، باپیرەم پێیوتم: بەخوا من وادەبینم کە ئێوەو خۆی و ماڵ و سامانەکەشی خستووەتە ناو زەحمەت و ئازارێکی زۆرەوە! منیش وتم: نەخێر باوە گەورە! ئەو خێرێکی زۆری بۆمان جێهێشتووە.

چەند بەردێکم هەڵگرت و خستنمە ئەو شوێنە کە باوکم پارەکەی تێدا دادەنا، ئینجا پۆشاکێکم خستە سەریان، دەستی باوە گەورەمم گرت و پێموت: باوە گەورە ئادەی دەستت بخەرە سەر ئەو پارەیە.

ئەویش دەستی خستەسەری، ئینجا وتی: خراپ نیە، ئەگەر ئەوەی بۆ جێهێشتبن ئەوا باشترە، ئەمەش ئاگادارکردنەوەیەکە بۆ ئێوەیە.

ئەسما دەڵێ: نە بەخوا هیچی بۆ جێنەهێشتبووین! بەڵام من دەمویست ترسەکەی باوە گەورەم هێوربکەمەوە، لەڕاستیدا بانگەواز بۆ لای خوای گەورە گرنگترە لە حەوانەوەی ئێمە، باوکم ئەو پارەیەی بۆیە برد تا هاوکاری پێغەمبەر(ﷺ) بکات لە بڵاوکردنەوەی ئاینی خوای باڵادەستدا، پێغەمبەریش(ﷺ) دەفەرموێ: ((هیچ ماڵێک بەڕادەی ماڵەکەی ئەبوبەکر سودی پێنەگەیاندووم)).

## ١١٩. هاوەڵگەران بەدوای پێغەمبەری خوا گەورەوەن(ﷺ)

خەڵکی ئەو خەڵاتانەیان بیست کە قورەیش دیاریکردبوو بۆ هەرکەسێ کە پێغەمبەر(ﷺ) بدۆزێتەوە، خێرا کەوتنە گەڕان بەدوایدا، ئەوانەی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) خۆشدەویست دەستیاندایە پاڕانەوە بۆی، ئەوانەش کە نەیاندەناسی، بەڵکو ئەوانەی کە خەڵات و پاداشتەکان خەڵەتاندبوونیان، لە هەموو شوێنێکەوە، کەوتنە گەڕان بەدوایدا، هەیانبوو داری بەدەستەوە گرتبوو، هەیانبوو شمشێر و بەرد.

دوو کەسی شارەزایان شوێنپێی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکریان سۆراخکرد، کەوتنە شوێنیان، تا گەیشتنە دەوروبەری کێوی سەور، یەکێکیان وتی: (هەرگیز نابێت لەم ئەشکەوتە دوورتر ڕۆیشتبن، چونکە شوێنپێیەکانیان لێرەدا تەواو بووە). پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر لە ئەشکەوتەکەدا بوون، گوێیان لە دەنگی دوو پیاوەکە بوو، ئەمە بە ئاستی بوو قاچی دوو کەسیان دەبینی کە لەبەردەم ئەشکەوتەکەدا وەستابوون، ئەبوبەکر لە ترس و تۆقین ئارەقی زۆری دەردەدا، ئینجا بە دەنگێکی کز بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: (ئەگەر یەکێکیان سەیری قاچەکانی خۆی بکات ئەوا دەمانبینێ). پێغەمبەر(ﷺ) بەوپەڕی متمانەوە فەرمووی: ((چ گومانی بە دوو کەس دەبەیت کە خوای گەورە سێیەمیانە؟)). پاشان لە خوای گەورە پاڕایەوە تا ئەبوبەکر دڵنیابێت و هێوربێتەوە، لە کتوپڕدا ئەبوبەکر ترس و تۆقینی نەماو بە فەزڵی خوای بالادەست دڵی بە تەواوەتی پڕ بوو لە متمانەو ئومێدو ئازایەتی و باوەڕ و وەک پێغەمبەری(ﷺ) لێهات.

## ١٢٠. سێ رۆژ لە ئەشکەوتدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکردا سێ رۆژ لە ئەشکەوتەکەدا مانەوە، قورەیشیش کاتێ کەونیانکرد سەد وشتری وەک خەڵات تەرخانکرد بۆ ئەو کەسەی دەیهێنێتەوە بۆ مەککە، عەبدوڵڵەی کوڕی ئەبوبەکر بە رۆژدا لەگەڵ قورەیشییەکاندا بوو تا گوێبیستی ئەو پیلانگێڕییانە بێت کە لە دژی پێغەمبەر(ﷺ) دەیکەن، بە شەویشدا بە نهێنی دەڕۆیشت بۆ ئەشکەوتەکەو پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکری ئاگادار دەکرد بە پیلان و دەنگوباسی قورەیش، عامیری کوڕی فوهەیرە کە کارگوزاری ئەبوبەکر بوو بە رۆژدا مەڕی خەڵکی مەککەی دەلەوەڕاند، بە شەویشدا مەڕەکانی ئەبوبەکری دەبرد بۆ ئەشکەوتەکە، لەوێ پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبوبەکر پێویستی خۆیان لە شیر و لە گۆشت لێیانەوە وەردەگرت. بە رۆژیشدا عەبدوڵڵەی کوڕی ئەبوبەکر بەجێی دەهێشتن و دەگەڕایەوە بۆ مەککە. ئینجا عامیری کوڕی فوهەیرە بەدوای عەبدوڵڵە دا بە مەڕەکانیەوە دەگەڕایەوە تا شوێنپێیەکانیان بەرەو ئەشکەوتەکە بسڕێتەوە.

دوای تێپەڕبوونی سێ رۆژ، قورەیش وایزانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەمێکە گەیشتووەتە شوێنی مەبەستی خۆی، لەپاش ماوەیەک، کاری گەڕانی بەدوایاندا برێ سوک کرد، ئەمەش دەقاو دەق ئەو مەبەستە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) چاوەڕێی دەکرد، لەگەڵ تەواوبوونی رۆژی سێیەمدا، پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاریدا لەگەڵ هاوەڵەکەیدا سەرلەنوێ درێژەبدەن بە رۆیشتن بەرەو مەدینە، لەوێ، لە مەدینە موسڵمانان بە شەوق و خۆشییەکی زۆر زۆرەوە چاوەڕێی هاتنی ئەو رۆژە بوون.

## ١٣١. خواحافیزی کردن لە مەککە

بێدەنگییەکی نائومێدیی و خەمناک ئامێز باڵیکێشا بەسەر مەککەدا، جادەو ڕێگاوبانەکان چۆڵەوانیان پێوە دیاربوو، خەڵکی لە چالاکی کەوتبوون، ئەو ڕۆژە دوو شەممە بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکری هاوەڵی بێدەنگی لە ئەشکەوتەکە چوونە دەرەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و سوپاسی خوای گەورەی کرد. لێی پارایەوە سەفەرەکەیان سوک و ئاسان بکات. پاداشتی بەخێریان بداتەوە. ئا لەو کاتەدا، ئەبوبەکر دوو وشتری ئامادەکرد، عامیر کە شوانی ئەبوبەکر بوو ئامادەبوو، بۆ لەمەوپاشیش دەبێتە ڕێنیشاندەری گەشتەکەیان، ئەبوبەکر وشترە بەهێزو خێراکەی (گوێ کەلەکەی) دا بە پێغەمبەر(ﷺ)، پێیوت: (سواربە باوک و دایکم بە قوربانت بن). پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ کات شتێکی وەرنەدەگرت کە هی خۆی نەبێت، فەرمووی پێی: ((من سواری وشترێک نابم هی خۆم نەبێت)). ئەبوبەکر وتی: (ئەوە هی تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بە باوک و دایکم بیت). پێغەمبەر وتەکەیی دووبارە کردەوەو ئەمەشی زیادکرد: ((نەخێر، بەڵام نرخی کڕینەکەیم پێبڵێ؟)). لە کۆتاییدا، ئەبوبەکر ناچاربوو نرخی وشترەکەی پێبڵێت، پێغەمبەریش(ﷺ) لێی کڕی و چوونە سەرپشتی هەردوو وشترەکە، ئینجا لەگەڵ عامیردا کەوتنەڕێ.

ئێستە ئیتر گردۆلکەکانی مەککە دوورکەوتوونەتەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ویستی بۆ دواجار سەیری ئەو شوێنە بکات کە تیایدا لەدایکبووەو گەورە بووە، واتە مەککەی پیرۆز، هەربۆیە وشترەکەیی وەستاند،

بۆ ماوەیەکی زۆر سەیرێکی کەعبەی پیرۆز و گردۆلکەکانی مەککەی کرد، ئینجا ئەم چەند وشەیە لە زاری پیرۆزی هاتنەدەر: ((سوێند بەخوا تۆ چاکترین زەوی خوای گەورەیت، خۆشەویسترین خاکی خوای بە لای خوای گەورەوە، ئەگەر بە زۆر دەرنەکرامایە بەجێم نەدەهێشتی)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی دڵسۆز بوو، چاکی هەڵسوکەوتی خەڵکی لەگەڵیدا لەبیر نەدەچوو، ئەو شارە بۆ ماوەیەکی زۆر فەزڵێکی گەورەی لەسەری هەبوو، ئابەمجۆرە شارەکەیی جێهێشت کە شتانێکی زۆری پێبەخشی.

## ١٢٢. شوانە مەڕێ جێگای پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی دۆزییەوە

شـوانێک لـە بیاباندا بڕکـە مەڕەکەیی دەلەوەڕاند، هێواش هێواش بـەدەوری مەڕەکانیـدا دەسـوڕایەوە، لەنـاکاودا، سـێ سـواری چاوکرد کە لـە دوورەوە دەهاتن، کەوتـە پرسـیارکردن لـە خۆی ئایا دەبێ ئـەو کەسـانە کێبن ئـاوا وێڵـی ئـەم بیابانـە بوون، کەوتـە چاودێریکردنیـان، تـا لـە کتوپـڕدا ڕاسـتێتی مەسـەلەکەی بـۆ ڕوونبوویـەوە. (ئەوانـە ئەوانـن!) موحەممـەد و ئەبوبەکری بینـی کـە چەنـد ڕۆژێکـە قورەیش بەدوایاندا دەگەڕێ، کـە سـەد وشـتری تەرخانکردووە بۆ ئەو کەسـەی دەیاندۆزێتـەوە! بەمجـۆرە، مەڕەکانـی بەتەنیـا جێهێشـت و ڕایکـرد، تـەواو دۆزینیـەوە! کەوتـە ڕاکردن بـەرەو مەککـە تـا قورەیش ئـاگادار بـکات، بیابـان و کێوەکانـی بـڕی، بەبـێ وەسـتان و وچانـدان هـەر ڕایدەکـرد، تـا گەیشـتەوە شـوێنی کۆبوونـەوەی قەومەکـەی، ئـەوکات لەنێویانـدا وەسـتاو وتـی: سـوێند بەخـوا پێـش کەمێـک سـێ سـوارم بینـی بەلامـدا تێپەڕیـن، مـن وادەبینـم موحەممـەد و دوو هاوەڵەکـەی بـن! سـوراقەی کـوڕی مالیـک سـەیرێکی کـرد و بـە هـەردوو چـاوی ئامـاژەی پێدا کـە بێدەنگ بێت، پاشـان سـوراقە وتـی: ئەوانـە نـەوەی فڵانەکەسـن دەگەڕێـن بـەدوای شـتێکیاندا کـە ونیانکـردووە! شـوانەکە وتـی: لەوانەیـە، ئیتـر بێدەنـگ بـوو.

## ١٢٣. سەرگوزەشتەی سوراقە

سوراقە کەسێکی ئازاو شارەزا بوو لە شوێنکەوتنی جێ پێیەکاندا هەرکات بچوایەتە سەر پشتی ئەسپەکەی ئیتر هیچ کەس نەیدەتوانی بیوەستێنێ، کەسیش نەیدەتوانی لەدەستی قوتار ببێت، هەرکە بیستی کە هەرکەس موحەممەد بدۆزێتەوە خەڵاتی سەد وشتر وەردەگری خێرا کەوتە گەڕان، هەموو شوێنێکی پشکنی تا بەڵکو پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) و ئەبوبەکر بدۆزێتەوە، زۆری نەخایاند جێ پێیەکانی دۆزینەوە، زۆر دڵخۆشبوو و بڕیاریدا بگات پێیان.

ئەبوبەکر کاتێ تەپوتۆزێکی زۆری بینی کە لە دوورەوە بەرزدەبوویەوە پەی بەوەبرد سوراقە بەدوایاندا دەگەڕێ، هەستی بە تۆقین و ترس کرد، ئا لەو کاتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر وشترەکەی سەرقاڵی خوێندنی قورئانی پیرۆز بوو، شڵەژاوی هاوەڵەکەیی بەدیکرد. هەروەها ئەو سوارەی بینی کە بەپرتاو بەرەو ڕوویان دێت، تەواو وەک ئەوەی لە ئەشکەوتەکەدا بەسەریاندا هات، پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە دڵنیاکردن و هێورکردنەوەی هاوەڵەکەی و پێیوت: ((دڵتەنگ مەبە، خوامان لەگەڵە)).

پێغەمبەر(ﷺ) ئاوڕێکی دایە دواوەو چاوی بڕییە سوراقە، کە سواری ئەسپەکەی بوو، سوراقە بە خێراییەکی زۆر بەرەو ڕوویان دەهات، ئەو ماوەیە کە لەنێوانیاندا مابوویەوە ماوەیەکی کورت بوو، بەجۆری کە سوراقە توانی گوێبیستی قورئان بێت لەسەر زمانی پێغەمبەر(ﷺ)، کەس نەیزانی چی لەگەڵ سوراقەدا گوزەرا، بەڵام قاچی ئەسپەکەی لە کتوپڕێکدا نوقمی لمەکە بوون، سوراقە زۆر شڵەژاو لە تورەییدا شێتگیر بوو. لەدوای ئەوە کە بە زەحمەتێکی زۆر توانی قاچی

ئەسپەکەی ڕزگار بکات، جارێکتر کەوتەوە شوێنیان، بەڵام ئەمجارەش قاچی ئەسپەکەی هەر نوقمی لمەکە بوون، ئەمجارەش هەرجۆر بوو ڕزگاری بوو، ئەم حاڵەتە سێجار دووبارە بوویەوە.

بۆ جاری سێیەم، ئیتر سوراقە نەیتوانی قاچی ئەسپەکەی لە لمەکە دەربێنێ، شێتگیر بوو و خۆی و ئەسپەکەی ئارقیان لێدەچۆڕا، کاتێ سەیری پێغەمبەری خۆشەویستمانی(ﷺ) کرد، بۆی مەعلوم بوو کە ناتوانێت بگات بە پێغەمبەر(ﷺ)، هاواری کردو وتی: (ئەی موحەممەد، من باش دەزانم ئەوە ئیشی تۆیە، دەی لە خوا بپاڕێرەوە ڕزگارم بکات لەوەی تێیکەوتووم، سوێند بەخوا ڕێگا لە هەرکەسێ وندەکەم کە لەدوای منەوە داوای ئێوە بکات)، سوراقە ئەوەشی وت: ڕۆژێ لە ڕۆژان کاتێ کە ئیسلام بەهێزو دەبێت و زیاتر بڵاودەبێتەوە ئەویش هەر باوەڕ بە ئیسلام دێنێ.

جا بەو پێیە کە پێغەمبەرمان(ﷺ) پێغەمبەری خۆشەویستی و بەزەییە، هیچ کات حەزی نەدەکرد کەس تووشی ئازارو زەحمەت ببێت، هەربۆیە هەردوو دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان و لە خوای گەورە پاڕایەوە تا سوراقە ڕزگار بکات، بەمشێوەیە، سوراقەو ئەسپەکەی لە لمەکە هاتنە دەرەوە. سوراقە ڕێزو پێزانینێکی گەورەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) نواند، گورج لێی نزیکبوویەوەو پێیوت: (ئەی پێغەمبەری خوا! هەرچیت دەوێ داوام لێبکە با بۆت جێبەجێ بکەم). پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکرد بگەڕێتە بۆ ناو قورەیش و ڕێگیرییان بکات لەوەی بیانەوێ بگەنەوە پێی، ئەوکات، سوراقە خواحافیزی لێکردن و گەڕایەوە بۆ ناو قەومەکەی، لەوێ چاوی کەوت بە زۆرێک لە بێباوەڕان لەوانەی کە بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ) دەگەڕان، پێیوتن: (بگەڕێنەوە، دڵنیابن ئەو شوێنەم بەتەواوەتی پشکنیوە، کەسم نەدۆزیوەتەوە، با لە شوێنانیتر بۆی بگەڕێین). سوراقە ئەو بەڵێنەی کە دابووی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەجێیگەیاند، لە ئایندەشدا خەڵاتەکانی ئەو بەڵێنەی وەردەگرێ.

## ١٢٤. کانییەک شیر

پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکر ڕەشدەواریکیان لە بیاباندا چاوکرد، کاتێ نزیککەوتنەوە لێی، بینیان هی ئافرەتێکە خواردن بە ڕێبواران دەفرۆشی.

سڵاویان لێکرد، ئینجا داوای هەندێ خواردنیان لێکرد، بەڵام ئەو داوای لێبوردنی کردو وتی خواردنەکە تەواو بووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەیکرد بۆ مەڕێک کە بەتەنیشت ئافرەتەکەوە وەستابوو، ئینجا پرسیاری لێکردو فەرمووی: ((ئەی دایکی مەعبەد! ئایا ئەو مەڕە شیری تێدایە؟)) ئافرەتەکە وەڵامیدایەوە کە: (نەخێر، ئەو لەوە لاوازترە بدۆشرێ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: ((ئایا مۆڵەتم دەدەیت بیدۆشم؟)) ئافرەتەکە ڕەزامەندی نواندو وتی: (ئەگەر ئەزانی شیری تێدایە بیدۆشە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی هێنا بەسەر گوانی مەڕەکەدا، ئینجا ناوی خوای گەورەی هێناو لێی پاڕایەوە، دوای ئەوە داوای دەفرێکی لە ئافرەتەکە کردو مەڕەکەی دۆشی، ئافرەتەکە بڕوای نەکرد تا بە چاوانی خۆی بینی کە دەفرەکە پڕبووە لە شیر، هەمووان لێیانخواردەوە تا تێریان خوارد، پاشان سوپاسی ئافرەتەکەیان کردو خواحافیزیان لێکردو ملی ڕێیان گرتەبەر.

دەفرەکەیان پڕ لە شیر جێهێشت، ئەو ئافرەتە کە پێشتر لە ژیانیدا شتی لەو شێوەیەی نەدیبوو زۆر سەری سوڕما، دەبێ ئەم پیاوە نەناسراوە کێبێت؟ چۆن ئەمە ڕوویدا؟

کاتێ مێردەکەی هاتەوە پرسیاری لە خێزانەکەی کردو وتی:

(ئەی دایکی مەعبەد ئەم شیرە لەکوێوە هات، خۆ مەڕەکە چتیرەو دوورە لە لەوەڕگاوە؟)، خێزانەکەی سەرگوزەشتەکەی بۆ گێڕایەوە، مێردەکەی پێیوت: (دایکی مەعبەد ئەو پیاوم بۆ وەسفبکە). ئەویش پێیوت: باڵای مامناوەندە، دوو چاوی ڕەشی پێوەیە، برۆکانی ڕەشن، درێژەیدا بە وەسفکردنی جوانی ڕەوشت و جەستەی. پیاوەکە ڕاستەوخۆ ئەوەی زانی کە ئەو پیاوە کەسێکی زۆر جیاوازو زۆر نەجیبە. بۆیە بە خێزانەکەیی وت: (سوێند بەخوا ئەوە گەورەکەی قورەیشە، کە لە مەککە باسی مەسەلەکەی ئەویان بۆ کردووین، ئەگەر بگەم پێی ئەوا داوای هاوەڵێتیم لێدەکرد، هەرکات بۆم گونجا ئەوە هەر دەکەم). دایکی مەعبەد و مێردەکەی خۆیان ئامادەکرد تا لە مەدینە بگەن بە پێغەمبەر(ﷺ)، لەوێش موسڵمان بوون.

بەمجۆرە، کاتێ کە پێغەمبەری خۆشەویستمان بەڕێگاوە بوو بەرەو مەدینە ژمارەیەکی زۆر لە پشتگیرکارو باوەڕدار لەملاولاوە هاتنە ڕیزەوەو هەموویان باوەڕیان بە پێغەمبەر(ﷺ) و بە ئیسلام هێنا.

## ١٢٥. ڕۆژی وەفاداریی و چاکەکاریی

کاتێ سوراقە بڕیاریدا بگەڕێتەوە بۆ مەککەو و چیتر شوێن پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی نەکەوێ، ئەبوبەکری صدیق نوسراوێکی نوسی و خستییە لای سوراقە، سوراقە هەڵیگرت و خستییەناو تیرخانەکەی و گەڕایەوە بۆ مەککە، تا دوای هەشت ساڵ هیچی لەوە باسنەکرد کە لەگەڵیدا کراوە واتە تا کاتێ کە مەککە ڕزگارکرا، پێغەمبەریش(ﷺ) لە جەنگی حونەین و ڕزگارکردنی تائیف لێبوویەوە، ئەوکات سوراقە نوسراوەکەی لەگەڵ خۆی هەڵگرت و ڕۆیشت بۆ بینینی پێغەمبەر(ﷺ) و لە جەعرانە گەیشتە خزمەتی، بە ناوبەینی دەستەیەک لە سوارەکانی پشتیوانانادا ڕێی خۆیکردەوە، ئەوان بە نێزەکانیان تێیاندەکوتی و دەیانوت: چیت دەوێ؟ تا تەواو نزیکبوویەوە لە پێغەمبەر(ﷺ) کە سواری وشترەکەی بوو، دەستی بە نوسراوەکەوە بەرزکردەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((ئەمڕۆ ڕۆژی وەفاداریی و چاکەکارییە نزیکبەرەوە))، لێی نزیکبوویەوەو موسڵمان بوو، پاشان لەبارەی هەندێ مەسەلەی ئاینییەوە پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، دواتر گەڕایەوە ناو قەومەکەی.

## ١٣٦. هاوڕێیەک لەسەر ڕێگای مەدینە

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا بە شەو و بە ڕۆژ ڕێیان دەکرد، گەرمای بیابان زۆر بەتین بوو، کات بۆ کاتیش ڕەشەبایەکی لماوی وەک گەردەلول هەڵیدەکردو هەرچی لەبەریدا بوایە دایدەپۆشی، تووشی برسێتی و تینویەتی و ماندووبوون هاتن، هەستییان بە شەکەتییەکی زۆر کرد، بەرگەی هەموو سەختییەکانیان گرت، بەڵام بەوەی کە موحەممەدی گەورەمان پێغەمبەری خوایە(ﷺ) ئەوا لەپێناو گەیاندنی پەیامەکەی بە خەڵکی بەرگەی هەموو ئەو ناڕەحەتییانەی گرت بێئەوەی بێزارو وەڕەس بێ.

هاودەم لەگەڵ نزیکبوونەوەیان لە شاری مەدینە، تەپوتۆزێکی زۆر لە دوورەوە دەرکەوت، ئەبوبەکر بە جوانی چاوی تێبڕی، زانی کە کەسێک لە مەدینەوە بەرەو ڕوویان دێت، بە وریایی و چاودێرییەوە چاوەڕێیان کرد، کاتێ کەسە هاتووەکە نزیککەوتەوە، بۆیان مەعلوم بوو کە (زوبەیر)ە، یەکێک لە موسڵمانەکانی مەدینەیە، هەردووکیان بە بینینی هاوڕێیەک لەماوەی ئەو گەشتە مەترسیدارەدا دڵخۆشبوون، زوبەیر لە سەفەرێکی بازرگانی گەڕابوویەوە، پێیوتن موسڵمانانی مەدینە بیستویانە کە پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵەکەی مەککەیان جێهێشووەو بەڕێگاوەن ئەوانیش لەسەر جادەو ڕێگاکان چاوەڕێیان دەکەن، وا گومان دەبەن کە دواکەوتوون. ئینجا زوبەیر پۆشاکێکی سپی بەخشی بە هەر یەکێکیان کە لە دیمەشق کڕیبووی، ئەوانیش سوپاسیان کردو درێژەیاندا بە ڕۆیشتن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی نەدەکرد خەڵکی ناچاربن چاوەڕێ بکەن، هەربۆیە زوو پێی هەڵگرت و هەنگاوەکانی خێراتر کرد تا زووتر بگاتە مەدینە.

## ١٣٧. یەکەمین حەوانەوەی ڕێبواری مەزن(ﷺ)

شاری مەدینە بە جۆش و خرۆش و شادیی و تامەزرۆبوونی بۆ بە خزمەت گەیشتنی(ﷺ) قوڵپی دەدا... ئەم هەستە ناسکانە زاڵبووبوون بەسەر پیاوان و ئافرتان و گەورەو بچوکی ئەو شارەدا. چونکە بیستبوویان کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەڕێگاوەیە بەرەو مەدینە، بەڵام کەسیان ئەوەی نەدەزانی کە سێ ڕۆژ لە ئەشکەوتی سەوردا ماوەتەوە. ئەو دواکەوتنە هەمووانی تووشی دڵەڕاوکە کردبوو، کەوتبوونە پرسیارکردن لەوەی تۆ بڵێی قورەیش کۆچکەرانی دۆزیبێتەوە.



لەماوەی سێ ڕۆژی کۆتاییدا، هەموو ڕوانین و چاوەڕێکردن لەسەر ڕێگای مەککە چڕبووبوونەوە، هەموو بەیانییەک، خەڵکی دەچوونە سەربانی ماڵەکان، سەردەکەوتن بەسەر دارخورماکانداو تا چاو کاربکات سەیری ڕێگاکەیان دەکرد، کاتێکیش گەرمای خۆر تینی دەسەند دەچوونەوە ناو ماڵەکانیان.

لەو ڕۆژەشدا، موسڵمانانی مەدینە لە ترسی گەرمای زۆر بەتین ڕایانکردبووە ناو ماڵەکانیانەوە، ئا لەو کاتەدا، یەکێک لە جووەکان بەسەر بانی ماڵەکەیەوە بوو، چەند کەسێکی لە دوورەوە چاوکرد کە پۆشاکی سپییان لەبەردابوو، مەعلوم ئەوانە ئەو ڕێبوارانەن کە موسڵمانانی مەدینە لە چاوەڕێیاندان، کابرای جولەکە بە دەنگێکی بەرز قیڕاندی: (ئا ئەوەتا ئەو کەسە مەزنە کە ئێوە چاوەڕێی دەکەن وا گەیشت!))، هەواڵەکە وەک چۆن ئاگر بەردەبێتە پوش ئاوا بڵاوبوویەوە، لە کتوپڕێکدا، شادیی و خۆشی هەموو شوێنێکی

شارەکەی گرتەوە، خەڵکی کەوتنە ئاگادارکردنی یەکتری کە: (ئەوا هات پێغەمبەر، پێغەمبەر هات!)، شەقام و کۆڵان و ڕێگاوبانەکان جمەیان دەهات بە موسڵمانان کە بۆ پێشوازیکردن لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتبوونە دەرەوە، هیچ کەس ئەو ساتەی لەبیر ناچێت و جارێکیتریش ناژیێتەوە تیایدا! ئەوە شادی و خۆشییەک بوو کە پێشتر هیچ کەسێک نەیبینیوە، نزیکەی پێنجسەد کەس لە موسڵمانان لە شەقامەکاندا ڕیزیان بەست، بە هەموو توانایان بانگیان دەکرد: (اللە أکبر!) ڕایاندەکرد تا بگەن بە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ دوو هاوەڵەکەیدا لە ژێر سێبەری درەختێکدا دانیشتن تا پشوویەک بدەن، مەدینە بە دارخورماکانیەوە لە دوورەوە پێدەکەنی بۆیان، لەنێو ئەو موسڵمانانەی مەدینەشدا کە چووبوون بۆ پێشوازی لێکردنی کەسانێکیان تێدابوون کە پێشتر پێغەمبەری خوایان(ﷺ) نەبینیبو، بەو هۆیەوە هەستییان بە گەرموگوڕی بینینی دەکرد، کاتێک بە خزمەتی گەیشتن لە سەرەتاوە نەیانناسی چونکە پێشتر نەیاندیبوو، بەڵام کاتێ ئەبوبەکریان بینی کە بە پۆشاکەکەی سێبەری بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد تا خۆر لێی نەدا ئەوکات زانیان کە ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، زۆر بە گەرمی پێشوازییان لێکرد.

لەدوای ئەو پشووە کورتە، پێغەمبەر(ﷺ) سواری وشترەکەی بوویەوە، لەگەڵ ئەو خەڵکەدا کە هاتبوون بۆ پێشوازیکردنی کەوتنەوەڕێ بەرەو مەدینە. کۆچبەران لە گوندێک بەناوی (قوبا) لە دەرەوەی مەدینە پشوویەکی تریان دا، خەڵکی قوبا زۆر دڵخۆشبوون کاتێ بیستییان کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ماوەیەک لە گوندەکەیاندا دەمێنێتەوە، لەوێ موسڵمانێک بەناوی کولسوم میوانداری کرد. ئەو ڕۆژە لە بەختەوەرترین و کامەرانترینی ڕۆژانی خەڵکی مەدینەو قوبا بوون.

## ١٢٨. سەلمان بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ) دەگەڕێ

گەنجێک هەبوو بە ناوی سەلمان لە شارێکدا دەژیا پێی دەوترا ئەسفەهان، لە وڵاتی فارس، باوکی کە ناوی بوزەخشان بوو کەسێکی خاوەن موڵک بوو، ئەویش وەک زۆرێک لە خەڵکی وڵات فارس، ئاگرپەرست بوو، بەڵام کوڕەکەیی زۆر خۆشدەویست، هەرگیز ڕێگای نەدەدا لە بەرچاوانی دووربکەوێتەوە.

بوزەخشان نەیدەهێشت کوڕەکەی لە ماڵ بچێتەدەر نەبادا تووشی شتێک ببێت، بەڵام ڕۆژێکیان، شتێکی گرنگ ڕوویدا، بڕیاریدا سەلمان بنێرێت بۆ سەر زەوییە کشتوکاڵییەکەی، بردییە لاوەو ئامۆژگاریکرد کە ئاگای لەخۆی بێت، پاشان ڕەوانەیکرد، ئەوە یەکەمجارە، سەلمان بەتەنها لەماڵ دەچێتە دەرەوە، بە ڕێگای تایبەتی خۆیدا دەڕوات و گەشتی تایبەتی خۆی دەکات، مەعلوم کە ئەو گەشتەی هەروا ئاسان نیە.

لەڕێگادا کەنیسەیەکی بینی و سەرنجی ڕاکێشا چونکە لەناویەوە دەنگ دەهاتەدەر، حەزیکرد بزانی ئەوە چییە، بە هێمنی بێئەوەی هیچ جۆرە دەنگە دەنگی دروستبکات چووە ژوورەوە، لەوێ کەسانێکی بینی کە ئاگریان نەدەپەرست، بەڵکو خوای گەورەیان دەپەرست، سەلمان ئەم کارە زۆر چووە دڵی، ئینجا بەخۆیی وت: (سوێند بەخوا ئەمە زۆر لەو ئاینە باشترە کە ئێمە واین لەسەری)، کاتێ بۆ ئێوارە گەڕایەوە ماڵەوە، باوکی ئاگادارکرد بەوەی کە بینی، پاشان پرسیاری لێکرد: (ئەری باوکە، چوومە لای خەڵکانێک لە کەنیسەکەیاندا نوێژیان دەکرد، شتانێکی ئاینەکەیانیان

ئەنجامدەدا کە زۆر چوو بە دڵمدا، بەخوا هەتا خۆرئاوا بوو هەر لای ئەوان مامەوە).

باوکی تورە بوو و وتی: (کوڕەکەم، ئەو ئاینە هیچ خێرو چاکەیەکی تێدا نیە، ئاینەکەی تۆ و باو باپیرانت زۆر لەو چاکترە). بەڵام سەلمان قەناعەتی نەکرد، بەڵکو بەردەوامبوو لە پرسیارکردن لە باوکی. لە واقیعیشدا، باوکی سەلمان هەستی بە دڵەڕاوکە دەکرد، دەترسا لەوەی نەبادا سەلمان واز لە ئاگرپەرستی بێنێ، ئابەمجۆرە، هەردوو قاچی بەست بە کۆڵەکەیەکیماڵەکەوە، تا ڕێگیری لێبکات بڕوات بۆ کەنیسەکە.

سەلمان ملکەچی فەرمانەکەی باوکی بوو، بەدرێژایی ئەو ڕۆژە لەبەردەم ئاگرەکەدا مایەوە، ئەو گەنجێکی زیرەک بوو، هیچ ژیریی و لۆژیکێکی لەوەدا بەدی نەدەکرد کە باوکی و ڕۆڵەکانی وڵاتەکەی ئاگر بپەرستن، هەربۆیە هەستا بە نهێنی کەنیسەی ئاگادارکرد کە دەچێتە ناو یەکەمین کاروانەوە، چونکە بیستبووی بەم نزیکانە کاروانێک دەڕوات بۆ دیمەشق، دوای ماوەیەکی کەم سەرکەوتوو بوو لەوەی کۆت و بەندەکانی بکاتەوەو خۆی بگەیەنێتە کاروانەکە.

کاتێ گەیشتە دیمەشق، لەگەڵ ژمارەیەک لە قەشەکان نیشتەجێ بوو، قەشەکان کاریان ئەوەبوو خەڵکییان فێری ئاینی مەسیحی دەکرد، بەڵام ئەو شتێکی جیاواز لەوانەوە فێربوو، دوا قەشە کە سەلمان لەگەڵیدا دەژیا، سەلمانی بردە لایەکەوەو پێیوت: (کوڕەکەم! لە کاتێکدا من ئێستە هەر فەرمان بە تۆ دەکەم فلانە شت و فلانە ڕێنمایی ئەنجامبدەیت، بەڵام سوێند بەخوا ونازانم کەسێک لە ئێمە لەسەر ئەو ڕێنماییانە مابێت کە پێشتر خۆمان لەسەری بووین و ئێستە بە تۆی دەڵێین، بەڵام تۆ کەوتوویتەتە سەردەمی پێغەمبەرێک کە لە حەرەمەوە ڕەوانە دەکرێ، کۆچدەکات لەنێوان دوو شارداو دەڕوات بەرەو ئەوەیان کە زەوییەکی خوێیاوی و دارخورما دارە،

ئەو کۆمەڵێ نیشانەی تێدایە کە ناشارێنەوە، مۆری پێغەمبەرایەتی بەناو شانیەوەیە، دیاری بۆ ببرێ دەیخوات بەڵام خێرو سەدەقە ناخوات، ئەگەر بتوانی خۆت ڕزگار بکەیت و بڕۆیت بۆ ئەو وڵاتە ئەوا بڕۆ، چونکە تۆ کەوتوویتەتە سەردەمی ئەو!).

قسەکانی ئەم قەشەیە هەستێکی لە سەلماندا دروستکرد وەک بڵێی ئاگر لەدڵیدا کڵپەی سەندووە، کەوتەڕێ بەرەو شوێنی مەبەست، بەڵام لەپێش ئەوە بگاتە نیوە دوورگەی عەرەبی کۆمەڵە کەسانێکی خراپەکار ڕفاندییان، ئینجا وەک کەسێکی کۆیلە فرۆشتیان بە کابرایەکی جولەکە، جولەکەکەو پیاوەکانی نەیاندەزانی چ شتێک بە مێشکی سەلماندا دێت و دەچێت. لەگەڵ خۆیان هێنایان بۆ مەدینە، بەڵام سەلمان نەیدەزانی بەرەو کوێی دەبەن، هەرکە چاوی بە مەدینە کەوت، ڕاستەوخۆ زانی کە هەر لەو شوێنە دەچێت مامۆستا قەشەکەی بۆی وەسفکردووە.

ئیتر لە ئێستە بەولاوە، لە مەدینە دەمێنێتەوە، هەر لە چاوەڕوانیشدا دەبێت بەو هیوایە چاوی بەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوە بکەوێت.

## ١٢٩. ئەو ساتە هەستیارە کە سەلمان چاوەڕێی دەکرد

سەلمان وەک کۆیلەیەک درێژەیدا بە ژیانی خۆی، ئەو کارانەی گرتەدەست کە گەورەکەی پێی دەسپاردو بە جوانترین شێوە رایدەپەڕاندن، بەڵام بەردەوام بیرو هۆشی لای ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) بوو کە کۆچدەکات بۆ مەدینە.

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا کە سەلمان بەسەر دارخورمایەکەوە خەریکی چنینی خورما بوو پیاوێک هاتە لای گەورەکەی سەلمان، گەورەکەی سەلمانیش لەژێر درەختێکدا دانیشتبوو، پیاوەکە پرسیاری لێکرد: (ئەزانی چی ڕوویداوە؟) ئەویش وتی: (چی ڕوویداوە؟)، پیاوەکە بە گەرموگوڕییەکەوە کەوتە قسەکردن و وتی: (خوای گەورە بەنو قیلە بکوژێ، سوێند بەخوا ئێستە هەموویان لە قوبا بەدەوری پیاوێکدا کۆبوونەتەوە کە لە مەککەوە هاتووەو دەڵێن پێغەمبەرە).

هەرکە سەلمان ئەوەی بیست، هەموو گیانی کەوتە لەرزە، زۆر زۆر شڵەژا بە ئاستێ کە خەریکبوو بکەوێتە خوارەوە، ئینجا لە درەختەکە هاتەخوارەوە، پرسیاری لە پیاوەکە کرد: (ئەو هەواڵە چییە؟) گەورەکەی سەلمان زۆر عاجز و بێتاقەت بوو بەو هەڵسوکەوتەی، زللەیەکی کێشا بەناوچاوانیداو پێیوت: (تۆ چیتە بەسەرە ئەوەوە، خەریکی ئیشی خۆت بە)، سەلمان گەڕایەوە سەر کارەکەی خۆی، بەڵام بیرو هۆشی هەر سەرقاڵبوو بەو پێغەمبەرەوە کە لە مەککەوە دێت. مەعلوم هەر ئەو پێغەمبەرە چاوەڕوانکراوەیە، دەیویست خۆی دڵنیا ببێت لە هەواڵەکە. چاوەڕێی کرد تا ئێوارەی بەسەردا هات.

کاتێ تاریکایی باڵیکێشا بەسەر ناوچەکەدا، سەلمان بڕێ خواردنی هەڵگرت و بە نهێنی ڕۆیشت بەرەو قوبا، لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) وەستا و وتی: (بیستوومە تۆ کەسێکی چاکی، کەسانێکی غەریبیشت لەگەڵدان، من هەندێ خێرو سەدەقەم هەبوو وادەزانم ئێوە لەم وڵاتەدا لە هەمووکەس شایستەترن، فەرموو ئەوە بۆ ئێوە، بیخۆن)، هەندێ خواردنی پێدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپاسیکرد، خواردنەکەی لێ وەرگرت و دابەشیکرد بەسەر ئەو موسڵمانانەدا کە لەوێ ئامادەبوون، بەڵام خۆی، هیچ لە خواردنەکەی نەخوارد، سەلمانیش هەر چاوەڕێی ئەوەی دەکرد، ئەو ئەوەی بیرکەوتەوە کە مامۆستاکەی پێی وتبوو: (ئەو چەند نیشانەیەکی تێدایە کە ناشارێنەوە وەک مۆری پێغەمبەرایەتی بە ناوشانییەوە، دیاری دەخوات و خێرو سەدەقە قبوڵناکات!) سەلمان بە خۆشییەکەوە گەڕایەوە مەدینە.

ئینجا لەگەڵ ڕەخساندنی یەکەم هەلدا، خۆی گەیاندەوە قوبا تا چاوی بە پێغەمبەر(ﷺ) بکەوێ، ئەمجارەیان هەندێ خواردنی وەک دیاری لەگەڵ خۆی هەڵگرتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) لێی وەرگرت، دەرخواردی ئەوانەیدا کە لەوێ بوون و خۆیشی لێی خوارد، سەلمان بۆ جاری دووەم بەخۆشییەکەوە گەڕایەوە بۆ مەدینە، بەڵام دەربارەی مۆری پێغەمبەرایەتی کە بەناوشانی پێغەمبەرەوەیە(ﷺ) ئەوا دەبێ چاوەڕوان بێت و ئارامبگرێ تا کاتی بینینی ئەو مۆرەش دێت.

## ١٣٠. هاتنی عەلی بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)

لەنێوان ئامۆزاکانی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) عەلی نزیکترینیان بوو لە دڵی پێغەمبەرەوە، ئەویش پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، لەو شەوەدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە نهێنی مەککەی جێهێشت، عەلی ژیانی خۆی لەپێناویدا خستە مەترسییەوە، کاتێ بێباوەڕان بۆسەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لەبەردەم ماڵەکەیدا دانا، جگە لە عەلی کەسیتریان لەسەر جێگاکەی نەبینی، ئەوان دەیانتوانی بیکوژن، بەڵام خوای گەورە عەلی پاراست کە بۆ ڕۆژێکیش دوودڵ نەبووە لەوەی لەسەر ڕێبازی پێغەمبەر(ﷺ) ڕێبکات، بێباوەڕان ئەوەندە بەجورئەت نەبوون بیکوژن.

لە مەککەدا جگە لە عەلی و ژمارەیەکی کەم لە موسڵمانان نەبێت ئیتر کەسیان نەمابوویەوە، کاتێ ئەوەش هات ئەوانیش کۆچبکەن بەرەو مەدینەی مونەووەرە. عەلی هەموو ئەو ڕێنماییانەی پێغەمبەری(ﷺ) جێبەجێ کرد کە ڕایسپاردبوو پێی، ماڵ و موڵکی خەڵکی گێڕایەوە بۆ خاوەنەکانیان کە بە ئەمانەت لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دایاننابوون، دوای ئەوە بە نهێنی کۆچیکرد بەرەو مەدینە، وڵاغی سواری نەبوو تا سواری ببێ، بەڵکو ناچار لەسەر پێیەکانی ئەو هەموو ڕێگا تولانییەی بڕی، بەڕۆژدا ڕێی دەکرد، بە شەویشدا لە شوێنێک خۆی حەشاردەدا، جا هەرچەندە ڕێگاکە زۆر سەخت و زەحمەت بوو بەڵام هەر درێژەیدا بە ڕۆیشتن، بە ئومێدی زوو گەیشتنەوەی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرگەی ئەو هەموو زەحمەت و نارەحەتییانەی گرت.

عەلی کاتێ گەیشتە گوندی قوبا، لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لە ماڵی کولسوم دابەزین، مانەوەی لە قوبا شەوێک یان دوو شەو زیاتر نەبوو، پاشان لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) چوو بۆ مەدینە.

## ١٣١. سەرگوزشتەی صوهەیب

صوهەیب یەکێک بوو لەو موسڵمانانە کە لە مەککەدا مابوویەوە، کەچی هەر لەلایەن بێباوەڕانەوە کەوتەبەر ئەشکەنجەدان، ئەویش دەیویست کۆچبکات بۆ مەدینە، چونکە زۆر بێتاقەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، کەوتە خۆئامادەکردن، لەگەڵ خانەوادەکەیدا کەوتنەڕێ، بەڵام هەر زوو بێباوەڕان گەڕان بەدوایداو گەیشتنەوە پێی، پێیانوت: (بەخوا لێت ناگەڕێین خۆت و ماڵت دەرباز بکەیت لێمان، تۆ هاتیتە مەککە بەندەیەکی هەژارو و داماو بوویت تا دەوڵەمەند بوویت و گەیشتیتە ئەوە کە پێیگەیشتوویت). صوهەیب کەسێکی زۆر بەجەرگ و ئازا بوو، خێرا لەسەر وشترەکەی هاتەخوارەوە، ئینجا چەند تیرێکی لە تیرخانەکەی ڕاکێشا و قیڕاندی بەسەریاندا و تی: (ئەی قورەیشییەکان، ئێوە باش دەزانن من باشترین تیروەشێنم و لە هەمووتان دەستم ڕاستترە، سوێند بەخوا ناتوانن بگەنە من هەتا بە هەر تیرێک لەم تیرانە یەکێک لەئێوە نەکوژم، پاشانیش بەم شمشێرەم تا شتێکی لەدەستمدا مابێتەوە تێتاندەکەوم و لێتان دەکوژم).

هاوەڵگەران ترسیان لێنیشت، بەڵام نیەتیان نەبوو وازی لێبێنن و لەدەستیان دەرچێت، ئەگەر صوهەیب بیویستایە دەیتوانی شمشێرەکەی بکات بە ناوسکیانداو هەموویان بکوژێ، بەڵام بۆ ماوەیەک بیریکردەوە، ئینجا تەماعێکی خستە بەردەمیان کە ڕەتیان نەدەکردەوە. پێیوتن: (ئەگەر ماڵ و سامانەکەم جێبێلم بۆتان ئیتر ڕێگام دەدەن بڕۆم؟) هاوەڵگەران سەریان سوڕما لەو قسەیەی و زۆر دڵخۆشبوون بەو تەماعەی خستییە بەردەمیان، وتیان: (بەڵێ).

صوهەیبیش هەموو ئەو پارەو شتە بەنرخانەی کە پێی بوون هەمووی پێدان، پاشان بە ئاسودەیی درێژەیدا بە ڕێکردن بەرەو مەدینە.

لەدوای سەفەرێکی تولانی و سەخت و پڕ لە مەترسی گەیشتنە قوبا، بەڵام لە ڕێگادا کۆمەڵێ نارەحەتی ڕووبەڕووی بوونەوە! کاتێک گەیشت، تووشی چاو ئێشە هاتبوو، لە کاتی سەفەرەکەدا ئازاریان بۆ دروست بووبوو، لەوانەیە بەهۆی گەردەلولی لماوییەوە یان بەهۆی تیشکی گەرمی خۆرەوە بووبێت، هەستی بە ماندووبوون و شەکەتی دەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانی پێشوازییەکی گەرمیان لێکرد چونکە زۆر بێتاقەت و تامەزرۆی بینینی بوون، لەوێ خورمای تەڕی تازە پێگەیشتوویان پێشکەشکرد کە مەدینە پێیەوە بەناوبانگە.

صوهەیب زۆر زۆر برسی بوو، خێرا کەوتە خواردنی خورماکە، یەک بەدوای یەکدا، پێغەمبەر(ﷺ) بە سوعبەتەوە پێی فەرموو: ((تۆ چاوئێشەتەو خورمایش دەخۆیت؟)).

صوهەیب بە زیرەکییەوە وتی: (من بە لاچاوە ڕاستەکەم دەیخۆم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بە وەڵامە سوعبەت ئامێزو و زیرەکییەکەی و زەردەخەنەی بۆکرد. لەدوای حەوانەوەیەکی کورت، صوهەیب هەموو ئەو باس و خواسانەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گێڕایەوە کە لە ڕێگادا بەسەری هاتبوو. وتی: (قورەیش گرتمیان و بەندییان کردم، منیش بەماڵەکەم خۆم و ماڵ و منداڵەکەمم کڕییەوە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە خۆشیدا پێکەنی و فەرمووی: ((ئەی ئەبو یەحیا لە فرشتنەکەتدا قازانجت کرد! لە فرۆشتنەکەتدا قازانجت کرد!)).

ئەم ڕستەیە کۆمەڵێک واتای گەورەی تێدابوو، بەڕاستی صوهەیب قوربانیدا بە هەموو سەروەتەکەی، بەڵام لەبەرانبەرەوە سوپاس و باشەوتنی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەدەستهێنا، ئا لەو ساتەدا وا هەستیکرد کە بەختەوەرترین مرۆڤە لەسەر زەویدا.

## ١٣٢. یەکەمین مزگەوت لە قوباء

ڕێنمایی زۆر هەبوون کە دەبوو موسڵمانانی قوباء لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) وەریانبگرن، بەو هۆیەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاریدا لەماوەی مانەوەی لەو گوندەدا مزگەوتێک دروستبکات، چونکە تا ئەو ڕۆژە، موسڵمانان شوێنێکیان نەبوو کۆببنەوەو نوێژی تێدا بکەن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵی موسڵمانێکدا نیشتەجێ بوو بەناوی کولسوم، کولسوم پارچە زەوییەکی چۆڵی هەبوو، بەکاریدەهێنا بۆ وشککردنەوەی خورمای تەڕ، لەسەر ئەوە ڕێکەوتن وەک شوێنی مزگەوت بەکاری بێنن، لەدوای ئەم بڕیارەوە، موسڵمانان زوو بەزوو قۆڵیان لێهەڵماڵی و دەستیاندایە دروستکردنی.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە ئیشکردن بوو، بە دەستی پیرۆزی خۆی بەردی بناغەی مزگەوتەکەی دانا، پاشان ئەبوبەکر و عومەر و عوسمان هەستان بە دانانی یەکەمین چینە بەرد، هەمووان بە گەرموگوڕییەوە هاتنە سەر ئیش، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە خۆ ماندوکردنێکی زۆر بەشداریکرد لە دروستکردنەکەدا، بەردی گەورەی لەسەر سکی هەڵدەگرت، کاتێ یەکێک لە هاوەڵان دەهات و دەیویست لێی وەرگرێ ئەو(ﷺ) ڕەتیدەکردەوەو داوای لێدەکرد بچێ بەردێکی تر هەڵبگرێ. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەوپەڕی لێبڕانەوە شانی دایە ژێر ئیشەکە، ئەمەش وای لە موسڵمانان کرد هەوڵ و ڕەنجدانیان چەندبارە زیاتر بکەن، بەم پێیە یەکەمین مزگەوت لە قوبا لە ماوەیەکی کورتدا دروستکرا.

کاتی ئەوە هات پێغەمبەری خوا(ﷺ) قوبا جێبێڵی، لە بەیانی ڕۆژێکی هەینیدا سواری وشترە گوێ کەلەکەی بوو، ئەبوبەکریش لە پشتییەوە سوار بوو، بەمشێوەیە وشترەکە بەرەو مەدینە کەوتەڕێ کە هەردوو میوانە چاوەڕوانکراوەکە لەسەر پشتی بوون، ڕاستە خەڵکی قوبا حەزیان نەدەکرد پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێیان دووربکەوێتەوە، بەلام لەولاوە خەڵکی مەدینە لە چاوەڕوانی کردنیدا ئارامیان لێبڕابوو.

لە کاتێکدا دوو ڕێبوارەکە خۆیان ئامادە کردبوو بۆ ڕۆیشتن بەرەو مەدینە، کاتی نوێژی هەینی هاتەپێش، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) گەیشتبووە ناوچەی بەنو سالمی کوڕی عەوف، بۆیە نوێژی هەینی لەو مزگەوتەدا کرد کە لە ناو دۆڵەکەدا بوو، ئەوەش یەکەمین نوێژی هەینی بوو کە لە مەدینە بەجێیهێنا.

لەدوای وتارەکە، پێغەمبەر(ﷺ) سەرلەنوێ سواری وشترەکەی بوو و کەوتەوەڕێ بەرەو مەدینە.

## ١٣٢. شادیی و خۆشییەکی ئێجگار زۆر

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سواری وشترە گوێکەلەکەی نزیککەوتەوە لە مەدینە، لق و پۆپی درەختە سەوزەکان سێبەریان بۆکردبوو، بەرزاییەکانی مەدینە جمەیان دەهات لە خەڵکی، زۆریکیشیان سەرکەوتبوونە سەربانیماڵەکانیان بەو هیوایە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ببینن.

پێغەمبەر(ﷺ) زەحمەتی زۆری تووشبوو، بەلام هەر چوو بەدەم بانگهێشتەکەیانەوە، بەو هۆیەوە، خەڵکی مەدینە هەستییان بە شادیی و خۆشییەکی ئێجگار زۆر دەکرد، منداڵان هەموو بە نێرو مێیانەوە جوانترین پۆشاکیان لەبەرکردو چوونە سەر شەقامەکان، هەندێکیشیان هەڵزنان بە قەدی هەندێ لە درەختەکاندا تا لەپێش خەڵکی ترەوە بینینی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ خۆیان بدزن.

کاتێک هاتە ناو مەدینەوە، هەمووی خەڵکی لەخۆشیدا دەنگییان بلندکرد، منداڵانیش بەو هەواڵە خۆشە کەوتنە مژدەدان بەیەکتری.

(موحەممەدی پێغەمبەری خوا هات، پێغەمبەری خوا هات!). لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەهێواشی لەسەر پشتی وشترەکەی دەهاتە پێش زۆرێک لە موسڵمانان لەخۆشیدا دەگریان و فرمێسکی شادییان دەڕشت.

خۆشی و شادی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هی ئەوان کەمتر نەبوو، چونکە بینینی خەڵکی مەدینە کە بەو شێوەیە پێشوازی گەرمی لێدەکەن کاریگەری زۆری لەسەری هەبوو، ئەمە لە کاتێکدا کە لە مەککە نەیدەتوانی بەنێو شەقامەکانیشدا ئازادانە هاتووچۆ بکات.

بەڕاستی خەڵکی مەدینە وەفادارییان نواند بەرانبەر بەو بەڵێنەی کە لە عەقەبە پێیاندابوو، باوەشیان گرتەوە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، منداڵان دەورەیانداو بە دەنگێکی بەرز هاواریان دەکرد: (بەخێرهاتی پێغەمبەری خۆشەویستمان).

پێغەمبەریش(ﷺ) بە چاوی سۆزو خۆشەویستییەوە دەیڕوانیە ئەو منداڵە بچوکانە کە لە دەوری کۆبووبوونەوە، ئینجا پێیوتن: ((خوای گەورە دەزانێ زۆرم خۆشدەوێن)).

## ١٣٤. دوو ڕۆژی تری هاوشێوەی ئەو دوو ڕۆژەم نەدیوە

ئەنەسی کوڕی مالیک -خوا لێی ڕازی بێت- کە مێردمنداڵێک بوو، بەدرێژایی ماوەی نیشتەجێبوونی پێغەمبەر(ﷺ) لە مەدینە کارگوزاری بوو، ئەو لەنێو ئاپۆڕای ئەو منداڵانەدا بوو کە پێشوازیان لە یەکەمین گەیشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد، ئەنەس وەسفی ئەو ڕووداوە دەکات کە لەو ڕۆژەدا ڕوویداو دەڵێ: (من لەنێو منداڵەکاندا تەکانم دەدا کە دەیانوت: موحەممەد هات! هەوڵمدەدا بەڵام هیچم بەدی نەدەکرد، پاشتر دەیانوتەوە: موحەممەد هات! تەکانم دەدایەوە بەس هەر هیچم نەدەبینی، ئەنەس دەڵێ: تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکری هاوەڵی هاتن، ئێمە لەنێو هەندێک گەنجی چالاکوانانی مەدینەدا بووین، پاشتر کەسێکمان لە خەڵکی مەدینە نارد تا پشتیوانان ئاگادار بکات، نزیکەی پێنجسەد کەس لە پشتیوانان لە پێشوازیاندا بوون تا گەیشتنە لایان. پشتیوانان وتیان: فەرموون پارێزراو و ئارامبن و گوێڕایەڵکراون. پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵەکەی لەنێویاندا دەرکەوتن، هەمووی خەڵکی مەدینە چوونە پێشوازی، تەنانەت ژنانیش بەسەر بانیماڵەکانەوە دەیانڕوانییە دیمەنی هاتنەکەی(ﷺ)، دەیانوت: کامیانە؟ کامیانە؟

ئەنەس دەڵێ : ئەو دیمەنەی ئەو ڕۆژە بینیمان ڕۆژی تری وامان نەدیبوو!

ئەنەسی کوڕی مالیک دەڵێ: ئەو ڕۆژەی کە پێغەمبەر(ﷺ) هاتە لامان، ئەو ڕۆژەش کە گیانی سپارد، دوو ڕۆژ بوون دوو ڕۆژی تری هاوشێوەی ئەو دوو ڕۆژەم نەدیوە!

## ١٣٥. پێغەمبەر(ﷺ) لەکوێ نیشتەجێ دەبێت؟

وشترە گوێکەلەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بە هێواشی بە شەقامەکانی مەدینەدا ڕێی دەکرد. بەوپەڕی شانازییەوە پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەسەر پشتی هەڵگرتبوو و هەوڵیدەدا ئازاری پێنەگەیەنێ و بێتاقەتی نەکات، کە تێدەپەڕی بە بەردەم هەر ماڵێکدا خاوەنەکەی هاواری دەکرد و دەیوت: (ئەی پێغەمبەری خوا لای ئێمە نیشتەجێ ببە)، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) بە دڵە پڕ لە بەزەییەکەی نەیدەویست هەستی کەس بریندار بکات، هەمووجار وەڵامیدەدانەوە کە: ((لێیگەڕێن - واتە وشترەکەی- ئەو فەرمانپێکراوە)).

کاتێک وشترەکە بووە جێگای تێڕوانینی هەمووان، کەوتە ڕۆیشتن ڕێک بە هەمان ئەو شوێنانەدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ لە تەمەنی منداڵیدا لەگەڵ دایکیدا هاتووەتە مەدینە پیایاندا ڕۆیشتووە. دەنگی ئەو خەڵکە بەرزبوونەوە کە داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد لە ماڵی ئەواندا نیشتەجێ ببێ، بەڵام وشترەکە گەشتە بچوکەکەیی درێژەپێدا، دواجار، لە پارچە زەوییەکی چۆڵدا کە تایبەت بوو بە وشکردنەوەی خورما پەچەی گرت.

ئەو خەڵکانەی لەو گەڕەکەدا بوون لە خێڵی بەنو نەججار بوون، بەنو نەججار خزمانی ئامینەی دایکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، منداڵانی ئەو گەڕەکەش لەخۆشیدا کەوتنە هاوارکردنی خۆشی، کچۆڵە بچوکەکانیش کەوتنە دەف لێدان و بە پۆشاکە نەخش و نیگارە چنراوەکانەوە ئەم دێرە شیعرەیان دەوت کە ئەکە مانای کوردییەتی:

ئێمە کۆمەڵە دراوسێیەکین لە بەنو نەججار..... خۆزگایە موحەممەد دەبوویە دراوسێمان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیرێکی کردن و زەردەخەنەی کرد، چونکە ئەویش بەهەمانشێوە دڵخۆشبوو بە خواستی وشترەکەی. وشترەکە کەوتە بادانی ملە جوانەکەی بەملاو لادا. پێغەمبەریش لەسەری دابەزی و فەرمووی إن شاء الله ئا لێرەدا نیشتەجێ دەبێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هیچ کات نە خۆی ئامادە دەکردو نە پلانی بۆ شتێک دادەڕێژا تا نەیفەرمووایە إن شاء الله، ئەمەش واتای ئەوەیە کە ناتوانێت خۆی بەخۆی هیچ کارێک بکات کە حەزی لێبێت تا خوای گەورە ڕەزامەندی لەسەری نەبێت و ویستی ئەوی لەسەر نەبێت.

## ١٣٦. جووتە برا سەهل و سوهەیل

ئەو پارچە زەوییە کە وشترەکە چۆکی دادا تیایدا هی دوو برا بوو بەناوی سەهل و سوهەیل، ئەم دوو برایە باوکیان نەمابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی بیانناسێ، دوو برا بچوکەکەش بەڕاکردن هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و بە شڵەژاوییەوە لەبەردەمیدا وەستان، لە کاتێکدا بە چاوی سۆزو خۆشەویستییەوە دەیڕوانی بۆیان، داوای لێکردن پارچە زەوییەکەیان بفرۆشن پێی، بەڵام ئەوان ئەو داوایەیان پەسەند نەکرد. بەڵکو بە جووتە وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا، ئێمە پارەمان ناوێ، بەڵکو بە تەواوی ڕەزامەندیمانەوە ئەو زەوییەت پێشکەش دەکەین!).

بەڵام مەعلومە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرگیز قوبوڵناکات دەستبگرێ بەسەر مافی هیچ کەسێکدا، لەبەرئەوە بەوە ڕازی نەبوو، بەڵکو هەستا بە پێدانی ئەو نرخە کە زەوییەکە شایستەی بوو بە سەهل و سوهەیل، ئا لەو جێگایەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئایندەدا خانوویەک بۆ خۆی دروستدەکات، هەردوو براکە شانازییان بەوەوە کرد.

## ١٣٧. خۆشیی و شادیی ئەبو ئەییوب

جا تا ئەو خانووە دروستدەکرێت، پێویستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە شوێنێکدا لەو گەڕەکە نیشتەجێ ببێ کە وشترەکە چۆکی داداوە تیایدا، واتە گەڕەکی بەنو نەججار، بەڵام دەبێ لە ماڵی کێ نیشتەجێ ببێ؟ هەمووان بە چاوەڕوانی و ئومێدەوە سەیریان دەکرد. پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەدەکرد هەستی کەس لەوانەی ئامادەبوون بریندار بکات، بۆیە بەمشێوازە پرسیاری لێکردن و فەرمووی: ((ماڵی کام لە کەسەکانمان نزیکترە؟)، یەکێک لە ئامادەبووان بەدەم زەردەخەنەوە هاتە پێشەوەو وتی: (من ئەی پێغەمبەری خوا، ئەوە ماڵەکەمەو ئەوەش دەرگاکەمە). ئاماژەیدا بە ماڵێک لە پشتەوەی.

ئەو پیاوە ناوی ئەبو ئەییوبی ئەنصاری بوو، کە بە خوو جوانیی و گوتە ناسکی ناوبانگی دەرکردبوو، هەمووی خەڵکی مەدینە ڕێزیان لێدەگرت، پێغەمبەریش(ﷺ) داواکەی پەسەندکرد و ڕۆیشت تا لە ماڵی ئەبو ئەییوب نیشتەجێ ببێ.

ئەبو ئەییوب کەلوپەلەکەی بە خۆشییەکی زۆرەوە لەسەر پشتی وشترەکە داگرت و هەڵیگرت تا ناو ماڵەکەی خۆی. پێشتر هیچ کەس ئەبو ئەییوبی بەو بەختەوەرییە نەدیبوو، خاتوو لەتیفەی خێزانیشی وەک خۆی خاوەنی دڵێکی بەسۆزو جوان بوو، پێیاندەوت دایکی ئەییوب، ئەویش زۆر دڵخۆشبوو بە میوانداریکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، خێرا ڕایکردەوە بۆ ماڵەوە تا ڕێکوپێکی بکات و ئەوەی لە توانایدایە بیکات تا پێغەمبەر(ﷺ) ئاسودەو حەواوە بێت، ماڵەکەی ئەبو ئەییوب و دایکی ئەییوب لە دوو قات پێکهاتبوو، قاتی دووەمیان تەرخانکرد بۆ پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێ لە ڕێکخستنی ماڵەکە تەواو بوون، گەڕانەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئاگاداریان کرد کە جێگایەکیان بۆ خۆی و ئەبوبەکر ڕێکخستووەو حازرە، کەسیش بێتاقەت نەبوو لەو هەڵبژاردنەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ئەو شوێنی نیشتەجێبوونەی، چونکە دەیانزانی ئەو کارەی بە فەرمانی خوای گەورە کردووە. هەربۆیە بەوپەڕی ڕێزەوەو بە دەف لێدان و سرود و شیعر وتن لە خزمەتیدا چوون بۆ ماڵەکەی ئەبو ئەییوب.

## ١٣٨. موعجیزەیەک لە ماڵی ئەبو ئەییوب

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەی پیرۆزەوە کۆچیکرد بۆ مەدینەی مونەووەرە. کۆچەکەی هەنگاوێکی گرنگ بوو، چونکە دەبێتە سەرەتایەک بۆ قۆناغێکی نوێ و خێرو چاکەکاریی. موسڵمانانیش لەدوای ئەو مێژووەوە ئیتر لە ڕۆژانێکی زۆر بەختەوەریی و کامەرانیدا دەژین. بەو هۆیەوە، پاشتر ئەو ڕۆژە بووە سەرەتای ساڵنامەی ئیسلامیی.

لە ماڵەکەی ئەبو ئەییوب، خۆشی و شادیی باڵیکێشا بەسەر هەمووواندا، خالیدی کوڕی زەید کە بە نازناوی ئەبو ئەییوب ناسراوەو خێزانەکەشی دایکی ئەییوب هەستان بە ئەنجامدانی هەموو ئەوەی لە توانایاندا بوو تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەست بە حەوانەوە بکات، بەوپەڕی گرنگیپێدانەوە خواردنی ئامادەکرد، ئەو خۆ ئامادەکردنەش بۆ دوو شەرەفمەندترین میوان بوون، ئەوانیش پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەبوبەکری هاوەڵی بوون. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بڕۆ سی کەس لە پیاوماقوڵانی پشتیوانانم بۆ بانگ بکە)).

لە واقیعدا، خواردنەکە بەشی دوو کەس زیاتری نەدەکرد، بەڵام ئەبو ئەییوب دوودڵ نەبوو، بەڵکو ڕۆیشت و بە یاوەری سی کەس گەڕایەوە ماڵەکەی. هەر هەموویان لە خواردنەکەیان خواردو تێربوون، شتێکیشی لێمایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئەبو ئەییوبی فەرموو: ((بڕۆ شەست کەسم لە پیاوماقوڵانی پشتیوانان بۆ بانگ بکە)). ئەبو ئەییوب واقی وڕما، چونکە سی کەس لە خواردنەکەیان خواردووە، ئێستەش پێغەمبەر(ﷺ) داوای

هێنانی شەست کەسیتر دەکات؟ بەلام ویڕای ئەوە ئەبو ئەییوب هەر فەرمانەکەی پێغەمبەری(ﷺ) جێبەجێ کرد، میوانەکان هاتن و ئەوانیش لە خواردنەکەیان خواردو هەموویان تێربوون، کەچی هێشتا شتێک لە خواردنەکە لە سەر سفرەکە مابوویەوە.

لەڕاستیدا ئەوە موعجیزەیەکی ڕوون بوو، ئەبو ئەییوب لەوە بەدواوە بەدرێژایی ژیانی ئەو ڕووداوەی لەبیر نەچوویەوە! دواتر خەڵکی ئاگادارکرد بەوەی کە ڕوویدا و وتی: (نەوەد کەس هەموو لە پشتیوانان لەم خواردنەیان خواردووم).

## ١٣٩. شادیی و خۆشی ئیبن سەلام

لە شاری مەدینە هەندێ جولەکە دەژیان کە باوەڕیان بە موسا پێغەمبەر(ﷺ) هەبوو، هەروەها بەو پێغەمبەرانەش کە دەچوونەوە سەر نەوەی ئەو.

ئەوانە وایان دادەنا کە خوای گەورە فەزڵیداون بەسەر تەواوی مرۆڤەکانی تردا، بەڵام لە واقیعدا، هەمووی خەڵکی یەکسانن لەبەردەم خوای گەورەدا.

جولەکە دەیانزانی ڕۆژێک دێت کە کۆتا پێغەمبەر دەردەکەوێ، خۆیان چاوەڕێی ئەو ڕۆژەیان دەکرد. چونکە تەورات باسی نیشانەکانی ئەوی تێدایە، تیایدا فەرمان بە جولەکە دەکات کە باوەڕ بەو پێغەمبەرە بێنن و شوێنی بکەون، بەڵام ئەوان پێشبینیان وابوو ئەو پێغەمبەرە یەکێک لەوان دەبێت، هەربۆیە کاتێک زانیان لەناو عەرەبدا هاتووە هەستییان بە نائومێدییەکی گەورە کرد، زۆرێکیان نکولیان لێیکردو باوەڕیان نەهێنا پێی.

لە مەدینەدا گەورە زانایەکی جولەکە هەبوو ناوی عەبدوللە کوڕی سەلام بوو، پیاوێکی زیرەک و خاکی بوو، هەرگیز نەیزانیوە ئیرەیی یانی چی. کاتێ بیستی کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) گەیشتووەتە مەدینەی مونەووەرە، زۆر دڵخۆشبوو، وتی: (الله أكبر)، پورەکەی بەو قسەیەی زۆر بێتاقەت بوو و قیژاندی بەسەریداو وتی: (ئەگەر تۆ هاتنی موسای کوڕی عەمرانیشت ببیستایە لەوە زیاترت نەدەوت). عەبدوللەی کوڕی سەلام بە خۆشییەکەوە وەڵامیدایەوە کە: (سوێند بەخوا ئەو برای موسای کوڕی عەمرانەو لەسەر ئاینی

ئەوەو هەر بەوەوە ڕەوانەکراوە کە ئەو پێی ڕەوانەکراوە). ئەوکات پورەکەی وتی: (ئەی برازاکەم، ئایا ئەمە ئەو پێغەمبەرەیە کە ئێمە هەواڵمان لەبارەیەوە هەیە کە لەم سەردەمەدا ڕەوانە دەکرێت). عەبدوالله وەڵامیدایەوە کە: (بەڵێ)، پورەکەی وتی: (کەواتە ئەوە).

عەبدوالڵەی کوڕی سەلام خێرا ڕۆیشت بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک سەیری کرد بۆی دەرکەوت ئەو دەموچاوە دەموچاوی کەسێکی درۆزن نیە! هەرکە بینی هەستیکرد کە ڕوخساری پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژیانی ڕۆشنکردووەتەوە! ڕاستەوخۆ موسڵمان بوو. ئا لەو ساتەدا وا هەستیکرد کە بەختەوەرترین مرۆڤە لەسەر زەویدا.

## ١٤٠. درۆزنیی جولەکە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو ماوەیەدا لە ماڵی ئەبو ئەییوب نیشتەجێ بوو، خەڵکیش دەستە دەستە بە مەبەستی زیارەتکردنی دەهاتنە خزمەتی، گوێیان بۆ ڕێنماییەکانی دەگرت، زانای جولەکەش عەبدوڵڵەی کوڕی سەلام یەکێک بوو لەو زیارەتکارانە. هەرکە چاوی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت بۆ مەعلوم بوو کە پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، ڕاستەوخۆ موسڵمان بوو.

بەڵام ترسی لەو جولەکانە هەبوو کە ڕەتیانکردەوە باوەڕی پێبکەن، لێرەوە وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، جولەکە قەومێکی بوهتانچیی و درۆزنن، ئەگەر بێت و بزانن من موسڵمان بووم درۆ بە دەممەوە دەکەن، کەواتە بنێرە لایان و هەواڵی منیان لێبپرسە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) داواکەی پەسەندکرد، کەسایەتییە دیارەکانی جولەکەی بانگهێشت کردو عەبدوڵڵەی شاردەوە، کاتێک گەیشتنە خزمەتی پێشوازییەکی گەرمی لێکردن و ئاگاداری کردن کە پێغەمبەرەو لە خوای گەورەوە ڕەوانەکراوە، بە ئاینێکی ڕاست و دروستەوە هاتووە بۆ هەمووی خەڵکی.

بەڵام جولەکەکان نارەزاییان دەربڕی و ئیسلامیان ڕەتکردەوە. ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوامبوو لە ئاخاوتن لەگەڵیانداو فەرمووی: ((ئیبن سەلام لەناو ئێوەدا چۆن پیاوێکە؟)) وتیان: (گەورە زانای کوڕی گەورە زانامانە، زانای کوڕی زانامانە). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر بزانن ئەو موسڵمان دەبێت ئێوەش موسڵمان دەبن؟)، لە وەڵامدا وتیان: (خوا پەنای بدات لەوە). ئا لەو

کاتـەدا پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بانگی عەبدوڵلـە کوڕی سـەلامی کـرد، عەبدوڵلـە لـە حەشـارگەکەی هاتـەدەرەوەو وتـی: (أشـهد أن لا إلـه إلا اللـه، وأن محمـداً رسـول اللـه). ئینجا کەوتـە بانگکردنی زانا جولەکەکان بۆ ترسـان لـە خـواو باوەڕهێنـان بـەو پێغەمبـەرە کـە لـە کتێبەکەیانـدا نـاوی هاتـووە.

جووەکان زۆر بەلایانـەوە سـەیر بـوو، ڕاسـتەوخۆ لێیهەڵگەڕانـەوە، کەوتنـە سـوکایەتی پێکردنـی و دەیانـوت: (خـراپ کـوڕی خراپمانـە، نـەزان کـوڕی نەزانمانـە). کەوتنـە سـەرزەنشـتکردنی خـۆی و باوکـی، جۆرەهـا تۆمەتیـان ئاراسـتەکرد، ئینجـا عەبدوڵلـەی کـوڕی سـەلام ئاوڕیدایـەوە بـەلای پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) و پێیـوت ئەمـە ئەوەبـوو کـە لێـی دەترسـام، ئـەو چـاک دەیزانـی کـە جولەکـە قەومێکـی زبـرو دڵڕەقـن، فێڵبـازو تۆمەتهەڵبەسـن.

عەبدوڵلـەی کـوڕی سـەلام لـەدوای موسـڵمانبوونی یـەک سـاتیش لـە کاتـی خـۆی بەفیـڕۆ نـەدەدا، بەڵکـو بـۆ هـەرلایـەک بڕۆیشـتایە خەڵکـی بانـگ دەکـرد بـۆ باوەڕهێنـان بـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـە نیشـانەکانی لـە تەوراتـدا هاتـووە. ژمارەیەکـی زۆر لـە جـووەکان لەسـەر دەسـتی ئـەو موسـڵمانبوون، هەوڵیـان نـەدەدا دەسـتبگرن بـە ڕاو حـەزی تایبەتـی خۆیـان هـەروەک زۆربـەی جووەکانیتـر وەهایـان کـرد، ئەمـان باوەڕیـان بـە ئاینـی هـەق و ڕاسـتی هێنـا، شـوێن فەرمانـی خـوای گـەورە کەوتـن، دەسـتیان هەڵگـرت لـە حەرامکراوەکانـی.

## ١٤١. ڕەوشتبەرزیی پێغەمبەر(ﷺ)

لە کاتێکدا منداڵان لە مەدینە پێکەوە یارییان دەکرد، پیاوێکی بەساڵاچوو هاتە لایان، دیاربوو کەسێکی ناشارەزا بوو بە مەدینە سەیرێکی کردن جۆرێ لە دوودڵی لەسەر ڕوخساری دەردەکەوت لێیان نزیکبوویەوەو پرسیاری لێکردن: (منداڵان، بیستوومە پیاوێک لە مەککەوە هاتووەتە ئێرە دەڵێت من پێغەمبەرم، ئایا ئێوە دەیناسن، ئەو چ جۆرە پیاوێکە؟ منداڵەکان لەنێوان خۆیاندا کەوتنە پێشبڕکێ بۆ وەڵامدانەوەی، هەر یەکێکیان شتێکی لەبارەی شەرەفمەندترین مرۆڤی خواوە دەوت. دەیانوت:

(ئەو چاکترین مرۆڤی خوایە لەسەر زەوی! هەموو هەڵسوکەوتەکانی چاکن، دەڵێن هەر لە منداڵییەوە کەسێکی جیاوازە).

(ئەو ڕاستگۆ و دەستپاکە).

(خاکیی و بەخشندەیە).

(نە درۆ دەکات و نەکەسیش دەخەڵەتێنێ).

(لاوازەکان دەپارێزێ، خێر بە نەداران دەکات).

(بەردەوام دەم بە زەردەخەنەیە، باسی عەیب و عاری خەڵکی ناکات).

(هاوکات کەسێکی جوان و خوو نەرمونیانە).

(چاو لەو مەسەلانە دەپۆشێ کە حەزی لێیان نیە، هەرگیز لۆمەی کەس ناکات).

(هەمیشە گەشبینە، ئارامگرو تێگەیشتووە).

(بەدوای کەموکوڕیی خەڵکیدا ناگەڕێ).

(بە بایەخپێدانەوە گوێ لە هەموو کەس دەگرێ تا قسەکانیان تەواو دەکەن، هەرگیز قسە بە کەس نابڕێ تا قسەکانی تەواو دەکات).

(غەیبەت و دووزمانی زۆر پێناخۆشە).

(حەزدەکات خەڵکی خەریکی ئەنجامدانی کردەوە چاکەکان بن، با شتانی ئاسایی و ساناش بن).

(خۆی ڕازاندووەتەوە بە جوانترینی ڕەوشتەکان، ئەوانەش ئەویان کردووتە پێشەنگی خۆیان باشترینی خەڵکین لە کۆمەڵگادا).

(کاتێ لە تەمەنی پازدەساڵیدا بووە، بەوە دادەنرا کە ڕەوشتبەرزترین کەسە لەناو قەومەکەی خۆیدا، هەرگیز ڕێگای بە ستەمکردن نەداوە، گرنگیدەدات بەکێشەکانی خەڵکی، بەو هۆیەوە نازناوی موحەممەدی ئەمینی وەرگرتووە).

دوای ئەوە کە پیاوە بەساڵاچووەکە گوێبیستی گوفتاری مناڵەکان بوو، وتی: (تەواو ئەوە پێغەمبەری خاتەمە،(ﷺ)، پاشان خێرا ڕۆیشت بۆ بینینی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ).

## ١٤٢. سەلمان ئازادی بۆ دەگەڕێتەوە

سەلمان گەنجێکی فارسی بوو، بۆ ماوەیەک لە مەدینەی مونەووەرە ژیاوە بەو ئومێدە پێغەمبەری چاوەڕوانکراو دەربکەوێ، زۆر تامەزرۆی دیتنی مۆری پێغەمبەرایەتی بوو کە مامۆستاکەی بۆی باسکردبوو. لەدوای کۆچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ مەدینە، سەلمان عادەتی پێوە گرتبوو هەرکات هەلی بۆ بڕەخسایە دەهاتە زیارەتی.

لە یەکێک لەو سەردانانەیدا، خوای گەورە ڕێزی لێنا ئەویش بە بینینی مۆری پێغەمبەرایەتی، ئەوکات بەدەم گریانەوە پێغەمبەری خوای(ﷺ) ئاگادارکرد لەوەی کە پێشتر ڕوویداوە لێی. ئینجا شایەتومانی هێناو باوەڕی بە ئیسلام کرد.

سەلمان حەزی نەدەکرد ژیانێکی دوور لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەربەرێ، تەنانەت بۆ یەک ساتیش بێت، بەڵام ئەو کەسێکی کۆیلە بوو، ئەو کارەش ئەوەی بەسەردا دەسەپێنێ کە دەبێت بەدرێژایی ڕۆژ کاربکات، بەبێ مۆڵەتی گەورەکەی نەیدەتوانی هاتووچۆی هیچ شوێنێک بکات، ڕێگیری لێدەکرد تەنانەت لە ئەنجامدانی نوێژەکانیشی. کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە حاڵی زانی خەمبار بوو بەو حاڵەی ئەوی تێدایە. ڕۆژێکیان، بانگیکردو پێی فەرموو ئیتر کاتی ئەوە هاتووە ڕزگاری ببێت لە کۆیلایەتی. پاشان داوای لێکرد بڕوات بۆ لای گەورەکەی و ڕێکەوتنێکی لەگەڵ ببەستێ، پێی فەرموو: ((ئەی سەلمان لەسەر خۆت بنوسە)).

سەلمان ڕۆیشت و قسەی لەگەڵ گەورەکەی کرد، ئینجا داوای لێکرد کە لەبەرانبەر ئازادکردنییەوە چی لێدەوێت؟ گەورەکەی کەسێکی دڵڕەق بوو، داوای لێکرد سێسەد نەمامی دارخورمای بەرداری بۆ بنێژێ، چل ئۆقیە ئاڵتونیشی بداتێ.

سەلمان کەسێکی هەژار بوو، نەتوانا بوو لەوەی ئەو مەرجانە جێبەجێ بکات، گەڕایەوە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوەی چوو بوو بەنێوان ئەو و گەورەکەیدا بۆی گێڕایەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هاوەڵانی فەرموو: ((لە نەمامە دارخورماکاندا هاوکاری براکەتان بکەن)).

هاوەڵان کەوتنە یارمەتیدانی سەلمان، لە ماوەیەکی کورتدا، سێسەد نەمامی دارخورمایان کۆکردەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (چاڵیان بۆ هەڵکەنەو هیچیان نەخەیتە ناو چاڵەکانەوە تا خۆم بەدەستی خۆم ئەوە نەکەم)). سەلمان ئەوەیکرد کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی فەرموو، کاتێ چاڵەکان تەواوبوون، پێغەمبەری ئاگادارکرد، ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات و بە دەستی پیرۆزی خۆی نەمامەکانی چەقاندو خۆڵی کرد بەسەریاندا، جگە لە یەک دانەیان. بە بەرەکەت و پاڕانەوەکانی نەمامەکان گەورە بوون لە ماوەی کەمتر لە ساڵێکدا بوون بە درەختی بەردار. ئەمەش موعجیزەیەک بوو کە خەڵکی سەرسامکرد.

بەڵام تەنیا یەک درەختیان بەری نەگرت، ئەویش ئەوەیان بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) بەدەستی خۆی نەیناشتبوو، کاتێک بینی، هەڵیکێشاو سەرلەنوێ ناشتییەوە، لەدوای ماوەیەکی کورت، ئەویش کەوتە خورما گرتن، سەلمان ئا بەمشێوەیە داواکاری گەورەکەیی بەجێگەیاند، کاتی ئەوەش هات کە چل ئۆقیە ئاڵتونەکەش ڕادەستی گەورەکەی بکات.

پێغەمبەر(ﷺ) پارچەیەک ئاڵتونی هەبوو بە قەبارەی هێلکە مریشکێک بوو، سەلمانی بانگکرد، ئاڵتونەکەی پێداو پێی فەرموو: ((ئەمە تەسلیم بکە)). سەلمان وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە چ جێگایەک دەگری لەوەی کە کەوتووتە سەرشانم؟)). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (وەریگرە خوای گەورە لەجیاتی تۆ دەیداتەوە)). سەلمان پارچە ئاڵتونەکەی هەلگرت و بردییە لای بازرگانێکی ئاڵتون و فرۆشتی، بەو پارەیە کە دەستی کەوت قەرزەکەی دایەوە، سەلمان ئاوا بە پارانەوەکان و سۆزو بەزەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئازاد کرا.

## ١٤٣. برایەتیی نێوان موسڵمانان

بۆئەوەی موسڵمانانی مەککەی پیرۆز بتوانن ئازادانە کاروباری ئاینەکەیان ڕاپەڕێنن، لە کاتێکدا کە ماڵ و سامان و شتە بەنرخەکانیان لە مەککە جێهێشتووە و کۆچیانکردووە بۆ مەدینە. هەر لەبەرئەوەش ناوی کۆچکەریان لێنراوە، ئەوانەش کە دەرگای ماڵەکان و دڵی خۆیانیان لە مەدینە بۆ والآکردن ناونران بە پشتیوانان، چونکە پشتیوانی کۆچکەرانیان کردو پشتگیرییان لێکردن. کۆچبەران هاتنەناو کەشو هەوایەکی نوێوە، ناو ژیانێکی نوێوە، هیچ شمەک و سەروەت و سامانێکیان لەگەڵ خۆیان نەهێنابوو، بەو هۆیەوە، ئاسان نەبوو بتوانن ژیانێکی نوێ دابمەزرێنن لە کاتێکدا کە لە هەوڵدابوون کارێک لە مەدینە بۆ خۆیان بدۆزنەوە.



پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر چاک ئەوەی دەزانی، ئەوا پێنج مانگ تێپەڕیوە بەسەر هاتنیان بۆ مەدینەی مونەووەرە، هەستی بەو ناڕەحەتییانە دەکرد کە ڕووبەڕووی موسڵمانانی مەککە بوونەتەوە. لەبەرئەوە هەموو موسڵمانانی پێکەوە کۆکردەوە، ئاگاداری کردن کە حەزدەکات هەر کۆچبەرێکی مەککەیی ببێتە برای پشتیوانێکی مەدینەیی، ئەم هەواڵە هەمووانی دڵخۆشکرد. هەرکاتێ دوو کەسی بانگبکردایە، ڕایدەگەیاند کە ئەم دوو موسڵمانە بوونەتە برا، بەم پێیەش موسڵمانە مەدینەییەکە بە پێخۆشبوونەوە ڕەزامەندی دەدا لەوەی ببێتە برای موسڵمانە مەککەییەکە، لێرەوە دەهات دەیکردە هاوبەشی لە هەموو سەروەت و سامانەکەی خۆیدا.

موسڵمانانی مەدینەی مونەووەرە کەسانێکی دڵپاک و میوانپەزیر بوون، تەنانەت بەرلەوەش پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی بخاتە نێوان ئەوان و موسڵمانانی مەککەوە ئەوان هەر باوەشیان گرتبووەوە بۆیان وماڵەکانیان لە خزمەت موسڵمانانی مەککەدا بوون. لەدوای ئەم ڕێکەوتنەوە ئیتر بەوپەڕی ڕەزامەندی و پاکییەوە حیسابی برای خۆیانیان بۆ دەکردن. بەم پێیە لێرە بەولاوە موسڵمانانی مەککە و مەدینە کار پێکەوە دەکەن و پێکەوە دەژین، بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکانیش ئەوەندەی تر بەهێز دەبن و یەکگرتوو دەبن، لە خۆشی و ناخۆشییەکاندا برای یەکن، ئەمەش وایکرد موسڵمانانی مەککە هەست بە تەنیایی و نەتوانایی نەکەن، موسڵمانانی مەدینەش بەهەمانشێوە زیاترو ئاسانتر فێری قورئانی پیرۆز دەبن ئەویش بەهۆی ئەو برایانەیانەوە کە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) لە مەککەی پیرۆز نزیکتر بوون لە قورئان و لە ڕێنماییەکانی ئیسلامەوە.

بەمشێوازە، پێغەمبەر(ﷺ) هەستا بە چارەسەرکردنی گرفتێکی تر لە گرفتەکانی موسڵمانان، کۆچبەران و پشتیوانان بە خۆشییەکی زۆرەوە ئەم ڕێکەوتننامە نوێیەیان پەسەندکرد.

## ١٤٤. مەدینە و طیبة

شاری مەدینە بە ڕووبەری سەوزایی و بە باخ و بێستانەکانی ناوبانگی دەرکردبوو. کەشو هەواکەی ئەوەندەی کە پێویست بێت بۆ پارێزگاریکردن لە سروشتە سەوزاییەکەی باراناوی بوو. پێش کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) ئەو شارە پێی دەوترا یەسریب، بەڵام لەبەرئەوە ماناکەی جوان نەبوو، پێغەمبەر(ﷺ) ناوی نا مەدینە، ئەمەش ناوێکە گونجاوە لەگەڵ ئاینی نوێدا، هەروەها پێی دەوترا طیبة.

شاری مەدینە لەگەڵ ناوە نوێیەکەی و لەگەڵ ئەو برایەتییەدا کە لەنێوان موسڵماناندا بڵاوبوویەوە ڕوویەکی نوێی پۆشی. هەروەها ڕوخساری دانیشتوانەکەی دەدرەوشایەوە بە بەختەوەریی، پشتیوانان بەخۆشحاڵییەوە هەموو ئەوەی کە هەیانبوو دابەشیانکرد لەگەڵ کۆچبەراندا.

ڕۆژێکیان، هەندێ لە پشتیوانان هاتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا! ئەو باخە دارخومایانەی ئێمە هەمانە دابەشی بکە لەنێوان ئێمەو براکانماندا. جا لەبەرئەوە کە موسڵمانانی مەککە پێشتر خەریکی بازرگانی بوون شتێکیان لەبارەی کشتوکاڵ و کێڵگەکانەوە نەدەزانی، پێغەمبەر(ﷺ) ڕەزامەندی لەسەر ئەو بیرۆکەیە نەدا، بەڵام خاوەن باخەکان زۆر داکۆکییان کرد و وتیان ئێمە خۆمان باخەکان ئاو دەدەین و سەرپەرشتیان دەکەین و بەرهەمەکەیان دەرنینەوە، کۆمەڵە ئیشێکی ئاسانیش جێدەهێڵین بۆ کۆچبەران. بەو شێوازەش، بەروبوومەکە لەگەڵیاندا دابەش دەکەین،

لەسەر داکۆکی زۆری ئەوان پێغەمبەر(ﷺ) داواکەی پەسەندکردن، بەڕاستی خەڵکی پێشتر تا ئەو ڕۆژە ئاشنا نەبوو بەو ئاستە بەرزە لە برایەتی و هاوبەشیکردن.

ئا بەمشێوەیە موسڵمانانی مەککەی پیرۆزو مەدینەی مونەوەرە بە فەزڵی ئەو برایەتییە جوانە لەسەر شێوازێکی پتەو یەکیانگرت. هەرکەسێکیش ئەو پەیوەندییە بەهێزانەی لەنێویاندا بینیبێ ئەوا هەستی بە سەرسوڕمانێکی گەورە کردووە، ئا ئەمە چ ئاینێکی نایابە! ئەم ئاینە توانی ڕۆڵەکانی یەک کۆمەڵگا بکاتە برای ڕاستەقینەی یەکتری، هاوکاری یەکتری بکەن و لەپێناو یەک دۆزدا یارمەتیدەری یەکتر دەبن.

مەدینەی مونەوەرە ئاستێکی بەرزی لە میوانپەزیری بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کۆچبەران نیشاندا، چونکە هەموو ئەو کۆچبەرانەی کە هاتن بێ ماڵ و حاڵ و بێ زەوی بوون بەڵام لە کتوپڕێکدا بوونە خاوەنی ماڵ و زەوی و باخاتی جوان. بەمەش هەزاران دڵخۆشبوون، شەوق و زەردەخەنە گەڕایەوە سەر ڕوخساری منداڵان، ئەوانەش کە لە ڕابردوودا کەسانی نەتواناو پەککەوتە بوون دوعای خێریان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکردو سوپاسی خوای گەورەیان کرد لەسەر ئەو نیعمەتانەی کە ڕژاندویەتی بەسەریاندا.

## ١٤٥. برایەتیی و هەوڵدان و ژیانێکی بە قەناعەت

بە تێپەڕبوونی کات تا دەهات برایەتی و خۆشەویستی لەنێوان موسڵماناندا زیاترو زیاتر دەبوو، بەڵام موسڵمانان ڕازینەبوون بەبێ ئیش بمێننەوە، چونکە ئاینی ئیسلام ڕێگیری دەکات لە تەمبەڵی، لێرەوە هەموو توانایان دەخەنەگەڕ تا چاکەی جوان و گەورەی برا پشتیوانەکانیان بەجوانی ڕەتبکەنەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) برایەتی خستە نێوان سەعد کوڕی ڕەبیع و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف. لە خوای گەورە پاڕایەوە کە عەبدوڕەحمان دەوڵەمەندتر بکات، سەعدی برای پێیوت: (من لە هەموو پشتیوانان دەوڵەمەندترم، وا نیوەی ماڵەکەم بەشدەکەم لەگەڵتدا)، بەڵام عەبدوڕەحمان وەڵامیدایەوەو وتی: (پێویستم بەوە نیە ئایا بازاڕێک هەیە بازرگانی تێدا بکرێ؟).

دوای ئەم داوایە، سەعد بازاڕی مەدینەی نیشاندا، ئەویش چووە بازاڕ و هەندێ ڕۆن و پەنیر و شتیتری خواردەمەنی کڕی، پاشان فرۆشتنی و بڕێ قازانجی دەستکەوت، لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، بازرگانییەکەی فراوان بوو، لەماوەیەکی کورتدا قازانجی گەورەی کرد، تا بووە یەکێک لە دەوڵەمەندترینی پیاوانی مەدینە، بەڵام ئەو سەروەتەی کە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف دەستیکەوت بەهۆی دۆعاکەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو، ئامادەبوو لەپێناو ئیسلامدا قوربانی بە هەر هەمووی بدات. لە ڕۆژانی ئایندەشدا، خەڵکی ئەوە دەبینن کە چۆن عەبدوڕەحمان بە حەوت سەد بار وشتر کە کەلوپەلی بەنرخیان هەڵگرتووە بەشدار دەبێت لە یارمەتیدانی هەژارانی مەدینەدا.

موسڵمانانی تریش هەروەک ئەو کاری نوێیان لە مەدینەی مونەووەرەدا بۆ خۆیان دۆزییەوە. لە ماوەیەکی کەمدا، لەباتی ئەوە پشت بە یارمەتی براکانیان ببەستن دەستیاندایە پەیداکردنی بژێوی خۆیان، ئەوان لەپێناو گوێڕایەڵیکردنی فەرمانەکانی خوای گەورەو وازهێنان لەو کارانەی ڕێگیری لێکردوون ماڵ و حاڵی خۆیانیان جێهێشت، خوای گەورەش بەوهۆیەوە کاری بۆ ئاسانکردن، بەرەکەتی خستە سەروەتییانەوە، وەک قەڵای پۆڵایینییان لێهات کە دەورەی پێغەمبەریاندا(ﷺ) و پاراستییان و یارمەتیدەری بوون. ئەوان کەسانی باوەڕدار و تێکۆشەر بوون، بە کەم ڕازیبوون و زۆربەی ئەوەی لەدەستیاندا بوو دەیانبەخشی، بەم سیفەتە جوانانەوە، بوون بە پێشەنگی هەمووی جیهان.

## ١٤٦. بەختەوەریی موسڵمانان

بە فەزڵی ئەو برایەتییەی لەنێوان موسڵماناندا هاتەکایە، خۆشی و بەختەوەریی و گەشبینی سەراپای ماڵەکانی مەدینەی مونەووەرەی گرتەوە، موسڵمانانی مەدینە بوونە نمونەیەکی جوان بۆ برا کۆچبەرەکانیان، خوای گەورەش لەم ئایەتە پیرۆزەدا لە وەسفی باشی ئەو ڕەفتارەیاندا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ تَبَوَّءُو ٱلدَّارَ وَٱلْإِيمَـٰنَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِى صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّآ أُوتُوا۟ وَيُؤْثِرُونَ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ ۚ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِۦ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴾ (الحشر: ٩)

پشتیوانان کۆچبەرانیان خستە ژێر سێبەری خۆیانەوە، لەبەرانبەردا کۆچبەرانیش ئامادەبوون لەپێناو برا پشتیوانەکانیان قوربانی بە گیانی خۆیان بدەن. جگە لە ڕایەڵەی برایەتی ئیسلامی شتێکیتر نەیبەستبوون بەیەکەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) برایەتی خستە نێوان ئەبو عوبەیدەی کوڕی جەڕاح و ئەبو تەڵحەوە، نێوان سەلمانی فارسی و ئەبو دەردائەوە، نێوان سەعد کوڕی ڕەبیع و عەبدورەحمانی کوڕی عەوف، نێوان ئەبوبەکری صدیق و خارجەی کوڕی زوهەیرەوە، نێوان عومەری کوڕی خەتتاب و عوتبان کوڕی مالیکەوە، نێوان حەمزەی کوڕی عەبدولموتتەلیب و زەیدی کوڕی حاریسە، نێوان تەواوی کۆچبەران و تەواوی پشتیوانانەوە، بەمجۆرە هەستی برایەتی و خۆشەویستی لەنێوانیاندا بڵاوبوویەوەو بووە نەریتێکی باش باش بۆیان.

موسڵمانان ئا بەمشێوەیە هەموو شتیان لەنێوان خۆیاندا دابەشدەکرد و یارمەتی یەکتریان دەدا. بە فەزڵی ئەو ئاشتی و برایەتییەی کە ئیسلام بۆیهێنان بە هەموویانەوە کۆمەڵگایەکی هاوئاوازو تۆکمەو پتەویان بونیاتنا. ئیرەیی و شانازیکردن و لەخۆباییبوون لە دڵی هیچ یەکێکیاندا جێگای نەدەبوویەوە. لەجیاتی ئەوە، تامی شیرینی ژیانیان لە کۆمەڵگای مەدینەی مونەووەرەی جوان و قەشەنگدا دەچەشت.

## ١٤٧. نامەیەک لە مەککەوە

بێباوەڕانی مەککە هەستییان بە ناڕەحەتی و شڵەژاویی دەکرد، زۆر بێتاقەتبوون بە بینینی موسڵمانانی مەدینە کە لە ژیانێکی ئاشتی و دڵئارامیدا دەژیان، لەبەرئەوە هەستان نامەیەکی بەڵێندان و هەڕەشە ئامێزیان نارد بۆ خەڵکی مەدینە، تیایدا داوایان لە خەڵکی مەدینە کرد دەستکۆتا بن لە پاراستنی موسڵمانانی مەککە، ئەگەرنا ئەوا سەرئەنجامێکی ناهەموارو کارەساتبار چاوەڕێیان دەکات.

کاتێک پشتیوانان نامەکەیان بەدەست گەیشت، باکیان پێی نەبوو کە چی تێدایە، نەک تەنها ئەوەندە بەڵکو بە نامەیەک وەڵامیاندانەوە کە ئەوان بەوپەڕی لێبڕان و پێداگرییەوە بەردەوام دەبن لە پاراستنی موسڵمانانی مەککە.



پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە ئەم ڕووداوەی بیست، دڵخۆشی نواند بە ئازایەتی و لێبڕانی پشتیوانان، ئیتر لێرە بەرەوژوور موسڵمانانی مەدینە چوون پەنجەی یەک دەست وەهان، قورەیشیش هەرکات ئەوەی زانی، ئەوا تەواوی هەوڵی خۆیان دەخەنەگەڕ بۆ هەڵوەشاندنەوەی ئەو یەکبوونەیان، با لەو پێناوەشدا ناچاربێ هێرش بکاتە سەر مەدینە.

پێویستە موسڵمانان ئامادەباش بن بۆ هەر ئەگەرێک، لەبەرئەوە کەوتنە گرتنەبەری هەر تەگبیرێکی پێویست، ئەوەندەی بیریان لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) و لە خەمی ئەودا بوون بیریان لەخۆیان نەدەکردەوە، خۆشویستنی و ترس لە ژیانی ئەو وایلێکردن بەسەرە بەدرێژایی شەو پاسەوانیماڵەکەی بکەن. ئەوان بەردەوام

سازوئامادەبوون بۆ هەر بەرەنگاربوونەوەیەک، نزمترین دەنگ یان ڕووداو یان جووڵە بەس بوو بۆ ئەوە هەر هەموویان لە کۆتا پلەی حاڵەتی هەڵمەتبردندا بن.

شەوێکیان، کەسێکیان گوێی لە دەنگێک بوو، ئەویش بە هەموو دەنگی هاواریکرد، ئەمە وایکرد خەڵکی باوەڕیان لا دروست ببێت کە بێباوەڕان هەڵمەتیان هێناوە بەرەو مەدینە، زۆر بە پەلە هەموو کۆبوونەوە بێئەوەی کەس بزانێ چی ڕوودەدات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خێرا شمشێرەکەیی هەڵگرت، ئینجا سواری ئەسپەکەی بوو و ڕوویکردە ئەو شوێنە دەنگەکە لێیەوە بیسترا، ئەو(ﷺ) لە دوژمن نەدەترسا، ئەو جگە لە خوای گەورە لە کەسیتر ناترسێ، پشکنینی لە ناوچەکە کرد، کاتێک دڵنیابوو کە هیچ مەترسییەک لە ئارادا نیە، مەسەلەکەی داخست و گەڕایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ترس و تۆقینی ئەو پیاوەی هێورکردەوە کە ئاگادارییەکەی دابوو، هەروەها ئەو خەڵکانەی تریش لەو جێگایەدا بوون، پاشان ڕێنمایی پێدان کە جگە لە خوا لە کەسیتر نەترسن، تا دڵنیا نەبوو کە هەموان هاتوونەتەوە سەر باری ئاسایی خۆیان جێگاکەی جێنەهێشت، بەهەمانشێوە لە هەموو شتێکیتریشدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ئازایەتی و خۆگری لەبەردەم مەترسییەکاندا پێشەنگی موسڵمانان بوو.

## ١٤٨. شادیی و خۆشیی سەهل و سوهەیل

موسڵمانان سەرلەنوێ پێویستییان بە جێگایەک بوو تا بۆ نوێژکردن تیایدا کۆببنەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاریدا مزگەوتێک لەو پارچە زەوییەدا دروستبکات کە لە سەهل و سوهەیلی جووتە برای کڕیبوو. خێرا هاوەڵان دەستیانکرد بە پاککردنەوەی کێڵگەکە، پاشان چەند کۆمایەک خشتی قوڕینیان دروستکرد، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دەستی خۆی بەردی بناغەکەیی دانا. دوای ئەوە گەورەی پێغەمبەران(ﷺ) کەوتە ئیشکردن بەبێ وەستان، هەموو توانای خۆی خستەگەڕ تا بەزووترین کات موسڵمانان شوێنێکی پەرستشکردنیان هەبێت، کاتێک موسڵمانان ئەم گەرموگوڕییەی پێغەمبەریان(ﷺ) بینی ئەوەندەی تر وزەو هەوڵی خۆیانیان زیاتر کرد، لە ماوەیەکی کەمدا، زەوییە خاڵییەکە کە لە بنەڕەتدا هی دوو کوڕە بێباوکەکە بوو بووە شوێنی مزگەوتێکی جوان کە تا ئەمڕۆش هەر ماوە، ئەو مزگەوتە ناونرا مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەر(ﷺ). لە شوێنی مینبەرەکەدا بەشێک لە قەدی دارخورمایەکی دێرینیان دانا، بۆ ماوەیەکی زۆر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەری دەوەستاو وتاری دەدا.

ئێستە ئیتر موسڵمانان دەتوانن نوێژی بە کۆمەڵ لەو مزگەوتەدا ئەنجامبدەن. یەکەمین پێشنوێژیش تیایدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، ئەو بینایە بە تەنها مزگەوت نەبوو بەڵکو مەڵبەندی کۆبوونەوەی موسڵمانانیش بوو. ئەو میوانانەی لە شوێنانی دوورەوە دەهاتن لەوێ نوێژیان دەکردو خواردنیان دەخوارد و هەر لەوێیش دەخەوتن،

تیایدا مشتومڕ لەسەر هەموو ئەو مەسەلانە دەکرا کە تایبەت بوون بە موسڵمانانەوەو بڕیاری پێویست لەباریانەوە وەردەگیرا.

موسڵمانان دوو ژووری تریشیان خستە سەر مزگەوتەکە، ئەو دوو ژوورەش کرانەماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

لەدوای تەواوکردنی ئیش لەوانیشدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵی ئەبو ئەیوبەوە گواستییەوە ناویان، چونکە هەر لەو کاتەوە کە هاتبووە مەدینەی مونەووەرە میوانی ئەبو ئەییوب بوو. وا ئێستە ئیتر ماڵی تایبەتی خۆی هەیە. سەهل و سوهەیلیش زۆر دڵخۆشبوون چونکە مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) لەسەر زەوییەکەی ئەوان دروستکرا. کە بۆ سەدان ساڵی ئایندە موسڵمانان لە سەرتاسەری جیهانەوە ڕووی تێدەکەن بۆ نوێژکردن تیایدا.

## ١٤٩. گریانی قەدی دارخورماکە

ڕۆژانی دوای دروستکردنی مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ)، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر قەدی دارخورماکە دەوەستاو قسەی بۆ خەڵکی دەکرد. بەڵام هاوەڵان بیریان لە شێوازێکی تر کردەوە تا زیاتر ئیسراحەت بێت، هاتن مینبەرێکی سێ پلەییان بۆ دروستکرد، مینبەریش بریتییە لە شانۆیەکی بەرز کە مرۆڤ لەسەری دەوەستێ تا قسە بۆ خەڵکی بکات، بەمشێوەیە ئیتر هەموویان لە توانایاندایە چاویان لێبێت و بە شێوەیەکی ڕوون گوێیان لە گوتاری بێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پێشنیارەی ڕەتنەکردنەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە سەر پلەکانی مینبەرەکەو دەستیکرد بە ڕێنماییدان بە موسڵمانان و ڕێگیرییان لە خراپەکان، لەوێ هیچ دەنگێک نابیستری بەڵکو بێدەنگی باڵیکێشاوە بەسەر موسڵمانانداو گوێیان ڕادێراوە بۆی. لە ناوەختدا خەڵکی لە مزگەوتەکەدا گوێیان لە دەنگێکی گریان بوو، کەوتنە ڕوانین بەملاولایاندا تا بزانن چییە، بەڵام دواجار کەسێکیان نەبینی کە بگری. ئینجا بۆیان ڕۆشنبوویەوە ئەو دەنگە دەنگی قەدە دارخورماکەیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) جاران لەسەری دەوەستا. هەموویان بە سەرسوڕمانەوە دەیانڕوانییە قەدەکە، بەڕاستیش قەدەکە دابوویە قوڵپەی گریان چونکە نەیتوانی بەرگەی جیابوونەوە لە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەی بگرێ، ئەم ڕووداوە هەستی ئامادەبووانی هێنایە لەرزین زۆر کاری تێکردن بەجۆرێ ئەوانیش کەوتنە گریان.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێبیستی گریانی قەدەکە بوو،خێرا لەسەر مینبەرەکە هاتەخوارەوەو نزیکبوویەوە لێی، ئینجا دەستی پیرۆزی خستە سەری و بە سۆزو خۆشەویستییەوە سەیرێکی کرد، هەر دەستی دەهێنا بەسەریدا، تا قەدەکە هەروەک منداڵێکی بچوک هێوربوویەوە. ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) کە هەموو بونەوەران خۆشیان ویستووە، ئیتر گیاندار یان بێگیان بووبن.

پێغەمبەر(ﷺ) ئاوڕیداوە بەلای هاوەڵاندا و فەرمووی پێیان: ((ئەگەر ئاشتم نەکردایەتەوە ئەوا هەتا ڕۆژی قیامەت هەر دەگریا)).

خەڵکیش نەوە بۆ نەوە کەوتنە گواستنەوەی ئەم هەواڵە، ئەم ڕووداوە دادەنرێ بە یەکێک لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

## ١٥٠. یەکەمین بانگ

موسڵمانان وایان لێهات بتوانن لە مەدینەی مونەووەرەدا بەبێ هیچ ڕێگیری و چەوساندنەوەیەک پەرستش بۆ خوای گەورە بکەن و نوێژ بکەن.

ئیتر سەردەمی ئازاردان و سوکایەتی پێکردن بەسەرچوو، خەڵکیش وایان لێهات بە شێوەیەکی ڕێکو پێک نوێژەکانیان لە مزگەوتی پێغەمبەردا(ﷺ) ئەنجامبدەن. بەڵام تەنها یەک گرفتیان هەبوو ئەویش ئەوەبوو زەحمەت بوو کاتی نوێژەکان بزانن، لەبەرئەوە بۆ ماوەیەک لەبەردەم مزگەوتەکەدا دەوەستان تا ئەوکات یەکێک لە ژوورەوە بانگی دەکردن، زۆربەیجار ناچار دەبوون کاتی نوێژەکان ئیتر لە هەرکوێ ببوونایە بە بیری یەکتری بێننەوە. جا لەبەرئەوە ناچاردەبوون کە زوو ڕووبکەنە مزگەوت ئەوا کاتێکی زۆریان بۆ کارەکانیان لەدەست دەچوو. ئەمەش پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئاینی ئیسلامە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی ئەم نارەحەتییەیان لەسەر هەڵبگرێ، کەوتە بیرکردنەوە لە گرتنەبەری شێوازێک تا لە کاتی دیاریکراودا خەڵکی لە مزگەوتدا کۆببنەوە، لێرەوە هات ڕاوێژی بە هاوەڵان کرد، ئەوانیش هەریەکەیان ڕای خۆی دەربڕی.

یەکێکیان وتی: (با ئێمەش وەک گاورەکان زەنگ لێبدەین).

یەکێکیتر وتی: (با وەک جولەکە فوو بکەین بە کەڕەنادا).

کەسانێکیش وتیان: (با لە شوێنێکی بەرزدا ئاگرێک بکەینەوە کە خەڵکی ببینن ئەوکات بەهۆیەوە کاتی نوێژەکان دەزانین).

بەڵام هەموو ئەم پێشنیارانە نەچوون بە دڵی پێغەمبەر(ﷺ) و موسڵمانانیدا، ئا لەو ساتەدا، عومەر وتی: ئەی پێغەمبەری خوا! بۆ کەسێک نەنێرین لە کاتی گونجاودا جاڕ بەناو خەڵکیدا بدات کە کاتی نوێژە. بیلالیش ئەو کەسە گونجاوە بوو، چونکە دەنگێکی بەهێزو زوڵاڵی هەبوو. هەمووی خەڵکی دەنگی بیلالیان بەدڵ بوو و زۆریان خۆشدەویست، ئینجا هەستاو بەناو شەقامەکانی مەدینەدا دەگەڕاو بانگی دەکرد: (نوێژە! نوێژ!. حي على الصلاة! حي على الصلاة!)

لە دوای ماوەیەکی کەم یەکێک لە هاوەڵان کە ناوی عەبدوڵڵای کوڕی زەید بوو خەوێکی بینی، لەو خەوەدا، فێرکرا چۆن بانگبدات، پاشان لە خۆشیدا هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و خەوەکەیی بۆ گێڕایەوە. پێغەمبەر(ﷺ) بانگەکەی پێخۆش بوو، ئینجا داوای لێکرد بگەڕێ بیلال بدۆزێتەوەو ئەو بانگەی فێربکات، ئا بەمجۆرە ئەو هاوەڵە هەستا بیلالی فێری بانگەکە کرد، کە ئەمە شێوەکەیەتی:

الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر

أشهد أن لا إله إلا الله — أشهد أن لا إله إلا الله

أشهد أن محمداً رسول الله — أشهد أن محمداً رسول الله

حي على الصلاة — حي على الصلاة

حي على الفلاح — حي على الفلاح

الله أكبر — الله أكبر

لا إله إلا الله

عومەری کوڕی خەتتاب گوێی لەو دەنگە خۆشە بوو، بە جۆش و خرۆشەوە ڕایکرد بۆ مزگەوت و بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: (منیش هەمان ئەو خەوم بینیوە کە ئەو بینیویەتی).

لەو ڕۆژەوە، ئیتر دەنگی ئەو بانگەوازە خۆشە لە سەرتاسەری جیهاندا دەلەرێتەوە، هەموو بونەوەران دەیبیستن. گەردوونیش لە خۆشیدا هاتووەتە سەما، خەڵکیش وەڵامگۆی ئەو بانگەوازە خواییەن، مزگەوتەکان پڕ دەبن بە نوێژخوێنان، هەر بەهۆی نوێژەوە، خەڵکی دەگەنە لێواری ڕزگاری و ئاشتی کە بووتە هێمای ئیسلام و دروشمی ڕاستەقینەیەتی.

## ١٥١. خانەوادەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەدینە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاتێ کۆچیکرد بۆ مەدینەی مونەووەرە نەیتوانی ماڵ و منداڵی لەگەڵ خۆی بێنێ، هەر لە مەککە جێیهێشتن، هەرچەندە ئەوان و موسڵمانانی تریش زۆر حەزیاندەکرد لەو سەفەرەیدا یاوەری بن، بەڵام نەیانتوانی، ئەو ماوەیە زۆر بە شەوق و تامەزرۆی بە خزمەت گەیشتنی بوون، چاوەڕوانی هاتنی فەرمانێک بوون تا سەرلەنوێ بگەنەوە پێی و لەگەڵیدا کۆببنەوە، لەو پێناوەشدا ئارامیان لێبڕابوو.

فاتیمەی کچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیدەتوانی یەک ڕۆژیش لە باوکی دووربکەوێتەوە، بەڵام ئەوەتا ئێستە بۆ چەندین ڕۆژی تولانی لێی دوورە، هەموو بەیانییەک لەبەردەم پەنجەرەکەیاندا دادەنیشت و چاوەڕێی هەواڵێکی نوێ بوو، لە بێتاقەتی دووریی لێی و تامەزرۆبوونی بۆ بەخزمەت گەیشتنی نەیدەتوانی فرمێسکەکانی وشکبکاتەوە.

دواجار ئەو ژوورانە کە لە نزیک مزگەوتەکەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دروستدەکران تەواو بوون. پێغەمبەریش(ﷺ) بەهەمانشێوە تامەزرۆی بینینی ئەوان بوو، هەر بەو مەبەستە زەیدی نارد بەدوایاندا تا بیانهێنێ بۆ مەدینە، زەید خێرا ڕۆیشت بەرەو مەککە، بە نهێنی بێئەوەی کەس پێی بزانێ چوونە ناو شارەوە، کاتێ ئەندامانی خێزانەکەی پێغەمبەر(ﷺ) زەیدیان بینی، زۆر دڵخۆشبوون، چونکە ئەوە مانای ئەوەیە کە کاتی گەیشتنەوە بە پێغەمبەر(ﷺ) نزیکبووەتەوە.

عەبدواللەی کوڕی ئەبوبەکر هەستا بە یارمەتیدانی زەید، زەید بەمجۆرە توانی خانەوادەی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بێنێتە مەدینەی مونەووەرە، لە ڕێگاد تووشی هیچ جۆرە گرفت و مەترسییەک نەهاتن، لەدوای سەفەرێکی تولانی و ماندوکەر گەیشتنە شاری مەدینە. باوەشیان بەیەکتردا کردو بە شەوق و تامەزرۆیی یەکتریان ماچدەکرد. فاتیمە بەشێوەیەکی تایبەتتر زۆر کامەران بوو، چونکە لەدوای دوورکەوتنەوەی لە باوکی ئێش و ئازارو خەفەتی زۆری چەشت، بەلام کاتێ سەرلەنوێ کۆبوویەوە لەگەڵ باوکیدا هەموو ئەوەی لەبیرچوویەوە. ئافرەتانی مەدینە زۆر بە گەرمی پێشوازی خانەوادەکەی پێغەمبەریان کرد، هەستیانکرد زۆر خۆشبەختن چونکە دەیانزانی کە زۆر لە ڕێنمایی ئاینەکەیان لەو ئافرەتانەوە فێردەبن کە لەپاڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) فێربوون.



خانەوادەی پێغەمبەر لەو ژوورانەدا نیشتەجێ بوون کە بۆیان تەرخان کرابوو، بەمجۆرەش شەوقی بەرەبەیانێکی نوێ باڵیکێشا بەسەر هەمووی موسڵماناندا، چونکە ئیتر سەردەمی ئازاردان و سوکایەتی پێکردن و هەڵسوکەوتی خراپ لەگەڵیاندا کۆتاییهات، ئێستە ئازادن، لە یەک شاریشدا کۆدەبنەوە تا لاپەڕەیەکی نوێ لە ژیانیان دوور لە دەستدرێژییەکانی هاوەڵگەران دەست پێبکەن.

## ١٥٢. هاوسەگیریی خاتوو عائیشە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ)

عائیشەی کچی ئەبوبەکر بەوە ناسرابوو کە ئافرەتێکی زیرەک و توانای شت لەبەرکردنی زۆر زۆر بووە، لە فێربوونی مەسەلە نوێیەکان و جێبەجێکردنیاندا کەس لەو سەرکەوتووتر نەبووە، خاوەنی زیرکییەکی تیژو حەزکردن بە فێربوون و بەشەوقی تێگەیشتن بووە.

ژمارەیەکی زۆر لە پیاوان دەوری پێغەمبەریان(ﷺ) دابوو، ئەو هاوەڵانە لە هەر سات و هەر کاتژمێرێکی نوێدا فێری زۆرێک لە کاروباری ئاینەکەیان دەبوون، بەڵام ڕووبەڕووی گرفتێکی گەورە بوونەوە ئەویش چۆنێتی گواستنەوەی ئەوەی کە خۆیان فێری دەبوون بۆ هاوسەرو منداڵەکان بوو. هەروەها کەمێکیان ئاگاداربوون بەسەر ژیانی تایبەتی پێغەمبەردا کە لەناو ماڵەکەیدا نەبێت ئیتر ئاسان نیە ئەو شارەزاییە دەستبخەن.

پێویست بوو موسڵمانان ئەم مەسەلە تایبەتانەش فێرببن، ئایا بەیانیان چۆن لە جێگاکەیدا هەڵدەستێ، ئەو زیکرو دۆعایانە چین کە دەیانکات، چۆن نان دەخوات، چۆن پۆشاک لەبەردەکات، چۆن خۆی دەشوات، چەندین هەڵسوکەوتی تریش، کەس لەوان ئەمانەیان نەدەزانی، لە کاتێکدا کە دەیانویست پێغەمبەر(ﷺ) لە هەموو شتێکدا پێشەنگیان بێت، چونکە خۆی هەموو ئەو شتانە دەزانێت کە دەبنە مایەی ڕەزامەندی خوای گەورە. پێویستە موسڵمانانیش وەک ئەو بژین و لەسەر ڕەویەی ئەو بن(ﷺ)، بەو هۆیەوە، پێویستییان بە کەسێک بوو شارەزا بێت بەو مەسەلە تایبەتانە، کەسێکی ڕاستگۆ

و زیرەک بێت، ئەو موسڵمانانەی هەستییان بەو پێویستییانە کرد داوایان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد عائیشەی کچی ئەبوبەکر بخوازێ، چونکە عائیشە ئەگەر بێتو ببێتە هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) ئەوا لە توانایدایە یارمەتیدەرێکی گەورەی بێت لە هەموو شتێکدا، ئەو ئافرەتێکی زیرەک و ڕەوشتبەرزە، ئیسلام پێویستی بە ئافرەتێکی وەک ئەو هەیە. ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) بیخوازێ ئەوا دەتوانێ زۆرێک پێشکەش بە موسڵمانان بکات، چونکە ئەو ڕاستەوخۆ لێیەوە فێردەبێت، ئەوەی کە فێری دەبێت لەبەریشی دەکات، ئینجا دێت ئەو ڕێنماییانە فێری ئافرەتانی موسڵمان دەکات.

دوای ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) مۆڵەتی لە خوای گەورەوە پێگەیشت، پێشنیاری هاوسەرگیری عائیشەی پەسەندکرد، ڕاستەوخۆ دەستیکرد بە ئامادەباشی بۆ ڕێوڕەسمی گواستنەوە. لەدوای ئەوە عائیشە بووبە هاوسەری، عائیشە جۆرەها پرسیاری لەبارەی هەموو مەسەلەکانەوە لێدەکرد، ئەوەی خۆی فێری دەبوو ئافرەتە موسڵمانەکانیشی فێر دەکرد، بەم پێیە ئافرەتە موسڵمانەکان پرسیارەکانیان ئاراستەی عائیشە دەکردو لێیەوە وەڵامیان دەست دەکەوت و فێردەبوون. بەڕاستی هاتنی ئافرەتێکی زیرەک و بەهێز بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کاریگەرییەکی چاکی هەبوو لەسەر دەروونی هەموو موسڵمانان.

## ١٥٣. ئەهلی صوففە

لە سوچی باکوری مزگەوتی پیرۆزی پێغەمبەردا، خەڵکی ڕووبەرێکیان دانابوو کە بە پەڕی دارخورما سێبەریان بۆ کردبوو، ئا لەو شوێنەدا، هاوەڵان لە غەیری کاتی نوێژەکاندا کۆدەبوونەوە، مەسەلەی نوێ لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فێردەبوون، ئەو شوێنە پێیدەوترا (صوففە) واتە هۆڵێکی گەورە.

خەڵکی حەزیان دەکرد لە صوففەدا قسەوباس بکەن، هەروەها بوو بووە شوێنێک بۆ ئەو کەسە نەدارانە کە ماڵ و حاڵیان نەبوو، جگە لەوەش هەندێ کەس بۆ نوێژە سوننەتەکان بەکاریان دەهێنا، بەمشێوەیە صوففە بووە شوێنێک بۆ فێربوون و پەرستشکردن.

لەنێو موسڵماناندا چەند کەسێک هەبوون ژنیان نەهێنابوو، ئەو گەنجانە کەسانێکی ڕەوشت جوان بوون، بەڵام نەدار و هەژار بوون، کەچی وێڕای ئەوە هەر بەپێی توانا حەزیان لە فێربوون بوو، بە هیچ جۆر حەزیان نەدەکرد لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دووربکەونەوە، ئەو شوێنە سێبەر بۆکراوە کە لکابوو بە مزگەوتەکەوە بۆ ئەوان قوتابخانەیەک بوو، بەو هۆیەوە، نازناوی ئەهلی صوففەیان پێبەخشرا. نوێژیان دەکرد و فێری قورئان دەبوون، هەرکەسێش حەزی بکردایە ئەوان قورئانیان فێر دەکرد، جا بەو پێیە کە خۆیان ماڵیان نەبوو ئەوا لەو سوچەی مزگەوتدا جێگیربوون. بەردەوام یاوەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون، بەردەوام لێیەوە فێردەبوون، بەمجۆرە دڵیان پڕبوو لە خۆشەویستی خوای گەورەو پێغەمبەرەکەی و دڵەکانیان ڕووناکبوون بە نووری مەعریفە. ئەوانە بە دەوری

پێغەمبەردا(ﷺ) وەک ئەستێرە وابوون، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە هاوکاری دەوڵەمەندە موسڵمانەکان دڵنەوایی دەکردن، جا هەرچەندە ئەهلی صوففە زۆر هەژاربوون و برسێتی لەو کاتەدا لە مەدینەدا بڵاوبوو بەڵام ئەوان بەردەوام سەرقاڵی نوێژکردن بوون ئەمەش مەسەلەیەک بوو پێغەمبەری زۆر دڵخۆشکردبوو.

ڕۆژێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێیان: ((ئەگەر بزانن چ پاداشتێکتان لای خوای گەورە هەیە، ئەوا ئەوەتان لا خۆشەویستر بوو کە زیاتر هەژارترو نەدارتر بن)). ئەهلی صوففە باشترین هاوکار بوون بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوان لەپێناو ئیسلامدا بە حەوانەوەو ئیسراحەتی خۆیان قوربانیاندا، چونکە دەیانویست ئاینی ئیسلام لە هەموو شارو وڵاتاندا بڵاوببێتەوە، بەو هۆیەشەوە قورئانی پیرۆز بە باشی وەسفیان دەکات.

## ١٥٤. ئەبو هورەیرە

عەبدوڕەحمانی دەوسی یەکێک بوو لە ئەهلی صوففە، پشیلەی زۆر خۆشدەویست، هەرکات پشیلەیەکی ببینیایە، خێرا دەڕۆیشت و یاری لەگەڵدا دەکرد، هەروەها ئەو خواردنەی کە هەیبوو با برسیشی بوایە هەر دابەشیدەکرد لەگەڵ پشیلەکاندا، کاتێ بە شەقامدا دەڕۆیشت پشیلەکان شوێنی دەکەوتن، ئەم ڕفتارەی دڵی پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆشکردبوو، لەبەرئەوە نازناوی ئەبو هورەیرەی بەسەردا برابوو.

ڕۆژێکیان، ئەبو هورەیرە هەستی بە برسێتییەکی زۆر دەکرد، گەدەی کەوتبووە ئێش و ئازار، هیچی دەست نەدەکەوت بیخوات، بەڵام کەس بەم حاڵەی نەزانیبوو، کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە لای، پێغەمبەر سەرنجیدا کە بۆ چەند ڕۆژێکە هیچی نەخواردووە، بەسۆزێکەوە بانگهێشتی کرد بۆ ماڵەکەی خۆی، ئەبو هورەیرە بە زەحمەت ڕاستبوویەوەو کەوتە شوێن پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێ گەیشتنە جێ، ئەبو هورەیرە قاپێ شیری لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا بینی، پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو: ((بڕۆ ئەهلی صوففە بانگبکە))، ئەبو هورەیرەش ڕۆیشت و هاوڕێکانی بانگکرد، بەڵام لە دڵی خۆیدا وتی: (ئەم قاپە شیرە تەنها کەمێ شیری تێدایە، ئەسڵەن هەر بەشی منیش ناکات، ئەهلی صوففەش کەمتر لە من برسی نین، ئیتر چۆن بەشمان دەکات؟).

هەموویان ڕۆیشتن بۆ ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، پێشوازی لێکردن و فەرمووی دانیشتنی لێکردن، پێغەمبەر بە ئەبو هورەیرەی فەرموو:

((ئەی ئەبو هر! هەڵیگرەو بیاندەرێ)). ئەبو هورەیرەش فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، بە دەستی خۆی قاپەکەی دایە دەست هەموویان، گومانی وابوو کە جگە لە چەند کەسێکی کەمیان نەبێت ئیتر بەشی هەموویان ناکات. بەڵام ئەهلی صوففە هەموویان لێیانخواردەوە تا تێریان خوارد، کەمێکی لێمایەوە، دواجار، ئەبو هورەیرە قاپەکەی دایە دەستی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش پێکەنی و فەرمووی: ((ئەبو هر!)) واتە خۆی کە ئەو هاوەڵە بوو هێشتا بە برسێتی مابوویەوە وەڵامیدایەوە: (بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا)، فەرمووی: ((من و تۆ ماوین. دانیشەو بخۆرەوە)). ئەبو هورەیرەش دانیشت و ناوی خوای گەورەی هێنا پاشان خواردییەوە، بەڵام شیرەکە هێشتا هەر تەواو نەبوو بوو، ئەبو هورەیرە خواردییەوە تا تێری خوارد. پێغەمبەر(ﷺ) هەر داکۆکی لێدەکردو دەیفەرموو: ((بخۆرەوە)). دواجار ئەبو هورەیرە وتی: (سوێند بەو زاتە تۆی بە حەق ڕەوانەکردووە، جێگایەک نیە تێی بکەم). ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((پێشانمبدە)). ئەبو هورەیرەش دەفرە شیرەکەی دایە دەستی، ئەویش سوپاسی خوای کردو ناوی خوای گەورەی هێناو و ئەوەی مابوویەوە خواردییەوە.

ئەهلی صوففە زۆر سەرسامبوون بەوەی کە ڕوویدا، چونکە ئەو قاپە تەنها کەمێ شیری تێدا بوو، کەچی هەموویان تێربوون، ئەوەش موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەهلی صوففەش بە خۆشەویستی و پێ سەرسامبوونەوە زۆر سوپاسی پێغەمبەری خوایان کرد، بە سکی تێرو دەروونی قەناعەتکارو بەختەوەرەوە گەڕانەوە شوێنی خۆیان.

## ١٥٥. قوربانیدانی هاوەڵە هەژارەکە

کەسێک لە سەفەرێکی زۆر دوورەوە هات، ئەوەندە شەکەت و ماندوو بوو نەیدەتوانی تەنانەت یەک هەنگاوی تر ڕێبکات، لە برساندا دەینالاند، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، من وا بۆ چەند ڕۆژێکە برسی و ماندووم، ئایا شتێکت لایە بیدەیت پێم؟).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دڵی سوتاو بەزەییهاتەوە بە کابرای نەداردا، ناردی لەماڵەوە داوای خواردنێ بکات، بەڵام خێزان و کچەکانی هەموو ئەوەی هەیانبوو دابەشیان کردبوو بەسەر هەژاراندا، پێیانوت: (سوێند بە خوا جگە لە ئاو شتێکیتر لەم ماڵەدا نەماوە)، ئەوسا پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە ئامادەبووان کرد تا بزانێ کامیان لە توانایدایە بۆ شەوێک میوانداریی ئەو پیاوە بکات، یەکێک لە پشتیوانان وتی: من ئەمشەو میواندری دەکەم، ئینجا کابرای نەداری لەگەڵ خۆی بردەوە بۆ ماڵەوە.

لەڕاستیدا، ئەو هاوەڵە پشتیوانەش هەر کەسێکی هەژار بوو، بەڵام بەزەیی هاتەوە بە کابرای ڕێبواردا، ویستی بیحەوێنێتەوەو خواردنی بداتێ، بەتایبەت کە دەیزانی پاداشتی ئەو کارەی چەندە گەورەیە، کاتێ کابرای نەدار چووە ژوورێکەوە تا کەمێ بحەوێتەوە، پیاوە پشتیوانەکە پرسیاری لە خێزانەکەی کرد: (ئایا خواردنمان هەیە؟)، ژنەکەی بە دەنگێکی نزم وتی: (تەنها ئەوەندەمان هەیە بەشی منداڵەکان بکات). خاوەن ماڵ وتی: (ئەمڕۆ منداڵەکان سەرقاڵبکە بە شتێکی ترەوە، کاتێکیش برسییان دەبێت بیانبەرە سەر جێگاکەیان،

کاتێک لەسەر سفرەکە دادەنیشین مۆمەکە بکوژێنەرەوە با میوانەکە وابزانێ ئێمەش لەگەڵیدا دەخۆین، ئینجا لێیگەڕێ با سکی تێر بکات).

ژنەکەی ئەو داوایەی مێردەکەیی جێبەجێ کرد، منداڵەکانی برد تا زوو بیانخەوێنێ، کاتێک خواردنەکەی خستە بەردەم میوانەکە هەستایەوەو مۆمەکەی کوژاندەوە، جگە لە شەوقی مانگ نەبێت هیچ ڕۆشنایی تر لە ژوورەکەدا نەبوو، ژن و مێردەکەش لەسەر سفرەکە دانیشتن، وایان گەیاند گوایا ئەوانیش هەر خەریکی نانخواردنن، بەهۆی تاریکیشەوە میوانەکەش هەر وایدەزانی ئەوانیش نانی لەگەڵدا دەخۆن، کابرا دەستیدایە خواردن تا تێربوو، کەچی ژن و مێردەکەی هەروەک چۆن بە برسێتی دانیشتن هەر بە برسێتیش لەسەر سفرەکە هەستان.

بۆ بەیانی، میوانەکە لە خەو هەستا کە تێرو دڵ ئیسراحەت بوو، ئینجا کابرای پشتیوان چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە سەیرێکی کرد وەک بڵێی زانیویەتی کە شەوی ڕابردوو چی گوزەراوە، پاشان بە پشتیوانەکەی فەرموو بەهۆی ئەو کارەوە کە شەوی ڕابردوو ئەنجامیانداوە خوای گەورە لە خۆی و لە ژنەکەی ڕازییە.

ئەوکات پشتیوانەکە زۆر زۆر دڵخۆشبوو و لە ناخی دڵییەوە سوپاسی خوای گەورەی کرد.

## ١٥٦. کۆیلەیەک ئازاد دەکرێ

پیاوێک هەبوو بەناوی ئەبو مەسعود زۆر تووڕە بوو لەگەڵ خزمەتکارەکەیدا، بە قامچی بە توندی کەوتە ویژەی، شەقەی قامچییەکەی لە دوورەوە دەبیسترا، چونکە زۆر بە توندی ئازاری دەدا، بێئەوەی تووڕەییەکەی دامرکێ، خزمەتکارەکە لە تاو ئازاردا کەوتە قیژاندن و ئاهوناڵە، بەڵام ئەبو مەسعود قامچییەکەی جار لەدوای جار بەرزتر دەکردەوە، لەو ساتەدا لە دواوەی گوێبیستی دەنگێک بوو دەیوت: (بزانە ئەبو مەسعود، بزانە ئەبو مەسعود). لەناکاودا قامچییەکە لە دەستی کەوتە خوارەوە، بەڵام تووڕەییەکەی هەر دانەمرکایەوە، سەرچاوەی دەنگەکەی فەرامۆشکردو سەرلەنوێ دەستیدایەوە قامچییەکە، بەڵام ئەمجارەش هەر گوێبیستی دەنگێک بوو دەیوت: (بزانە ئەبو مەسعود، بزانە ئەبو مەسعود)، بەخۆی دەوت ئایا دەبێ کێبێت وا بانگی دەکات، ئینجا ئاوڕیدایەوە، کاتێک قسەکەرەکەی ناسی لە زۆر سەغڵەتبووندا سورهەڵگەڕا، چونکە ئەوە کەسە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو کە بانگی دەکرد، لەوێدا ئەبو مەسعود هەستی بە تاوان کردو کاتێک پێغەمبەری خوا لێی نزیکبوویەوە ئەو سەری بۆ دانەواند.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((بزانە ئەبو مەسعود کە خوای گەورە توانای بەسەر تۆدا زیاترە لە توانای تۆ بەسەر ئەو خزمەتکارەدا)). ئەوکات ئەبو مەسعود لە هەڵەی خۆی تێگەیشت و هەستی بە پەشیمانی دەکرد. بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: (ئەی پێغەمبەری خوا وا لەبەرخاتری خوا ئەو ئازادە، سوێند بەو زاتە

تۆی بە هەق و ڕاستی ڕەوانەکردووە ئیتر لەدوای ئەمەوە لە هیچ بەندەیەک نادەم).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بە ئازادبوونی ئەو کۆیلەیە کە ڕزگاری بوو لە ستەم، بەندەکەش وەها هەستیدەکرد کە تازە لەدایکبووە، بەهۆی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ڕزگاری بوو لە لێدان، ئازادی وەرگرت، بە پێزانینەوە سەیری پێغەمبەری کردو لە ناخی دڵییەوە سوپاسیکرد.

## ١٥٧. ڕزگاربوونی کۆیلەکان لە ستەملێکردن

دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) هۆشداریدا بە ئەبو مەسعود لە سەرئەنجامی خراپی ستەمکردن لە خزمەتکارەکەی و قامچی لێدانی، ئەبو مەسعود هەستا بە ئاگادارکردنی هاوڕێکانی لەوەی کە ڕوویدا. هەموویان ترسیان لێنیشت چونکە ئەوانیش هەر ئازاری بەندەکانی خۆیانیان دەدا، لەپێش ئەو ڕووداوەوە نەیاندەزانی کە دەبێت چۆن هەڵسوکەوتیان لەگەڵ بکەن.

لەبەرئەوە، کۆبوونەوەو ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، یەکێکیان پرسیاری لێکردو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی پێغەمبەری خوا تا چ ئاستێ لێببورم لە خزمەتکارەکەم). پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاوڕی لێدایەوەو بە لەسەرخۆیی و بە لێبڕانەوە فەرمووی: (هەموو ڕۆژێ حەفتا جار)). ئامادەبووان بە سەرسامییەوە کەوتنە سەیرکردنی یەکتری، چونکە تا ئەو ڕۆژە کۆیلەکانیان ناچار دەکرد لەسەر کارکردن لە بارودۆخێکی سەختدا. سوکایەتییان پێدەکردن و لێیان دەدان. بەڵام ئێستە فێردەبن کە ئەو ڕەفتارەیان چەندە هەڵە بووە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوامبوو لە گوتەکانیداو فەرمووی: ((ئەوانە براتانن، خوای گەورە خستوونیەتە ژێردەستی ئێوە، خۆتان چی دەخۆن لەوەش دەرخواردی ئەوان بدەن، چی دەپۆشن هەر لەوەش ئەوان پۆشتە بکەن، زیاد لە توانایان ئەرک نەخەنە سەرشانیان، هەرکارێکتان پێسپاردن خۆیشتان یارمەتییان بدەن)).

موسڵمانان گوێیان گرت بۆ گوفتارەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دواتر هەستان ڕۆیشتن و بە وردی بیریان لە ڕێنماییەکان

دەکردەوە. ئیتر لەو ڕۆژەوە، دەموچاوی کۆیلەکان ڕۆشن و گەشبین بوون، بەجۆرەها شێوە بەختەوەریی باڵیکێشا بەسەر ماڵ و حاڵی موسڵمانانداد، چونکە کۆیلەکانیان نەدەکەوتنە بەر ستەملێکردن، خەڵکیش ئەوەندە تورە نەدەبوون کە بێن لێدانی کۆیلەکانیان بکەن، دەستیان هەڵگرت لەوەی وەک خزمەتکار هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکەن، وایان لێهات وەک منداڵی ماڵی خۆیان حیسابیان بۆ دەکردن، بەڕاستی جوانیی ئەم باوەڕو ئاینە درێژبوویەوە بۆ دڵی خەڵکی بۆ چەندەها سەدەی دواتر. هاوڕا لەگەڵ ئەو سیستەمەدا کە پێغەمبەری خۆشەویستمان دایمەزراند ئاشتی و بەختەوەریی هەموو شوێنێکی گرتەوە.

## ١٥٨. زەید دەست لە ئەسپە خۆشەویستەکەی هەڵدەگرێ

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی هاندەدا بۆ خێرو چاکەکردن، زۆربەیجار ئەم ئایەتە پیرۆزەی دووبارە دەکردەوە کە دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ...﴾ (آل عمران: ٩٢) زەید چەند جارێک گوێبیستی ئەو ئایەتە پیرۆزە بوو، ئەسپێکی هەبوو زۆری خۆشدەویست پێیدەوت سەبەل، خێرا ڕۆیشت و هێنایەوە. ڕەشۆی ئەسپەکەیی دا بە پێغەمبەر(ﷺ) و وتی: (ئەمە لەپێناوی خوای گەورەدا).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بەو کارەی زەید و بە قوربانیدانێکی گەورەی نرخاند. ئەو دەیزانی کە زەید چەندە ئەسپە سەبەلەکەی خۆی خۆشدەوێت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خێرەکەی لێ قوبوڵکرد، زۆری نەخایاند دواتر پێغەمبەر(ﷺ) دای بە ئوسامەی کوڕی زەید، زەید زۆر بەلایەوە سەیر بوو و زۆری پێناخۆش بوو، پاشتر هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پرسیاری لێکرد: (ئەی پێغەمبەری خوا ، ئایا خوای گەورە خێرەکەمی وەرنەگرتووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: بەڵێ وەریگرتووە. ئینجا زەید بە دڵێکی پڕ لەخۆشییەوە ڕۆیشت.

## ١٥٩. خۆشترین ڕۆژەکانی مەعاز

مەعازی کوڕی جەبەل پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگیکرد تا لە پشتییەوە سواری وشترەکە ببێ، مەعاز بەم کارە زۆر دڵخۆشبوو.

لەدوای ماوەیەکی کورت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەی مەعاز ئایا دەزانی مافی خوا لەسەر بەندەکانی کامانەن، وە مافەکانی بەندەکانیش لەسەر خوای گەورە کامانەن)). مەعاز وتی: (خواو پێغەمبەرەکەی دەزانن). فەرمووی: ((مافی خوا لەسەر بەندەکانی ئەوەیە بیپەرستن و هیچ هاوەڵێکی بۆ بڕیار نەدەن، مافی بەندەکانیش لەسەر خوای گەورە ئەوەیە سزای کەسێک نەدات هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار نەدات)). ئینجا مەعاز پرسیاری لێکردو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئایا ئەم مژدەیە بدەم بە خەڵکی). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((مژدەیان مەدەرێ چونکە پاڵی لێدەدەنەوە)). پێغەمبەری خوا ترسا لەوەی خەڵکی پشت بە ڕەحمەتی خوا ببەستن و ئەوکات لە پەرستشەکانیاندا شلگیر ببن.



لەدوای برینی ماوەیەکی کورت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و مەعاز لەسەر پشتی وشترەکە هاتنە خوارەوەو لە شوێنێکدا دانیشتن، مەعاز زۆر زۆر بەختەوەر بوو، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) دەیویست بەختەوەرتری بکات، ئینجا دەستی گرت و سەیرێکی کرد، پاشان فەرمووی: ((ئەی مەعاز! من لەبەر خوای گەورە تۆم خۆشدەوێت!)). ئەم گوتەیە زۆر کاریگەربوو لەسەر مەعاز و فرمێسک بەسەر کوڵمەکانیدا هاتنە خوارەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئەم ئامۆژگاریەی

پێداو فەرمووی: ((با چەند وشەیەکت فێربکەم تا لەدوای تەواوبوونی هەر نوێژێک بیانڵێیت، بڵێ: پەروەردگارم یارمەتیم بدە لەسەر زیکرکردن و سوپاسکردن و جوان ئەنجامدانی پەرستشەکانت)).

مەعاز لەوە بەدواوە ئیتر بەدرێژایی ژیانی ئەو ڕووداوەی لەبیر نەچوویەوە کە لەو ڕۆژە خۆشەدا ڕوویدا. بەردەوام ئەو دۆعایەی لەدوای هەموو نوێژێک دەخوێند کە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فێری بوو بوو. هیچ جۆرە زەحمەت و سەغڵەتییەکی لە پەرستنی خوای گەورەدا نەدەبینی.

## ١٦٠. دڵخۆشبوونی نەدارەکە

هەموو بێباوکان و هەژاران و لاوازو پەککەوتەکان، ئەوانەی لە مەدینەی مونەووەرەدا دەژیان، کەسانێکیان بۆ ڕەخسان بیانخەنە پەنای خۆیانەوە، چونکە خۆشەویستی و سۆزیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) زامەکانی سارێژکردبوون. بەو هۆیەوە، پێغەمبەریان بە تەنها نەهێشتەوە.

کەسێکی نەدار هەبوو کە زۆر سەختی و ناڕەحەتی بەسەردا هاتبوو، جگە لە هەژاریی و برسێتی گەیشتبووە پلەی پەککەوتەیی، هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و حاڵی خۆی بۆ باسکرد، ئینجا داوای یارمەتی لێکرد، پێغەمبەریش زۆر بەباشی گوێی بۆ کابرا گرت، پاشان بیریکردەوە تا ڕێگاچارەیەک بۆ حاڵی بدۆزێتەوە، خوای گەورە فەرمانی بە خەڵکیداوە کاربکەن و ڕەنجبکێشن، دەیەوێت بچنەژێر ئەرکی بەرپرسێتی ماڵ و منداڵیان، لەبەرانبەر ئەو ڕەنج و زەحمەتەیانەوە پادشتی گەورە وەربگرن، پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە کابرای نەدار کرد: ((ئایا هیچ لە ماڵەکەتدا هەیە؟)) کابرا وتی: (بەڵێ، پۆشاکێکمان هەیە، هەندێکی لەبەردەکەین و هەندێکی ڕادەخەین، هەروەها جامێکمان هەیە ئاوی تێدا دەخۆینەوە). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بیانهێنە بۆم)). کابرا خێرا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەکەی و دەفرەکەو پۆشتەکەرەکەی هێنا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرتنی بەدەستییەوەو هاواریکرد: ((کێ ئەم دووانە دەکڕی؟))، کەسێک وتی: (من بە یەک پەنجایی هەردووکیان هەڵدەگرم). ئەو نرخێکی کەمی لەسەر دانان، پێغەمبەر(ﷺ)

سەرلەنوێ هاواریکرد و فەرمووی: ((کێ زیاتر دەدات؟)). پیاوێکی تر وتی: (من بە دوو پەنجایی هەڵیاندەگرم). ئینجا شمەکەکانی کابرای نەداری کڕی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوو پەنجاییەکەی دا بە کابرا، فەرمووی پێی: ((بە پەنجاییەکیان خواردن بکڕەو بیدەرە خێزانەکەت، بەویتریان تەورزینێک بکڕەو بۆم بێنە)).

پیاوەکە هیچ تێنەگەیشت، بەڵام ئەو فەرمانەی پێغەمبەر(ﷺ) پێیکرد بەجێیگەیاند، هەندێ خواردەمەنی کڕی و بە ئەویتری تەورزینێکی کڕی. پاشان هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) دەسکێکی بۆ تەورزینەکە کرد و فەرمووی: ((برۆ چیلکە کۆبکەرەوەو بیفرۆشە، تا پازدە ڕۆژیتر نەتبینم)).

کابرا ڕۆیشت، دوای دوو هەفتە هاتەوەو زەردەخەنە لەسەر ڕوخساری بوو. پێغەمبەر(ﷺ) بە بینینی دڵخۆشبوو و پرسیاری لێکرد کە چیکردووە. کابرا وتی: (هەندێ چیلکەم بەو تەورزینە کە پێتدام کۆدەکردەوە، پاشان دەمبردە ناوشارو لە بازاڕ دەمفرۆشت، لە ماوەی دوو هەفتەدا پارەیەکی زۆرم دەستکەوتووە، هەندێ خواردن و پۆشاکم بۆ خێزانەکەم کڕیوە). پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: ((ئەمە چاکترە بۆت لەوەی بێیت داوا لە خەڵک بکەیت و دواتر لە قیامەتدا ببێتە خاڵێک بەنێو چاوانتەوە)).

ئەم کابرا نەدارە ڕێگای خۆی بۆ دەستخستنی بژێوی خۆی دۆزییەوە بێئەوەی ببێتە بار بەسەر کەسیترەوە. هیچ بەڕادەی ئەوە جوان نیە مرۆڤ بە ئارەقی نێوچاوانی خۆی ڕزق و بژێوی خۆی پەیدا بکات. ئەم پیاوە بەهۆی ڕێنمایی و حیکمەتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە هەژاری ڕزگاری بوو.

## ١٦١. سەلەمەو مالومەکە

لەوکاتـەوە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هاتبـووە مەدینـەی مونـەووەرە، هـەر ڕۆژێـک کـە بەسـەر خەڵکەکەیدا تێدەپەڕی ڕۆژێکی نـوێ بـوو و لـە ڕۆژی ڕابـردوو خۆشـتر بـوو. موسـڵمانان لەزەتیان دەبرد لـەو بەختەوەرییـە کـە باڵیکێشـا بەسـەریاندا. دەیانویسـت ئـەو جوانیـی و خۆشـییەی ئیسـلام بۆیهێنـاون خەڵکانیتریـش بەشـداربن لەگەڵیانـدا. ئەوەندەی لـە تواناییاندا بـوو بەخەرجیاندا تـا خەڵکی فێری ئاینەکەیان بکـەن و بانگهێشـتییان بکـەن بـۆ باوەڕهێنـان پێـی.

ڕۆژێکیـان، یەکێـک لـە گەنجەکانـی مەدینـەی مونـەووەرە قسـەی لەگەڵ مالومێکی جولەکـەدا دەکرد، گەنجەکە کە نـاوی سـەلەمە بـوو ویستی گوتەیەکی مالومەکـە بـە بیـری بێنێتـەوە کـە جارێکیـان خـۆی کردبووی، بۆیـە پێیـوت: (ئایا بـە بیرت دێت چـۆن پێش چەند سـاڵێک لەبەردەم ماڵەکەماندا وەستایت و وتارت بۆ خەڵکی دەدا، بەشێوەیەکی وەهابـوو کـە زۆر کاری تێکـردم، مـن هەرگیـز ئـەو گوتـارەی تـۆم لەبیرناچێـت). مالومەکـە لەگـەڵ ئەوانـەی بەدەوریـدا بـوون بەجوانـی گوێـی لـە سـەلەمە گرتبـوو، سـەلەمە بەردەوامبـوو و وتـی: (ئێمـە بـە سەرسـوڕمانەوە گوێبیسـتی ئـەوە بوویـن کـە دەتوت، تۆ ئاماژەتدا بـە مەککـەو وتـت بەدڵنیایـی کـە پێغەمبەرێـک لـەوێ پەیـدا دەبێـت، ڕۆژێ لـە ڕۆژانیـش دێـت بـۆ مەدینـە، هەروەهـا وتـت دەیسـەلمێنێ کـە تـۆ –واتـە مـن– لەسـەر هـەق و ڕاسـتیت. ئایـا ئـەو کەسـە تـۆ نەبوویت؟ مالومەکە وەڵامیدایەوە بە: (بەڵـێ، مـن ئـەوەم وت). (هەروەهـا وتـت کـە خۆیشـت شـوێنکەوتەی ئـەو پێغەمبـەرە دەبێـت و هـاوکاری دەکەیـت،

ئایا وانیە؟) مالومەکە وتی: (بەڵێ). سەلەمە وتی: (دەی ئەوەتا ئەو پێغەمبەرە هاتووە، ئێستە لەناوماندایە، ئەی بۆ باوەڕی پێناهێنی؟)، مالومەکە وەڵامیدایەوە: (چونکە لە ئێوەیە. ئەمە ئەو پێغەمبەرە نیە کە چاوەڕوانی هاتنیمان دەکرد).

ئای چ وەڵامێکی گەوجانەیە، هەر ئەو مالومە کە خەڵکی ئاگادارکرد بە هاتنی پێغەمبەر ئێستە بووەتە کەسێکی گێرو قیرسیچمە. باوەڕیشی پێنەکرد تەنها لەبەرئەوە لە قەومەکەی ئەو نیە. سەلەمە ئەوەندە توڕەبوو دەموچاوی سورهەڵگەڕا، بەڵام دانی بەخۆیدا گرت و بەجێیهێشت، بەڵام مالومەکە کە ڕەتیکردەوە باوەڕ بە پێغەمبەر(ﷺ) بێنێ باش باش دەیزانی کە هەر خودی خۆی پێشبینی بە هاتنی داوە.

## ١٦٢. ئەنەس لە ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

شاری مەدینە بە خۆشترین و جوانترین ڕۆژەکانیدا تێدەپەڕی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆشەویستی و بەخشندەیی و بەزەیی بە دەوری خۆیدا بە هەموولایەکدا بڵاودەکردەوە. موسڵمانان بە هیچ جۆر حەزیان نەدەکرد دووربکەونەوە لێی، بەڵکو دەیانویست کاتێکی زیاتر لە خزمەتیدا بەسەربەرن، تا تێر سەیری بکەن، گوێ بۆ وشە فێنککەرەوەکانی بگرن، ئەوان دەستە دەستەو پۆل پۆل دەهاتنە خزمەتی، دیاری جۆراو جۆریان بۆ دەهێنا، خۆشەویستی خۆیان بەوە بۆ دەردەبڕی کە دەعوەتیان دەکرد بۆ ماڵەکانی خۆیان.

ئافرەتێکی هەژار و نەدار هەبوو بەناوی دایکی سولەیم، لەدوای مردنی مێردەکەی، منداڵەکەیی گرت بەدەستییەوەو هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ). دڵی منداڵە بچوکەکە بە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێیدەدا، هەستی وەهابوو وەک بڵێی وا لە خۆشیاندا دەفڕێ بە ئاسماندا.

دایکی سولەیم وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! هیچ پیاو و ئافرەتێک لە پشتیوانان نەماوە دیارییەکی بەنرخت بۆ نەهێنێ، منیش جگە لەم کوڕەم شتێکی ترم نیە تا بیکەمە دیارییەکی بەنرخ بۆت، لێم وەربگرە، با تا خۆت پێتخۆشە خزمەتت بکات).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خێری ئافرەتەکەی پێخۆشبوو، بە سۆزو خۆشەویستییەوە سەیری ئەنەسی کرد، ڕوون و ئاشکرایە کە ئەو منداڵە بچوکە ئاواتەخوازە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بێت و خزمەتی بکات. ئەنەسیش هەستیکردو وەک بڵێی بە چاوانی بڵێ:

(ئەی پێغەمبەری خوا ئاواتەخوازم وەرمبگری، لێمگەڕێ با لەگەڵتدا بمێنمەوە، هەرگیز لێت جیانەبمەوە، ئەگەر قوبوڵت بێت، ئەوا دەبمە بەختەوەرترین منداڵ لەم جیهانەدا).

ئەنەس و دایکی چاوەڕێی وەڵامی پێغەمبەریان دەکرد، چۆن دەبێ پێغەمبەری خۆشەویستی و پێکەوەژیان ژیان لەگەڵ کەسانێکدا ڕەتبکاتەوە کە دەیانەوێ لە نزیکییەوە بژین؟ چۆن دەبێ گومانی ئەو منداڵە جوانە کە دەیەوێ یاوەری بێت نائومێد بکات؟ کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ڕەزامەندی دا لەسەر داواکەی دایکی ئەنەس، خۆی و کوڕەکەی زۆر دڵخۆشبوون، چونکە ئەوە بەواتای هاوەڵێتی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، بە واتای ژیان بردنەسەرە لە ماڵەکەیدا، لە نزیکەوە ناسینیەتی تا شوێنکەوتەی بێت لە گوفتارو لە کردارەکانیدا، ئەوەش هەلێکە هەرگیز دووبارە نابێتەوە، ئەنەس زۆر دڵخۆشبوو چونکە لە پەنای باوک و پێغەمبەرێکدا دەژی.

دایکی ئەنەس بە تەواوی ڕەزامەندییەوە ڕۆیشت چونکە جگەرگۆشەکەی لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) داناوە، مەعلومە ئەنەس هەرکات بیەوێت دەتوانێت دایکی ببینێ، چۆن حەزبکات وەها لەگەڵیدا بژی، بەڵام هەرجۆرە دوورکەوتنەوەیەکی با بۆ یەک ساتیش بووبێت لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەتکردەوە.

## ١٦٣. ئەنەس لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

ئەنـەس لـە صوففـە نزیـک بـە ماڵـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) نیشـتەجێ بـوو، بەیانیـان لەپێـش هەمـوو ئەوانیتـرەوە لـە خـەو هەڵدەسـتاو دەچـوو بـۆ خزمەتکردنـی پێغەمبـەر(ﷺ)، پاشـان لـە پشـتییەوە نوێـژی دەکـرد، باوکـی ئەنـەس چەنـد سـاڵێک لـەوەو پێش مردبـوو، هەسـتکردن بە بێباوکی دڵی ئەنەسی پڕکردبوو لە غـەم و پـەژارە. بـەڵام لـە ئێسـتە بـەدواوە، ئیتر کەسـێکی هەیـە کـە خۆشـیدەوێ و هـەروەک باوکـی بێـت پارێـزگاری لێدەکات. بوونـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) ئـازاری لەدەسـتدانی باوکـی لەبیری ئەنـەس بردبـووەوە، زۆر بەختـەوەر بـوو، پێغەمبەریـش(ﷺ) فێـری دەکـردو بـە جوانـی پـەروەردەی دەکـرد. چونکـە دەیویسـت ببێتـە پیاوێکـی زیـرەک و ڕەوشـتبەرز بێـت.

کات بـۆ کات، پێغەمبـەر(ﷺ) ئامـۆژگاری دەکـرد کـە سـڵاو لـە خەڵکی بکات و لەنێوان خەڵکیدا بڵاوەی پێبکات. پیاوێک لێی پرسـی: کام ئیسـلامەتییە چاکـە؟ پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: (نـان دەرخـواردی خەڵکـی بدەیـت، سـڵاو لـە هەمـوو ئەوانـە بکەیـت کـە دەیانناسـی و ئەوانـەش کـە نایانناسـیت)).

بە حوکمـی ئـەو پەیوەندییە پتـەو و خۆشەویستییە کە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) و ئەنەسـی کۆکردبـووەوە، پێغەمبـەر(ﷺ) گاڵتـەی زۆری لەگەڵدا دەکرد، بۆ نمونە نازنـاوی (خـاوەن دوو گوێیەکە)ی بەسـەردا بڕیبـوو چونکـە بەوپـەڕی ئاگاییـەوە گوێـی بـۆ دەگـرت، هـەرکات بـەو نازنـاوەوە بانگـی بکردایـە ئەنـەس پێکەنیـن دەیگـرت.

پێغەمبەر(ﷺ) وشەکانی خۆی هەروەک شتێک لە دڵی ئەنەسدا بچنێ چین چین دەیچنین، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەموو ئوممەتی من دەچنە بەهەشت جگە لە کەسێ کە خۆی نەیەوێت،... هەرکەس گوێڕایەڵم بێت دەچێتە بەهەشت، هەرکەسیش سەرپێچیم بکات ئەوا نایەوێت)). لەدوای بیستنی ئەم فەرموودەیە ئەنەس بڕیاریدا گوێڕایەڵی پێغەمبەر(ﷺ) بێت لە هەموو فەرمانەکانیداو هەر شتێک کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕاهاتبوو لەسەر ئەنجامدانی ئەویش پراکتیزەی بکات لەخۆیدا، ئەمەش پێیدەوترێت (سوننەت).

ئەنەس لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەموو شتێک فێربوو تەنانەت چۆنێتی ئاوخواردنەوەش، چونکە خواردنەوەی ئاو بە سێ وچان باشترین شێوازە بۆ نەهێشتنی تینویەتی. ئەمەش تەندروستترە، ئەنەس بەدرێژایی تەمەنی سوننەتی پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەخۆیدا جێبەجێ کرد، بە تێپەڕبوونی کات بۆی مەعلوم بوو ژیان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) گەنجینەیەکی وەها گەورەیە کە هاوشێوەی نەبووەو نیە.

## ١٦٤. گەشتی ئەنەس لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ)

پێغەمبەر(ﷺ) هەندێجار کە دەڕۆیشت بۆ سەفەر ئەنەسی لەگەڵ خۆی دەبرد، لەو کاتانەدا، هەندێ لە شتە چاک و جوانەکانی فێردەکرد، ئەنەسیش لە زەینیدا تۆماری دەکردن و هەوڵیدەدا دەقاو دەق جێبەجێیان بکات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیویست ئەنەس لە ژیانێکی خۆش و ڕەزامەندا بژی، ئەو(ﷺ) دەیفەرموو: ((ئەوە بزانن کە چاکترینی کارەکانتان نوێژە، جگە لە موسڵمان کەسیتر پارێزگاری لە دەستنوێژ ناکات)). هەروەها دەفەرموێ: ((هەر کەسێک بە دەستنوێژەوە بخەوێت ئەوا فریشتەیەکی لەگەڵدایە، لە هەر کاتێکی شەودا ئەمدیو و ئەو دیو بکات فریشتەکە دەڵێ: خوایە لەم بەندەیەت خۆشببە، چونکە ئەو بەدەستنوێژەوە خەوتووە)).

ئەنەس زۆر سەرسام بوو بە شێوازی نوێژکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەیویست وەک ئەو نوێژ بکات، ئەمانە چەند ڕێنماییەکی پێغەمبەرن(ﷺ) لەبارەی نوێژەوە کە دەفەرموێ: ((هەرکات چوویتە ڕوکوعەوە، هەردوو ناولەپت بخەرە سەر ئەژنۆکانت و پەنجەکانت لەیەک دووربگرە، دەستەکانت دووربن لە لاشەتەوە، کاتێ سەرت لە ڕوکوعەوە بەرزکردەوە هەر پارچەیەکی جەستەت لە شوێنی خۆیدا بوەستێنە واتە ڕێک بوەستە، چونکە خوای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا سەیری ئەو کەسە ناکات کە لە ڕوکوع و سوژدەیدا ڕاستنابێتەوە، هەرکات چوویتە سوژدەوە با سوژدەکەت دنوکدان نەبێت لە زەوی هەروەک چۆن کەڵەشێر هەر دنوک لەدوای دنوک دەدات بە زەویدا، وەهاش ڕامەکشێ هەروەک چۆن سەگ پاڵدەکەوێ، نەکەی وەک

شێریش بێت کە هەردوو باڵی تەختی زەوی دەکات، وریابە نەکەی وەک ڕێویش هەر لە ئاوڕدانەوەدا بێت)).

ئەنەس بێزار نەدەبوو لە گوێگرتن بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، حەزی بەوە بوو کە هەرگیز پێغەمبەر لە قسەکردن نەوەستایە، ئەمەش بۆ ئەوە بوو تا بەردەوام لێیەوە فێرببێت، پێغەمبەر(ﷺ) دەیفەرموو: ((لە ئێمە نیە هەرکەس بەزەیی بە بچوکماندا نەیەتەوە، ڕێز لە گەورەمان نەگرێ، ڕێزی زانامان نەزانێت، هەرکەس ساختەمان لێبکات لە ئێمە نیە، کەستان باوەڕی تەواو نیە تا ئەو چاکەیەی بۆ خۆی پێیخۆشە بۆ براکەشی پێیخۆشبێت)).

ئەنەس بەڵێنی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا تا لەژیاندایە هەموو ڕێنماییەکانی جێبەجێ بکات. ئەو لەسەر ڕەویەی پێغەمبەر(ﷺ) ژیانی خۆی بردەسەر، هەوڵیدا هەموو سوننەتەکەی بەتەواوەتی جێبەجێ بکات، بەڕاستی ئەنەس لە واتای بەختەوەریی ڕاستەقینە تێگەیشت، کوڕێکی خۆشبەخت بوو.

## ١٦٥. ئەنەس نهێنی پارێزە

ئەنەس لەگەڵ هاوەڵانیدا لە شەقامەکانی مەدینەی مونەووەرەدا یاری دەکرد. دەنگە دەنگی منداڵان و پێکەنینەکانیان لە هەموو شوێنێک دەنگیدەدایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە لایان، بۆیان پێکەنی و سڵاوی لێکردن.

پاش ماوەیەکی کەم، بانگی ئەنەسی کردو داوای لێکرد بڕوات بۆ شوێنێک، بەڵام ئەنەس سەرقاڵی یاریکردن بوو. دوای ڕۆیشتنی پێغەمبەر(ﷺ)، گەڕایەوە بۆ درێژەدان بە یاریکردن، ئەوەی لەبیرچوو کە داوای لێکرابوو، دوای کەمێک، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە بۆ لای تا بزانێ ئایا داواکەی جێبەجێ کردووە یان نا. ئەوکات ئەنەس بیریکەوتەوە و وتی هەر ئێستە دەڕوات، ئینجا یارییەکەی جێهێشت و خێرا ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنە پێغەمبەر(ﷺ) ناردبووی. پێغەمبەریش(ﷺ) چاوەڕێی گەڕانەوەیی دەکرد.

کاتێ ئەنەس گەڕایەوە، ئێوارە بوو، دایکی تێڕاما لە دواکەوتنی گەڕانەوەی، پرسیاری لێکرد: (کوڕەکەم، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ کوێی ناردی)، وەڵامیدایەوە: (دایە، ئەوە نهێنییە لەنێوان من و پێغەمبەردا(ﷺ)، ناتوانم بۆ کەسی بدرکێنم). ئەوکات دایکی زۆری پێخۆشبوو و زیاتر هانیدا و پێیوت: (ئافەرین کوڕەکەم، نهێنی پێغەمبەر بۆ کەس نەدرکێنی).

پاراستنی نهێنی زۆر گرنگە، ئەو مرۆڤەی کە نهێنی دەپارێزێ کەسێکی ئەمینەو شایانی متمانە پێکردنە، بەو هۆیەوە، ئەنەس ئەو نهێنییەی پاراست کە پێی سپێردرا، هەرگیز نەیدرکاند بۆ هیچ کەس.

## ١٦٦. بەڵێنی بەیەکگەیشتن لە بەهەشتدا

ئەنەس لە منداڵیدا بەردەوام لە بیرکردنەوەدا بوو، خولیای زیاتر زانین تیایدا وای لێکردبوو هەندێ مەسەلە بوروژێنێ، بۆ نمونە، کاتێ ڕۆژی لێپرسینەوە دەستپێدەکات و خەڵکی کۆدەکرێنەوە تا چاکەو خراپەکانیان بە تەرازووی دادپەروەری کێشانە بکرێن، مرۆڤ چیبکات؟ بۆ کوێ بڕوات؟ هاوار بۆ کێ ببات؟ ئایا پێغەمبەر(ﷺ) دەبینێ؟ جا ئەگەر بینی ئەوا هەندێ مەسەلە لەسەری سوک دەبێت.

دواجار، چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەوەی لە مێشک و ناخیدا دەهات و دەچوو بۆی باسکرد. پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو بەڵێنیدایێ لە ڕۆژی قیامەتدا شەفاعەتی بۆ بکات، ئەنەس تا ڕادەیەک بەمە دەروونی حەوایەوە. بەڵام دووبارە پرسیاری لە پێغەمبەر(ﷺ) کردەوەو پێیوت: (ئەی لەکوێ بتبینم؟).

پێغەمبەری خوا وەلامیدایەوە کە: ((یەکەمجار لەسەر پردی صیراط دەمبینی)). ئەنەس وتی: ئەی ئەگەر لەسەر پردی صیراط بە خزمەتت نەگەیشتم؟ فەرمووی: ((لای تەرازووەکە)). ئەنەس دەڵێ وتم: (ئەی ئەگەر لای تەرازووەکە نەمبینیت؟، فەرمووی: ((لای حەوزەکە دەمبینی، من لەو سێ شوێنە تێناپەڕم)).

صیراط پردێکە لە ڕۆژی مەحشەردا دادەنرێ، مەحشەریش ئەو شوێنەیە کە هەموو ئادەمیزادەکان هەر لە سەردەمی ئادەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) هەتا ڕۆژی قیامەت لەوێ تیایدا کۆدەبنەوە.

تەرازوو، ئەو شایەنەیە کە لە ڕۆژی قیامەتدا چاکەو خراپەکانی هەر مرۆڤێ لەسەری کێشانە دەکرێن. حەوزیش، ئەو شوێنەیە

کە خەڵکی بەهەشت لە ڕۆژی قیامەتدا بە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) دەگەن. لەوێ پێغەمبەر پەرادخێ ئاو دەدات بە هەریەکێک لە ئوممەتەکەی، لەدوای ئەوە ئیتر هەرگیز تینویان نابێت، ئەوکات ئەنەس زەردەخەنەیەکی کردو سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەو نیعمەتی ئیمانە کە پێیبەخشیوە.

## ١٦٧. نوغەیر، مەلەکەی ئەبو عومەیر

پێغەمبەری خوا(ﷺ) منداڵانی زۆر خۆشدەویست، هەرکات چاوی بە منداڵێ بکەوتایە، نزیکدەکەوتەوە لێی و دەستی دەهێنا بەسەریداو ماچیدەکرد، هەروەها هەندێجار گاڵتەو یاری لەگەڵ دەکردن.

ئەنەس برایەکی بچوکی هەبوو نازناوی ئەبو عومەیری لێنرابوو، ئەبو عومەیر مەلێکی زۆر بچوکی هەبوو، دنوکێکی سور و دووچاوی بازنەیی هەبوو ناوی نوغەیر بوو. عومەیر داینابوو بە هاورێ نزیکەکەی خۆی، بەدرێژایی ڕۆژ یاری لەگەڵ دەکردو هەرگیز بێتاقەت نەدەبوو لێی.

هەرکات پێغەمبەر(ﷺ) بیدیایە کە لەگەڵ مەلەکەیدایە، پێی دەفەرموو: ((ئەی ئەبا عومەیر، نوغەیر چیدەکات؟)) ئەم پەیوەندییە پتەوە لەگەڵ پێغەمبەردا ئەبو عومەیری زۆر دڵخۆشکردبوو.

ڕۆژێکیان، لە ناوەختدا نوغەیر مرد، ئەویش زۆر غەمبار بوو بۆی، لە هەمان ڕۆژیشدا پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی کردن بینی کە ئەبا عومەیر زۆر بێتاقەت و خەفەتبارە، فەرمووی: ((ئەوە چییەتی؟)) وتیان: نوغەیرەکەی مرد، پێغەمبەر(ﷺ) دەستیهێنا بەسەریداو هەواڵی خۆیی پرسی، ئینجا سەرەخۆشی لێکردو خەفەتی لەسەری سوک دەکرد، ئەو سۆزدارییە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرانبەر ئەبو عومەیر نواندی خەم و ئێش و ناڕەحەتییەکەی لەبیر بردەوەو دڵی خۆشکرد.

## ١٦٨. دوعای پێغەمبەر(ﷺ) بۆ ئەنەس

دایکی ئەنەس بە پەروەردەکردنی کوڕەکەی لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر بەختەوەر بوو، چونکە لە هەر ڕۆژێکی نوێدا فێری مەسەلەیەکی نوێ دەبوو، ئەو دایکە دەیویست کەسێکی ڕەوشتبەرز بێت، ڕۆژێکیان، هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد دوعای خێر بۆ کوڕەکەی بکات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەنەسی زۆر خۆشدەویست، لێرەوە هات بەدەم داواکەی دایکییەوەو فەرمووی: ((ئەی خوای گەورە ماڵ و منداڵی زۆری پێببەخشە، تەمەنی درێژ بکە، بیخەرە بەهەشتەکەت)).



ئا بەمجۆرە ئەنەس لە ماڵی پێغەمبەردا(ﷺ) لە کەشو هەوایەکی خۆشەویستی و سۆزدا گەورەو پەروەردە بوو ، لەسەر ڕەویەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشت و بووبە کەسێکی ڕەوشتبەرز. شایستەی دوعا بۆکردنی پێغەمبەر بوو، کاری بە ڕێنماییەکانی ئەو دەکرد، بووە یەکێک لە کەسە هەرە دەوڵەمەندەکانی مەدینەی مونەووەرە، هەروەها هاوسەرگیری کردو بووبە خاوەنی منداڵی زۆر.

ئەنەس لەسەر ئەو دوعایەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بۆیکرد زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد، بەردەوام هەوڵیدەدا پەیامی پێغەمبەرو گوتە جوانەکانی بگەیەنێت بەو کوڕو منداڵانەی بەدەوریدا بوون.

ئەنەس خۆشترین و جوانترین ساڵەکانی تەمەنی بە یاوەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەربرد، لەژێر سەرپەرشتی ئەودا بوو.

دواتر زۆرجار باسی ئەو ڕۆژانەی ژیانی خۆی دەکرد کە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) بەسەری بردوون و دەیوت: (دە ساڵی ڕەبەق خزمەتی پێغەمبەری خوام کرد، هەرگیز ئازاری نەداوم، جنێوی پێنەداوم، ڕووی لێ گرژ نەکردووم).

ئەنەسی کوڕی مالیک کە ڕۆژانی منداڵێتی خۆی لە پەنای پێغەمبەری خوادا بەسەربرد، هەرگیز ئەو ڕۆژانەی لەبیرنەدەچوویەوە، بە فەزڵی دوعای پێغەمبەر(ﷺ) بۆی لە ژیانێکی بەختەوەریدا دەژیا، کەسێکی تەندروست باش و خاوەن سەروەت و بەختەوەر و ڕاستگۆ بوو.

## ١٦٩. مژدەی بەخشینی بەهەشت بە ئارامگران

کاتێ هەژارو نەدارو لاوازەکان گوێبیستی هاتنی پێغەمبەرێکی نوێ بوون زۆر دڵخۆشبوون، لەنێوان خۆیاندا کەوتبوونە چپە چپکردن لەبارەی ئەو هەواڵەوە، خەڵکی دەیانوت ئەو یارمەتی هەموو کەس دەدات با گرفتەکانیان تا هەرکوێ و تا هەرچەندە ببن.

جارێکیان ئافرەتێک بە تەنها هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە دەینالاند بەدەست نەخۆشییەکی سەختەوە، پێغەمبەری ئاگادارکرد بە کێشەکەی و وتی: نەخۆشم، ئینجا داوای لێکرد لە خوای گەورە بپاڕێتەوە تا شیفای بۆ بنێرێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (بۆت هەیە ئارامبگریت و بەهەشتت مسۆگەرە، بۆشت هەیە لە خوا بپاڕێمەوە شیفات بۆ بنێرێ).

ئافرەتەکە کەمێک بیریکردەوە، خۆی ئازادە یان ئەوەتا لەزەت لە ژیانێکی کورت ببات بە تەندروستییەوە، یان ژیانێکی بەختەوەریی هەتا هەتایی لە بەهەشتدا مسۆگەر بکات. بۆیە بڕیاریدا بەختەوەریی هەمیشەیی لە بەهەشتدا هەڵبژێرێ و بیدات بەسەر بەختەوەرییەکی کورت و کاتیدا. ئینجا چپەیەکی کرد وتی: (بەڵکو ئارامدەگرم ئەی پێغەمبەری خوا). پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵبژاردەکەیی پێخۆشبوو، دوایی گەڕایەوەماڵەکەی خۆی، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) بە هاوەڵەکانی فەرموو: ((هەر ناڕەحەتییەک تووشی موسڵمان دەبێت ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی دەوەرێنی، تەنانەت ئەگەر دڕکێکیش بچێت بە قاچیدا)).

هەرکەس گوێڕادێری لەم فەرموودەیە، سوپاسی خوای گەورە دەکات لەسەر نیعمەتی ئاینی جوانی ئیسلام و لەسەر ئەو پێغەمبەرە گەورەیە، لەوەبەولاوە ئیتر ئەو ئافرەتە نەخۆشە بەهۆی نەخۆشییەکەیەوە هەستی بە بێتاقەتی و غەمباری نەدەکرد، بەڵکو بە ئومێدی دەستخستنی بەختەوەریی هەمیشەیی لە ڕۆژی دواییدا ژیانی گوزەراند.

## ١٧٠. ئەم دەموچاوە درۆزن نیە

مەدینەی مونەووەرە لە سەردەمی ئاڵتونی خۆیدا دەژیا، دەنگوباسی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ڕەوشت جوانییەکەی هەموو شوێنێکی گرتەوە، هەرکەسێکیش بهاتایە بۆ چاوپێکەوتنی و دوایی بڕۆیشتایە زۆر دەچوو بەدڵیداو سەرسام دەبوو پێی، چونکە هەر جووڵەیەک و هەر دانیشتنێکی کاریگەریان لەسەر خەڵکی دروست دەکرد. هەرکەس چاوی پێکەوتایە باوەڕی دەهێنا کە ئەم ئاینە ئاینی هەق و ڕاستییە، ناوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتە سەر زمانی هەموو کەس. خەڵکیش لە ناوچە دوورەکانی جیهانەوە هەواڵی هاتنی پێغەمبەرێکیان لە مەککەدا بە یەکتری دەدا.



هەرکەسیش خۆی چاوی پێی نەکەوتبێ پرسیاری لەو کەسانە دەکرد کە چاویان پێی کەوتبوو، ئەوانیش بەوە وەسفیان دەکرد کە موحەممەد جوانترین مرۆڤی سەر زەوییە، تەنانەت جوانییەکەی لە جوانی یوسف زیاترە. نە درێژەو نە کورتە، نە قەڵەوەو نە لەڕو لاوازە، قژی زۆر ڕەش بووە، درێژی قژەکانی لە پەنای گوێیەکانییەوە درێژ بووبوونەوە تا سەر ناوشانی، هەندێجار دەیدا بە لای ڕاست و جارانێکیش بە لای چەپدا، کەسێکی ناوشان پان بووە، لە ناوشانیدا مۆری پێغەمبەرایەتی هەبوو. دەموچاوی بازنەیی بوو وەک مانگ، برۆکانی چڕو چەماوە بوون، سپێنەی چاوەکانی زۆر زۆر سپی بوون لەگەڵ زۆر ڕەشی بیلبیلەکانی، برژانگی درێژ بوون، کاتێک سەیری کەسێکی بکردایە یان قسەی لەگەڵدا بکردایە بە تەواوی جەستەیەوە لایدەکرد بەلایەوە، وتراوە کە تەوێڵی

یان بووەو ڕیشی زۆر پڕبووە، هەمیشە دەم بەزەردەخەنە بووە، ددانەکانی وەک مرواری سپی بوون.

هاوەڵێک بەناوی جابیر کوڕی سومرە لەبارەیەوە دەڵێ: (لە شەوێکی ساماڵ و سافدا چاوم پێکەوت، کەوتمە سەیرکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و مانگ، پۆشاکێکی سوری پۆشیبوو وەهام بینی کە ئەو(ﷺ) لە مانگ جوانترە). یەکێک لە ئافرەتە هاوەڵەکانیش دەڵێ: (ئەگەر بیبینی ئەوا خۆر دەبینی لە کاتی هەڵهاتنیدا). کاتێ کە خەڵکی بۆ یەکەمجار چاویان پێیدەکەوت ڕاستەوخۆ باسیان لە خۆشەویستییەکەی کردووە کە چووەتە دڵیانەوە، دەیانوت: (ئەم دەموچاوە درۆزن نیە). ڕاستەوخۆ هەر بە چاوپێکەوتنی باوەڕیان دەهێنا، سیفەتە جوانەکانی پێغەمبەریان(ﷺ) لەنێوان خۆیاندا دەگواستەوە. بەمجۆرە هەموو چاوەکان ڕوویان لە مەدینەی مونەووەرە بوو، چونکە هەمووی خەڵکی دەیانویست ئەم ئاینە نوێیە بناسن و باوەڕی پێبێنن.

## ١٧١. یەکەمین دەوڵەتی ئیسلامی

بەختەوەریی باڵیکێشا بەسەر مەدینەی مونەووەرەدا، بووە جوانترین شار، باخە دارخورماکانی و بەرهەمە فرە ڕەنگەکەی لە بەرچاواندا بوو، وەک بڵێی خۆی ڕازاندووەتەوە تا پێشوازی لە میوانەکانی بکات، شەماڵەکەی پڕبوو لە مژدە هەروەک عەترو گوڵاو بۆنخۆش بوو، خەڵکی لە هەموو شوێنانی جیهانەوە دەهاتن تا باوەڕ بە ئیسلام بێنن، ئەو گردبوونەوە مرۆییە کە دەوری پێغەمبەری خوایان(ﷺ) دابوو تا دەهات ژمارەیان لە زیادبووندا بوو.



ئەم گەشەسەندنە هەندێکی بێتاقەت کردبوو، جولەکە تۆقرەیان لێبڕا چونکە باوەڕیان بە پێغەمبەر(ﷺ) نەهێنا، گوایا ئەو پێغەمبەرە کە هاتووە لە خۆیان نیە. قورەیشیش کەوتنە نانەوەی پیلانی نوێ دژ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ).

کەسانێکی تریش هەبوون لە ڕواڵەتدا خۆیان بە هاوەڵی پێغەمبەر(ﷺ) دەزانی بەڵام دوژمنی بوون، ئەوانیش دووڕووەکان بوون کە کرداریان پێچەوانەی گوفتاریان بوو، ئەوانەش لە مەترسیدارترینی دوژمنانی ئیسلام بوون، چونکە کەس نیەتی ڕاستەقینەی ئەوانی نەدەزانی، عەبدوڵڵەی کوڕی ئوبەی یەکێک بوو لەوان. ئەم کەسە بەشداریکرد لە پیلانگێڕی دژ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەهات ئەو زانیاریانەی کە لە موسڵمانانەوە دەکەوتنە دەستی دەینااردن بۆ قورەیش ئەویش بە مەبەستی سنوردانان بۆ بڵاوبوونەوەی ئیسلام.

لە لایەکیترەوە، دووبەرەکی و ململانێیەکی سەخت و درێژخایەن و دێرین لەنێوان چەند هۆزێکی مەدینەی مونەووەرەدا بوونی هەبوو، شتێکی ئاسان بوو ئەو دووبەرەکی و ناکۆکیانە لە هەر ئان و ساتێکدا بگۆڕدرێن بۆ شەڕێکی خوێناوی ڕاستەقینە لەنێوانیاندا، بەمشێوەیە، مەدینە لەلایەن ئاراستە جیاوازەکانەوە کەوتبووە بەر چەندین مەترسی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەباشی پەی بەم حاڵەتە ناباشە بردو ویستی ئەو مەترسیانە کە ڕوویان لە مەدینە کردووە نەیانهێڵێ، بەم مەبەستە هەستا بە کۆکردنەوەی کەسایەتییە دیارەکان و پیاوماقوڵانی شارەکە. پێغەمبەر(ﷺ) خۆی سەرۆکایەتی ئەو کۆبوونەوەیەی کرد. هات باسی ئەو مەترسیانەی بۆ ئامادەبووان کرد کە لە دەرەوە ڕوویان لە مەدینە کردووە، پاشان پێی فەرموون کە دەبێ یەکگرتوو بن تا بتوانن بەرگری لە شارەکە بکەن.

لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا، گەیشتنە ڕێکەوتنێک، ئەو ڕێکەوتنەش بووە یەکەمین دەستور بۆ دەوڵەتی ئیسلامی، بەپێی ئەو دەستورە خەڵکی مەدینە بوونە یەک ئوممەت، جولەکەش دانران بە هاونیشتمانی شاری مەدینەی مونەووەرە، هەروەها تێیدا هاتبوو کە بارودۆخ هەرجۆر بگەڕێ پێویستە هەمووان بەشداربن لە بەرگری لە مەدینە دژ بە دەستدرێژکاران. شتێکی ئاشکرابوو کە ئەو دەستورە لە بەرژەوەندی هەموولایەک بوو، چونکە هەر کۆمەڵ و گروپێک کەسانێکی دژی هەبوون کە دەترسا لێیان. ئەم دەستورە بووە زامنی پاراستنی هەمووان لە شارەکەدا.

## ١٧٢. مۆڵەتی چاوەڕوانکراو

هاوەڵگەرانی قورەیش کاتێ ئەو ڕێکەوتننامەیەیان بیست کە موسڵمانان لە مەدینەدا کردوویانە زۆر تورە بوون، هاتن کەوتنە گەڕان بەدوای ئەو شێوازانەدا کە دەبنە مایەی بێتاقەتکردن و بێزارکردنی موسڵمانانی مەدینە.

لەماوەی ئەو سیازدە ساڵەدا کە موسڵمانان لە مەککەی پیرۆزدا گوزەراندیان، دووچاری هەموو جۆرەکانی چەوساندنەوە هاتبوون، سوکایەتی پێکردنێ نەما بێباوەڕان نەیکەن بەرانبەریان، هەروەها جۆرەها شێوازەکانی ئەشکەنجەو ئازاردانیان لە دژیان بەکارهێنا. لەو کارە قێزەونانەیاندا ئەوەندە ڕۆچوون تا موسڵمانان ناچاربوون مەککە جێبێڵن، موسڵمانانیش لە بەرانبەرەوە هەر ئارامیان گرت تا خوای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی پێدان، چونکە ئیسلام ئاینی ئاشتی و خۆشەویستییە، بە هیچ جۆر داوای خوێنڕشتن ناکات.

لە بەرانبەرەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوام بە باشترین شێوازو بە جوانی بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێگای ڕاستی، ئارامیگرت لەسەر ستەمیان، دەیویست موسڵمانانیش هەمان شت بکەن چونکە ئەوان ژێردەستەو لانەوازە بوون. ئەوە پێغەمبەرە کە داوای کاری چاکە دەکات، داوای ڕاستگۆیی و بەزەیی دەکات، بە حیکمەتەوە مامەڵە لەگەڵ هاوەڵگەراندا دەکات، مەسەلەکان بەراورد دەکات و بە تەرازووی هەق کێشانەیان دەکات، لەبەرئەوە کاتێ لە مەککە بوو نەهات بە توندوتیژی ڕووبەڕووی هاوەڵگەران ببێتەوە.

بەڵام وا ئێستە قورەیش دەستیکردووە بە دانانی پلانی نوێ دژ بە موسڵمانان، ئەوان یەکەمجار ویستییان پێغەمبەر(ﷺ) و دوای ئەویش هەموو موسڵمانان لەناوبەرن. موسڵمانان ئەو پیلانانەی قورەیشیان بیست کە بۆ کوشتنی پێغەمبەر(ﷺ) دایان دەڕێژا. لەبەرئەوە بڕیاریاندا بەرگری لێبکەن و بیپارێزن. ئەوان بەرگەی ئەوە ناگرن تەنها یەک تاڵەمووی سەری ئەو(ﷺ) ئازاری پێبگات، لێرەوە چاوەڕێی فەرمانی خوای گەورە بوون بۆ جەنگکردن دژ بە بێباوەڕان. شەو و ڕۆژ دەپاڕانەوە تا ئەو مۆڵەتەیان پێبدرەێ.

مەعلومە کە خوای گەورە ڕێگانادات پێغەمبەرەکەی تووشی هیچ جۆرە ئازاردانێک ببێت، تا دواجار خوای گەورە لە ڕێگای جیرەئیلەوە مۆڵەتی پێدان کە دەفەرموێ: ﴿أُذِنَ لِلَّذِينَ يُقَـٰتَلُونَ بِأَنَّهُمْ ظُلِمُواْ وَإِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ نَصْرِهِمْ لَقَدِيرٌ ، ٱلَّذِينَ أُخْرِجُواْ مِن دِيَـٰرِهِم بِغَيْرِ حَقٍّ إِلَّآ أَن يَقُولُواْ رَبُّنَا ٱللَّهُ ...﴾ (الحج: ٣٩ - ٤٠). بەمشێوەیە خوای گەورە مۆڵەتی بە موسڵمانان دا تا بە مەبەستی بەرگری لە خۆیان دژ بە بێباوەڕان بجەنگن، ئەوانیش بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشبون، چونکە وایان لێهات لێرە بەولاوە بتوانن بەرپەرچی هەرجۆرە چەوساندنەوەو ستەمێک بدەنەوە تا ئاین و پێغەمبەرو قورئانەکەیان و خۆیان بپارێزن. ئەوان تەواو ئامادەباش بوون بۆ ئەو کارە با لەوپێناوەشدا گیانی خۆیان بکەنە قوربانی

## ١٧٣. جەنگی بەدر

قورەیش کەوتە خۆ ئامادەکردن بۆ شەڕێک کە لە داهاتوودا دژ بە موسڵمانان ئەنجامی دەدات. بەڵام بۆ ڕێکخستنی سوپایەکی بەهێز پێویستی بە ماڵ و بە چەک هەبوو، بەو مەبەستە هەستا بە ناردنی کاروانێک کە پێکهاتبوو لە هەزار وشتری بارهەڵگر بۆ دیمەشق، ئەبو سوفیان بووە سەرکردەی ئەو کاروانە. ئەو بازرگانییە قازانجێکی گەورەی بۆ قورەیش دەستخست، زۆریش دڵخۆشبوون پێی، دوای ئەوە بە پێکەنین و گۆرانی وتنەوە بەرەو مەککە گەڕانەوە. لە دانانی پلاندا بوون بۆ هێرشکردنە سەر موسڵمانان بەو چەکانەی کە بەو پارەیە کڕیبوویان.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانی قورەیش پلان بۆ شەڕ دادەڕێژێ. ناچار کەوتە بیرکردنەوە بۆ گرتنەبەری ڕێگایەک تا ئەو پلانەیان شکست پێبێنێ، ئەو نەیدەویست خوێن بڕژێ. دواجار، بیرۆکەیەکی بۆ هات، بڕیاریدا ڕێگیری بکات لە گەڕانەوەی کاروانەکە بۆ مەککە. پێویستە بێباوەڕان بوەستێنێ بەرلەوە هەرجۆرە بەریەککەوتنێک ڕووبدات، بەم پێیە هات سوپایەکی بە نزیکەی سێسەد سەرباز ڕێکخست.

کاتێک ویستی مەدینەی مونەووەرە جێبێڵێ، ڕوقیەی کچی نەخۆشکەوت، بەڵام بۆ پاراستنی موسڵمانان لە ئازاردانی قورەیش پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناچاربوو کچە نەخۆشەکەی لەماڵدا جێبێڵێ تا بەخۆی سەرکردایەتی سوپاکە بکات. بەدر شوێنێکە دەکەوێتە نێوان مەککەی پیرۆزو مەدینەی مونەووەرە، دەورەدراوە بە کێوی بەرز

بەرز، ئەو دەشتە جوانە ڕازاوە بوو بە درەختی مۆزو دارمێو و تری، شوێنێکی گونجاو بوو بۆ وەستانی کاروان تیایدا. لە ڕێگای گەڕانەوەیاندا، بێباوەڕان لەوپەڕی خۆشیدا بوون چونکە ئەو چەک و چۆڵە زۆرە دەهات بە خەیاڵیاندا کە لەپێناو ئەو جەنگەدا دەیکڕن، ئەبو جەهلیش بەسەر وشترەکەیەوە لە مەشکەیەکی پێستییەوە شەرابی هەڵدەلوشی.

لە بەرانبەرەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵان بەدەم وتنی الله أکبر و سبحان الله بەرەو بەدر دەڕۆیشتن، موصعەبی کوڕی عومەیر ئاڵا سپییەکەی پێغەمبەری(ﷺ) هەڵگرتبوو، هاوکات هەریەک لە عەلی و سەعد کوڕی مەعاز دوو ئاڵای تریان هەڵگرتبوو، ئیسلام ڕێگیری لە موسڵمانان دەکات بجەنگن و خوێن بڕژێ، مەگەر لە حاڵەتێکدا نەبێت کە لەپێناو دۆزێکی دادپەروەرانەدا بێت، ئەگەر بهاتایە بێباوەڕان دواتر بکشانایە بەرەو مەدینە ئەوا ژیانی زۆرێک لە ئافرەتان و منداڵان دەکەوتە مەترسییەوە، بۆیە موسڵمانان ناچاربوون بڕۆن بەرەو بەدر تا ڕێگیری لەوە بارە نەخوازراوە بکەن و خانەوادەکانیان بپارێزن.

جەنگی بەدر سەرلەبەیانی ڕۆژی هەینی حەڤدەی ڕەمەزان بەرپابوو.

## ١٧٤. پێغەمبەرێکی ئازاو دلێر

سوپای موسڵمانان وشتری زۆریان لەگەڵ نەبوو. وشترەکان بەشی سوپاکەیان نەدەکرد هەموویان هەڵبگرن چونکە پێکهاتبوون لە زیاتر لە سێسەد جەنگاوەر. بەو هۆیەوە، بە نۆرە بەو ڕێگا بیابان و گەرمەدا سواریان دەبوون، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا ئەو نۆرەیەی دەکرد، ماوەیەک بەپێ و ماوەیەکیش سوار دەبوو. کاتێ سەرە هاتەسەری بەپێ ڕێبکات، دووان لە هاوەڵان پێیانوت: (ئێمە لەجیاتی تۆ بەپێ دەڕۆین). بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کە کەسێکی دادپەروەر بوو و حەزی لە یەکسانیی بوو، وەڵامیدانەوە کە: ((نە ئێوە لە من بەهێزترن و نە منیش کەمتر لە ئێوە بەتەمای پاداشتم)). بەمشێوەیە پێغەمبەر(ﷺ) گرنگێتی یەکسانیی بۆ خستنەڕوو. چونکە هەموو موسڵمانان چوونیەکن، بۆ ڕۆژێکیش فەزڵی خۆی نەداوە بەسەر هیچ یەک لە موسڵماناندا، با ئەو پێغەمبەری خاتەمیش بێت، ئەو سیفەتەی وایلێنەکردبوو لەخۆی بایی ببێ و بە لوتبەرزی هەڵسوکەوتیان لەگەڵدا بکات.

لە کاتێکدا سوپای موسڵمانان بە خێرایی بەرەو بەدر دەڕۆیشت تا ڕێگا لە کاروانەکەی قورەیش بگرێ، سیخوڕێک هەستا بە گەیاندنی هەواڵەکە بە ئەبو سوفیان کە سەرکردەی کاروانەکە بوو، چونکە هەر لە سەرەتاوە لەو مەسەلەیە دەترسا، ئەبو سوفیان بەپەلە هەواڵەکەی نارد بۆ مەککەو خۆیشی ڕێگای کاروانەکەی گۆڕی. بۆیە بڕیاریدا بە زووترین کات بگاتەوە مەککە، تا سوپایەکی گەورەو بەهێز ڕێکبخات و هێرشبکاتە سەر موسڵمانان.

ئەو پیاوە کە ئەبو سوفیان ناردی بۆ مەککە بە شەقامەکاندا دەڕۆیشت و بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد (فریاکەون! فریاکەون! موسڵمانان هێرشدەکەنە سەر کاروانەکەمان، دەستدەگرن بەسەر هەموو سەروەتەکەماندا. فریاکەون!).

بێباوەڕان داچڵەکان، خێرا کەوتنە خۆ ئامادەکردن، هەزار جەنگاوەرو ژمارەیەکی زۆر لە وشتریان کۆکردەوە، ئافرەتانیان لەگەڵ خۆیاندا هێنا تا بکەونە ئاواز چڕین و وتنی گۆرانی و سرودی جەنگی. هەروەها شیعر خوێندنەوە تا ورەی سەربازەکان بەرزبکەنەوە. بەمجۆرە ئەو سوپا گەورەیە کە لەوپەڕی ئامادەباشیدا بوو بە سەرکردایەتی ئەبو جەهل ڕۆیشت بەرەو بەدر.

هەواڵی سوپاکەی قورەیش زوو بەزوو گەیشتە پێغەمبەری خوا(ﷺ). زانی کە هاوەڵگەران بە سوپایەکی گەورەوە کشاون بەرەو بەدر، ئەویش وەک هەموو جارێکیتری داوای یارمەتی لە خوای باڵادەست کرد، موسڵمانان بەو کارەیان ویستیان ڕێگیری لە هاوەڵگەران بکەن لەوەی خۆیان سازدەن بۆ جەنگ، بەڵام نەهاتبوو بە خەیاڵیاندا کە بێباوەڕان دێن بۆ بەدر بۆ شەڕ، لەسەروبەندی ئەو ڕووداوە نوێیانەدا، کەوتنە تاوتوێکردنی مەسەلەکە لەنێوان خۆیاندا، دواجار، ئەو موسڵمانانە کە ئامادەی قوربانیدان بوون بە گیانی خۆیان لەپێناو پێغەمبەردا(ﷺ) وتیان: (ئێمە باوەڕمان بە تۆ هێناوەو شایەتیمانداوە ئەوەی تۆ بۆتهێناوین هەق و ڕاستییە، لەسەر ئەو بنەمایە بەڵێن و پەیماننامەمان پێداوی کە گوێبیست و گوێڕایەڵت بین، کەواتە ئەی پێغەمبەری خوا بەردەوامبە لەسەر ئەوەی دەتەوێ بیکەیت، سوێند بەو کەسە تۆی بە هەق و ڕاستی ڕەوانەکردووە ئەگەر ئەو دەریایەمان بخەیتە پێشچاو و بتەوێ بچیتە ناوی ئەوا لەگەڵتدا دەچینە ناوی، تەنها یەک کەس لە ئێمە لەو بەڵێنە پاشگەزنابینەوە، پێمان ناخۆش نیە سبەینێ ڕووبەڕووی

دوژمنمـان ببینـەوە، ئێمـە ئەهلـی خۆڕاگریـن لـە جەنگدا، ڕاسـتگۆین لە بەرەنگاربوونـەوەدا، بەڵکو خوای گەورە وابکات ئەوەمان لێببینی کە چاوانت ئاسـودە ببن، دەی کەواتـە بڕۆ لەسـەر بەرەکەتی خـوای گـەورە).

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دڵخۆشـبوو بـە ئازایەتی هـاوەڵان و فەرمووی پێیـان: ((بـڕۆن و مژدەبەخـش بـن، چونکـە خـوای گـەورە بەڵێنـی یەکێک لـە دوو تاقمەکەی پێداوم، سـوێند بەخوا وەها دەبینم کە ئەو قەومـە لەناودەچن)). ئـەو هاندانـە ئەوەندەیتر هێزو ورەی پێبەخشـین، موسـڵمانان ئا بەمشـێوەیە چوونـە پێش و دڵیان پڕبوو لـە باوەڕ بـە خـواو بـە سـەرکەوتن، بەجۆرێکی وەهـا ورەبـەرز بـوون کـە توانایـان هەبـوو ڕووبـەڕووی هەمـووی جیهـان ببنـەوە. ئـەوان دڵنیابـوون لـە سـەرکەوتن، چونکـە پێغەمبـەر(ﷺ) کـە پێشـەوایەتی دەکردن جگـە لـە ترس لـە خـوای گـەورە ترسـی لـە کەسـیتر نەبـوو.

## ١٧٥. لە پانتایی بەدر دا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) شەوی پێنج شەممە لەسەر هەینی لەگەڵ سوپاکەی گەیشتنە بەدر، زۆر ماندوو و شەکەت بوون، پێی فەرموون دەیەوێت هەندێ زانیاری لەسەر ئەو بیرە ئاوانە دەستبکەوێت کە لە تەنیشت تەپۆڵکەیەکی بچوکەوەن، هات بۆ ئەو مەسەلەیە عەلی و چەند هاوەڵێکی تری نارد.

موسڵمانان چەند بێباوەڕێکیان بینی کە بەدەوری بیرەکەدا بوون و ئاویان هەڵدەگۆزی، وشترەکانیان بەدەوریاندا بڵاوەیان کردبوو. موسڵمانان دووان لەوانیان بەدیل گرت، هێنانیان بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش چەند پرسیارێکی لەبارەی سوپای بێباوەڕانەوە لێکردن. یەکێکیان وتی: (ئەوان لەپشتی ئەو تەپۆڵکەیەوەن کە لەم دوورەوە دەبینرێ). ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لێکردن کە: (چەند کەس دەبن؟) وتیان: (زۆر)، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((چەکەکانیان چین؟))، وتیان: (نازانین). ئەوکات پرسیارێکی جیاوازی لێکردن تا ژمارەکە بخەملێنێ فەرمووی: ((ڕۆژی چەند سەر سەردەبڕن؟)) یەکێکیان وتی: (ڕۆژێ نۆ و ڕۆژێک دە)، پێغەمبەر فەرمووی: ((کەواتە ئەوان لەنێوان نۆسەد و هەزار دان)).

هاوەڵان سەریان سوڕما لەو شێوازەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ خەملاندنی ژمارەی سوپای دوژمنان بەکاریهێنا. جا مادامێ سەرکردەیەکی وەهایان هەیە ئەوا ئامادەن لەگەڵیدا بڕۆن بۆ دوورترین شوێنی ئەم جیهانە. بەمجۆرە هاتن لە بەرانبەر بیرەکانەوە چادرەکانیان هەڵدا.

هاوەڵان لە پەلی دارخورما چادرێکیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامادەکرد، خۆی و ئەبوبەکر چوونە ناوی، ژمارەیەک لە هاوەڵانیش بوونە پاسەوانیان.

## ١٧٦. سەوواد ڕاست بوەستە

جەنگی بەدر لە بەیانی ڕۆژی هەینی لە حەڤدەی ڕەمەزاندا بەرپابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستا بە ڕێکخستنی ڕیزی هاوەڵان و قامچییەکی بەدەستەوە بوو. گەیشتە لای سەوواد کوڕی غەزیە کە لەناو ڕیزەکەدا دەرپەڕیبوو، بە قامچییەکە کێشای بە سکیدا تا ڕیزەکە ڕاستبکاتەوەو فەرمووی: ((ڕاست بوەستە ئەی سەوواد)). سەوواد وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئێشت پێگەیاندم! تۆ خوای گەورە بە هەق و بە دادپەروەری ڕەوانەی کردوویت تۆڵەم بۆ بکەرەوە (واتە لەجیاتی ئەو لێدانت لە من تۆڵەی من لە خۆت بکەرەوە)، پێغەمبەری خوا سکی خۆی ڕووت کرد و فەرمووی: ((تۆڵەی خۆت بکەرەوە)). خێرا سەوواد باوەشی بە پێغەمبەردا(ﷺ) کردو سکی ماچکرد! ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ئەوە چی وایلێکردی ئەو کارە بکەیت ئەی سەوواد؟)). سەوواد وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، چۆنی باش دەزانی ئاوا ئامادەسازی بکە بۆ جەنگ لەگەڵ بێباوەڕاندا، ویستم کۆتا ساتەکانی تەمەنم ئەوە بێت پێستم لە پێستت بکەوێ. لە خۆشویستنم بۆت ئەی پێغەمبەری خوا! پێغەمبەریش(ﷺ) دۆعای خێری بۆکرد.

## ١٧٧. موحەممەدی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سەرکردەی مەزن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوکێکی بەسۆز بوو، دەستی بەسەر بێباوکاندا دەهێنا، بەزەیی پێیاندا دەهاتەوە، پارێزگاری لێدەکردن، بە بەزەیی بوو لەگەڵ گیاندارانیدا، ڕێگای بە کەس نەدەدا ئازار تەنانەت بە مێرووليەکی بچوکیش بگەیەنێ، ڕاهاتبوو لەسەر دانەوەی مافی خەڵکی بەتەواوەتی. هیچ جۆرە ڕق و کینەیەکی لە دڵیدا بەرانبەر بە کەس هەڵنەگرتبوو. هەروەها ئاواتەخواز نەبوو ئازارو زیان بە هیچ کەس بگات.

کاتێ بەرەنگاری دوژمنان بوویەوە هۆیەکەی ئەوەبوو ئەوان دژایەتی ئاینی خوای گەورەیان دەکرد، بەو هۆیەوە، ئامادەبوو تا کۆتا دڵۆپە خوێنی قوربانی بە گیانی خۆی بدات. ئا ئەوەتا ئەو ساتە هاتە پێش، کاتی بەرگری لە ئیسلام دژ بە دوژمنانی هاتە پێش. لە کاتێکدا سەربازەکان بە درێژایی شەو لە پرخەی خەودا بوون، پێڵوی چاوانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەنران بەیەکدا، لە شوێنی مانەوەیەدا کە هاوەڵان بۆیان ئامادە کردبوو، بەدرێژایی شەو نوێژی کرد، لە خوای گەورە پاڕایەوە یارمەتی بدات، بەردەوام هەتا بەرەبەیان لە نوێژو لە پاڕانەوەدا بوو. بەمجۆرە ئاسمانی بەدر پڕبوو لە نوێژو دوعاکانی پێغەمبەر(ﷺ).

سەربازانی سوپای ئیسلام بەیانی زوو لە خەو هەستان و کەوتنە خۆ ئامادەکردن، هەموو چاوەکان ڕوویان کردبووە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کە عادەتی وابوو هەموو شتێکی بەشێوەیەکی ڕێک و ڕاست ئەنجامدەدا، سوپاکەی ڕێکخست، لە شوێنێکی گونجاودا

دایمەزراند، پاشان سەرکردەیەکی بۆ هەر دەستەیەک هەڵبژارد، فەرمانی پێکردن و فەرمووی: ((ئەگەر ئەو قەومە لێتان نزیککەوتنەوە ئەوا بە تیر کون کونیان بکەن، شمشێر نەخەنەوە کێلان تا ئەوان هەڵنەکوتنە سەرتان)).

هاوەڵان لە چاوەڕوانیدا بوون و سەرقاڵی زیکرکردن بوون، داوای یارمەتی و سەرکەوتنیان لە خوای گەورە دەکرد. پاش ماوەیەکی کەم، سوپای بێباوەڕانیش گەیشتە بەدر، بەرانبەر بە سوپای موسڵمانان وەستا کە ژمارەیان نزیکەی هەزار کەس بوو، پڕچەک بوون، وشترو ئەسپی زۆریان لەگەڵ بوو، لە ڕووی ژمارەو چەکەوە لە موسڵمانان بەهێزتر بوون. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە چادرەکەی هاتە دەرەوە، بۆ دواجار سوپاکەی بەسەرکردەوە، هەموو شت ئامادەبوو . عومەری وەک نێردەیەکی خۆی ناردە لای ئەبو جەهل، تا داوا لە سوپای دوژمنان بکات کە ئەگەر دەکرێ هەردوولا لەکوێوە هاتوون بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان بێئەوەی هیچ بەریەککەوتن ڕووبدات، بەڵام ئەبو جەهل قوبوڵی نەکرد، ڕێک لەو ساتەدا، یەکێک لە بێباوەڕان تیرێکی گرتە سوپای موسڵمانان، یەکێک لە کۆچبەران کە ناوی میهجەع بوو پێکرا، میهجەع ڕاستەوخۆ گیانی سپارد، ئەویش چووە ڕیزی ئەو کەسانەوە کە لەپێناو ئیسلامدا گیانی خۆیان کردە قوربانی. خوای گەورە مژدەی بەهەشتی بە شەهیدەکان داوە، میهجەعیش ئەو پلە باڵایەی ڕۆژی قیامەتی دەستکەوت.

دوای ئەوە، عەلی و حەمزە چوونە پێشەوەو شەڕ کڵپەی سەند، موسڵمانان بە متمانەیەکی بەهێز بە خوای گەورەو بە پێغەمبەرەکەی خۆڕاگربوون لەبەردەم سوپای بێباوەڕاندا، کاتێ هاوەڵگەران سەربازانی خۆیانیان بینی کە یەک بەدوای یەکدا تەختی مەیدانی جەنگەکە دەبن، زۆر ترسان. ئەبو جەهل هەوڵیدا

ترس و تۆقینیان کەمبکاتەوەو ورەیان بەرزبکاتەوە، بەڵام ئەوان لە حاڵەتەکە داچڵەکان و سەرسامبوون، چونکە موسڵمانان بەو ژمارە کەمەیانەوە توانیان بە ئازایەتییەکی گەورەوە بەرپەرچییان بدەنەوە، موسڵمانان بە جۆش و گەرمو گوڕییەکی زۆرەوە لەپێناو خوای گەورەدا دەجەنگان.

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) کاتێ موسڵمانانی بینی ئا بەو شێوەیەو بەو ئازایەتییە زۆرەوە دژ بە دوژمنەکەیان دەجەنگن کە بە ژمارەو بە چەک و لەوان بەهێزترن دیمەنەکە زۆر کاری تێکرد، ئینجا دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو لە خوای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی: ((پەروەردگارا ئەم موسڵمانانە پێخاوسن بەرزیانبکەرەوە، ڕووتن پۆشتەیان بکە، برسین تێریان بکە)).

## ١٧٨. مشتێ لمی ورد سوپای دوژمنانی تەفروتونا کرد

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرکردەیەکی مەزن بوو، بۆ یەک ساتیش سوپاکەی فەرامۆش نەکرد. کەوتە هاندانی سەربازەکان کە بە دڵێکی ئارام و دڵنیاکەرەوە دەچوونە مەیدانی شەڕەکە. سوپای قورەیش بە هەموو توانایان هێرشیان دەکردە سەر موسڵمانان و هەوڵیاندەدا پەرتەوازەو لەیەکیان دابڕن. بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک قەڵایەکی سەخت و قایم بەڕوویاندا وەستا، کاتێک هاوەڵان ئەو خۆڕاگرییەی پێغەمبەریان(ﷺ) بینی بەوپەڕی لێبڕان و پێداگرییەوە ڕووبەڕووی دوژمن بوونەوە، هەموو جارێ کە دوژمنان دەهاتنە پێش موسڵمانان ئازایەتی خۆیان لە پێغەمبەرەکەیانەوە وەردەگرت و ئەوانیان دەشکاند.

شەڕێکی سەخت و پێکهەڵپژانێکی توند و کوشندە ڕوویدا، کاتێک فشار لەسەر موسڵمانان سەختتر بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەمییەوەو مشتێ لمە وردەی لە زەوی هەڵگرت و وەشاندی بەسەر سوپای دوژمندا. دوعای لێکردن، ئا لەو ساتەدا بێباوەڕان هەستییان بە ئازارێکی زۆر کرد لە چاوانیاندا، لێرەوە کەوتنە جێهێشتنی گۆڕەپانی شەڕەکە. بەمجۆرە فشار لەسەر موسڵمانان سوک بوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوام بوو لە هاندانی سەربازەکانی، مژدەی بەهەشتی پێدەدان، لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا، هەردوو سوپاکە هەستییان بە ماندوو بوون دەکرد، هەمووﻻ بڕیاریاندا حەوانەوەیەک وەربگرن. ئەو مشتە لمەی پێغەمبەر(ﷺ) دای بەڕووی سوپای دوژمندا بیری سەربازانی هەردوو لای تاڕادەیەک سەرقاڵکرد. موسڵمانان وەک موعجیزەیەکی پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەیریان کرد، سوپاسی خوای گەورەیان کرد لەسەری، بەڵام بێباوەڕان نەیانتوانی تێبگەن لەوەی کە ڕوویدا.

## ١٧٩. پێغەمبەر(ﷺ) بەڵێن پارێزە

بۆ ڕۆژی دواتر شەڕ دەستیپێکردەوە. ئەبو جەهل بەڵێنی دابوو پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکوژێ، بەدرێژایی کات بەردەوام لە گۆڕەپانەکەدا بەدوایدا دەگەڕا. لە کاتی شەڕو کوشتارەکەدا، سەربازەکان دوو ڕێبواریان هێنا بۆ ئەبو جەهل، لەدوای پشکنینیان ئەبو جەهل پرسیاری لێکردن: (بۆ کوێ دەچن؟ ئایا ئێوە دەچن بۆ یارمەتیدانی موحەممەد؟). وەڵامیاندایەوە کە: (نەخێر، بەڵکو بۆ مەدینە دەچین). ئەبو جەهل وتی: (ئێستە کاتم نیە، ئەگەر ڕاستگۆیانە بەڵێنم دەدەنێ کە یارمەتی موحەممەد نەدەن ئەوا بەرتان دەدەم، ئەگەرنا ئەوا دەتانکوژم). پێیانوت: (بەڵێنی ئەوەت دەدەینێ کە ئێمە بۆ مەدینە دەڕۆین، یارمەتی موحەممەدیش نادەین). ئەبو جەهل وتی: (کەواتە ئێوە ئازادەن، ئەگەر ئەو بەڵێنەتان بشکێنن کە پێتان داوم، ئەوا لێتان ناگەڕێم بڕۆن). خێرا دوو پیاوەکە شوێنەکەیان جێهێشت، لەپاش ماوەیەک، چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێیانوت: (بە ئەبو جەهلمان وتووە ئێمە بۆ مەدینە دەچین، بەڵام خوا دەزانێ ئێمە هاتووین بۆ یارمەتیدانی تۆ، ئێمە لەژێر فەرمانی تۆداین، چیمان لێداوا دەکەیت بیکە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گوێی بۆگرتن، قسەکەیان نەچوو بەدڵیدا، چونکە خۆی بەردەوام فەرمانی بە خەڵکی دەدا پارێزگاری لە بەڵێنەکانیان بکەن، زۆر ڕقی لە ناپاکی بوو. تەنانەت لە جەنگیشدا، لەبەرانبەریشەوە نەیدەویست هەستی دوو پیاوەکە بریندار بکات لەبەرئەوە فەرمانی پێدان بە بێدەنگی بڕۆن بۆ مەدینە.

دوو پیاوەکە زۆر سەرسامبوون، چونکە سوپای موسڵمانان پێویستی بە هەموو هاوکارییەک بوو، ئیتر ئەوان چۆن بڕۆن بەرەو مەدینە؟ بەلام پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێیان پێویستە ئەو بەڵێنەی کە داویانە بیبەنەسەر.

دوو پیاوەکە ئا لەو کاتەدا هەستییان بە گرنگیتی پاراستنی بەڵێن کرد، ئەو ڕووداوە بووە پەندو وانەیەک بۆیان، بەو شێوەیە ڕۆیشتن بەرەو مەدینە تا ئەو بەڵێنەی بە ئەبو جەهلیان دابوو بیبەنە سەر. هەر بەو ڕێگایە سلاوی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) لە مەدینە گەیاندە ڕوقیەی کچی کە نەخۆش بوو.

## ١٨٠. سڵاوێک لە بەدرەوە

لە ماوەی جەنگی بەدردا، ڕوقیەی کچی پێغەمبەری خوا تەمەنی نزیکەی بیست ساڵ بوو، تا ئەو ڕۆژە ژیانێکی تەواو سەخت و پڕ لە چەرمەسەری گوزەراندبوو. کچەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هەمان ئەو نارەحەتییانەدا تێپەڕی کە بەسەر باوکیدا تێپەڕین. بەڵام هەر ئامادەبوو لەپێناو ئیسلامدا بەرگەی زیاتر لەوە بگرێ، بەهۆی باوەڕە بەهێزەکەیەوە هەستێ بە بڵاوکردنەوەی پەیامی ئیسلام، یەکەمین کۆچی ڕوقیە بۆ حەبەشە بوو، -حەبەشە لە ئەمڕۆدا بە ئەسیوبیا ناودەبرێ، دەکەوێتە لای چەپی دەریا لە بەرانبەر مەککەی پیرۆز-. دواتریش کۆچیکرد بۆ مەدینەی مونەووەرە تا بگاتەوە بە باوکی، بەم کۆچە دواییەی تا ڕادەیەک حەسایەوە.

ڕوقیە لە تافی لاوێتیدا بوو، بەڵام زۆر نەخۆش بوو، ڕوخساری زەرد هەڵگەڕابوو، چاوانی شەوقیان نەمابوو، بە تێپەڕبوونی کات تا دەهات باری تەندروستی خراپتر دەبوو، بەڵام مێردەکەی، بۆ یەک ساتیش بەجێی نەهێشت، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە هەمانشێوە ڕێگای بە مێردەکەی نەدا بچێت لەگەڵ سوپاکەدا، بەڵکو داوای لێکرد لە مەدینە بمێنێتەوەو بەدەم هاوسەرەکەیەوە بێت. عوسمان زۆر خەفەتی خوارد، چونکە لە لایەکەوە، باری تەندروستی خێزانەکەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بەرەو خراپتر دەچوو، لە لایەکیترەوە نەیتوانی یاوەری پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت. هەرکات ڕوقیە چاوی بکردایەتەوە، لە کاتێکدا کە دەینالاند بەدەم ئێش و ئازارەوە هەر ئەم پرسیارەی لە مێردەکەی دووبارە دەکردەوەو دەیوت: (ئایا باوکم هیچ هەواڵێکی هەیە؟).

عوسمان سەرگەرمی پاڕانەوە بوو لە خوای گەورە کە هەواڵی دڵخۆشکەر لە گۆڕەپانی جەنگەکەوە بگات، هاوکات داوای شیفای بۆ خێزانەکەی دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوا کە دەیزانی کچەکەی لە کاتێکدا لەسەر جێگای نەخۆشییە پێویستی بە تروسکاییەک ئومێد هەیە، سڵاوی خۆی لەگەڵ ئەو دوو کابرایەدا بۆ نارد کە فەرمانی پێکردن بڕۆن بۆ مەدینەی مونەووەرە.

دوو کابراکە لە مەدینە گەڕان بەدوای عوسماندا، کاتێ بینیان، سڵاوی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بە عوسماندا گەیاندە ڕوقیە، عوسمانیش خێرا گەڕایەوە بۆ لای خێزانەکەی، هەواڵەکەی پێدا. ڕوقیە زۆر دڵخۆشبوو بە سڵاوەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دەموچاوی گەشایەوە، چاوانی کەمێ شەوقیان بۆ گەڕایەوە، ئەو بەهۆی باوەڕی پتەویەوە بە خوای گەورە باکی نەبوو تەنانەت ئەگەر بەبێ بینینی باوکیشی گیانی بسپێرێ.

## ١٨١. فریشتە بەشداری شەڕەکە دەکەن

بەیانی ڕۆژی هەینی بەیانییەکی فێنک بوو، ئا لەو شەوەدا، ئاسمان کەمێ بارانی بەسەر دەشتی بەدردا باراند، موسڵمانان بەیانی زوو هەستان، کە لەدوای وەرگرتنی حەوانەوەی شەو هەستییان بە چالاکی دەکرد، چونکە ئەو شەوە بەشی پێویست خەوتبوون، ئەوەش بوو بووە مایەی هێزو لێبڕان تیایاند.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو شەوەی بە نوێژکردن و بە پاڕانەوە لە خوای گەورە بەسەربرد، هەرچەندە ئەو پێغەمبەری خوا بوو بەڵام هیچ کات لە دوعاو نوێژکردن نەدەوەستا، داوای لە پەروەردگاری کرد لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام خۆی و سەربازەکانی سەربخات.

لە بەیانییەکی زوودا، پێغەمبەر(ﷺ) سەرلەنوێ داوای لە سوپاکەی کرد ڕیز ببن تا ئامادەباشی بۆ شەڕەکە وەربگرن، پاشان لەپێش دەستپێکردنی شەڕەکە گەڕایەوە ناو چادرەکەی خۆی، بە پاڕانەوە ڕووی لە پەروەردگاری کرد، دەستی بەرزکردەوە بۆ ئاسمان، داوای لە خوای گەورە کرد یارمەتی بدات و پشتگیری لێبکات، وەها دەبینرا وەک بڵێی خۆیی لەبیرچووبێتەوە، بە قووڵی چووبووە ناو دوعاکردنەوە تا عەباکەی بێئەوەی هەستی پێبکات لەسەر شانەکانی داخزاو کەوتە سەر زەوی، ئەبوبەکری هاوەڵی لە نزیکییەوە وەستابوو، عەباکەی هەڵگرتەوە، سەرلەنوێ خستییەوە سەر هەردوو شانی پێغەمبەر(ﷺ)، پاشان بە هێمنییەوە پێیوت: ((ئەی پێغەمبەری خوا، با پاڕانەوەو داواکردنت لە خوای گەورەت

بەس بێت، چونکە ئەو زاتە ئەوەی کە بەڵێنی پێداویت بۆت جێبەجێ دەکات).

پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام بوو لە پاڕانەوە، بەڵام لە کتوپڕدا خەوی لێکەوت، پاش کەمێک بەئاگاهاتەوە. دەموچاوی زەردەخەنەیەکی ڕەزامەندی و ئاسودەیی پێوە دیاربوو. بانگی لە ئەبوبەکری هاوەڵی کردو پێیوت: ((مژدە بێت ئەبوبەکر، سەرکەوتنی خوای گەورەت بۆ هات!)) چاوانی ئەبوبەکر لەخۆشیدا دەدرەوشانەوە.

لە کاتژمێرەکانی داهاتوودا، شەڕ سەرلەنوێ دەستیپێکردەوە، سەرکردەی بێباوەڕان فەرمانی بە سەربازەکانیدا هێرش بکەنە سەر موسڵمانان. بەڵام ئایا خوای گەورە پێغەمبەرەکەی لەبەرانبەر هێرشێکی ئاوا نا دادپەروەردا بە تەنها دەهێڵێتەوە؟ مەعلومە کە نەخێر. جبرەئیل(ﷺ) بە سێ هەزار فریشتەوە هات بۆ یارمەتیدانی موسڵمانان، فریشتەکان تێکەڵبوون بە سوپای موسڵمانان، ئەوانیش کەوتنە شەڕکردن، عەلی و حەمزە شانبەشانی یەک لە ڕیزەکانی پێشەوە دەجەنگان.



لە ناوەختدا بێباوەڕان کەوتنە سەر لێواری تێکشکان، وەک بڵێی توانایان نەما لەسەر بەردەوامبوون لە شەڕکردن، بە تەواوەتی تێکشکان، لەناو ئەو پشێوییەدا، سەربازەکان ئەبو جەهلیان بینی کە بەدەم ئاهوناڵەو گیاندانەوە کەوتە سەر زەوی، ئیتر نەیتوانی هەستێتەوە، ئەوەتا سەرکردەکەیان مرد، سوپای هاوەڵگەران تووشی ترس و بیم هاتن، سەربازەکانیان لە گۆڕەپانی جەنگەکە بە ترس و تۆقینێکی گەورەوە کەوتنە هەڵاتن. چەکەکانیان لەدوای خۆیان جێدەهێشت.

سوپای قورەیش جگە لە زامدارەکان و کەرەستەو چەکەکانیان ئیتر کەسیتریان لە دەشتی بەدردا نەمایەوە، بەڕاستی خوای گەورە دۆعای پێغەمبەرەکەیی(ﷺ) گیرا کردو یارمەتی پێبەخشی،

موسڵمانان سەرکەوتن، دیلەکانیان قۆڵبەست کرد تا نەتوانن ڕابکەن. بەمجۆرە سوپای موسڵمانان کە ژمارەیان سێسەد کەس بوون توانیان سوپای هاوەڵگەران تێکبشکێنن کە سوپایەکی زەبەلاح بوو و ژمارەیان نزیکەی هەزار سەرباز بوون، هاوکات حەفتا کەسیان لێ بەدیلگرتن.

ئەوە هەمووی بە فەزڵی خوای گەورە بوو، کاتێک خۆر بەسەر تەپۆڵکە لماوییەکانەوە دادەبەزی و لە ئاسۆ وندەبوو، تەنها موسڵمانان لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا مابوونەوە. جەنگی بەدر بە یارمەتی خوای گەورە، بە قازانجی موسڵمانان تەواو بوو. سەرگوزەشتەکانی ئەو سەرکەوتنە گەورەیە هەر بەنەمری مایەوەو چەندین سەدەیە بە شانازییەوە دەگێڕدرێتەوە.

## ١٨٢. لە دوای شەڕەکە

موسڵمانان لە بەدر سەرکەوتنێکی چاوەڕواننەکراویان تۆمار کرد. جا بۆئەوەی هاوەڵگەران گیانی خۆیان ڕزگار بکەن، لە گۆڕەپانی شەڕەکە ڕایان کردو هەموو چەک و کەستە جەنگییەکان و شتانی حەوانەیان جێهێشت، گۆڕەپانەکە پڕبوو لە شتانێکی بە نرخ، لە خواردن و پۆشاک و پاچ و خاکەنازو قەڵغان و تیرو چەندین ئەسپ و وشتر کە بەبێ خاوەن دەسوڕانەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ماوەیەکی زۆر سەیری دۆڵەکەی کرد، حەزی نەدەکرد بەوجۆرە بەجێبیێڵێ، هەروەک چۆن بایەخی بە پاکوخاوێنی خۆیدەدا بەهەمانشێوە گرنگیدەدا بە پاکوخاوێنی ژینگەو دەوروبەرەکەی، هەربۆیە فەرمانیدا بەو موسڵمانانە کە لە دەوریدا بوون دۆڵەکە بگێڕنەوە سەر باری پێش جەنگەکە. موسڵمانان بە هاوکاری یەکتری کەوتنە پاککردنەوەی شوێنەکە، لە پێشەوە هاتن چەند گۆڕێکیان بۆ شەهیدەکان هەڵکەند، پاشان نوێژی جەنازەیان لەسەریان کردو بەخاکیان سپاردن، دوای ئەوە ڕۆیشتن بۆ شوێنی بێباوەڕان و مردووەکانیان بەخاکسپارد، ئینجا ئاژەڵەکان و شەخەڵی گۆڕەپانەکەیان کۆکردەوە، بەپێی یاساکانی جەنگ هەموو ئەو شتە بەنرخانە کە دوژمن لەدوای خۆی جێیهێشتبوون موسڵمانان بردنیان بۆ خۆیان، ئینجا هەموو شتێکیان کۆکردنەوە لە یەک شوێندا، ئەم هەڵسوکەوتەی پێغەمبەر(ﷺ) زەوق و جوانییەکی گەورە بوو، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەنانەت لە بارودۆخە سەختەکانیشدا هەندێ مەسەلەی گرنگ و زەروری لەبیر نەدەچوو.

ڕێگای بە موسڵمانان نەدا بگەڕێنەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە و دڵخۆشبن بە سەرکەوتنەکەیان، بەڵام دۆڵەکە لەسەر ئەو بارە شێواو و شپرزە جێبێڵن. ئیسلام ئەمەیە. ئەوەش پێغەمبەرەکەمانە. ئەمە لە کاتێکدا کە موسڵمانان لە مەدینە لە چاوەڕوانی گەڕانەوەی سوپا سەرکەوتووەکەیاندا ئارامیان لێبڕابوو، بەڵام خۆ نابێت ئەو سوپا سەرکەوتووە بگەڕێتەوە تا دۆڵی بەدر نەگێڕنەوە بۆ دۆخی جارانی. بەم هۆیەوە سێ ڕۆژ دوای تەواوبوونی شەڕەکە لە بەدر مانەوە. تا ئەو ئەرکەی پێیان سپێردرابوو بە تەواوەتی جێبەجێیان نەکرد نەگەڕانەوە بۆ شارەکەیان.

## ١٨٣. سەرمامبوونی دیلەکان

دیلەکانی جەنگەکە کە موسڵمانان گرتنیان بە ترسەوە چاوەڕوانیان دەکرد چونکە نەیاندەزانی چییان بەسەر دێ. لەو سەردەمەدا، دیلەکانی جەنگ دەیناننالاند بەدەست برسێتی و تینوێتییەوە، ئەو تەمەنەی کە مابوویان ناچاردەکران بە زۆرەملێ کاری سەخت و قورسیان پێدەکردن، وەک کۆیلە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرا، لەبەرئەوە دیلیی دادەنرا بە خراپتر لە مردن.

لە کاتێکدا کە دیلەکانی بێباوەڕان بە ترس و لەرزەوەو بەسەرشۆڕی و نائومێدییەوە ڕۆیشتن بەرەو مەدینەی مونەووەرە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سوپاسی خوای گەورەی دەکرد. کاتێ سوپای موسڵمانان گەیشتەوە مەدینە، موسڵمانان زۆر بە دڵخۆشییەوە پێشوازییەکی گەرمیان لە سوپاکە کرد. ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) چەک و ئەسپ و وشتر و هەموو ئەو شتانەی لە جەنگەکەدا دەستی موسڵمانان کەوتبوون بە یەکسانی دابەشیکردن بەسەر موسڵماناندا.

سەرە هاتە سەر دیلەکان، کەوتە پرسیارکردن لەوەی چییان لێبکات. ڕاستە ئەو پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، بەڵام هیچ کارێکی نەدەکرد تا ڕاوێژی بە هاوەڵان نەکردایە، بەم مەبەستە کۆیکردنەوەو پرسیاری لێکردن، یەکەمجار پرسیاری لە ئەبوبەکر کرد، ئەو وای پێباشبوو بە پارە ئازاد بکرێن، ئەوانە کوڕە ئامۆزان و لێبووردن لێیان چاکترە، بەڵکو خوای گەورەش هیدایەتیان بدات موسڵمان ببن، (فیدیە) بریتییە لە بڕێک پارە هەردوولای بەشەڕهاتوو لەسەری ڕێکدەکەون بۆ ئازادکردنی دیلەکان. پاشتر پێغەمبەری خوا(ﷺ)

ڕاوێژی بە عومەری کوڕی خەتتاب کرد، ئەو ڕای وابوو بکوژرێن، ئەویش بەهۆی ئەو ئازاردانەی کە پێشتر تووشی پێغەمبەرو موسڵمانانیان کردبوو. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) ڕاکەی ئەبوبەکری پێباشتر بوو، پاشان هەستاو گەڕایەوە ناو چادرەکەی خۆی، پاش ماوەیەک هاتەوە بۆ ناو کۆبوونەوەکە، فەرمووی کە بە ڕایەکەی ئەبوبەکر دەکات، ڕزگار دەکرێن و فیدیەیان لێ وەردەگیرێ.

بەڵام لەنێو دیلەکاندا کەسانێک هەبوون توانای فیدییەدانیان نەبوو چونکە هەژار بوون. موسڵمانان چارەسەریان بۆ ئەوانیش دۆزییەوە، کردیانە مەرج لەسەر ئەو دیلانەی کە خوێندنەوەو نوسینیان باش بوو هەریەکەیان لە بەرانبەر ئازادکردنییەوە دە منداڵی موسڵمانان فێری خوێندنەوەو نوسین بکەن، بەمشێوەیە پێشنیارەکە پەسەندکرا و جێبەجێ کرا، ئینجا ئەو دیلانەیان توانای فیدییەدانیان بوو گەڕانەوە بۆ مەککە، بەڵام ئەوانەیان ئەو توانایەیان نەبوو لە مەدینە مانەوە بۆ ئەوەی هەریەکەیان دە منداڵی موسڵمان فێری خوێندنەوەو نوسین بکات.

دیلەکان ئەو هەڵسوکەوتە جوانەی موسڵمانان کە لەگەڵیاندا کردیان زۆر بەلایانەوە سەیر بوو، جگە لە بەزەیی و سۆزو هەڵسوکەوتی جوان شتێکی خراپیان لە موسڵمانان نەبینی، هیچ جۆرە جنێوپێدانێکیان لێیانەوە نەبیست، ئازاریان نەدان، هەرکامێکیان ئازاد کرابوو، سەری سوڕمابوو لەو نرخ و بەهایە کە ئیسلام بە ژیانی مرۆڤی دەدات. هەروەها بەلایانەوە سەیر بوو کە خوێندنەوەو نوسین ئەوەندە بایەخی لای ئەوان هەیە. هەر هەموویان لە گەورەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و جوانی ئاینی ئیسلام تێگەیشتن.

## ١٨٤. مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدیلگیرا

عەبباس بچوکترین مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو. هەر لە منداڵییەوە لە یەکەوە نزیکبوون، پێکەوە گەورە بوون. چەندین یادەوەری هاوبەشیان پێکەوە هەبوو، بەڵام لەدوای هاتنی وەحی عەبباس چووە ڕیزی قورەیشەوە، جا هەرچەندە ئەو کارەی عەبباس پێغەمبەری(ﷺ) خەمبار کرد، بەڵام هیچ دەستەڵاتێکی نەبوو جگە لەوە لە خوای گەورە بپاڕێتەوە هیدایەتی بدات، عەبباس لە جەنگی بەدردا بەدیلگیرا. حاڵی ئەویش وەک حاڵی دیلەکانی تر بوو، لە بەرانبەر چەند مەرجێکی دیاریکراوەوە ئازاد کرا.



پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە عەبباسی مامی فەرموو: ((ئەی عەبباس، فیدیەی خۆت و برازاکەت بدە)). عەبباس وەڵامیدایەوە وتی: (پارەم نیە). ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لێکرد: ((ئەی ئەو پارەیەت کوا کە لە مەککە داتنابوو؟ چونکە کاتێ لای دایکی فەزڵ هاتیتە دەرەوە و کەسیترتان لا نەبوو، وتت ئەگەر لەم سەفەرەمدا تووشهاتم ئەوا ئەوەندە بۆ فەزڵ و ئەوەندەش بۆ قوسم و ئەوەندەش بۆ عەبدوالله)). عەبباس زۆر سەری سوڕما لەو قسەوباسە ئینجا وتی: (سوێند بەو کەسە تۆی بە هەق ڕەوانەکردووە جگە لە خۆم و دایکی فەزڵ نەبێت کەسی تر ئاگادار نەبووە بەسەر ئەو باسەدا، ئێستە ئیتر دەزانم کە تۆ پێغەمبەری خوای).

دڵی عەبباس لە بەرانبەر پێغەمبەرایەتی موحەممەدەوە کە لەگەڵیدا گەورە بووە هیچ جۆرە گومانێکی تێدا نەبوو، جگە لە ڕاستگۆیی و ئەمانەتپارێزی هیچیتری لێنەدیبوو، وا هەستی بەخۆی

کرد کە وا ڕۆشنایی خۆر لەسەر دڵی هەڵدێ، ئینجا هەستا بە ئەنجامدانی ئەو کارەی کە بۆ چەندین ساڵە هەر ڕەتیکردووەتەوە، ڕاستەوخۆ شایەتومانی هێناو موسڵمان بوو.

عەبباس ویستی بگەڕێتەوە بۆ ناو قورەیش تا ڕێگرییان بکات لەوەی ئازاری موسڵمانان بدەن، لەبەرئەوە ئیسلامبوونەکەیی بە نهێنی هێشتەوە، موحەممەدی برازای بەمجۆرە بووە پێغەمبەرو سەرکردەی.

## ١٨٥. شەوێک لەلای پێغەمبەری خوا(ﷺ)

عەبدوالله کە کوڕی عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، منداڵێکی چاک و جوان و دڵپاک بوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، حەزینەدەکرد لێی دووربکەوێتەوە، پوری عەبدوالله لەدایکەوە خێزانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، عەبدوالله کەوتە خولیای زیاتر شارەزابوون بەسەر ڕەفتاری پێغەمبەری خوادا(ﷺ) لەناو ماڵەکەی خۆیدا. داوای مۆڵەتی لە پوری کرد تا شەوێک لایان بمێنێتەوە، زۆر بەپەرۆشبوو چونکە دەیویست بزانێت پێغەمبەر(ﷺ) هەڵسوکەوتی چۆنە لە ماڵی خۆیدا. کاتێ ئێوارە هات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، زۆر حەزی لە میوان دەکردو لەپێناو ئاسودەکردنیان ئەوەی لە توانایدا بوایە ئەنجامیدەدا.

کاتێک عەبدوالڵەی بینی زۆری پێخۆشبوو، گرنگییەکی تایبەتی پێدا، بە هێمنی و ئارامی نانی ئێوارەیان پێکەوە خوارد. تا درەنگانی شەو هەر قسەی لەگەڵ عەبباسدا دەکرد، کاتێ کاتی نوستن هات، عەبدوالله ویستی لە هەمان ژووری نوستنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵیدا بخەوێ. بەڵام شڵەژاو نەیزانی چۆن ئەو داوایەی بە پێغەمبەر(ﷺ) بگەیەنێت. پێغەمبەر زانی کە عەبدوالله چیدەوێت هەربۆیە بانگهێشتی کرد تا لە ژوورەکەی ئەودا بخەوێ، پێغەمبەرو عەبدوالله لەسەر یەک سەرین خەوتن، بۆنی عەتری پێغەمبەر(ﷺ) ژوورەکەی پڕ کرد، لە نیوە شەودا، عەبدوالڵەی منداڵ بەئاگاهاتەوەو بینی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەتەنیشتییەوە نیە، گەڕا بەدوایدا، سەیریکرد وا لە پەنجەرەکەوە سەرنجی ئاسمان دەدات، بێئەوەی عەبدوالله

هیچ دەنگێکی لێبێت لەسەر جێگاکەی ڕاکشایەوەو لەوێوە کەوتە سەرنجدانی پێغەمبەر(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) بەدەم ڕوانین بۆ مانگ و ئەستێرەکان دەستیکرد بە خوێندنی ئەم چەند ئایەتە لە قورئانی پیرۆز: ﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الْأَلْبَابِ ، الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ ﴾ (آل عمران: ١٩٠ - ١٩١)

عەبدوالله بە سەرسامییەوە چاودێری دەکرد. دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) ددانەکانی بە سیواک پاککردەوە، دەستیکرد بە شەونوێژ، هەتا درەنگانێکی شەو هەر نوێژی کرد، داوای لە خوای گەورە کرد لە هەموو باوەڕداران خۆش ببێ. کە بەرەبەیان هات دەنگی بانگدانەکەی بیلال دەبیسترا. پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشت بۆ نوێژکردن بۆ مزگەوت، ئەو شەوەی لە نوێژو لە پەرستشکردنا بەسەربرد، ئەوکات عەبدوالله هەستاو دەستنوێژی گرت پاشان ڕۆیشت تا بگات بەو نوێژخوێنانە کە ئامادەی نوێژی بەیانی بوون.

## ١٨٦. هاوڕێ کەم تەمەنەکان

هەندێجار، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر وشتر یان ئەسپ منداڵانی لە پشت خۆیەوە سوار دەکرد، دەیبردن بۆ گەڕان و سەیران، جاری وابوو سێ منداڵی بە یەکجار هەڵدەگرت. ئا لەو کاتانەدا، منداڵان لە خۆشیاندا هەر ئەوە نەبوو لە خۆشیدا بفڕن، کاتێ دەچوونە سەرپشتی وشترەکەی بەختەوەریی سەراپای جەستەیانی دادەپۆشی. یان لە باوەشیدا دایدەنان، یان دەچوونە سەرپشتی. پێغەمبەریش(ﷺ) قسەی بۆدەکردن و فێری زۆرێک لە کارە جوانەکانی دەکردن.

ڕۆژێکیان، عەبدوڵڵەی خستە سەرپشتی وشترەکەی، بە هەردوو دەستی توند عەبدوڵڵەی گرت، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: (ئەی کوڕەکە)، عەبباس وەڵامیدایەوە: (بەڵێ ئەی پێغەمبەری خوا). ئینجا فەرمووی: ((خوای گەورە بپەرستە دەتپارێزێ، خوا بپەرستە دەیبینی لەپێشتەوەیە، لە کاتی خۆشیدا خوا بناسە ئەویش لە کاتی تەنگانەدا دەتناسێ، هەرکات داوایەکت هەبوو تەنها لە خوای گەورەی داوا بکە، ئەگەر یارمەتیت داواکرد تەنها لە خوای گەورە داوای یارمەتی بکە، دڵنیابە پێنوس کۆڵە لە لێکدانەوەی ئەوەی کە دەبێت ڕووبدات، ئەگەر هەمووی خەڵکی بیانەوێت سودێکت پێبگەیەنن ئەوا ئەگەر خوای گەورە بۆی نەنوسیبیت ئەوان دەستەوسانن لەوەی بتوانن بۆت جێبەجێ بکەن، وە ئەگەر ویستییان خراپەیەکت پێبگەیەنن ئەوا ئەگەر خوای گەورە نەینوسیبێت لەسەرت ئەوان ناتوان ئەو زیانەت پێبگەیەنن، ئەوەش بزانە ئەگەر ئارامبگریت لەسەر ئەوە

کە پێتناخۆشە خێرو چاکەی زۆری تێدایە، بزانە سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتندایە، بزانە کە لەگەڵ هەموو ناڕەحەتییەکدا دەروویەکی خێر هەیە، ئەوە بزانە لەگەڵ هەر تەنگانەیەکدا کرانەوەو ئاسانکاریی هەیە)).

عەبدوالله بەدرێژایی تەمەنی ئەو وشە پڕ لە حیکمەتانەی لەبیر نەکرد، بەردەوام کاری پێدەکردن، بەڵێنی بەخۆیدا ئەو ساتە بەنرخانە لەبیر نەکات کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بەسەریبردن.

## ١٨٧. زەید، ڕازگری پێغەمبەری خوایە(ﷺ)

زەید کوڕێکی بێباوک بوو، پێش چەندین ساڵ لەوەوبەر باوکی مردبوو، کەسێکی نەبوو سەرپەرشتی بکات یان گرنگی بە پەروەردەکردنی بدات، لەبەرئەوە، هەستی بە تەنیایی دەکرد، چاوانی پڕبوون لە خەم و پەژارە چونکە دەیویست ببێتە کەسێکی گەورەو خوێندەوار. زەید زۆر زیرەک بوو، ئەگەر بێتو بتوانێ خوێندنێکی باش بەدەستبێنێ ئەوا سودی زۆر پێشکەش بە مرۆڤایەتی دەکات.

لەدوای جەنگی بەدر، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چارەسەرێکی بۆ منداڵانی وەک زەید دۆزییەوە، ئەوانەی کە دەیانویست فێری خوێندنەوەو نوسین ببن، ئەو هەلەیان پێشتر بۆ نەڕەخسابوو، هەربۆیە مەرجێکی سەپاند بەسەر دیلەکانی قورەیشدا کە دەبێت لەبەرانبەر ئازادکردنیان هەریەکەیان دە منداڵ لە منداڵانی موسڵمانان فێری خوێندنەوەو نوسین بکات، کاتێکیش ئەو دیلانە زانیان کە ئازادی تەواویان بۆ دەگەڕێتەوە بەخۆشییەوە هاتن بەدەم جێبەجێکردنی ئەو کارەوە.

زەید یەکێک بوو لە منداڵە خۆشبەختەکان، چونکە لە ماوەیەکی کورتدا فێری خوێندنەوەو نوسین بوو، ئەمەش زۆر دڵخۆشی کرد، سوپاسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد کە ئەو دەرفەتەی بۆ ڕەخساند، پێغەمبەر(ﷺ) گرنگییەکی تایبەتی دەدا بەو منداڵانەی کە وەک زەید بێباوک بوون، لێیان نزیکدەبوویەوە، دەستی دەهێنا بەسەریاندا، بەپێی گونجان پارەی دەدانێ و پرسیاری لێدەکرن لەبارەی ئەو گرفتانەوە ڕووی تێدەکردن.

مەعلوم کە سەرنجەکانی زەید و سیمای ڕوخساری سەرنجی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) ڕاکێشابوو. پێغەمبەریش(ﷺ) دەیویست زەید ببێتە خوێندەوارێکی باش و زمانێکی بیانی فێر ببێت، چونکە بەو زمانە زەید دەتوانێ پەیوەندی و لێکتێگەیشتن لەگەڵ غەیرە عەرەبدا دروستبکات، ئەو مەسەلەیە هەلێکی گەورەی بۆ زەید ڕەخساند، دواتر سودی زۆری پێگەیاند، گوێڕایەڵی حەزەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بوو. فێری زمانێکی بیانی بوو کە زمانی سریانی بوو. سریانی لەو سەردەمەدا زمانێکی گرنگ بوو و لە وڵاتی شامدا قسەی پێدەکرا. زەید بە باشی فێری زمانی سریانی بوو، وایلێهات بە خوێندنەوەو نوسین و بە قسەکردن شارەزایی تەواوی تێدا پەیدا بکات، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) زەیدی لەگەڵ خۆی برد بۆماڵەوە، کردییە یارمەتیدەدری تایبەتی خۆی. کاتێک نامەیەکی بە زمانی سریانی بەدەست بگەیشتایە، داوای لە زەید دەکرد بیخوێنێتەوە بۆی و پاشان داوای لێدەکرد وەڵامی بداتەوە.

زەید زۆر دڵخۆشبوو بەم پلەو پایەیە، ئەویش بە فەزڵی خوو جوانی و ئیجتهادە ڕاستەکان و بیرتیژییەکەی سەرکەوتوو بوو و بووبە ڕازگری نهێنی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

لە ماوەیەکی کەمدا، زەید فێری چەند زمانێکی تریش بوو وەک زمانی عیبری جولەکە، بەم پێیەش لە منداڵێکی بێباوکی هەژاری بێ سەرپەرشتەوە بووە نزیکترین کەس لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) و یەکەمین یارمەتیدەری، جا ئەگەر خۆشەویستی و گرنگیپێدانی پێغەمبەر(ﷺ) نەبوایە هەرگیز ئەو ئاواتەی بەدی نەدەهات، ئیتر لەو کاتەوە شادی و گەشاوەیی لە نێوچاوانی زەید نەبڕا.

## ١٨٨. پێغەمبەرێکی لێبوردە

موسڵمانان بە سەرکەوتنیان لە جەنگی بەدر زۆر دڵخۆشبوون، ژمارەی موسڵمانان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتری دەکرد، ئاینی ئیسلامیش زیاتر بڵاودەبوویەوە، بەڵام دوژمنانی ئیسلام، هەستییان بە نائومێدییەکی گەورە کرد. نەیاندەزانی چیبکەن، چونکە ئەگەر مەسەلەکە بەدەستی ئەوان بوایە ئەوا بەتەواوەتی موسڵمانانیان لەناودەبرد، بەڵام توانای ئەوەیان نەبوو. کاتێک جووەکان پێکەوە کۆدەبوونەوە، لەنێو خۆیاندا دەیانوت: (نیشانەکانی ئەم پێغەمبەرە لە کتێبە پیرزەکەی ئێمەدا لە تەوراتدا باسکراون، لێرە بەولاوە ئیتر کەس ناتوانێت بەرڕوویدا بوەستێ). بەڵام وێڕای ئەوە هەر چپەچپیان بوو کە چۆن ئازار بە موسڵمانان بگەیەنن، بۆیە بەردەوامبوون لە پیلانگێڕی لە دژیان.

کاتێک ئەو پیلانانە دارێژران، عەبدوللە کوڕی ئوبەی، سەرۆکی دووڕووەکان بە نهێنی هاوکاری و یارمەتی پێشکەش دەکردن. لەگەڵ هەر دەرفەتێکدا بۆی بڕەخسایە بە خراپە باسی ئیسلامی دەکرد، ئەوەی لە توانایدا بوو بە خەرجیدا لەپێناو لاوازکردنی باوەڕی موسڵمانان و متمانەیان بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ). هەندێ کەس پێغەمبەری خوایان(ﷺ) ئاگادارکرد بەوەی ئەو دووڕووە دژ بە ئیسلام دەیڵێت و دەیکات. ڕۆژێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) بانگیکردو پرسیاری لێکرد کە ئایا ئەوەی لەبارەیەوە بیستویەتی ڕاستە یان نا، جا یەکێک لە هەرە زەقترینی نیشانەی دووڕوو ئەوەیە کە کەسێکی دووڕووە، لەبەرئەوە، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) فشاری

خستەسەر عەبدوالله کوڕی ئوبەی درۆیکردو وتی: (نەخێر، بەخوا شتی وام نەوتووە، ئەوانە درۆ دەکەن).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) باش دەیزانی کە عەبدوالله کوڕی ئوبەی درۆزنە، ئاگاداربوو بەسەر هەموو ئەو کارە خراپانەدا کە ئەنجامیدەدان، بەڵام ئەو(ﷺ) عادەتی وابوو بە هەڵەکانیان ڕووبەڕووی کەسانیتر نەدەبوویەوە، بۆیە بەوپەڕی ئارامگرتنەوە چاوەڕوانیکرد تا بەڵکو ڕۆژێک بێت عەبدوالله خۆی هەست بە هەڵەکانی خۆی بکات. هەروەها ئومێدخواز بوو لە پشتی ئەم کەسە کەسانێکی چاکەخواز پەیدا ببن، بەو هیوایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) ئارامیگرت لەسەر کوڕەکەی ئوبەی و هاوڕێکانی، لە خوای گەورە دەپاڕایەوە و داوای هیدایەتی بۆ ئەوانە دەکرد کە ناخیان خراپەی دژ بە موسڵمانان تێدایە.

## ١٨٩. پێشێلکردنی ڕێکەوتننامە

کێشـەکانی نێـوان موسـڵمانان و جووەکانـی مەدینـە ڕۆژ لـەدوای ڕۆژ لـە زیادبووندا بـوون، کاتێـک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـۆی ڕوونبوویـەوە کـە جـووەکان ڕێـز لـە بەندەکانـی ئـەو ڕێکەوتننامەیـە ناگرن کـە ئیمزایان کردووە لەگەڵیدا، هەستا گەورەکەیانی بانگهێشت کـرد تـا لەگەڵیـدا ڕێکبکـەوێ.

جـووەکان هاتـن بـۆ کۆبوونەوەکـە، بـۆ جارێکـی تریـش داوای لێکـردن موسـڵمان ببـن، پێیوتـن وازبێنـن لـە سـەرپێچیکردنی خـوای گـەورە، هۆشـداری پێدان لـە سـەرئەنجامی خراپـی ئـەو کێشـانە کـە لەنێوان ئـەوان و موسـڵماناندا لـە زیادبووندان، بەئـاگای هێنانـەوە لـە مەترسـی ناپاکیکـردن بەرانبـەر ڕێکەوتننامەکـە، هەروەهـا باسـی ئـەو سـزا سـەختەی بێباوەڕانـی بۆکـردن کـە لـە بـەدردا بەسـەریاندا هـات، داوای لێکـردن پەنـد لـەو ڕووداوە وەربگـرن کـە بەسـەر ئەواندا هـات.

بـەڵام جـووەکان زۆر بـە ناشـیرین هەڵسـوکەوتیان کـرد. لێکتێگەیشـتنیان لەگـەڵ پێغەمبـەری خـوادا(ﷺ) ڕەتکـردەوە، هـاوکات گاڵتەیـان هـات بـە ئامۆژگارییەکانی. وتیـان: (ئێمـە لـە شـەڕکردنی ئێـوە لەگەڵمـان ناترسـین). ئـەم ڕەفتـارە هەڵەشـانەو ڕەقـە وای لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) کـرد بەخۆیـدا بچێتـەوەو هەڵوێسـتی تـر وەربگـرێ، بەڕاسـتی ئـەوان هەڵەیەکـی گەورەیـان کـرد کاتـێ داوای ڕاسـتگۆیانەی ئەویـان ڕەتکـردەوە. ئەمـە لـە کاتێکـدا کـە پێغەمبـەر(ﷺ) نیەتپاکـی جوانـی لەگەڵیانـدا بەخەرجـدا، بـەڵام شـتێکی ڕوون و ئاشـکرابوو کـە ئـەوان ڕازینەبـوون واز لـە کردەوەکانیـان بێنـن. دوای ئـەوە جـووەکان

کۆبوونەوەکەیان جێهێشت، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانێکی لە خوای گەورەوە پێگەیشت. کە بڕیار وەرگیرابوو بە یەکلاکردنەوەی مەسەلەکە، ئەویش ڕاگەیاندنی شەڕە لەسەر جووەکانی مەدینە.

جووەکان هەموو دەرگاکانیان بەڕووی لێکتێگەیشتن لەگەڵ موسڵمانان داخست، هیچ بژاردەیەکی تریان جگە لە شەڕکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نەهێشتەوە. ڕۆژی دواتر ئامادەباشی دەستپێکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاڵا سپییەکەی خۆی دایە دەست حەمزە، لەگەڵ ژمارەیەک لە سەربازەکان ڕۆیشتن بەرەو جووەکانی مەدینە، ئێستە ئیتر کاتی ئەوە هاتووە وانەیەکی ئەوانە دابدەن کە بەڵێنیان شکاند.

کاتێ جووەکان بیستییان کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سوپاکەیەوە بەرەو ڕوویان دەڕوات، بە هەڵەداوان و بە ترسەوە خۆیان لە قەڵا قایمەکانیاندا کە دەورەی گەڕەکەکەیانی دابوو لە مەدینە شاردەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سوپاکەی گەمارۆی خستە سەریان، گەمارۆدانەکە پێنج ڕۆژی خایاند، دواجار جووەکان هیچ چارەیەکی تریان نەبوو ئەوە نەبێت خۆیان ڕادەست بکەن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) متمانەی پێیان نەبوو چونکە پێشتر ناپاکییان بەرانبەر بەڵێننامەکە کردبوو. هاوڕێ دووڕووەکەشیان عەبدوڵڵە کوڕی ئوبەی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و کەوتە پاڕانەوە بۆیان و وتی: (ئەی موحەممەد، چاکەکاربە لەگەڵ ژێردەستەکانتدا). پێغەمبەر(ﷺ) بێدەنگ بوو، بەڵام عەبدوڵڵە هەر بەردەوام بوو لەسەر داواکەی، پێغەمبەر(ﷺ) پشتی تێکرد کەچی ئەو هەر داکۆکی لێدەکرد و بەدەوریدا دەسوڕایەوە. لەڕاستیدا ئەگەر جووەکان بەردەوامبن لە ژیان بەسەربردن لە مەدینەی مونەووەرە، ئەوا درێژە دەدەن بە کردەوە خراپەکانیان، ژیان لە موسڵمانان تێکدەدەن، هەرکاتیش شەڕ لەگەڵ دوژمندا هەڵگیرسا

ئەوا دەبنە یارمەتیدەری دوژمن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیری لەو ئەگەرانە کردەوە، کەوتە گەڕان بەدوای چارەسەرێکی گونجاودا، دواجار، بڕیاریدا لە مەدینە دەریانبکات، بەو هۆیەوە داوای لێکردن بە زووترین کات مەدینە جێبێڵن، کۆچبکەن بۆ شام.

جووەکان دڵخۆشبوون چونکە ژیانیان سەلامەت دەبێت، خێرا مەدینەیان جێهێشت، موسڵمانانیش ڕزگاریان بوو لەو کێشانە کە جوو بۆی دروستکردبوون.

## ١٩٠. ڕۆژی هەینی

هەر ئاینێک ڕۆژێکی پەرستشی جیاکاری تایبەت بەخۆی هەیە، ڕۆژی شەممە هی جووە. مەسیحییەکانیش ڕۆژی یەک شەممەیان هەیە، بەڵام موسڵمانان ڕۆژی تایبەت بەخۆیان بۆ پەرستشکردنێکی دیایکراو ڕۆژی هەینییە. تەنانەت دادەنرێ بە جەژنیان، خەڵکی تیایدا دەڕۆن بۆ مزگەوتەکان و گوێبیستی وتاری هەینی دەبن و نوێژەکەیان بە کۆمەڵ دەکەن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانان هاندەدات لەسەر خۆشۆردن لە ڕۆژی هەینیدا، لەسەر پۆشینی پۆشاکی پاک و جوان، بۆنخۆشکردن، لەبارەی ڕۆژی هەینییەوە دەفەرموێ: ((چاکترین ڕۆژێک کە خۆری لەسەر هەڵاتبێ ڕۆژی هەینییە)). هەروەها(ﷺ) دەفەرموێ: ((هەرکەس لە ڕۆژی هەینیدا خۆی بشوات و بەپێی توانا پاکوخاوێنی خۆی بکات، پاشان بۆنی خۆش لە خۆی بدات، ئینجا بڕوات بۆ مزگەوت و نەچێت بەسەر موسڵماناندا، ئینجا کاتێ وتاربێژ چووە سەر مینبەر ئەم بێدەنگ بێت، ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی نێوان ئەو هەینییەو هەینی داهاتووی خۆشدەبێت)). ئا بەمشێوەیە باسی گرنگێتی ڕۆژی هەینی بۆ موسڵمانان دەکات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستوویەتی موسڵمانان لە هەموو ڕۆژێکی هەینیدا لە مزگەوت کۆببنەوە، لەبەرئەوە هانیدەدان لەسەر زوو ئامادەبوون لە مزگەوتدا و دەیفەرموو: ((هەرکە ڕۆژی هەینی هات فریشتەکان لەسەر دەرگای مزگەوت دەوەستن، ئامادەبووان یەک لەدوای یەک تۆمار دەکەن، یەکەم کەسی ئامادەبوو وەک ئەو کەسە

وایە وشترێک بکات بە خێر، کەسی دوای ئەو وەک ئەو کەسە وایە مانگایەک بکات بە خێر، دوای ئەو وەک ئەو کەسە وایە بەرانێک بکاتە خێر، ئینجا مریشکێک، ئینجا هێلکەیەک، هەرکات وتارخوێن چووە سەر مینبەر قورئانەکانیان دەپێچنەوەو گوێبیستی قورئان و ئامۆژگاری دەبن)). چونکە ئەو موسڵمانانەی کە گوێبیستی دەبن هەوڵدەدەن چاوی لێبکەن.

هەرجارێ کە هەینی دێت، موسڵمانان خۆیان دەشۆن، پاشان پۆشاکی پاکوخاوێن لەبەر دەکەن، خۆیان بۆنخۆش دەکەن، دڵی هەژاران بە خێرکردن و یارمەتیدانیان خۆش دەکەن، بەمجۆرە گرنگیێتی ڕۆژی هەینی لەنێوان خەڵکیدا بڵاوبوویەوە. لە دێرزەمانەوە پێغەمبەر خوا(ﷺ) ڕۆژی هەینی داناوە بە جەژنی هەفتانەی موسڵمانان.

## ١٩١. شادیی و خۆشی لە شاری مەدینەی مونەووەرە

دوو ساڵ بەسەر کۆچی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بۆ مەدینەی مونەووەرە تێپەڕی. دواتریش شادی و خۆشییەکی تر هات کە هەموو شوێنێکی ئەو شارەی گرتەوە، ئەویش ئەوەبوو فەرمانێکی نوێ لە خوای گەورەوە لەم ئایەتەدا بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتەخوارەوە کە دەفەرمووی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴾ (البقرة: ١٨٣).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی بە فەرمانەکە ئاگادارکرد، ئەوانیش زۆر دڵخۆشبوون. چونکە لەمەولا بەدرێژایی مانگی ڕەمەزان بەڕۆژوو دەبن. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێیان: پێویستە لەسەرتان نیەتی ڕۆژووگرتن بێنن، ئینجا باسی خێرو سودەکانی پارشێوکردنی بۆکردن، ئەویش بریتییە لەو ژەمە خواردنە کە موسڵمانان لەپێش نوێژی بەیانی دەیخۆن، ئەویش بۆ بەهێزکردنی جەستەیانە، تا لە ماوەی ڕۆژەکەدا زۆر هەست بە برسێتی نەکەن، هەروەها فێری کردن کە دەبێ کاتێ بەڕۆژوو دەبن چیبکەن و خۆیان لە چی بگرنەوە، موسڵمانانیش گوێڕایەڵی بوون، لەڕاستیدا بۆنەی شیرینی ڕەمەزان شەقامەکانی مەدینەی پڕکرد لە خۆشی.

یەکەمجار کە وەحی دابەزێنرایە سەر پێغەمبەر(ﷺ) لە مانگی ڕەمەزاندا بوو، قورئانیش کۆتا کتێبی ئاسمانە کە هاتبێتە خوارەوەوە، لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا مانگی ڕەمەزان بە مانگی قورئان دادەنێ. لەمبارەیەوە بۆ هاندانی موسڵمانان لەسەر قورئانخوێندن دەفەرموێ: ((هەرکەس یەک پیت لە پەڕاوەکەی خوای گەورە بخوێنێ ئەوا

چاکەیەکی بۆ دەنوسرێ، هەرچاکەیەکیش بە دە چاکەیە، من ناڵێم (ألم) بە هەموویەوە یەک پیتە بەڵکو دەڵێم ئەلف پیتێکە، لام پیتێکە، میم پیتێکە)). ئەمەش بۆ موسڵمان هەلێکەو قەرەبوو ناکرێتەوە، بەمشێوەیە موسڵمانان دەستیاندایە زۆر خوێندنەوەی قورئانی پیرۆز، دەنگیان لە هەموو ماڵەکانەوە بەرزدەبوویەوە.

موسڵمانان چاویان بڕیبووە هەموو جووڵەیەک لە جموجووڵەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، هەموو دانیشتن و بێدەنگییەکی، چونکە بەردەوام سودی نوێ لێیەوە فێردەبوون. بەو هۆیەوە، هەموو گوفتارێکیان لەبەرکرد، ژیانیان لەسەر سوننەتەکەی بوو، حەزی لەوە بوو خواردنەکەی لەگەڵ میوانەکانیدا بەش بکات. دەیفەرموو میوان بەرکەت لەگەڵ خۆیدا دێنێ، ئەوەی کە زۆر حەزی لێدەکرد ناندان بوو بە هەژاران و یارمەتیدانی خاوەن پێویستییەکان. کاتێکیش دەیفەرموو کە پاداشتی ئەو کارانە لە ڕەمەزاندا چەندبارە پاداشتی زیاتریان هەیە، ئیتر موسڵمانان هەوڵیاندەدا بەبێ میوان لەسەر سفرەکانیان دانەنیشن.



پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی دەفەرموون کە ڕۆژوو بریتی نیە تەنها لە خواردن و خواردنەوە، بەڵکو دەبێت ڕۆژووەوان چاودێری بیرو ڕەفتارەکانی خۆی بکات، ئامۆژگاری دەکردن کە هەرکات یەکێکیان تورە بوو لە کاتێکدا کە بەڕۆژووە با بڵێ: من بەڕۆژووم، من بەڕۆژووم، چونکە ڕۆژوو واتە ئارامگرتن.

واتای ڕاستەقینەی ڕۆژوو خۆی لە پاککردنەوەی دەروونندا وێنا دەکات. لەگەڵیدا پەی بەوە دەبەین کە ئێمە چەندە لاوازین و نەتوانایین لەبەردەم زاتی خوای باڵادەستدا کە سەرچاوەی هەموو نیعمەتەکانە لەم جیهانەدا. چونکە ئێمە تا ئەو مۆڵەتمان نەدات خواردن ناخۆین، لەبەرئەوە، بەڵێنی پاداشتی گەورەی بە ڕۆژووەوان داوە. لەو پێناوەدا موسڵمانانی مەدینە هەستییان بە ڕازیبوون کردو بەختەوەرییەک کە وەسفناکرێ سەراپای دەروون و جەستەیانی گرتەوە.

## ١٩٢. دڵۆپێک لە دەریای گەنجینەکان

هەر لە یەکەمین ڕۆژەکانی ڕەمەزانەوە، هەموو شوێنێکی مەدینە چالاکی و گوڕوتینی بەخۆیەوە دەبینی. ئەو منداڵانەی کە بۆ یەکەمجار بەرۆژوو دەبوون لە چاوەڕوانی بانگی مەغریبدا بوون بەجۆرێ کە ئارامیان لێبڕابوو. کاتێکیش ساتی ڕۆژووکردنەوە دەهات بە خێرایی دەچوونە سەر سفرە، ڕۆژووکردنەوە ئەو ناوەیە کە نراوە لە ژەمی خواردنی ئێواران لە مانگی ڕەمەزاندا کە کۆتایی بە ڕۆژووگرتنی ئەو ڕۆژە دێنێ.

بەڕاستی تام و چێژی خواردنی خورماو نانی وشک تامێکە وەسفناکرێ، ئاویش تامێکی تری هەیە کە تینوییەتی ئەو ڕۆژە دەشکێنێ.

ئەهلی صوففە ئەو قوتابیانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوون کە ژیانی خۆیان تەرخانکرد بۆ مەعریفەو فێربوون. هەریەک لەوان هەوڵێکی زۆری دەدا بۆ خوێندن و فێربوون و ئەنجامدانی سروتەکانی ئیسلام لەگەڵ پێغەمبەری خۆشەویستمان بە باشترین شێوە.

تەنانەت کاتێ هەستییان بە برسێتی و تینویەتی دەکرد ئەوا ڕووناکی ئەو مەعریفەیە کە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) بەدەستیان هێنابوو بۆ ئەوان بەس بوو، ئەو هاوەڵانە تەنانەت جگە لە مانگی ڕەمەزانیش زۆر بەڕۆژوو دەبوون، ئەوان ڕۆژانێکیان بەسەردا دەهات تەنانەت لە کاتی ڕۆژووکردنەوەو پارشێویشدا خواردنی ئەو ڕۆژەیان نەبوو. لە ڕۆژانی یەکەمی ڕەمەزاندا ڕۆژانێکی سەختیان لە برسێتی و ماندووبوون بەڕێکرد، هی وایان هەبوو دوو ڕۆژ لەسەر

یەک بەڕۆژوو دەبوو بێئەوەی بۆ ئێوارە شتێکی هەبێت بیخوات. بەڵام دیارە کەس بەمەی نەزانیوە، ئەمەش وایلێکردن جەستەیان تووشی لاوازییەکی زۆر هات، دواجار وایانلێهات بەرگەی ئەو حاڵەتەیان نەدەگرت، لێرەوە چوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و حاڵی خۆیانیان بۆ باسکرد.

هەر خێرا، کەسێکی نارد بۆ ماڵەکەی خۆی تا شتێک بێنێ بۆیان بەڵام بەدەستی بەتاڵ گەڕایەوەو هیچی دەستنەکەوت، چونکە ئەو خواردنەی لە ماڵیاندا هەبوو هەمووی دابەشکرابوو بەسەر هەژاراندا. ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەهلی صوففەی کۆکردەوەو لە خوای گەورە پاڕایەوە تا بە فەزڵی خۆی شتێک بڕێژێ بەسەریاندا. ئەوانیش وتیان (ئامین).

هێشتا پێغەمبەر(ﷺ) پاڕانەوەکەیی تەواو نەکردبوو کەسێک تەقەی دا لە دەرگا، کاتێک بۆیان کردەوە بینیان وا کەسێک سینییەکی هەڵگرتووە کە پارچەیەک گۆشت و هەندێ نانی لەسەر بوو، بەم پێیە پەروەردگاری جیهانیان بە فەزڵی دوعاکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) یارمەتی بۆناردن. لە کاتێکدا ئەوان لە خواردنیدا بوون پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەوە ڕزقی خوای گەورەیەو بۆ ئێوەی ناردووە.

ئەوەش دڵۆپێکە لە دەریای گەنجینەکان کە خوای گەورە بۆ بەندە دڵسۆزەکانی خۆی شاردوونیەتەوە. ئەهلی صوففەش ئەوەیان بە فەزڵی دوعاکەی پێغەمبەر خوا(ﷺ) دەستکەوت.

## ١٩٣. جەژن لە مەدینەی مونەووەرە

لە بەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا، کە دوای مانگی ڕەمەزان دێت، شادی و خۆشی شەقامەکانی مەدینەی پڕکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زوو لە خەو هەستا، خۆیشۆردو دەستنوێژی گرت، پاشان پۆشاکە پاکەکەی لەبەرکردو بۆنی خۆشی لە خۆیدا، دوایی ڕۆیشت بۆ شوێنی نوێژکردنەکە لە دەرەوەی مەدینە بۆ ئەنجامدانی نوێژی جەژن. گۆڕەپانی شوێنی نوێژەکە جمەی دەهات بە نوێژخوێنان، پێکەوە نوێژیان کردو سوپاسی خوای گەورەیان کرد کە گەیاندنیە ئەو جەژنە بەختەوەرە. زەردەخەنەی بەردەوام لەسەر ڕوخساری پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵی پڕکردبوون لە فێنکی و خۆشی، دوای نوێژەکە هەمووان یەک بەیەک پیرۆزباییان لە یەکتری دەکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە شەقامەکانی مەدینەی مونەووەرەدا دەڕۆیشت تا ئاگادار بێت بەسەر باری موسڵماناندا، منداڵان لە هەموو شوێنێک بە شادی و خۆشییەوە کە پۆشاکی نوێیان پۆشیبوو لەبەردەم ماڵەکانیاندا یاریان دەکرد. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بە دیتنی ئەو بەختەوەرییە کە لەو ڕۆژە پیرۆزەدا ڕوومەتیانی داپۆشیوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەڵکی هاندەدا لەسەر نواندنی خۆشی و شادیی لە جەژندا، لەسەر لەبەرکردنی جوانترینی پۆشاکەکان؟، پێغەمبەر(ﷺ) حەزی بە یاریکردنی منداڵان دەکرد و بەسەربردنی کاتی خۆش لەگەڵیاندا، فەرمانی بە باوەڕداران دەدا هەندێ کات لەگەڵ منداڵەکانیاندا بەسەربەرن، خۆی(ﷺ) گاڵتەی لەگەڵ دەکردن

و ماچیدەکردن، دەستی دەهێنا بەسەریاندا، بەختەوەریی و دڵخۆشی منداڵان لەو ڕۆژەدا وەسفناکرێ، بە پۆشاکی ڕەنگاو ڕەنگ و گەشاوەیی و خۆشییەوە بە هەموولایەکی شارەکەدا ڕاپاندەکرد کە ئەوەندەی تر خۆشی جەژنی خۆشکردبوو.

## ١٩٤. کچە بێباوکەکەی دایکی سولەیم

لای دایکی سولەیم کچۆڵەیەکی بێباوک هەبوو نازناوی دایکی ئەنەسی لێنرابوو، خۆشیدەویست و زۆرباش بەخێوی دەکرد.

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) کچۆڵە بێباوکەکەی بینی، فەرمووی پێی: ((گەورە بوویت، تەمەنت گەورە نەبێت!)).

کچۆڵەکەش بە گریانەوە گەڕایەوە بۆ لای دایکی سولەیم، کە دایکی سولەیم بینی زۆر خەفەتی بۆخوارد و پێیوت: کچەکەم ئەوە چیتە؟

ئەویش وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوعای لێکردم کە تەمەنم گەورە نەبێت!

دایکی سولەیم بە پەلە هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش پرسیاری لێکرد: ((دایکی سولەیم چیت هەیە؟))

وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دوعات لە کچۆڵە بێباوکەکەم کردووە؟

فەرمووی: ((ئەو دوعایە چییە؟))

وتی: دەڵێ تۆ دوعات لێکردووە تەمەنی گەورە نەبێت!

پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و پاشان فەرمووی: ((ئەی دایکی سولەیم! ئەی نازانی مەرجی من لەسەر پەروەردگارەکەم ئەوەیە کە پێموتووە: پەروەردگار من مرۆڤێکم ڕازی دەبم وەک چۆن خەڵکی ڕازی دەبن، تووڕە دەبم وەک چۆن خەڵکی تووڕە دەبن، هەرکات دوعام لە هەر کەسێ لە ئوممەتم کرد کە شایستەی نەبێت ئەوەیە پەروەردگارم بیکاتە مایەی پاکبوونەوەی لە گوناهو و بەرەکەت

بڕێژێ بەسەریداو بەهۆیەوە لە ڕۆژی قیامەتدا لە خوای گەورە نزیکبێتەوە)).

دوای ئەوە کە دایکی سولەیم گوێبیستی گوفتارەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو خەفەتەکەی گۆڕدرا بۆ خۆشی و دڵی بۆ کچە بێباوکەکەی ئارام بوویەوە، چونکە دوعاکەی پێغەمبەر(ﷺ) لە بەرژەوەندی کچەکەیە نەک لە دژی بێت.

## ١٩٥. زەکاتی ماڵ و سامان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەموو مەسەلەکاندا پێشەنگ بوو بۆ خەڵکی، لە هەموویان بەخشندەو میوانپەزێرتر بوو، هەرچی هەبوایە دابەشیکرد بەسەر هەژاراندا، حەزی لە یارمەتیدانی خەڵکی بوو، پلانی دەوڵەمەندبوونی نەدەکێشا، چونکە سەروەت و سامانی ماڵی بۆ ئەو لەم جیهانەدا شتێک نەبوو جێگای بایەخ بێت، لەبەرئەوە، فەزڵی هەژارانی دەدا بەسەر خۆیدا، گرنگی پێدەدان و پارێزگاری لێدەکردن.

سەیری دەوروبەری خۆیدەکرد کەسانێکی دەوڵەمەندی دەبینی کە خۆیشیان ڕادەی سەروەتی خۆیان نەدەزانی، لەبەرانبەریشەوە هەژارو نەدارەکانی دەبینی کە تەنانەت نانە ڕەقەیەکیان دەست نەدەکەوت بیخۆن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزیکرد ئەو دیاردەی نا یەکسانییە لەنێوان ئەو دوو توێژەی خەڵکیدا نەهێڵێ. خوای گەورە ڕێنماییکرد بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە. لە ڕێگای جبرەئیلەوە(ﷺ) فەرمانی پێدا کە با دەوڵەمەندەکان بەشێک لە ماڵ و سامانیان بدەن بە هەژارەکان، ئەویش بەڕێژەی چل یەک لەدوای تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر بەدەستهێنانی ئەو سەروەتە. واتە ئەگەر مرۆڤ چل پارچە ئاڵتونی هەبێت، ئەوا دەبێت یەک پارچەی بدات بە هەژاران. ئەگەر چل وشتری هەبوو پێویستە یەکێکیان بکات بە زەکات، چل مەڕی هەبوو بەهەمانشێوە یەکێکیان بدات بە نەداران، لەو ڕێگایەشەوە موسڵمانان فێری ئەوە بوون کە هەموو سەروەتەکەیان کۆبکەنەوەو بیکەن بە چل بەشەوە بەشێکی بدەن

بە هەژارو نەدارەکان. ئەم ماڵ بەخشینە بەو شێوەیەی سەرەوە پێیدەوترێت زەکات.

جگە لە زەکاتیش هەندێ لە دەوڵەمەندان خێرو خێراتی تر دەکەن لەپێناوی ڕەزامەندی خوای گەورەدا بێئەوەی چاوەڕێی هیچ شتێک لە هیچ کەسەوە بکەن. بەم پێیە مافی هەژاران پارێزراو دەبێت و دەوڵەمەندانیش فێری بەخشین و دنیانەویستی دەبن.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی ئاگادارکرد کە خوای گەورە فەرمانی پێداون زەکات بدەن، ئەوانیش خێرا ئەو فەرمانەیان جێبەجێ کرد. بەجۆرێ کە ئیتر بووە بەشێک لە ژیانیان، ئەوان تێگەیشتن کە زەکاتدان و خێرو خێرات کردن مافی هەژارانەو لای دەوڵەمەندەکانەو دەبێ بیدەن. ئەوە مافی هەژارە لای دەوڵەمەند، ئەوشیان زانی کە نەدانی زەکات و خێرنەکردن دەبێتە گوناهو ستەمێکی گەورەو لە ملی خاوەنەکەیدایە. لەبەرئەوە موسڵمانان پەلەیان کرد لە دەرکردنی زەکات لە سەروەتەکەیاندا. بەمشێوەیەش هەژاریی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا نەما. لە هەمانکاتدا دەوڵەمەندانیش تام و شیرینی بەخشین و هاوکارییان چەشت. بینیان کە بەمشێوەیە تادێت سەروەتەکەیان زیاتر دەکات و بەرەکەتی تێدەکەوێت. بەم پێیە خێرو بەرەکەت هەمووانی گرتەوەو خۆشویستنی ئیسلامیش لە دڵەکاندا جێگای خۆی قایمتر کرد.

## ١٩٦. بەخشین، دەرگایەکە لە دەرگاکانی بەهەشت

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) وتاری بۆ موسڵمانان داو هانیدان لەسەر بەخشین. ڕێنمایی پێدان کە دەبێ موسڵمان هەموو بەیانییەک بەخشینی هەبێت، بەخشین بریتی نیە تەنها لە بەخشینی ماڵ و سامان. چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: ((نێوان دوو کەس ڕێکبخات ئەوە بەخشینە، کەسێ هاوکاری ولاغەکەی بکات و کۆڵی سوک بکات بەخشینە، وتەی جوان و شیرین بەخشینە، هەر هەنگاوێ کە دەینێت بۆ چوون بۆ نوێژکردن بەخشینە، لابردنی شتی ئازاگەیەنەر لەسەرە ڕێگادا بەخشینە))، هەروەها چەندەها جۆری تری بەخشین هەن کە مرۆڤ دەتوانێ بیانکات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵیداوە کە دەرگایەک لە دەرگاکانی بەهەشت بەخشینە، ئەو باس لە دەرگاکانی بەهەشت و ئەو کەسە دەکات کە دەچێتە ناویەوە و دەفەرموێ: ((هەرکەس لە توێژی نوێژخوێنان بێت ئەوا لە دەرگای نوێژەوە بانگدەکرێ، هەرکەس لە موجاهیدان بێت ئەوا لە دەرگای تێکۆشانەوە بانگدەکرێ، هەرکەس لە بەخشندەکان بێت لە دەرگای بەخشینەوە بانگدەکرێ، هەرکەس لە ڕۆژووەوانان بێت لە دەرگای ڕەییانەوە بانگدەکرێ)).

ئەبوبەکری صدیق وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا کەس هەیە لە هەموو ئەو دەرگایانەوە بانگبکرێ؟

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ، ئومێدەوارم تۆش یەکێک بیت لەوان)).

## ١٩٧. دڵخۆشیی دوو هاوڕێ

لە مەدینەی مونەووەرە دوو هاوڕێ هەبوون، یەکێکیان ناوی عەبدوڵڵە و ئەویتریان ناوی ئەبو دەرداء بوو، یەکتریان زۆر خۆشدەویست، بەڵام لە مەسەلەیەکدا ناکۆک و ڕا جیاواز بوون، چونکە عەبدوڵڵە کەسێکی باوەڕدار بوو، بەڵام ئەبو دەرداء هێشتا هەر بتی دەپەرست، عەبدوڵڵە زۆر خەفەتی بۆ هاوڕێکەی خوارد، دەیویست ئەویش شوێنکەوتەی ڕێگای ڕاستی بێت، دەگەڕا بەدوای ڕێگایەکدا تا قەناعەتی پێبکات.

ڕۆژێکیان عەبدوڵڵە ڕۆیشت بۆ ماڵی ئەبو دەرداء، چەکوشێکی بەدەستەوە بوو، ئەبو دەرداء لە ماڵ نەبوو، عەبدوڵڵە هەستا بە شکاندنی یەک بەیەکی ئەو بتانە کە هاوڕێکەی دەیپەرستن. کاتێ ئەبو دەرداء گەڕایەوە ماڵەوە بینی وا هەموو بتەکانی شکێنراون، زۆر بەلایەوە سەیر بوو، لە دڵی خۆیدا وتی: ئەگەر ئەمانە خوای ڕاستەقینە بوونایە ئەوا دەیانتوانی سود یان زیان بە کەسێک بگەیەنن، پێش هەموو شتێش بەرگرییان لەخۆیان بکردایە.

دیمەنی بتە شکاوەکان ئەبو دەردائی هێنایەوە سەر ئەقڵی خۆی، ماوەیەک بیریکردەوە، دواجار، بڕیاریدا خوای گەورە، بەدیهێنەری زەوی و ئاسمانەکان بپەرستێ، ئەویش هەروەک عەبدوڵڵە، چونکە خوای گەورە توانای بەسەر هەمووشتێکدا هەیە. بەمجۆرە چووە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو، ئەوکات عەبدوڵڵە بە خۆشییەکەوە لایکردەوە بە لای پێغەمبەردا(ﷺ) و سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ڕزگاربوونی هاوڕێکەی لە هاوەڵگەریی،

ئەبو دەرداء هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمان بوو، ئینجا شایەتومانی هێنا. ئیتر لەو کاتەوە هەرگیز حەزی نەدەکرد لە پێغەمبەر(ﷺ) دووربکەوێتەوە. ئەویش وەک هاوڕێکەی، ئینجا سەیرێکی عەبدوڵڵەی هاوڕێی کرد کە نیشانەکانی دڵخۆشی و شادی زیاتر لە جاران پێیەوە دەردەکەوت، ئەو ڕوانینەی ئەویش بۆ عەبدوڵڵە نیشانەی پێزانینێکی قووڵی لێ بەدی دەکرا.

## ١٩٨. فاتیمە و عەلی(رضي الله عنهما)

خاتـوو فاتیمـە بچوکتریـن کچـی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بـوو، لـە هەمـوو منداڵەکانیتـر زیاتـر شـێوەی چـوو بـووەوە سـەر باوکـی. لـە ڕۆیشـتنی، لـە وەسـتانی، لـە قسـەکرنیدا لـە باوکـی دەچـوو، هەروەهـا وەک ئـەو(ﷺ) ڕاسـتگۆ و ئەمانەتپارێـز و دەم بـە زەردەخەنـە بـوو، کچێـک بـوو پەروەردەیەکـی تـەواو بـەرزی هەبـوو، تـا ئاسـتی پێویسـت شـەرمن بـوو، پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) خاتـوو فاتیمـەی زۆر زۆر خۆشدەویسـت، هـەرکات بهاتایەتـە خزمەتـی لەبـەری هەڵدەسـتا، دەسـتی دەگـرت و ماچیدەکـردو لـە شـوێنەکەی خـۆی دایدەنـا.

کاتـێ خاتـوو فاتیمـە کچـە عازەبێـک بـوو، زۆرێـک لـە پیـاوان خوازبێنیـان کـرد، بـەڵام پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لە خوای گـەورە پاڕایەوە هاوسـەرێکی گونجـاوی بـۆ بنێـرێ. ئـەوەش گەورەتریـن ئاواتـی بـوو. بـەو هۆیـەوە، هەرکـەس بهاتایەتـە خوازبێنـی دەیفەرمـوو چاوەڕێـی فەرمانـی خـوا دەکات لەبارەیـەوە.

دواجـار، فەرمانـی چاوەڕوانکـراو گەیشـت، عەلـی ئامـۆزای هاتـە خوازبێنی فاتیمـە. عەلـی گەنجێکـی هـەژار بـوو. بـەڵام باوەڕێکـی زۆر بەهێـزی هەبـوو. پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هەردووکیانـی خۆشدەویسـت، لەبەرئـەوە زۆر دڵخۆشـبوو، هـات بـە ڕەزامەنـدی هەردووکیان خاتـوو فاتیمـەی مارەکـرد لـە عەلـی ئامـۆزای.

بەمجـۆرە ماڵێکـی جـوان و پـڕ لـە خۆشەویسـتی و بەختـەوەری دامـەزرا، پێغەمبەریـش(ﷺ) زۆر دڵخۆشـبوو.

## ١٩٩. کچەزاکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

خوای گەورە منداڵی یەکەمی بە عەلی و خاتوو فاتیمە بەخشی، مەلۆتکەیەک بوو، کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە لەدایکبوونی کچەزاکەیی زانی، بە خۆشییەکەوە ڕۆیشت بۆ لای کچەکەی و زاواکەی، پێی فەرموون: ((کوڕەکەمم پیشانبدەن)). ئەوانیش منداڵە بچوکەکەیان بۆ هێنا، وەها دەبینرا وەک بڵێی زەردەخەنە بۆ باپیرەی دەکات، پێغەمبەر(ﷺ) کردییە باوەشی، ئینجا کەمێ خورمای خستە ناودەمییەوە، منداڵەکە لە باوەشی باپیرەیدا چووە خەوێکی قووڵ، وەها دەبینرا کە زۆر بەختەوەرە.

منداڵەکەیان ناونا (حەسەن) واتە جوان. کاتێ (حەسەن) گەیشتە ڕۆژی حەوتەم، دوو بەرانیان بۆ سەربڕی، ئەمەش سوننەتێکە پێیدەوترێ عەقیقە، سەریانتاشی، بە کێشانەی قژەکانی زیویان بەخشیوە بەسەر هەژاراندا، پاش ماوەیەکیش خەتەنەیان کرد. منداڵەکە کەوتە گەورەبوون و بڵاوکردنەوەی شادمانیی بەدەوری خۆیدا، پاش تێپەڕبوونی ساڵێک بەسەر حەسەندا عەلی و خاتوو فاتیمە کوڕی دووەمیان پێبەخشرا، ناویاننا حوسەین، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەردوو کچەزاکەیی زۆر خۆشدەویست، لە خوای گەورە دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا زاتی تۆ ئاگاداری کە من چەندەم خۆشدەوێن تۆش خۆشت بوێن)).

جاروبار پێغەمبەر(ﷺ) سەردانی کچەزاکانی دەکرد. لەبارەیانەوە دەیفەرموو: ((حەسەن و حوسەین دوو بۆنخۆشەکەی منن لە دنیادا)).

حەسەن و حوسەین بەمشێوەیە پەروەردە بوون کە دەورە درابوون بە خۆشەویستی و بە سۆزی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

## ٢٠٠. دوو منداڵی کامەران

حەسەن و حوسەین لە بەختەوەرترینی منداڵان بوون. ئەوان دوو کچەزا بەنازەکەی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، لەژێر چاودێری و سەرپەرشتی ئەودا دەژیان، حەسەن تا ڕادەیەکی زۆر شێوەی دەچووەوە سەر باپیرەی، نێوچاوان پان و ڕوخسارێکی جوان و گەشی هەبوو، زۆربەیجار پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو کچەزاکەیی دەکردە باوەش و ماچیدەکردن. هەروەها سوربوو لەسەر تەرخانکردنی کاتی تایبەت بەوان، لەپێناو بەختەوەرکردنیان هەرچی لە توانایدا بوو بە خەرجی دەدا. حەسەن و حوسەین ئەوەندە حەزیان لە بە خزمەت گەیشتنی باپیرەیان بوو هەمیشە چاوەڕێی هاتنیان دەکردو ئارامیان لێدەبڕا، کاتێک دەگەیشت، خێرا دەچوون بۆ لای و یارییان لەگەڵ دەکرد. پێغەمبەریش(ﷺ) هەندێجار دەیخستنە سەر شانی یان لە زەویدا یاری لەگەڵیاندا دەکرد و ڕێگای دەدان بچنە سەر پشتی، کاتێک خەو زۆری بۆ دەهێنان دەیخستنە باوەشی و ڕایدەژەندن هەتا خەویان لێدەکەوت. دوو براکە هەرگیز تێر نەدەبوون لە پێکەوەبوون لەگەڵ باپیرەیاندا.

هەندێجار، پێغەمبەر(ﷺ) هەردوو کچەزاکەیی دەخستە سەرشانی و دەیبردن بۆ مزگەوت، کاتێک هاوەڵان دەیانبینین لە سەرشانی پێغەمبەرن(ﷺ) پێیان دەوتن: (ئای ئێوە چەندە بە خۆشویستنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەختەوەرن). پێغەمبەریش زەردەخەنەیەکی دەکردو دەیفەرموو: ((هەرکەس منی خۆشدەوێت با ئەم دووانەی خۆشبووێت)). ئەم دوو منداڵە ئا بەو شێوەیە لە خۆشیدا بوون و خۆشەویستی پێغەمبەر(ﷺ) سەراپای ژیانیانی داپۆشیبوو.

## ٢٠١. هاوەڵان فێری خۆشویستنی منداڵەکانیان دەبن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموو منداڵانی خۆشدەویست و ڕێزی دەگرتن. هەروەها بە پەرۆشبوو لەسەر نواندنی خۆشەویستی خۆی بۆیان، ئەویش بە دەست لە ملکردن و ماچکردنیان. ئەو کەسانەش وا ڕانەهاتبوون کات لەگەڵ منداڵەکانیان بەسەربەرن کاتێک پێغەمبەریان(ﷺ) بینی کە ئەوەندە گرنگیدەدات بە منداڵان ئەوانیش کەوتنە تەرخانکردنی کاتێکی تایبەت بۆیان، بە فەزڵی پێغەمبەر(ﷺ) منداڵەکانیش ئەو خۆشەویستییەیان لەگەڵیاندا ئاڵوگۆڕ کرد کە پێشتر شتی وایان نەدیبوو، وایان لێهات تام و چێژی لە ئامێزگرتن و ماچکردن و نازکێشانیان دەچەشت.

ڕۆژێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هەردوو کچەزاکەی حەسەن و حوسەیندا دانیشتبوو، گاڵتەی لەگەڵ دەکردن و ماچیدەکردن، لەناکاو پیاوێک هاتە خزمەتی، بینی کە چۆن نازی کچەزاکانی دەکێشێ، کابرا زۆری بەلاوە سەیر بوو، بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) وت: (ئایا ئەی پێغەمبەری خوا ماچیان دەکەیت؟ من دە منداڵم هەیە هیچیانم ماچ نەکردووە). پێغەمبەر(ﷺ) سەرسامبوو کە چۆن دەبێت باوک ئاوا هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵەکانیدا بکات، ئینجا بە کابرای وت: ((تاوانی من چییە خوای گەورە بەزەیی لە دڵی تۆ دەرهێناوە)).

کابرا لە مەبەستەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشت، ئینجا پەیبرد بە گەورەیی پاداشتی خۆشویستنی منداڵان و جوان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیان، پەشیمانبوویەوە لەو شێوازی هەڵسوکەوتەی خۆی لەگەڵ منداڵەکانیدا، ئەویش وەک هەموو باوکانی تری موسڵمان فێری ئەوە بوو کە جوان مامەڵەکردن لەگەڵ منداڵانداو نواندنی سۆز بۆیان چەندە گرنگە.

## ٢٠٢. ئاو سەرەتا بەو کەسە دەدرێ داوایکردووە

پێغەمبەر(ﷺ) ویستی حەسەن و حوسەین بە پەروەردەیەکی جوان گەورە ببن، هانیدەدان لەسەر وەرزشکردن بۆئەوەی جەستەیەکی بەهێزیان هەبێت، لەبەرئەوە، زۆرجار داوای لێدەکردن زۆرانبازی لەگەڵ یەکتریدا بکەن، پێشبڕکێ، تیرئەندازی، بازدان و مەلە بکەن.

ئەو کاتانەی کە لەگەڵ کچەزاکانیدا بەسەری دەبرد هەرگیز جیاوازی نەدەخست لەنێوانیاندا، بەڵکو بە یەکسانی هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکردن. جارێکیان، هاتە سەردانیان لە کاتێکدا منداڵەکان خەوتبوون.

دوای کەمێک، حەسەن هەستاو داوای ئاوی کرد. پێغەمبەر(ﷺ) هەستاو بڕێ ئاوی بۆ داکردو بۆیهێنا، هەر لەو ساتەدا حوسەینیش بەخەبەر هات و داوای خواردنەوەی هەمان ئەو ئاوەی کرد کە پێغەمبەر(ﷺ) دەیدا بە حەسەن، بەڵام پێغەمبەر دۆلکە ئاوەکەی دا بە حەسەن و نەیدا بە حوسەین، خاتوو فاتیمە ئاگای لە حاڵەتەکە بوو کە ڕوویدا، بۆیە وتی: (دەڵێی ئەوت زیاتر خۆشدەوێ). بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەپەرۆشبوو لەسەر هەڵسوکەوتکردنی خەڵکی بە یەکسانیی، مافی تەنها بە خاوەن ماف دەدا. وەڵامی کچەکەیی دایەوەو فەرمووی: ((ئەو پێش براکەی داوای ئاوەکەی کردووە)). واتە یەکەمجار ئەو داوایکردووە.

بەم ڕەفتارە، پێغەمبەری خۆشەویستمان مافی حەسەنی پێشخست، حوسەینیشی فێری ئارامگرتن کرد، هەروەها بۆی

دەرخست کە پێویستە فەزڵی براکەی بدات بەسەر خۆیداو هەوڵنەدات مافی ئەو زەوتبکات.

هەمیشە(ﷺ) دەیفەرموو: ((کەستان باوەڕی تەواو نیە تا ئەوەی بۆ خۆی پێیخۆشە دەبێ بۆ براکەشی پێی خۆشبێت)). ئای چەندە جوانە، ئای ئەو کەسەش لەسەر ڕەویەی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) دەڕوات چەندە بەختەوەرە.

## ٢٠٣. بڕۆنەوە لای دایکتان

حەسەن و حوسەین بیلبیلەی چاوانی پێغەمبەر(ﷺ) بوون، نەیدەتوانی لێیان دووربکەوێتەوە، ئەوانیش زۆر زۆر ئالودەی باپیرەیان بوو بوون و بێئەو نەیاندەکرا، خۆشترین کاتەکانی ژیانیان ئەو کاتانە بوو کە لە نزیکی ئەوەوە بەسەریان دەبرد، دوو براکە بەردەوام پێکەوە یارییان دەکردو جیانەدەبوونەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) پەنای بە خوای گەورە دەگرت تا لە شەڕی شەیتان بیانپارێزێ. دەیفەرموو: ((دەتاندەمە پەنای وتە پیرۆزەکانی خوای گەورە کە سەلامەتبن لە هەر شەڕێکی شەیتان و هەر وەسوەسەیەکی، لە هەر چاوێکی حەسود))، ئەبو هورەیرە باسی ڕووداوێکی سەیرمان بۆ دەکات کە لەگەڵ حەسەن و حوسەیندا ڕوویداوە، دەڵێت: (ئێمە جارێکیان لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نوێژی عیشامان دەکرد، کاتێ چووە سوژدەوە حەسەن و حوسەین بازیاندایە سەرپشتی، کاتێک سەری بەرزکردەوە لەدواوە بە دەستی بە هێواشی گرتنی و بە ئەسپایی لەولاوە داینان، کاتێ چووەوە سوژدە دیسان ئەوانیش چوونەوە سەرپشتی، کاتێ هەستایەوە خستنیە سەر ڕانی، یەکێکیان لەسەر ئەم ڕانی و ئەویتریان لەسەر ئەو ڕانی. ئەبو هورەیرە دەڵێ: هاتمە خزمەتی و وتم: ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا نەیانبەمەوە بۆ دایکیان؟ فەرمووی: (نەخێر)). کتوپڕ شەوقێک پەیدابوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە دوو کچەزاکەیی فەرمووی: ((بڕۆنەوە بۆ لای دایکتان)). ئەوانیش لەبەر ڕۆشنایی ئەو شەوقەدا ڕۆیشتن تا گەیشتنەوە لای دایکیان.

## ٢٠٤. ئامۆژگارییەکی ئاڵتونیی

حەسەن و حوسەین لەسەر پەروەردەی ئاڵتونیی باپیرەیان(ﷺ) گەورە بوون، بە جوانترین شێوە پەروەردەی دەکردن، فێری خۆشویستنی کەسانیتری کردن، هەروەها جوان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵ خەڵکیدا.

بەردەوام باسی گرنگیتی پەرستنی خوای گەورەی بۆ دەکردن، کاتێ تەمەنیان گەیشتە حەوت ساڵان پێیوتن نوێژ بکەن، حوسەین هێشتا زۆر منداڵ بوو، عادەتی پێوەگرتبوو هەمیشە گوێبگرێ بۆ گوتەکانی باوەگەورەی، بەڵام حەسەن، دیویست ئەوەی کە فێرێ دەبێت ڕاستەوخۆ جێبەجێی بکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاستی گەرموگوڕی حەسەنی بۆ دەرکەوت، فێری نوێژی کرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگارییەکی ئاڵتونیی فەرموو پێیان کە: ((ڕاستگۆیی ڕێنیشاندەرە بۆ چاکەکاریی، چاکەکاریش ڕێنیشاندەرە بۆ بەهەشت، مرۆڤیش کاتێ ڕاستگۆیەو بەردەوام ڕاستگۆیی دەڵێ ئەوا وای لێدێت لای خوای گەورە بە ڕاستگۆ ناودەبرێ، وریابن درۆ نەکەن، چونکە درۆ ڕێنیشاندەرە بۆ خراپەکاریی، خراپەکاریش ڕێنیشاندەرە بۆ دۆزەخ، مرۆڤیش گەر هاتوو درۆیکرد و درۆزن بێت ئەوا لای خوای گەورە ناوی بە درۆزن تۆمار دەکرێ)).

درۆ خراپترین شتێک بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ڕقی لێیبوو، چاکترین شتێکیش ئەو خۆشی ویستبێ ڕاستگۆیی بووە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بە پەرۆشبوو حەسەن و حوسەین لە ڕاستە شەقام لانەدەن، بۆی باسدەکردن کە چۆن درۆ ئازاری کۆمەڵگاو خودی ئەو کەسە خۆیشی دەدات، هەردوو منداڵەکەش بە جوانی گوێیان بۆ ڕادەدێرا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە پێشەنگێکی کرداریی بۆ حەسەن و حوسەین و ئەوانیش بڕیاریاندا وەک باوەگەورەیان بن.

## ٢٠٥. ئوسامە، ئەو منداڵەی کە پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خۆشیویستووە

ئوسامە منداڵێکی جوان و زۆر زیرەک بوو، کوڕی تاقانەی دایکی ئەیمەن بوو، واتە پەروەرشکارەکەی پێغەمبەر(ﷺ)، باوکیشی لە شەڕێکدا شەهید کرابوو. بەڵام ئوسامە بە فەزڵی خۆشەویستی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) و سەرپەرشتیکردنی بۆی ئێش و ئازاری بێباوکیی لەبیر چووبوویەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆرجار ئەو و حەسەنی لەسەر هەردوو ئەژنۆی دادەنا، دەیکردنە باوەش و ماچیدەکردن و دەیفەرموو: ((پەروەردگارا من خۆشمدەوێن تۆش خۆشتبووێن)). بەختەوەریی ئوسامە لە ماڵی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ڕوون و ئاشکراو لەبەرچاوان بوو.

ڕۆژێکیان، ئوسامە کەوتبوو و خوێن لە نێوچاوانی دەچۆڕی، پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە خێزانەکەی کرد دەموچاوی پاکبکاتەوە. بەڵام عائیشە کەمێک دواکەوت، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) خۆی خێرا هەستاو زامی منداڵەکەی پاککردەوەو دەموچاوی شۆری و دڵیدایەوە. زۆرجار لەبارەی ئوسامەوە دەیفەرموو: ((ئەگەر ئوسامە کەنیزەکێک بوایە ئەوا پۆشتەم دەکردو بە خشڵ دەمڕازاندەوە تا دەمگەیاندە جێگای خۆی)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆرجار ئوسامەی لەگەڵ خۆی لەسەر وشترەکەی دەبرد بۆ گەڕان و سەیران، ئەویش زۆری پێخۆشبوو. ئەو منداڵە کە لەسەر ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەروەردە

بوو وردە وردە گەورەبوو تا بووبە پیاوێکی بەڕێز و موجتەهیدو ڕەوشتبەرز.

ئوسامە پێناخشبوو کاتی خۆی بەفیڕۆ بڕوات، کاتەکانی بە کاردن و چالاکی پڕدەکردەوە، هەر لە منداڵییەوە فێری سواری ئەسپ و تیرئەندازی و مەلەوانی و ڕاکردن بوو.

ئەم منداڵە لە زۆر بواردا لەپێش هاوتەمەنەکانییەوە بوو، کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) کۆشش و لێبڕان و گەرموگوڕییەکەی بینی کە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا بوو سەرکردایەتی سوپای موسڵمانانی ڕادەستکرد. ئوسامەیش شانازیکرد بەو ئەرکەوەو زۆر دڵخۆشبوو بەو ڕێزەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێی گرت، ئەویش بە هەموو توانای هەوڵیدا تا شایستەی ئەو خۆشەویستی و هاوەڵێتییە بەردەوامە بێت.

## ٢٠٦. ڕەوشتجوانیی حەسەن و حوسەین

حەسەن و حوسەین گەورەبوون و بوون بە دوو گەنجی باوەڕدار. زیرەکی لە چاوانیاندا دەدرەوشایەوە، هەمیشە دەم بە زەردەخەنە بوون، ئەوانیش هەروەک باوەگەورەیان بوون چونکە لەسەر دەستی ئەو پەروەردەکران.

دوو گەنج بوون گرنگییەکی زۆریان بە پەرستش و نوێژکردن دەدا، یەک فەرزیان لە کیس نەدەچوو. لە ڕۆژێکدا پێنج جار لە خزمەت خوای گەورەدا دەوەستان کە ئەوە سەرچاوەی شانازی بوو بۆیان، هەر لەسەر ڕەویەی باوەگەورەیان کەسانێکی بە ئەدەب و بە ویقار بوون، هەڵسوکەوتیان لەگەڵ خەڵکیدا جوان بوو، ئازاری کەسیان نەدەدا، لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) فێربوون ئاماژە بە هەڵەی کەسانیتر نەکەن، بەوهۆیەوە، بەهۆی پەروەردەو ئەتەکێتی جوانیانەوە چوونە دڵی هەمووان، لە هەموو شوێنێ ناوبانگیان دەرکرد.

هەروەها بەهۆی ڕەوشتبەرزییان و سیفەتە چاکەکانی تریان حەسەن و حوسەین بوونە شایستەی ئەو پلە باڵایە لە بەهەشتدا کە پێغەمبەر(ﷺ) لە بارەیانەوە دەفەرموێ: ((حەسەن و حوسەین دوو گەورەی گەنجانی بەهەشتن)).

## ٢٠٧. بڕیارێکی ئاڵۆز

بێباوەڕانی مەککە ئەو شکستەی لە جەنگی بەدردا بەسەریان هات لەبیریان نەچوو بوو. بەڵام لوتبەرزیان ڕێگیریی لێکردن لەوەی دان بە شکستیاندا بنێن، لەبەرئەوە هاتن هەموو توانای خۆیان لە چەک و چۆڵ و هێز خڕکرد تا هێرشبکەنە سەر مەدینەی مونەووەرە، داوای یارمەتییان لە عەرەبە دەشتەکییەکان کرد، بەهێزترینی جەنگاوەرانی خۆیان کۆکردەوە، ناودارترینی شاعیرانیان هێنا تا هانی سەربازەکان بدەن و وورەیان بەرزبکەنەوە، بە سوپایەکی سێ هەزار جەنگاوەرەوە ملیاننا بەرەو مەدینە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ڕێگای نامەیەکی عەبباسی مامییەوە هەواڵی هێرشەکەیانی پێگەیشت. کە سوپای بێباوەڕان وا لە مەدینە نزیکدەبێتەوە، خێرا کۆبوونەوەی بە هاوەڵان کرد، کەوتنە ڕاوێژکردن تا گونجاوترین شوێن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن هەڵبژێرن.

هاوەڵان ڕا جیاواز بوون، هەیانبوو دەیوت با هەر لە مەدینە بەرەنگاریان ببینەوە، هەیانبوو پێی وابوو بچنە دەرەوەی مەدینەو لەوێ لەگەڵ دوژمن بجەنگن، گەنجانێکی بەجۆش و خرۆشیان تێدابوون وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە ئاواتەخوازی ئەو ڕۆژە بووین و لە خوای گەورە دەپاڕاینەوە کە بێت، ئەوا بۆیهێناین و ڕێگای دووری نزیککردینەوە، بڕۆرە دەرەوە بۆیان تا وا نەزانن ئێمە لێیان دەترسین). حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) کە بە کەسێکی ئازاو بەجەرگ ناسرابوو وتی: (سوێند بێت بەو زاتە قورئانی نادووەتە خوارەوە بۆت، تامی خواردن ناچەژم تا لە دەرەوەی مەدینە بەم شمشێرەم نەجەنگم لەگەڵیاندا).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشت کە زۆربەی هاوەڵان دەیانەوێت لە دەرەوەی مەدینە شەڕی بێباوەڕان بکەن، لەسەر ئەو بنەمایە بڕیاری وەرگرت و ئامۆژگاری هاوەڵانی کرد لە خوای گەورە بپاڕێنەوەو لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمندا ئارامگربن. بڕیاریدا بۆ شەڕکردن لەگەڵ دوژمنان کە ژمارەیان سێ هەزار سەرباز بوون بچێتە دەرەوەی مەدینە.

## ٢٠٨. سەربازە تەمەن بچوکەکان

موسڵمانان بۆ بەرەنگاربوونەوەی دوژمن چوونە دەرەوەی مەدینە. دڵیان پڕبوو لە جۆش و خرۆش، زمانیان وشەی الله أكبری دەوتەوە، پێغەمبەری خوا جار لەدوای جار دڵنیا دەبوو لە سوپاکەی و ڕیزەکانی ڕێکدەخست، کاتێک بۆ جارێکیتر سەرنجی سوپاکەییدا، ژمارەیەک لە منداڵانی لەنێو سوپاکەدا بەدیکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) منداڵانی خۆشدەویست و بەپەرۆشبوو نەیانخاتە باری مەترسییەوە، ئەو شوێنەش شوێنێکی گونجاو نەبوو بۆ تەمەنی ئەوان. بەوهۆیەوە فەرمانیدا زوو بەزوو ئەو منداڵانە بگەڕێنەوە بۆ مەدینە. منداڵێک لەنێویاندا بوو ناوی ڕافیع بوو، بە تەواوی قەناعەتی دڵیی حەزیدەکرد بچێتەناو سوپاکەوە، ئا لەوێدا یەکێک لە سەربازەکان پیایداهەڵداو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەو تیروەشێنە).

پێغەمبەر(ﷺ) زیرەکی لە تێڕوانینەکانی ڕافیعدا بەدیکرد، تێگەیشت کە چەندە سورە لەسەر چوونە ڕیزی سوپای موسڵمانانەوە، ئینجا ڕێگای پێدا بمێنێتەوە.

چوونی ڕافیع بۆ ناو سوپاکە سەمورەی هاوڕێی بێتاقەت کرد، بە دەم فرمێسک سڕینەوە بە باوکی وت: (باوکە، پێغەمبەری خوا ڕێگای بە ڕافیعی کوڕی خەدیج داو منی ڕەتکردەوە، من لە زۆرانبازیدا ڕافیعی کوڕی خەدیج دەدەم بە زەویدا)، باوکەکەش پێغەمبەری ئاگادارکرد کە کوڕەکەی حەزدەکات لەناو سوپاکەدا بمێنێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) حەزی نەدەکرد بەکەم سەیری کەس بکات. بۆیە داوای لە ڕافیع و سەمورە کرد لەبەردەمیدا زۆران بگرن.

سەمورە زاڵبوو بەسەر ڕافیعداو دای بەزەویدا، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) ڕێگای بەویشدا لەناو سوپاکەدا بمێنێتەوە. تەمەنی سەمورە لەو کاتەدا پازدە ساڵی تێنەپەڕاندبوو.

هەردوو هاوڕێکە زۆر دڵخۆشبوون کە چوونە ناو سوپاکەی پێغەمبەر(ﷺ)، بەلام منداڵەکانیتر فەرمانەکەی پێغەمبەریان(ﷺ) جێبەجێ کردو گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان. پێغەمبەریش(ﷺ) لە مەدینە ئەرکی پێسپاردن کە پارێزگاری لە دایکان و خوشک و براکانیان بکەن لە هەر مەترسییەک، بەمشێوازە، پێغەمبەر(ﷺ) ورەی بەرزکردنەوەو دڵیدانەوە. ئەوانیش بە دڵخۆشی و بە شانازیکردن بەو متمانەیەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێیبەخشین گەڕانەوە بۆ مەدینە.

## ٢٠٩. چاوەڕوانیی سەخت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ سوپاکەیدا لە نزیک کێوی ئوحود حەوانەوەیەکی وەرگرت. لەگەڵ هەڵاتنی خۆری ڕۆژی دواتر، هەردوو سوپاکە ڕووبەڕووری یەکتر وەستان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ئەسپەکەی دابەزی، فەرمانی بە سەربازەکانیدا ڕیزەکانیان ڕێکبکەن، سوپای موسڵمانان لە ڕووی ژمارەوە کەم بوون، بەڵام باوەڕیان بەهێز بوو. بۆ وریابوونی زیاتر پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانیدا ژمارەیەک لە تیروەشێنە شارەزاکان لەسەر ئەو تەپۆڵکەیە بوەستن کە لە نزیک کێوەکەوە بوو. هەروەها پاسەوانی ئەو ڕووبەرە لە ئەستۆ بگرن کە کێوی ئوحود و کێوی عەینەین لەیەک جیادەکاتەوە. ئەو دەیزانی کە دوژمن لەگەڵ یەکەم دەرفەتی ڕەخساودا هەوڵدەدات لەو شوێنەوە بپەڕێتەوەو لە پشتەوە هەڵکوتێتە سەر سوپای موسڵمانان، چەندینجار لە تیروەشێنەکانی دووپاتکردەوەو فەرمووی: ((لە شوێنی خۆتان جێگیربن و نەجوڵێن، ئەگەر لای ئێوەوە هێرشمان نەکەنەسەر ئەوا لەدواوە نایەنە سەرمان، با شەڕەکەش بۆ ئێمە بێت یان لەسەرمان بکەوێ، پشتمان بپارێزن، ئەگەر ئێمەتان بینی کە دەکوژرێین هەر مەیەن بۆ یارمەتیدانمان، ئەگەر ئێمەتان بینی کە دەستکەوتی جەنگی بەدەست دێنین هەر بەشداریمان نەکەن، ئەگەر ئێمەتان بینی کە دوژمنمان شکاند شوێنەکەمان گرتن ئەوا تا ئاگادارتان نەکەم شوێنی خۆتان جێنەهێڵن)).

لە نێو چادرگای دوژمنەوە دەنگ و قاو و قیژ دەبیسترا، دڵیان پڕبوو لە ڕق و کینە، بەتایبەتی ئافرەتانیان ئەوانەی کە دەستیاندایە

دەف لێدان و وتنی سرودی جەنگی بۆ بەرزکردنەوەی ورەی سوپای بێباوەڕان.

لە بەرانبەرەوە دەنگی الله أكبرو پاڕانەوەکان لە خوای گەورە لە سوپای موسڵمانانەوە بەرزبوویەوە لە مەیدانی جەنگەکەداو دەنگی دەدایەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتە هاندانی سەربازەکان و فەرمووی پێیان بە یارمەتی خوای گەورە سەردەکەون بەسەر دوژمندا.

لە پاش کەمێک، سوپای هاوەڵگەران هێرشیان هێنا، شەڕێکی کتوپڕو خێرا وەک ڕەشەبا دەستیپێکرد، لە هەردوو سوپاکەوە دەنگی شەمشێرو تیر و ئەسپ و وشترەکان بەرزبوویەوە، شەڕێکی سەخت و قورس ڕوویدا، هەندێ لە بێباوەڕە لە شەڕ شارەزاکان بەدەم هاتنە پێشەوە دەیانوت: (کێ شەڕم لەگەڵ دەکات؟)، پێشەوا عەلی کە ئازایەتییەکەی لەبەرچاو بوو لێیان چووە پێش.



لە گۆڕەپانی جەنگەکەدا، پێشەوا عەلی هەمووانی فێری وانەیەک لە ئازایەتی و هێز کرد کە لە باوەڕەکەیەوە وەریگرتبوو، ئەو لەلایەکەوە دەجەنگا، حەمزەی مامە پاڵەوانەکەی پێغەمبەریش(ﷺ) لەلایەکیترەوە لەگەڵ باوەڕدارانددا بە هەموو توانایەوە دەجەنگا، ڕێگایان بە هیچ یەک لە هاوەڵگەران نەدا هەناسەیەکی حەوانەوە هەڵمژێ.

سوپای دوژمن کە دەستپێشخەر بوو لە شەڕەکەدا تووشی پەشیمانییەکی ئێجگار زۆر هات، چونکە لە کۆتا کاتژمێرەکانی شەڕەکەدا کەسانێکی زۆریان لەدەست دا، ئەمە لە کاتێکدا کە ژمارەیان زیاترو چەکیان بەهێزتر بوو. کاتێک بۆیان ڕوونبوویەوە کە تێکدەشکێن، ترس و بیم چووە دڵیانەوە، کەوتنە هەڵاتن لە گۆڕەپانی شەڕەکە، بۆئەوەی گیانی خۆیان دەرباز بکەن زۆرێک لە چەک و ئەسپ و کەلوپەلەکانیان جێهێشت

## ٢١٠. پیاوێکی دڵپاک

مەخیریق زانایەکی چاکی ناو جولەکە بوو، خەڵکی خۆشیاندەویست و ڕێزیان لێدەگرت. لە هەمانکاتدا کەسێکی زۆر دەوڵەمەند بوو، خاوەنی جوانترین باخ و کێڵگەکانی مەدینەی مونەووەرە بوو. هەروەها حەزی لە خوێندنەوەو زانست بوو.

باوەڕی هەبوو کە موحەممەد کۆتا پێغەمبەرە، چونکە ئەم پیاوە ئەو پێغەمبەرەیە کە لە دێرزەمانەوە ناوی لە تەوراتدا هاتووە، لەبەرئەوە، زۆری خۆشدەویست، بەڵام لە ترسی جولەکە باوەڕی خۆی پێی ئاشکرا نەکرد.

لە ڕۆژەکانی پێش جەنگی ئوحود، مەخیریق هەستی بە شڵەژاوییەکی زۆر کرد، چونکە کاتێ پێغەمبەری خوا دەکەوێتە ناو تاقیکردنەوەوە بەلایەوە زەحمەت بوو ئەو دابنیشێ و نەتوانێ شتێک بۆ یارمەتیدانی بکات. لە ڕۆژی شەممەیەکدا، بە کۆمەڵێک جولەکەی وت: (ئەی قەومی جولەکە! بەخوا ئێوە دەزانن سەرکەوتنی موحەممەد بەسەرتاندا هەق و ڕاستییە). بەڵام جووەکان نەیانویست گوێبیستی بن هەربۆیە هەستان بەجێیانهێشت، ئەوکات، مەخیریق نەیدەتوانی لەوە زیاتر چاوەڕوانی بکات. شمشێرەکەیی هەڵگرت و خۆی حازرکرد بچێتە ناو سوپای موسڵمانان لە ئوحود.

بەرلەوە مەدینە بەجێبێڵێ، یەکێک لە خزمە متمانەپێکراوەکانی خۆی بانگکردو پێیوت: (ئەگەر ئەمڕۆ کوژرام ئەوا سەروەت و سامانم بۆ موحەممەدە، با وای لێبکات کە خوا فەرمانی پێدەکات). لەسەر ئەوە، ڕۆیشت بۆ بەشداریکردن لە شەڕەکەدا.

کاتێک گەیشتە ئوحود، شەڕەکە دەستیپێکردبوو، ئێستە ئیتر ئەویش موسڵمانێکی ڕاستەقینەیە، ئامادەی قوربانیدانە بە ژیانی خۆی لەپێناو خوای گەورەدا، کاتێک شەڕەکە سەختتر بوو مەخیریق شەهید بوو.

## ٢١١. لەدەستدانی سەرکەوتن

خالیدی کوڕی وەلید جەنگاوەرێکی ئازاو دلێر بوو، هەر کارێکی بکردایە سەرکەوتوو بوو تیایدا، قورەیش لە ئوحود کردیان بە سەرکردەی سوپای بێباوەڕان.

تا ئەو ڕۆژە شکستی لە شەڕدا نەهێنابوو، نەیدەویست ئەو شەڕەش بدۆڕێنێ، لەبەرئەوە وێڕای ئەوە کە سەربازەکانی تێکشکان بەڵام هەر خۆی ڕادەست نەکرد، چووە کۆتایی سوپاکەی و گەڕا بەدوای دەرفەتێکدا تا ڕێڕەوی شەڕەکە بگۆڕێ، چاوی لەسەر کێوی عەینەین بوو. چەند جارێک هەوڵیدا لەوێوە بپەڕێتەوە، بەڵام تیروەشێنەکان کە پێغەمبەری خۆشەویستمان لەوێ جێگیری کردبوون ڕێگایان بە سەربازەکانی نەدا لەوێوە تێپەڕن. بیریکردەوە کە ئەگەر ئەو سەربازانە ئەو جێگایەیان جێبێڵن ئەوا دەتوانێ پشتی سوپای موسڵمانان بگرێ و لەوێوە هێرشبکاتە سەریان. خالید کەوتە پلاندانان و چاودێری هەموو شتێکی دەکرد.

تیروەشێنە موسڵمانەکان ئاگایان لەو پلانانەی خالید نەبوو، دڵخۆشبوون بەو سەرکەوتنەی موسڵمانان بەدەستیانهێنا، سەیریانکردن کە ئاوازی سەرکەوتنێکی گەورە دەچڕن. سەربازانی دوژمنیش ڕایاندەکردو هەموو شتێکیان لەدوای خۆیان جێدەهێشت، تیروەشێنە موسڵمانەکانیش سەیریانکرد موسڵمانەکان کەوتوونەتە کۆکردنەوەی ئەو دەستکەوتانەی دوژمن جێیهێشتوون لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا، ئەوانیش زۆریان پێخۆشبوو و نەیانتوانی لە شوێنی خۆیان بمێننەوە، ویستییان بە زووترین کات بگەنەوە هاوڕێکانیان.

وا هاتە پێشچاویان کە موسڵمانان سەرکەوتوون و شەڕەکە تەواو بووە. لێرەدا هیچ هۆکارێک نەماوە بۆ مانەوەیان لەسەر لوتکەی ئەو تەپۆڵکەیە. لەبیریان چوو بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرمووبوون: ((ئەگەر ئێمەتان بینی کە واین بەدەم باڵندەوە، ئەوا ئەو جێگایەتان جێمەهێڵن هەتا خۆم کەسێک نەنێرمە لاتان، وە ئەگەر ئێمەتان بینی کە دوژمنمان تێکشاندو شوێنەکەمان گرتن، هەر شوێنتان جێمەهێڵن تا کەسێک نەنێرمە لاتان)).

بەڵام تیروەشێنەکان بەمجۆرە یەک بەدوای یەکدا تەپۆڵکەکەیان جێهێشت، هاتنەخوارەوە بۆ گۆڕەپانی شەڕەکە، سەرکردەکەیان لەدواوە بانگیکردنەوە : (ئایا ئێوە لەبیرتان چوویەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) چی فەرموو پێتان؟) لەوێدا کەسانێکیان گەڕانەوە بەڵام زۆربەیان بەردەوامبوون و هاتنەخوارەوە. ئەمەش بەتەواوەتی ئەو هەلە بوو کە خالیدی کوڕی وەلید چاوەڕێی دەکرد. هەرکە تیروەشێنەکانی بینی دابەزین خێرا ئەویش پاشماوەی سەربازەکانی خۆی کۆکردنەوە و سەرکەوتە سەر تەپۆڵکەی عەینەین.

جا هەرچەندە ئەو چەند سەربازەی کە تەپۆڵکەکەیان جێنەهێشتبوو شەڕێکی پاڵەوانانەیان کرد بەڵام نەیانتوانی دوژمن بوستێنن و تێکی بشکێنن، خالید بە خۆی و سەربازەکانیەوە چووە سەر تەپۆڵکەکە، لەوێوە لەدواوە هێرشیکردە سەر موسڵمانان ئەویش لە ساتێکی چاوەڕواننەکراودا.

مەعلوم هەرچی پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی بێ هۆکار نەبووە، موسڵمانانیش باش ئەوەیان دەزانی، بەڵام ئەمجارەیان فەرمانەکەیان لەبیرچوو، وایانزانی شەڕەکە تەواوبووە، دوژمن ڕایکردووە، زۆرێک چەک و کەلوپەلی جێهێشتووە، کەس لە موسڵمانان پێشبینیان نەدەکرد کە دژە هێرشێکی نوێ لە دوژمنەوە ڕووبدات، کاتێ سەربازانی دوژمن بینیان کە سەرکردەکەیان پلانێکی فێڵبازانە

جێبەجێ دەکات ئەوانیش خۆیان کۆکردەوەو کەیشتنەوە بە خالید، موسڵمانان ئا بەمجۆرە بۆ یەک سات کەمتەرخەمی ئەو جەنگیان دۆڕاند کە پێشتر سەرکەوتنیان هێنابوو تیایدا.

تیروەشێنەکان پەنجەی پەشیمانیان گەست چونکە سەرپێچی پێغەمبەری سەرکردەیان کرد، ئا لەوێدا شڵەژانێکی ئێجگار گەورە لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا ڕوویدا، موسڵمانان هەستیان کرد کە لەبەردەم کارەساتێکی گەورەدان، چونکە ئەو چەند سەربازە کەمە کە لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) مابوونەوە هەموو توانای خۆیان خستەگەڕ تا بیپارێزن لە دوژمن، دوژمن بە هەموو توانای هێرشی خۆیکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زامدار بوو، چەند هاوەڵێک بروسکە ئاسا خێرا ڕۆیشتن تا پارێزگاری لێبکەن، قەڵغانێکی مرۆییان بەدەوریدا دروستکرد. ئامادەبوون قوربانی بەخۆیان بدەن تا ئەو تووشی هیچ نارەحەتییەک نەبێت کە خوای گەورە مۆڵەتی پێنەداوە.

## ٢١٢. حەمزە، پاڵەوانێکی مەزن

چاوی دوژمنان لەسەر حەمزە بوو، ئەوان گومانیان وابوو بە کوشتنی حەمزە ئیتر دەستیان دەگاتە پێغەمبەری خۆشەویست(ﷺ)، بەڵام ترسیان لە حەمزە ڕێگیری لێکردبوون لەوەی نزیکبکەونەوە لێی، چونکە ئەوان دەیانزانی حەمزە جەنگاوەرێکی ئازاو بەجەرگەو ناتوانن بە ئاسانی زاڵبین بەسەریدا.

لەو جەنگەدا بەندەیەکی ڕەشپێست هەبوو بەناوی وەحشی، بە شارەزابوونی لە بەکارهێنانی ڕمدا ناوبانگی دەرکردبوو، بەدرێژایی ماوەی تەواوی شەڕەکە هەر چاوی لەسەر مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، چونکە هیندی ژنی ئەبو سوفیان گەورەی بێباوەڕانی قورەیش بەکرێی گرتبوو تا حەمزە بکوژێ، هیند بەڵێنی پێدابوو ئەگەر حەمزە بکوژێ ئەوا ئازادی دەکات و چەندین خەڵاتی بەهاداری پێدەدات.

وەحشی بە ڕمەکەی حەمزەی کردە نیشانەو دای لەسەر دڵی، مامی پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە سەرزەوی، خێرا شەهید بوو، بێباوەڕان دڵخۆشبوون چونکە دواجار توانیان ئەو ئاواتەیان بێننەدی، لێرەوە ورەیان بەرزبوویەوەو سەرلەنوێ کەوتنە هێشکردنە سەر موسڵمانان، پاشان یەکێک لە بێباوەڕان هەڵزنا بە تەپۆڵکەیەکی نزیکداو قیڕاندی: (موحەممەد کوژرا!).

شڵەژاوییەکی ئێجگار گەورە سوپای موسڵمانانی گرتەوە، هەندێکیان ئەقڵ لەسەریاندا نەما، عەلی هەستی بە دڵەڕاوکێیەکی زۆر دەکرد، ئایا ئەقلگیرە ئەم هەواڵە ڕاست بێت؟ ئایا بەڕاست پێغەمبەری خۆشەویستمان کوژرا؟ کەوتە گەڕان بەهەموو شوێنێکدا تا بەڵکو جارێکیتر بیبینێتەوە.

لە کاتێکدا عەلی لە مەیدانی جەنگەکەدا ڕایدەکرد بەدوای دۆزینەوەی پێغەمبەردا(ﷺ)، گوێی لە دەنگێک بوو قیڕاندی: (مژدەم بدەنێ پێغەمبەر لە ژیاندایە نەمردووە! ئا ئەوە پێغەمبەرە!). ئەوکات موسڵمانان بەدەوری پێغەمبەردا(ﷺ) بە خۆشییەکەوە کۆبوونەوە. تاکە ئامانجیان پارێزگاریکردن بوو لێی.

بێباوەڕان کە زانیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێشتا زیندووە لەوە ترسان موسڵمانان هێزو توانایان کۆبکەنەوەو هێرشێکی نوێ بکەنە سەریان، هەربۆیە گۆڕەپانی شەڕەکەیان جێهێشت و پاشەکشەیان کرد.

لەڕاستیدا موسڵمانان نزیککەوتبوونەوە لە سەرکەوتنی کۆتایی، بەڵام سەرپێچی تیروەشێنەکان لە فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو سەرکەوتنەی گۆڕین بۆ شکست، ئەمەش وانەیەکی گرنگمان لە ژیاندا پێدەدات، ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز نابێت سەرپێچی لە فەرمانی پێغەمبەری خوا بکەین، چونکە تیروەشێنەکان تەنها یەکجار سەرپێچی فەرمانی ئەویان کرد ئا بەو شێوەیە تووشی ئەو شکستە هاتن، جا ئەگەر ئێمە لە هەر سەردەمێکدا بمانەوێ سەرکەوین ئەوا دەبێت گوێڕایەڵی فەرمانی پێغەمبەرەکەمان(ﷺ) بین و سەرپێچی لێنەکەین. کاتێک ئێوارە بوویەوە موسڵمانان دەستیانکرد بە گەڕانەوە بۆ ماڵەکانیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زامدارو ماندوو بوو، چونکە مامەی و ژمارەیەکی زۆر لە خزمان و هاوەڵان لە سەربازە موسڵمانە ئازاکانی لەدەستدا.

## ٣١٣. ئومێدەوارم بەم شەلیەمەوە بچمە بەهەشت

عەمروی کوڕی جەموح کەسێکی زۆر شەل بوو، چوار کوڕی شێرئاسای هەبوو، لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) ئامادەی جەنگەکان بوون، کاتێ جەنگی ئوحود هاتە پێش کوڕەکانی ویستییان ڕێگیری لە باوکیان بکەن تا نەچێت بۆ شەڕ، پێیانوت: تۆ لای خوای گەورە عوزرت هەیە، ئەویش هاتە خزمەتی پێەمبەر(ﷺ) و پێیوت: (منداڵەکانم دەیانەوێ ڕێگیریم لێبکەن نەچم بۆ غەزاو لەگەڵتدا نەیم، دەی سوێند بە خوای گەورە ئومێدخوازم بەم شەلییەمەوە بچمە بەهەشت).

ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێی: ((بەڵام خوای گەورە عوزری تۆی قوبوڵەو شەڕو جیهادت لەسەر نیە)). ئینجا بە کوڕەکانیشی فەرموو: ((بۆتان نیە ڕێگیری لێبکەن، کێ دەڵێ خوای گەورە شەهیدیی نەکردووەتە نەسیبی)). ئەوکات ڕۆیشت بۆ ئوحود و شەهید بوو.

## ٢١٤. شەهیدانی جەنگی ئوحود

لە جەنگی ئوحودا ژمارەیەکی زۆر لە جەنگاوەران شەهیدبوون، دوای ئەوە بێباوەڕان مەیدانی جەنگەکەیان جێهێشت، پێغەمبەر(ﷺ) بە سوپاکەیەوە گەڕایەوە بەرەو مەدینەی مونەووەرە، ژنان و منداڵان لە شەقامەکاندا پێشوازییان لێکردن، هەیانبوو چاوەڕوانی گەڕانەوەی مێردەکەی دەکردو هەیانبوو چاوەڕێی گەڕانەوەی باوک و براکانیان بوون ، دڵەڕاوکەو ناڕەحەتی لەسەر ڕوخساریان بەدی دەکرا.

پێغەمبەری خوایش(ﷺ) دڵیدانەوەو فەرمووی: ((کاتێ براکانتان لە ئوحود تووشهاتن و شەهیدبوون، خوای گەورە ڕۆحی ئەوانی خستەناو سکی باڵندەی سەوزەوە، دەچنە سەر ڕووبارەکانی بەهەشت، لە بەروبوومی بەهەشت دەخۆن، بۆ حەوانەوەش دەچنە ناو چرای ئاڵتونی لە سێبەری عەرشدا)). ئینجا ئەم ئایەتەی خوای گەورەی خوێندەوە بەسەریاندا: ﴿ وَلَا تَحۡسَبَنَّ ٱلَّذِينَ قُتِلُواْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ أَمۡوَٰتَۢاۚ بَلۡ أَحۡيَآءٌ عِندَ رَبِّهِمۡ يُرۡزَقُونَ ، فَرِحِينَ بِمَآ ءَاتَىٰهُمُ ٱللَّهُ مِن فَضۡلِهِۦ وَيَسۡتَبۡشِرُونَ بِٱلَّذِينَ لَمۡ يَلۡحَقُواْ بِهِم مِّنۡ خَلۡفِهِمۡ أَلَّا خَوۡفٌ عَلَيۡهِمۡ وَلَا هُمۡ يَحۡزَنُونَ ﴾ (آل عمران: ١٦٩ - ١٧٠)

موسڵمانان لە ئوحودەوە بە بێدەنگی و بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە گەڕانەوە ماڵەکانیان، بەڵام دڵدانەوەو سەرەخۆشی پێغەمبەر(ﷺ) بۆیان تا ڕادەیەک خەم و خەفەتی کەمکردنەوە، هیوای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ئایندە زۆر زۆر بوو، ئەو قەناعەتی تەواوی هەبوو کە هەرکەس لەگەڵ هەق و ڕاستیدا بێت دواجار هەر سەردەکەوێ.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی، خاتوو فاتیمەی بینی کە بۆ شەهیدبوونی حەمزە و موسڵمانەکانی تریش دەگریا، باوەشی پێداکردو هەوڵیدا دڵیبداتەوە، هەروەها مژدەی پێدا کە تا مەککە ڕزگار دەکرێ جارێکیتر موسڵمانان تووشی شکستی وەک شکستی ئوحود نابن، دەبا بە پاڕانەوەو ئارامگرتن چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژانە بن.

## ٢١٥. پاداشتی دیارییەک موعجیزەیەکی پێغەمبەرە(ﷺ)!

ئافرەتێکی چکەخواز لە مەدینەدا دەژیا ناوی دایکی مالیک بوو، چەند منداڵێکی هەبوو، جا هەرچەندە هەژارو نەدار بوو بەڵام دڵ و دەروونێکی دەوڵەمەندی هەبوو، حەزی لە بەخشینی دیاری و خێرکردن بوو، ڕۆحی زۆر وابەستەبوو بە پێغەمبەری خواوە(ﷺ)، ڕۆژێکیان بیریکردەوە دیارییەک پێشکەش بە پێغەمبەر(ﷺ) بکات، بەڵام لەبەرئەوە جگە لە هەندێ ڕۆن شتێکیتری نەبوو، ڕۆنەکەی کردبووە دەفرێکی پێستییەوە، ئەوەی مایەوە پێشکەشی پێغەمبەری(ﷺ) کرد، ئەم دیارییەی چەند جارێ دووبارە کردەوە، ڕۆژێکیان لە ماڵەکەیدا هیچ خواردنێ نەمابوو، منداڵەکانیشی بە برسێتی هاتنەوە، ئەویش چووە سەر دەفری ڕۆنەکە کە ڕۆنی لێدەکردە دیاری بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، سەیریکرد پڕ پڕە! ئەوکات منداڵەکانی لێ تێرکرد و سوپاسی خوای گەورەی کرد، هەرکات منداڵەکانی برسییان بوایە دەچووە سەر دەفرەکەو دەیبینی پڕە لە ڕۆن، ئەویش منداڵەکانی لێ تێر دەکرد.

جارێکیان، دایکی مالیک دەفرە پێستییەکەی گوشی تا ڕۆنی لێدەربێنێ، سەیریکرد خاڵییە! ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئاگاداریکرد بە حاڵەتەکە، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (ئەگەر وازت لێبهێنایە -واتە نەتگوشیایە- ئەوا هەر وەک خۆی پڕدەبوو)). ئەو دەفر پڕییە موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ).

## ٢١٦. خورمای بەرەکەتدار بە دوعا

عەبدوڵڵە یەکێک بوو لە شەهیدانی ئوحود، دوای خۆی شەش منداڵ و بڕێ زۆر قەرزاریی بەجێهێشت، کاتێ وەرزی ڕنینی خورما هات، خاوەن قەرزەکان هاتنە لای ماڵ و خێزانەکەی تا قەرزەکانیان بداتەوە، بەڵام ئەو خێزانە جگە لە دوو دارخورما ئیتر شتێکیتریان نەبوو، باخەکەش ئەوەندە بەرهەمی ئەوتۆی تێدا نەبوو، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ناتوانێ قەرزەکانی عەبدوڵڵە بداتەوە، ئەو خێزانە خۆیان لە بارێکی سەخت و نالەباردا بینییەوە.

عەبدوڵڵەی شەهید کوڕێکی هەبوو ناوی جابیر بوو، خاوەن قەرزەکان یەک لەدوای یەک دەهاتنە لای جابیر و داوای دانەوەی قەرزەکانی باوکیان لێکرد. پێیانوت: (ئێمە ماڵی خۆمانمان دەوێ، وازت لێناهێنین تا بۆمان نەگێڕیتەوە!). جابیر نەیدەزانی چیبکات، کۆڵی قورسی ئەو قەرزانە کەوتنە سەرشانی، قەرزەکانیش بە بەراورد بەو بەربوومە کەمەی هەیانبوو زۆر زۆر بوون. تەنانەت ئەگەر هەموو خورماکەو ماڵ و کەلوپەل و پۆشاک و هەموو شتەکانیتری خێزانەکەشی بفرۆشتایە هەر نەیدەتوانێ قەرزەکانی سەرشانی باوکی بداتەوە.

جابیر خۆی لە بارێکی سەغڵەت و نارەحەتتدا دەبینی، لە لایەکەوە دەیویست تاقیکردنەوەی لەدەستدانی باوکی تێپەڕێنێ، لە لایەکیترەوە، لەبەردەم داواکاری خاوەن قەرزەکاندایە، بۆیە بڕیاریدا بڕواتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ڕاوێژی پێبکات، پێیوت: (ئەی پێغەمبەری خوا من باوکم لە غەزای ئوحود شەهید بوو و

قەرزێکی زۆری لەدوای خۆی جێهێشتووە، خەڵکیش هاتوون داوای ماڵی خۆیان دەکەن، بەڵام من ناتوانم بۆیان بگێڕمەوە). پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ حاڵی جابیر غەمباربوو، حەزیکرد سوکی بکات لەسەری، پێشنیاری بۆکرد بەروبوومی باخەکە بڕنێتەوە، ئینجا بنێرێ بەدوای پێغەمبەردا(ﷺ).

جابیر خێرا ڕۆیشت بۆ باخەکەو ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) پێی فەرموو ئەنجامیدا، ئینجا ناردی بەدوایدا، پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هات بۆ ماڵی جابیر، سەیرێکی بەروبوومەکەی کرد، ئینجا داوای لە جابیر کرد بنێرێ بەدوای خاوەن قەرزەکاندا، خێرا خاوەن قەرزەکان هاتن بۆ ماڵی جابیر، بەربوومەکە کێشانە کراو لە ماوەیەکی کورتدا دابەشکرا بەسەریاندا. بەروبوومەکە بەشی دانەوەی هەموو قەرزەکانی کرد.

ئەو خەڵکانەی کە هاتبوون قەرزەکانیان وەربگرنەوە سەریان سوڕما لەوەی کە بینییان، جابیر زۆر سوپاسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد لەسەر دوعاکەی و یارمەتیدانی، چونکە بە فەزڵی خوای گەورەو هاوکاری پێغەمبەر(ﷺ) جابیر توانی هەموو قەرزەکانی سەرشانی باوکی بداتەوە، دواجار هەستی بە ئاسودەیی و حەوانەوەیەکی گەورە کرد، سەیرێکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردو لەنێو چاوانیدا بەختەوەریی و خۆشویستنێکی گەورەی بۆ باوەڕداران تێیاندا بەدیکرد، جابیر لەو ساتەدا هەستی بە خۆشەویستییەکی گەورە و ڕاستگۆیانە بۆ خوای گەورە کرد کە ئەو نیعمەتەی پێداوە هاوەڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بێت.

## ٢١٧. زەینەبی جوان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەمیشە خۆشەویستی خۆی بۆ منداڵان دەردەبڕی و یاری و گاڵتەی دەکرد لەگەڵیاندا. لەبەرئەوە، منداڵان هەرکات چاویان پێی بکەوتایە خێرا خۆیان دەگەیاندە لای، ڕۆژێکیان، دەستنوێژی دەگرت تا خۆی ئامادە بکات بۆ نوێژکردن، کچێکی بچکۆلە لێی نزیکبوویەوەو بە خۆشەویستییەوە کەوتە تەماشاکردنی، کچەکە ناوی زەینەب بوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، بە وردی چاوی بڕییە هەموو جموجوڵێکی.

دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستنوێژەکەی گرت، لایکردەوە بەلای کچەکەداو زەردەخەنەی بۆکرد، ئینجا بە ئاو دەستەکانی تەڕکرد، کەوتە یاریکردن لەگەڵیداو ئاوپرژێنی دەموچاوی کرد، کچۆڵەکەش پێدەکەنی و زۆری پێخۆشبوو.

ئیتر لەو ڕۆژەوە، خەڵکی جوانییەکی تایبەتیان لە ڕوخساری زەینەبدا بەدیی دەکرد، وەک بڵێی ئەو ئاوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕژاندی بەسەر دەموچاویدا ئەوەندەیتر جوانیکرد، منداڵانی تریش بە خۆشویستنەوە سەیریان دەکرد، چاویان دەبڕییە ڕوخسارە جوانەکەی. زەینەبیش بەردەوام سوپاسی خوای گەورەی دەکردو پێزانینی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) دەردەبڕی

## ٢١٨. ئەو گەنجەی گاڵتەی بە بانگدان کرد

پێغەمبەر(ﷺ) لە غەزای حونەینەوە دەگەڕایەوە، کاتی نوێژ هات و بانگبێژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بانگیدا بۆ نوێژ، وا ڕێکەوت چەند گەنجێک لەو کاتەدا تێدەپەڕین کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوون، دواتر موسڵمان بوون، گەنجێکیان تێدابوو بەناوی ئەبو مەحزورە، کاتێ گوێیان لە بانگەکە بوو کەوتنە لاساییکردنەوەو لاقرتی پێکردنی.

پێغەمبەر(ﷺ) گوێی لێیان بوو فەرمانیدا بیانهێنن بۆ خزمەتی، ئینجا پرسیاری لێکردن ئەوە کێ بوو بە لاقرتییەوە بانگیدەدا؟ هەموویان ئاماژەیاندا بە ئەبو مەحزورە، هەموویانی ئازادکرد جگە لەو، ئینجا داوای لێکرد بانگبدات.

ئەبو مەحزورە هەستی بە سەغڵەتییەکی زۆر کردو نەیدەزانی چیبلێ، هەموو هێزی بەکارهێناو کەوتە بانگدان، ئا لەو کاتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵەکانی بۆ ڕاستدەکردەوەو ئەوەی لەبیری دەچوو بیری دەخستەوە. کاتێک تەواو بوو، پێغەمبەر(ﷺ) بڕێ پارەی پێداو ئینجا دووجار دەستی هێنا بەنێوچاوانیدا، پاشان بەسەر دەستەکانیدا، بەسەر دڵیدا، ئینجا بەسەر ناوکیدا، دوای ئەوە فەرمووی پێی: ((خوای گەورە فەڕو بەرەکەت بڕێژێ بەسەرتدا)).

ئەبو مەحزورە سەرسامبوو بەو هەڵسوکەوت و لێبوردییەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نواندی لەگەڵیدا. ئالەوێدا لەبەرئەنجامی ئەو لاقرتییەی کە پێشتر بە بانگەکەی کرد هەستی بە سەغڵەتییەکی زۆر کرد.

لەو ڕۆژەدا، ئەبو مەحزورە بڕیاریدا ببێتە بانگبێژ لە مزگەوتی پێغەمبەردا(ﷺ) بەڵکو ئەوە ببێتە هۆی لێخۆشبوون لە گوناهەکانی، خۆی تەرخانکرد بانگدان لەبەربکات و لەجیاتی ئەوە لاقرتی پێبکات بێت بە شێوەیەکی ڕاست جێبەجێی بکات. کاتێک وایلێهات کە دەتوانێ بە شێوەیەکی باش ئەنجامی بدات، چووە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکرد مۆڵەتی بدات لە مزگەوتی حەرام بانگبدات. بەمشێوەیە ئەبو مەحزورە لەپاش ئەوە کە لاقرتی پێدەکرد دڵی بووە وابەستەی بانگدان.

بەو پەرۆشییەوە، ئەبو مەحزورە بووبە بانگبێژێکی سەرکەوتوو و لەخۆبوردە، بۆ چەندین ساڵی ژیانی خۆی تەرخانکرد بەو ئەرکە هەستێ و لەدوای خۆیشی منداڵەکانی ئەو ئەرکە بگرنە ئەستۆیان.

## ٢١٩. هەرکاتێ چاوی پێمکەوتبێ زەردەخەنەی بۆم کردووە

جەریری بیجلی ڕۆیشت بۆ مەدینەی مونەووەرە تا ئاشنا ببێت بەم ئاینە نوێیە کە لە بڵاوبوونەوەدایە، کاتێ گەیشتە ئەوێ وشترەکەیی بەستەوەو جوانترین پۆشاکی لەبەرکرد و چووە مزگەوتی پێغەمبەر، بینی وا پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتار دەدات. کاتێ چووە ژوورەوە خەڵکی ئاوڕیان لێدایەوەو بۆ ماوەیەک هەر سەیریان دەکرد! ئینجا دانیشت و بەو کەسەی وت کە بەتەنیشتییەوە بوو: (ئەی عەبدوڵڵە، ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوی منی برد؟ ئەویش وتی: بەڵێ! بە باشترین ناوبردن ناوی بردی، لە کاتێکدا ئەو(ﷺ) وتاری دەدا، لە وتارەکەیدا فەرمووی: ((لەو دەرگایەوە کەسێک دێتە لاتان لە باشترین کەسەکانی خەڵکی یەمەنە، نێوچاوانی جێدەستی فریشتەی پێوە دیارە!)).

جەریر وتی: سوپاسی خوای گەورەم کرد لەسەر ئەوە کە تاقیکردمەوە، پاشان موسڵمان بووم، بەیعەتم بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا نوێژ بکەم و زەکات بدەم، ئامۆژگاری موسڵمانان بکەم و دڵسۆزبم پێیان، لەو کاتەوە کە موسڵمانبووم ئیتر شتێک نەمایەوە دامبڕێ لێی، هەرکاتیش چاوی پێمکەوتبێ زەردەخەنەی بەڕوومدا کردووە.

## ٢٢٠. تەنانەت گیانلەبەرانیش ڕێزیان لێدەگرت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گیانلەبەرانی زۆر خۆشدەویست و ئازاری نەدەدان. هەمیشە ئامۆژگاری خاوەن مەڕو مالات و ئاژەڵە ماڵییەکانی دەکرد بە باشە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەن و نەیانترسێنن. خۆی وشترێکی هەبوو ناوی وشترە گوێکەلەکە بوو (قەصوا)، خۆی بەخێوی دەکردو جار جار دەستی دەهێنا بەسەر پشتیدا.

پێغەمبەر(ﷺ) بەرگری لەو ئاژەڵانە دەکرد چونکە ئەوان بێزمانن. هەروەک چۆن مرۆڤی خۆشدەویست ئەوانیشی خۆشدەویست. ئاژەڵەکانیش ڕێزو خۆشەویستییەکی گەورەیان بۆی هەبوو.

وشترە قەصوا پێغەمبەری لەسەر پشتی خۆی هەڵدەگرت بێئەوەی بێتاقەتی بکات، پێشتر کەسی ئەوەندە بەسۆزو هەستیاری لەو شێوەیە نەدیبوو. هەرگیز لێی دوور نەدەکەوتەوە.

## ٢٢١. شادمانیی مێردمنداڵێکی نەخۆش

پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام خۆشەویستی و دڵپاکی خۆی بۆ هەموو مرۆڤەکان نیشاندەدا. لەبەرئەوە منداڵان بەشێوەیەکی تایبەت خۆشیاندەویست، مێردمنداڵێکی جولەکە هەبوو ئەویش وەک منداڵانیتر پێغەمبەری(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، لە کارە جۆراو جۆرەکانیدا زوو دەچوو بۆ یارمەتیدانی.

چەند ڕۆژێک تێپەڕی و هیچکام لە منداڵی دراوسێیەکان ئەو منداڵەیان نەدەبینی، پێغەمبەر(ﷺ) بێتاقەتی دەکرد، کەوتە پرسیارکردن بۆی، پرسیاری لە خزمەکانی کرد، پێیانوت ئەو نەخۆشەو ماوەیەکە لەسەر جێگایە.



پێغەمبەر(ﷺ) بە بیستنی ئەو هەواڵە ناخۆشە خەمباربوو، خێرا بانگی ئەنەسی کردو پێکەوە ڕۆیشتن بۆ سەردانی کوڕەکە. پێغەمبەر(ﷺ) بەردەوام ئامۆژگاری خەڵکی دەکرد کە سەردانی نەخۆش بکەن چونکە پاداشتی گەورەی هەیە، هەرکاتیش بڕۆیشتایە بۆ سەردانی نەخۆش دیاری بۆ دەبرد، لەگەڵ نەخۆشەکاندا قسەوباسێکی نەدەکرد کە بێسود بێت، بەڵکو شتانێکی دەفەرموو کە ئاسودەیان بکات، بەرلەوە بەجێیان بێڵێ دوعای چاکبوونەوەی بۆ دەکردن.

کاتێ لەگەڵ ئەنەس چووە سەردانی کوڕە نەخۆشەکە، سەرنجیدا زەردهەڵگەڕاوە و نەخۆشە، منداڵەکە لەسەر جێگاکەی ڕاکشابوو، بەڵام هەرکە پێغەمبەری(ﷺ) بینی هەردوو چاوە ماندووەکانی کردەوەو ڕوخساری گەشبوویەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان

لەلایەوە دانیشت، بە قسەی جوان کەوتە دڵخۆشکردنی. هەتا ئەو(ﷺ) قسەی زیاتری بفەرمووایە زەردەخەنەی سەر لێوانی ئەو فراوانتر دەبوو و نەخۆشییەکەیی لەبیردەچوویەوە.

پاش کەمێک، پێغەمبەر(ﷺ) کوڕە جووەکەی بانگهێشت کرد بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، ئەویش بە دوودڵییەوە سەیرێکی باوکی کرد، ئەمە لە کاتێکدا کە باوکیشی هەر جولەکە بوو. بەڵام جوان دەیزانی کە موحەممەد پێغەمبەری خاتەمە، بۆیە بە کوڕەکەیی وت: (بەگوێی ئەبا قاسم بکە).

کوڕەکە دڵخۆشبوو، ڕاستەوخۆ شایەتومانی هێنا، وا هەستیکرد وەک بڵێی تازە لەدایکبووە، پێغەمبەریش(ﷺ) زۆری پێخۆشبوو، فەرمووی: ((سوپاس بۆ خوای گەورە کە پاراستی لە دۆزەخ)).

## ٣٢٢. سکاڵای وشترێک

ڕۆژێ لە ڕۆژان، وشترێک بەسترابوویەوە بە درەختێکی دارخورماوە، بە دەنگێکی زۆر بەرز کەوتبووە ئاهونالەو کڕوزانەوە، ملەجیرەی بوو لەگەڵ ئەو گوریسەدا پێی بەسترابوویەوە، ڕێگای بە کەس نەدەدا نزیکبێتەوە لێی، هەرکەسیش جورئەتی بەخۆی بدایە نزیکبێتەوە لێی، لقەیەکی بۆ دەهاویشت و دووری دەخستەوە لە خۆی، وشترەکە دواجار خۆی لە گوریسەکە ڕزگارکرد، بەوپەڕی توانای کەوتە غاردان، کەس جورئەتی ئەوەی نەبوو بیوەستێنێ، زۆر توڕەو هار بوو، هاوەڵان حاڵی وشترەکەیان گەیاندە پێغەمبەر(ﷺ)، فەرمووی پێیان: ((هەستن)). هەموو چوون بۆ ئەو باخە کە وشترەکەی لێبوو، هەرکە وشترەکە پێغەمبەری(ﷺ) بینی هێور بوویەوەو لەبەردەمیدا چۆکیدادا، وەها نەدەبینرا هەمان ئەو وشترە بێت کە پێش چەند خولەکێک شێت و هار و توڕە بوو، ئینجا نێوچاوانی خۆی خستە سەرزەوی وەک بڵێی سوژدە ببات وەهابوو.

پێغەمبەر(ﷺ) دەستیهێنا بەسەر پشتیدا، ئینجا بە گوریسەکە بەستییەوە، مەسەلەکە وەها دەبینرا وەک بڵێی ئەو وشترە ویستبێتی شتێک بە پێغەمبەر(ﷺ) بڵێ، ئینجا پێغەمبەری خوا زیاتر لێی نزیکبوویەوەو گوێی بۆگرت. پاشان هەموانی ئاگادارکرد کە وشترەکە سکاڵای لەسەر خاوەنەکەی هەیەو بێزارە لێی، پێغەمبەر(ﷺ) خاوەنەکەیی بانگکرد، داوای لێکرد جوان هەڵسوکەوت لەگەڵ وشترەکەیدا بکات، نەکات باری قورسی لێبنێ کە توانای بەسەریدا نەشکێ. کابرایش بەڵێنی پێدا وەها بکات.

وشترەکە تێگەیشت کە پێغەمبەر(ﷺ) توانی قەناعەت بە خاوەنەکەی بکات، ئینجا خۆشی بۆ گەڕایەوەو پێزانینی خۆی بۆی دەبڕی کە بووە یارمەتیدەری. چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە وتاردانەدا بوو کاتی ئاگاداریان کرد بە حاڵی ئەو وشترە ئەویش وتارەکەی بڕی تا گرنگی بەو گیاندارە بێزمانە بدات و گوێبیستی سکاڵاکەی بێت، ڕێگیریشی لە خاوەنەکەی کرد بە خراپ هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکات و ستەمی لێنەکات. چونکە دادپەروەریی لە هەموو شتێک گرنگترە، تەنانەت بەرانبەر بە گیاندارانیش. ئەو دادپەروەرییە تایبەت نیە بە مرۆڤەوە، بەڵکو ئاژەڵان و هەموو بەدیهێنراوانی تریش دەگرێتەوە، گەورەیی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ئا لەمەدا دەردەکەوێ.

## ٢٢٣. مژدەیەک لە جبرەئیلەوە

هۆزێکی جولەکە هەبوو بەناوی بەنو نەزیر (بنو نضیر)، ئەم هۆزە لە دەوروبەری مەدینەی مونەووەرە نیشتەجێ بوون، ناوبانگیان بە دەوڵەمەندی دەرکردبوو، خەڵکەکەی لە قەڵاو شوێنە قایمەکاندا دەژیان، لە ڕابردوودا، بەڵێنیان بە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) دابوو بە ئاشتی لەگەڵ باوەڕدارانندا بژین و هیچ جۆرە کێشەیەک دروست نەکەن. بەڵام کەوتنە پاشگەزبوونەوە لە مەرجەکانی ڕێکەوتننامەکە، دەستیاندایە هاوکاریکردنی دوژمنانی پێغەمبەر(ﷺ)، ئەویش کە ئەوەی بیست، بە یاوەری هاوەڵان ڕۆیشت بۆ سەردانیان، پێغەمبەر(ﷺ) حەزی دەکرد وەفادار بێت بەرانبەر بە بەڵێننامەکان، هەرکەسیش بیشکاندایە بە نەرمی ئاگاداری دەکردو هۆشداری پێدەدا، هەمیشە لەگەڵ ئاشتی و برایەتیدا بووە.

جووەکان بە گەرمی پێشوازییان لە پێغەمبەر(ﷺ) کرد، چاکەیان وت و ڕوخۆشییان نواند بەڕوویدا، پێیانوت کە دڵخۆشبوون بە سەردانەکەی، بەڵام لە واقیعدا لە ناخەوە تەواو پێچەوانەی ئەوە بوون کە بە زمان دەیانوت.

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ چەند هاوەڵێکی لە ڕێگای گەڕانەوەیان دانیشتن بحەسێنەوە، پاڵیاندا بە دیوارێکەوە، یەکێک لە پیاوە ناپاکەکان ئەوەی بە هەل زانی و چپاندی بەگوێی یەکێکتریانداو وتی: (ئێوە زیاتر لە ئێستە نابینن موحەممەد ئاوا لێیەوە نزیکبن، کێتان دەڕواتە سەر ئەو خانووەو بەردێکی گەورە بەربداتەوە بەسەریداو ڕزگارمان بکات لێی؟) کابرایەکی پیسییان وتی: (من).

بەڵام یەکێک لە زانا جووەکان پێیوتن: (ئەگەر ئێوە ئیشی وابکەن ئەوا خوا دەیپارێزێ لێی و ئێوەش ئەو بەڵێننامەیە دەشکێنن کە واژۆتان لەسەری کردووە، لەبەرئەوە واز لەو پیلانگێڕییە بێنن). بەڵام کابرای فێڵباز گرنگی نەدا بە قسەی زاناکەیان، بەڵکو بەردێکی گەورەی هەڵگرت و چووە سەر خانووەکە تا بیدات بەسەر پێغەمبەردا(ﷺ)، مەعلوم بوو کە خوای گەورە لێناگەڕێ پێغەمبەرەکەی بکەوێتەناو ئەو تەڵەیەوە، خوای گەورە جیبرەئیلی(ﷺ) نارد تا پێغەمبەر(ﷺ) ئاگاداربکات بەوەی کە ڕوودەدات.

هەرکە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی زانی، بەهێواشی شوێنەکەی جێهێشت، بێئەوەی هیچ جۆرە ترس یان شڵەژاوی پێیەوە دەربکەوێت. بمجۆرە خوای گەورە ڕزگاری کرد.

دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشت، کەسێک کە لەوێ بوو وتی: (ئایا دەزانن موحەممەد بۆچی ڕۆیشت؟ چونکە ئاگادارکرا بەوەی پلانتان بۆ داڕێژابوو)، ئەوانیش کەوتنە سەیرکردنی یەکتری و بە سەرسوڕمانەوە وتیان: (چۆنت زانی؟) پیاوەکە وتی: (ئەو پێغەمبەرە، هەموو نیشانەکانی پێغەمبەرێتی ئەو لە تەوراتدا باسکراوە. بە حەتمی موحەممەد خاتەمی پێغەمبەرانە، وا گومان دەبەم بەمزوانە لەسەر پشتی وشترەکانتان ئەم شوێنە جێدەهێڵن). ئەوانیش پێیانوت: (کەواتە، ئامۆژگاریت چییە بۆمان؟) پیاوەکە وتی: (موسڵمان ببن و بچنەناو هاوەڵانی موحەممەدەوە، بەم ڕێگایە، خۆتان و منداڵەکانتان ڕزگار دەکەن). بەڵام ئەوان ڕەتیانکردەوەو وتیان: نەخێر، هەرگیز واز لە ئاینی باو باپیرانمان ناهێنین).

دوای ئەو ڕووداوە، پێغەمبەر(ﷺ) دە ڕۆژ دەرفەتیدا بە بەنو نەزیر تا ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ موسڵمانان نوێبکەنەوە، بەڵام ئەوان بە تەواوەتی ڕەتیانکردەوە، ئەوکات پێغەمبەر(ﷺ) گەمارۆی خستە سەریان تا دواجار خۆیان ڕادەستکرد.

ئـەوکات، پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمانـی پێـدان مەدینـە بەجێبێڵـن و بگوازنـەوە بـۆ شـوێنێکی تـر. موسـڵمانانیش بـەو شـێوازە ڕزگاریـان بـوو لـە ئـازارو زیانـی بەنـو نەزیـر، هەمـوو کەلوپـەل و مـاڵ و سـامانیان خسـتە سـەر پشـتی وشـترەکانیان و ڕۆیشـتن بـۆ خەیبـەر، کـە جولەکـەی تریشـی تێـدا دەژیـا.

## ٣٢٤. ئافرەتێک و دوازدە بزنەکەی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەیدا بە ماڵێک لە مەدینەدا، پاشان فەرمووی: ((ئەوە ئافرەتێکی تێدا بوو، لەگەڵ دەستەیەک لە موسڵمانان ڕۆیشت بۆ غەزا، دوازدە سەر بزن و سوژنەکەیی جێهێشت کە شتی پێدەدوری.

ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) باسیکرد کە کاتێ لە سەفەرەکەی گەڕاوەتەوە بزنێکی ونبووە، ئەویش کەوتووەتە پاڕانەوەو وتوویەتی: ئەی پەروەردگار! زاتی تۆ زامنی پاراستنی ئەو کەسەی لەپێناوی تۆدا ڕۆیشتووە بۆ غەزا کەچی من بزنێکم لە ڕانەکەم و سوژنەکەمم لەدەستداوە، داوات لێدەکەم بزنەکەو سوژنەکەم بۆ بگێڕیتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی ئەو ئافرەتە ئەوەندە بەکوڵ لە پەروەردگاری دەپاڕایەوە تا خوای گەورە دوعاکەی گیراکردو بزنەکەو سوژنەکەشی بۆ گێڕایەوە.

## ٢٢٥. چۆلەکەش بەچکەی خۆی خۆشدەوێت

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) قسەی بۆ هاوەڵان دەکرد، یەکێکیان باڵندەیەکی لە دوورەوە چاوکرد، باڵندەکە بەدەوری هێلانەیەکدا دەسوڕایەوە کە بەچکە چۆلەکەیەکی تێدابوو. یەکێک لە هاوەڵان ڕۆیشت بۆ لای هێلانەکەو بەچکەکەی هەڵگرت، کاتێ دایکەکەی ئەوەی بینی، کەوتە سوڕانەوە بەدەوری هاوەڵەکەدا وەک هەوڵێک بۆ پاراستنی بەچکەکەی. بە تورەیی و هاروهاجی دەسوڕایەوە بە دەوری هاوەڵەکەدا. خەریکبوو خۆی بدات بەسەریدا، هاوەڵەکانی تریش بە سەرسوڕمانەوە سەیری دایکەکەیان دەکرد.

کاتێ پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەو حاڵەتەی بینی، پرسیاری لێکردن ئەوە کێ ئەو بەچکەیەی بردووە. داوای لێکردن بگەڕێنرێتەوە بۆ جێگای خۆی، پاشان بە هاوەڵەکانی فەرموو: ((خوای گەورە بەزەیی کردووە بە سەد بەشەوە، نەوەدو نۆ بەشی لای زاتی خۆی هێشتووەتەوەو یەک بەشی دابەزاندووەتە سەرزەوی، هەموو دروستکراوەکان دەکەونەبەر بەزەیی ئەو یەک بەشە، تەنانەت ماین سمی بەرزدەکاتەوە لە بەچکەکەی نەبادا تووشی ناڕەحەتی بکات)).

هاوەڵان کەوتنە بیرکردنەوە لە ئاستی ڕەحمەتی خوای گەورە بۆیان، لەدوای ئەو ڕووداوە هەستیان بە ئاشتی و دڵئارامی کرد.

## ٢٢٦. لافاو لە شەقامەکانی مەدینەدا

لە خوای گەورەوە فەرمانێکی نوێ هاتە خوارەوە کە لەم دوو ئایەتەدا خۆی وێنا دەکات: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ، إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَن يُوقِعَ بَيۡنَكُمُ ٱلۡعَدَٰوَةَ وَٱلۡبَغۡضَآءَ فِي ٱلۡخَمۡرِ وَٱلۡمَيۡسِرِ وَيَصُدَّكُمۡ عَن ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِۖ فَهَلۡ أَنتُم مُّنتَهُونَ﴾ (المائـدة: ٩٠ - ٩١)

لەم دوو ئایەتەدا، خوای گەورە خواردنەوەی مەی لەسەر موسڵمانان حەرامکرد کە پێشتر ئالودە بوون پێیەوە. ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) جارِدەری نارد بۆ شەقامەکانی مەدینە تا هاواربکەن و خەڵکی بەو فەرمانە ئاگادار بکەن. جارِدەران بە شەقامەکانی مەدینەدا دەسوڕانەوەو بە دەنگی بەرز دەیانوت: (ئەی موسڵمانان! ئەوە بزانن لە ئێستە بەولاوە ئیتر مەی خواردنەوەتان لێ حەرامکراوە!). شڵەژاوییەک لەنێو خەڵکەکەدا دروستبوو، هەر موسڵمانانێک ئەو ئایەتەی بیست ئیتر یەک دڵۆپ ئارەقی لە ماڵی خۆیدا نەهێشت، خێراو دەستوبرد خەڵکی کەوتنە فڕێدانی بەرمیلە ئارەقەکانیان بە شەقامەکاندا، تا شەقامەکانی مەدینەی مونەووەرە سەرڕێژ بوون بە ئارەق.

باوەڕی خەڵکی ئەوەندە بەهێزبوو هیچ شتێکیان لە ئارەق لە ماڵەکانی خۆیاندا نەهێشتەوە، لەپێناو خوای گەورە خۆیان ڕزگارکرد لێی، زۆر زوویش هەستیان بە جوانی و سودی ئەو فەرمانە کرد کە لە خوای گەورەوە دابەزییە سەریان، چونکە ئەنجامی دوورکەوتنەوە لە ئارەق پاراستنی خەڵکییە لە هەموو شێوەکانی خراپەکاریی کە

مرۆڤی سەرخۆش و گێژ تووشی دەبێت، چونکە ئەقڵ و وردەکاریی مرۆڤ ناهێڵێ.

پێغەمبەر(ﷺ) دەفەرموێ: ((مەی دایکی خراپەکانە)). واتە دەرگایەکە بۆ هەموو گوناهەکان، موسڵمانانیش گوێڕایەڵی ئەو فەرمانە بوون و ڕێنمایی خوای گەورەیان جێبەجێ کرد. هەروەها زۆر سوپاسگوزاریی بوون کە لەو خووە پیسە ڕزگاری کردن.

## ٢٢٧. گەنجێکی کەشخە

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) خەڵکی هاندەدا لەسەر پۆشینی پۆشاکی پاکوخاوێن و کەشخە. خودی خۆی(ﷺ) زۆر بەجوانی پارێزگاری لە پاکوخاوێنی خۆیدەکرد. پۆشاکی گونجاوی بۆ هەر بۆنەیەکی جیا لەبەردەکرد. ڕۆژێکیان، گەنجێک هاتە خزمەتی کە حەزی لە پۆشینی پۆشاکی جوان و جیاکار دەکرد، چونکە جارێکیان گوێبیستی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە دەیفەرموو: ((هەرکەس بە ڕادەی دەنکە خەرتەلەیەک خۆبەزلزانی تێدابێت ناچێتە بەهەشت))، گەنجەکەش پێیوت: (مرۆڤ حەزدەکات پۆشاکەکەی جوان و پێڵاوەکانی جوان بن). پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەڵامیدایەوەو فەرمووی: ((خوای گەورە جوانەو جوانی خۆشدەوێت، خۆبەزلزانی لادانە لە هەق و بەکەمزانینی خەڵکییە)).

گەنجەکە زۆر دڵخۆشبوو ئەوەی لە زاری پێغەمبەر(ﷺ) بیست. هەروەها فەرمووی: ((پۆشاکی جوان بپۆشن بەمەرجێ زیادەڕۆیی یان فیزکردنی تێدا نەبێت)). ئەوکات گەنجەکە لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فێری ئەوە بوو کە لەبەرکردنی پۆشاکی جوان و کەشخە هەڵە نیە بەمەرجێ نرخەکەی زۆر گران نەبێت یان بۆ فیزکردن و شانازیکردن نەبێ بەسەر خەڵکیدا، لەدوای ئەو ڕۆژەوە ئیتر گەنجەکە پۆشاکی ناوازەو جیاکاری بۆ خۆی هەڵدەبژاردو خەیاڵیشی ئاسودە بوو، بێئەوەی زیادەڕۆیی بکات یان بە فیزو خۆبەزلزانینەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵکیدا بکات.




**Tanya Haji | تەنیاحاجی**

public channel

Description

﷽

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

داوای ڕیکلام مەکە نایکەین🚫

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچوون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

## ٢٢٨. دوعا بۆ دایکی دووەم کە بەهەشتی بێت

دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە کەسێکی بێ باوک و دایک، ئەبو تالیبی مامی و فاتیمەی خێزانی لە ئامێزیان گرت. پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو سۆزو بەزەییەی کە خێزانی مامی لە ماڵەکەی خۆیدا پێیدا لەبیری نەدەچوویەوە، بەڕاستی هەڵسوکەوتی لەگەڵیدا باشتر بوو لەوەی لەگەڵ منداڵەکانی خۆیدا دەیکرد. بەو هۆیەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زوو زوو سەردانی دەکرد، هەرگیز ڕێزی بۆی کەمی نەکرد، فاتیمەی خێزانی مامی لە ژیاندا مایەوە و تەمەنێکی زۆری بەسەربرد، دواجار ڕۆژێک مردن یەخەی پێگرت.

کاتێ هەواڵی مردنی گەیشتە پێغەمبەری خوا(ﷺ) وا هەستیکرد کە دایکی مردووە. ڕۆیشت تا ڕێوڕەسمی جەنازەکەی بەڕێبکات، کاتێ گەیشتنە گۆڕستانەکە، نوێژی جەنازەی لەسەر کرد و دوعای لێخۆشبوونی بۆکرد.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆر خەمباربوو بۆ دایکی دووەمی و فرمێسک لە چاوانی دەهاتنە خوار، ئای ئەو دوعایە چەندە نایابە کە پێغەمبەر(ﷺ) لە نوێژی جەنازەدا دەیفەرموو: ((پەروەردگار لێیخۆشبەو بەزەییت پێیدا بێتەوە، سەلامەتی بکەو لێی ببورە و ڕێزی میوانداربیەکەی بگرە، گۆڕەکەی فراوان بکە، بە ئاو و بەفرو تەرزە بیشۆ، لە گوناهەکانی پاکیبکەرەوە هەروەک پۆشاکی سپی لە چڵک و چەپەڵی پاکدەکرێتەوە، خانوویەکی چاکتر لەم خانووەی پێببەخشە، خانەوادەیەکی چاکتر لەم خانەوادەی ئێرەی پێببەخشە، بیخەرە بەهەشتەکەت، بیپارێزە لە سزای ناو گۆڕ، لە سزای دۆزەخ)). کاتێک خەڵکی ئەو وەفادارییەیان بۆ ئەو دایکە لێبینی کە پەروەردەی کردووە ئەوەندەیتر خۆشەویستییان و ڕێزیان بۆی زیاتر بوو.

## ٣٢٩. نابێتە بار بەسەر کەسەوە

پێغەمبەر(ﷺ) لە ماڵی خۆیدا وەک مرۆڤێکی ئاسایی ژیانی دەبردەسەر. ئەگەر خۆی بیویستایە، ئەوا خەڵکی پێشبڕکێیان دەکرد بۆ خزمەتکردنی، چونکە سەدان کەس چاوەڕێی ئاماژەیەکی بوون، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) ژیانی سادەی پێباشتر بوو، هەر شتێک لە ماڵەکەیدا تێکبچوایە خۆی چاکیدەکرد، پۆشاکەکەی خۆی دەدوریەوەو پینەی دەکرد، هەروەها پێویستییەکانی لە بازاڕ دەکڕی و یارمەتی خێزانەکانی دەدا، گسکی دەدا، ماڵەکەیی ڕێکدەکرد، ئالیکی بە ئاژەڵەکانی دەداو بە دەستی خۆی دەیدۆشین. حەزی لە تەمبەڵی نەبوو، بەڵکو هەمیشە حەزی لە کارکردن و چالاکی بوو.

جارێکیان کەسانێک پرسیاریان لە عائیشەی خێزانی -خوا لێی ڕازی بێت- کرد کە ئایا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماڵی خۆیدا چیدەکرد؟ وتی: (ئەو وەک هەر مرۆڤێکی تر وابوو، وەک بڵێی پیشەی ماڵەکەی ئەنجامدەدا، پۆشاکەکەی پینە دەکردو دەیدوریەوە، مەڕەکانی دەدۆشی، هەر کاریَ پیاوان لە ماڵدا بیکەن ئەویش دەیکرد، تا خەڵکی وایانلێهات وەک ئەویان دەکردو لە هەموو کاروبارێکدا چاویان لێدەکرد، پیاوان کەوتنە یارمەتیدانی خێزانەکانیان، پارێزگاریان لە پاکوخاوێنی و ڕێکوپێکی خۆیان دەکرد، بە هەموو لێبڕان و گورج و گۆڵییەوە کاریان دەکرد بێئەوەی ببنە بار بەسەر کەسەوە.

## ٤٣٠. بسم الله لە کاتی دەستکردن بە نانخواردن

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ڕێسای وابوو دەستی بە هەر شتێک بکردایە بە دەستەواژەی (بسم اللە) دەستی پێدەکرد. پێش ئەوە دەستبکات بە نانخواردن دەیفەرموو بسم الله، لە قاپی هاوبەشدا دەیخوارد، تەنها لەبەرخۆیەوە دەیخوارد، داوای لە هەمووانیش دەکرد هەمان شت بکەن، ڕۆژێکیان، هاوەڵان هاتنە خزمەتی، پێیانوت: (ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە هەر دەخۆین و تێرناخۆین). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لەوانەیە بەجیا خواردن بخۆن)). وتیان: (بەڵێ). فەرمووی: ((کەواتە کۆببنەوە لەسەر خواردنەکەتان، ناوی خوای گەورەی لەسەر بێنن تا فەڕو بەرەکەتی تێبکات)).

جارێکیان، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەریکی نانخواردن بوو، مێردمنداڵێک هاتە خزمەتی، فەرمووی پێی: ((ئەی کوڕەکە، ناوی خوا ببە، بە دەستی ڕاستت بخۆ، لەوە بخۆ لەبەردەمتەوەیە)).

ئەم گوفتارە حەکیمانەیە پڕە لە سود. هاوەڵانیش دەقاو دەق شوێن ڕێنماییەکانی پێغەمبەریان(ﷺ) کەوتن، بەدرێژایی ژیانیان ڕێساکانی ئەو ڕەفتارە کۆمەڵایەتییەیان جێبەجێ کرد کە فێری کردن.

## ٢٣١. سیلەی ڕەحم

پێغەمبەر(ﷺ) خزمەکانی خۆشدەویست و ڕێزی لێدەگرتن، زۆرجار سەردانی دەکردن و هەواڵی باری ژیانیانی دەپرسی، لە هەموو شتێکدا یارمەتی دەدان، بەوانەی دەفەرموو کە گرنگییان بە خزمەکانیان نەدەدا سیلەی ڕەحم بەرەکەت دەخاتە تەمەن و ڕزقەوە.

ڕۆژێکیان، کەسێک هاتە خزمەتی و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، من خزمەکانم زۆر خۆشدەوێن و بەردەوام سەردانیان دەکەم، بەڵام ئەوان لەبەرانبەردا بەوجۆرە هەڵسوکەوتم لەگەڵ ناکەن، بەڵکو ئازارم دەدەن و هەستم بریندار دەکەن، بە زبری و ڕەقی مامەڵەم لەگەڵدا دەکەن). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر تۆ وەها بیت کە خۆت دەڵێیت ئەوا وەک ئەوە وایە خۆڵەمێشی گەرمیان بدەیتی، هەتا تۆ لەسەر ئەو حاڵەتە بەردەوامبیت ئەوا لە خوای گەورەوە پشتگیریت لێدەکرێ)).

هانیدا لەسەر درێژەدان بە سیلەی ڕەحمەکەی و ئارامگرتن لەسەر ئازاردانیان، خوای گەورەش پشتگیری دەکات و پاداشتی ونناکات.

## ٢٣٢. درۆ نەکەیت با بە گاڵتەش بێت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە درۆکردن نەبووە با بە گاڵتەشەوە بوو بێت.

ڕۆژێکیان چوو بۆ سەردانی ماڵێک. ژنی ماڵەکە بە منداڵەکەی وت: (وەرە کوڕەکەم، ئەو شتەت دەدەمێ کە حەزت لێبەتی). پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لە ئافرەتەکە کرد: ((بەڕاست دەیدەیتێ؟)). ژنەکە وتی: (بەڵێ). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئەگەر نەیدەیتێ ئەوا درۆیەکت لەسەر نوسراوە)).

پێغەمبەر(ﷺ) هۆشداریداوە لەوەی کەسێک بە مەبەستی سوعبەتکردن درۆبکات و دەفەرموێ: (نەگبەتی بۆ ئەو کەسە کە بە درۆ قسە دەکات تا خەڵکی پێبکەنن، نەگبەتی بۆی، نەگبەتی بۆی)).

## ٢٣٣. عەبایەک

پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک خۆری پرشنگدار وابوو بە ئاسمانی مەدینەی مونەووەرەوە. هەموو ئەوەی کە دەیکرد خەڵکی جوانییەکی جیاوازیان تێدا بەدیدەکرد. ئەو کەسێکی زۆر بەخشندە بوو، هەموو ئەوەی کە هەیبوو دەیبەخشی بە هەژاران و نەداران، خۆشەویستی بۆ خەڵکی ئەوەندە زۆر بوو کە فەزڵی ئەوانی دەدا بەسەر خۆیدا. ئەو ئاواتی ئەوە بوو هەمووان هەست بە بەختەوەری بکەن.

ڕۆژێکیان، ئافرەتێک کە عەبایەکی بەدەستەوە بوو هاتە خزمەتی، وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، خۆم هەستاوم بە چنینی ئەم عەبایە بۆت. تکام وایە وەک دیارییەک لێم وەربگری). پێغەمبەر(ﷺ) دیاری ئافرەتەکەی وەرگرت و زۆری پێخۆشبوو.

لەڕاستیشدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێویستی بەو عەبایە هەبوو. فەرمووی بسم الله پاشان کردییە بەری، پاشان بە هەندێ ئیشوکار لەماڵەوە چووە دەرەوەوە، لەڕێگادا پیاوێک وەستانی، لە تێڕوانینی هاوەڵانەوە هەرچی هی پێغەمبەر بوایە لای ئەوان زۆر بە نرخ بوو، زۆر حەزیان لە دەستخستنی شتێک بوو کە پێشتر پێغەمبەر(ﷺ) بەکاری هێنابێت یان لەبەری کردبێ. پیاوەکە دەستیدا لە عەباکەی پێغەمبەر و وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئەمە چەندە جوانە، بیکەرە بەرم).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی وەهابوو داواکاری کەسی ڕەتنەدەکردەوە، با ئەو شتەشی نەبوایە کە خەڵکانێک داوایان لێدەکرد، کەسی بە نائومێدی نەدەگێڕایەوە، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە

ماڵەکەی خۆی، عەباکەی داکەند، پاشان پێچایەوەو دای بەو هاوەڵە کە داوایکرد، هاوەڵەکە زۆر دڵخۆشبوو بە دیارییەکەی پێغەمبەری خوا. بەڵام یەکێک لە هاوەڵان پێیوت: (باشت نەکرد چونکە کاتێ پێغەمبەرت(ﷺ) بینی کە وەریگرتووە ئەوە پێویستی پێی هەبووە، کەچی تۆ داوات کرد لێی، تۆ ئەوەش دەزانی کە هەرکەس هەرچی لێداوا بکات دەیداتێ). پیاوەکەش وتی: (ئەوکات کە بینیم پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەبەریکرد ئومێدم ئەوە بوو بەڵکو ببێتە کفنم). دواییش هەروەها دەرچوو کە پیاوەکە ئاواتی بۆ خواست، کاتێ مرد عەباکە کرایە کفنی.

ئا ئەو جۆرە کەسانە بە ئاستێکی وەها نزیکبوون لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) کە داوای لێدەکەن عەباکەی لەبەری دابکەنێ و بیدات بەوان، ئەوانە ئامادەبوون قوربانی بە گیانی خۆیانبدەن لەپێناویدا، بەوهۆیەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕژد نەبووە لەگەڵیاندا تەنانەت با خۆیشی پێویستی بە شتێک بووبێت، هەر ئەم ڕەوەشتە بەرزەی وایکرد هەموو مرۆڤەکان سەرسامبن پێی.

## ٢٣٤. ڕقخواردنەوە

جارێک دوو کەس لە یەکێک لە شەقامەکانی مەدینەدا شەڕیان بوو، نیشانەکانی توڕەییەکی زۆر بە دەمارە گرژبوو و ئاوساوەکانیانەوە دیاربوو، ڕوخساریان شین هەڵگەڕاو و چاویان سور بووبوو.

ئا لەو ساتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە لایان، ئینجا بەو کەسانەی بەدەوریدا بوون فەرمووی: ((من وشەیەک دەزانم ئەگەر ئەم کابرا زۆر توڕەیە بیڵێت ئەوا ئەوەی کە تیایدایە دەڕوات، ئەگەر بڵێت: پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شەیتان، ئەوا ئەو توڕەییەی دەڕوات کە تیایدایە)). ئەوکات خەڵکەکە ڕۆیشتن بۆ لای پیاوە زۆر توڕەکەو پێیانوت: پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((پەنابگرە بە خوای گەورە لە شەیتان)).

بەڵام کابرا زۆر زۆر توڕە بوو، وتی: (بۆ من شێتم؟). ئاشکرابوو ئەو پیاوە لەو ساتەدا توانای بەسەر خۆیدا نەبوو ڕقەکەی بخواتەوە، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) پرسیاری لەوانەی دەوروبەری کردو فەرمووی: ((ئایا پاڵەوان لای ئێوە کێیە؟)). ئەوانیش وتیان: (ئەو کەسەیە کە هەرگیز نابەزێ). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((پاڵەوان ئەو کەسەیە لە کاتی توڕەبووندا خۆیدەگرێ)).

پێغەمبەری خوا بەمشێوەیە ڕەخنە لەوانە دەگرێ کە لە ساتی توڕەبووندا توانایان نیە زاڵبین بەسەر پەرچەکردارياندا، هەروەها ئامۆژگاریمان دەکات بە کەوتن بە باری هێمنیدا و وەرگرتنی بڕیاری ڕاست و دروست، واتە بە کۆنترۆڵکردنی باری دەروونی لە ساتی توڕەبووندا.

## ٢٣٥. گۆشتی مەڕێک بۆندەکەم بێ مۆڵەتی خاوەنەکەی سەربڕاوە

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) فێری کردووین کە: یەکێک لە مافەکانی موسڵمان بەسەر برا موسڵمانەکەیەوە ئەوەیە هەرکات بانگهێشتی کرد بۆ سەر سفرەی نانخواردن بچێت بەدەمیەوە، بەتایبەتی ئەگەر ئەو دەعوەتە هی شایی بێت.

لەبەرئەوە هەرکات دەعوەتنامەی نانخواردن بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هاتبێت نەیویستووە ڕەتیبکاتەوە. جارێکیان ڕۆیشت لەگەڵ جەنازەی کەسێک لە پشتیوانان، کاتێ تەواوبوون و لەگەڵ هاوەڵان گەڕانەوە، کەسێک لەلایەن ئافرەتێکی قورەیشییەوە گەیشتە پێغەمبەر(ﷺ) و بانگهێشتی پێغەمبەرو ئەو هاوەڵانەی کرد بۆ سەر خوانی نانخواردن، پێغەمبەریش(ﷺ) لەگەڵ ئەو هاوەڵانەی لەگەڵیدا بوون ڕۆیشتن بەدەم دەعوەتەکەوە، هەموو دانیشتن و خواردنەکە هات، پێغەمبەر(ﷺ) دەستیدایە خواردنەکەو هاوەڵانیش بەدوایدا، ئەوان سەیری پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد، بینیان ئاسودە نیە بەوەی کە دیخوارد، هێشتا پارووەکە هەر لە دەمیدا بوو، نەیجوی، هاوەڵان لە خواردن وەستان و چاوەڕێی پێغەمبەریان(ﷺ) دەکرد تا بزانن ئەو چیدەکات؟ سەیریان کرد پارووەکەی لە دەمی دەرهێناو فەرمووی: ((من بۆنی گۆشتی مەڕێک دەکەم کە بێ مۆڵەتی خاوەنەکەیەتی!)). هاوەڵان لێرەدا وانەیەکی گرنگ فێربوون، ئەویش ئەوەیە کە نابێت مرۆڤ شتێک ببات موڵکی کەسێکیتر بێت و بێ مۆڵەتی ئەو بەکاری بێنێ، با ئەو شتەش خواردن بێت و بیەوێت دەرخواردی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بدات.

## ٢٣٦. ئای ئێمە چەندە بەختەوەرین پێت!

پێغەمبەر(ﷺ) لە خوای گەورە دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا بە هەژاری بمژیێنە و بە هەژاری بمرێنە، لەگەڵ دەستەی هەژاراندا حەشرم بکەیت)).

ڕۆژێکیان، کۆمەڵە کەسانێکی زۆر هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەو کەسانە زۆر هەژاربوون و پۆشاکەکەیان کەڵکی پێوە نەمابوو، بە ئاستێکی وەها کە پارچە قوماشی بچوک بچوکیان پێچابوو بەدەوری خۆیاندا.

کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو حاڵەتەدا چاوی پێیان کەوت، کتوپڕ ڕوخساری دەموچاوی گۆڕدرا. پاشان چووە دەرەوەو چووەوە ماڵەکەی خۆی وەک هەوڵێک تا شتێک پەیدا بکات بیانداتێ. بەڵام ئەوەی کە هەیبوو هەمووی دابەشکرابوو بەسەر هەژاراندا، ئەوکات هەستی بە نەتوانابییەکی گەورە کرد. داوای لە بیلال کرد بانگبدات، بیلالیش فەرمانەکەی جێبەجێ کرد، موسڵمانان گردبوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پێشنوێژی بۆکردن، پاشان داوای لێکردن خێر بەو هەژارانە بکەن، لە ماوەیەکی کەمدا، موسڵمانان پۆشاک و پێڵاو و پارەیەکی زۆریان کۆکردەوەو دابەشیانکرد بەسەر ئەو نەدارانەدا.

بەو ئاوڕانەوە بەخشندەو بەڕێزانەیە پێغەمبەری خۆشەویستمان ئەو خەڵکەی ڕزگارکرد لە داماوی، ئەوانیش بە دڵخۆشییەوە و بە وتنەوەی ئەم دەستەواژەیە (ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە چەندە بەختەوەرین پێت) گەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان.

## ٢٣٧. پێیان بڵێن کە خۆشتان دەوێن

ڕۆژێکیان، پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵاندا دانیشتبوو، لەو ساتەدا، کەسێک چووە لایان، یەکێک لە هاوەڵان وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، من ئەم پیاوەم خۆشدەوێ). پێغەمبەریش فەرمووی پێی: (پێت وتووە؟) هاوەڵەکە وتی: (نەخێر). فەرمووی: (هەستە پێیبڵێ).

ئەوکات، هاوەڵەکە هەستاو بەو پیاوەی وت کە هاتە لایان: (من لەبەر خوا خۆشمدەوێیت). هاوڕێکەی وتی: (خوای گەورەش تۆی خۆشبوێ کە منت لەبەر ئەو خۆشدەوێ). هەردوو هاوڕێکە بە شادییەوە دەستیاندایە پێکەنین. ئایا لەوە جوانتر هەیە کە لەبەر خوای گەورە یەکتریمان خۆشبوێ؟

## ٢٣٨. پێغەمبەری خوا(ﷺ) یاری لەگەڵ منداڵان دەکرد و فێری دەکردن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەرکات چاوی بە منداڵێک کەوتبێ، چووە بۆ لای و لاواندوویەتی. کاتێکیش دەگەیشت بە منداڵان کە لە شەقامدا یارییان کردبێ، سواری وشترەکەیی دەکردن، ماوەیەک کاتی لەگەڵیاندا بەسەر دەبرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەسەنی کچەزای بینی کە دەستی برد بۆ خورمایەکی خێر و خواردی، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((کخ کخ، ئەی نازانی ئێمە شتی خێر ناخۆین؟!)) لێرەدا ڕێنمایی کردو فێری ئاکارەکەی کرد لە کاتێکدا ئەو منداڵێکی بچوک بوو. کاتێکیش(ﷺ) منداڵێکی بینی کە لە چوارلای دەوریەکەیەوە دەیخوارد، فێری ئاکاری نانخواردنی کردو پێیوت: (ئەی کوڕەکە، ناوی خوا بێنە، بە دەستی ڕاستت بخۆ، لەوە بخۆ لەبەرخۆتەوەیە)). کاتێک منداڵەکە گەورە بوو و بووە پیاو هەر بەو شێوەیە دەیخوارد کە پێغەمبەر(ﷺ) فێری کرد، پەروەردە لە منداڵیدا وەک نەخشی سەر بەرد وایەو هەردەمێنێ.

## ٢٣٩. پۆستەچییەک لە قورەیشەوە بۆ مەدینە

ئیسلام ئاینی ڕاستگۆیی و شەرەفمەندی و وەفادارییە، درۆزنی و بەدنمەکی و ناپاکی قوبوڵ نیە، هەرگیز قوبوڵی نەکردووە درۆزن یان بەدنمەک لە ڕیزەکانیدا بن.

پێغەمبەر(ﷺ) هاوەڵانی فێری ئەم ئاکارانە کردو پەروەردەی کردن لەسەریان، خۆی(ﷺ) پێشەنگێکی جوان بوو بۆیان.

ڕۆژێ لە ڕۆژان، قورەیش نوسراوێکی بە نێردراوێکی خۆیدا کە ناوی ئەبو ڕافیع بوو نارد بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، کاتێک ئەم پیاوە گەیشتە مەدینە موحەممەد پێغەمبەری لەناو هاوەڵەکانیدا بەدیکرد کە فێری زانست و حیکمەتی دەکردن و هیدایەتی دەدان و دەروونی پاکدەکردنەوە، بە چاوی خۆی موسڵمانانی بینی کە چەندە بە ئەدەب و ڕێکوپێک و پاکوخاوێن و ڕۆشنبیرن، برایەتی و یەکسانی و هاوکاریکردنی یەکتری لەسەر چاکەکاریی و پارێزکاری لەناویاندا ڕەنگیداوەتەوە.

ئەبو ڕافیع هەستا بە بەراوردکردن لەنێوان موسڵمانانی مەدینەو نێوان بێباوەڕانی مەککەدا کە ئاو ناکەوێتە سەر ڕوومەتیان، هاوکات یەکسانیی لەنێوانیاندا نیە، چونکە ڕێنماکارێ نیە هیدایەتیان بدات، جگە لە ئەبو جەهل و کەسانی هاوشێوەی ئەبو جەهل ئیتر کەسێکیتر نیە ڕابەرایەتیان بکات!

کاتێ ئەبو ڕافیع هەموو ئەوەی بینی، دڵی پڕبوو لە بە گەورە ڕاگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) و چووە دڵییەوە، چونکە ئەو خاوەنی چاکەیە لە هەموو ئەو گۆڕانکاری و جیاکاریانەی کە لە موسڵماناندا بەدیکرد، دڵی بەرەو ئیسلام هات و حەزیکرد بێتە ناوی، تا ببێتە یەکێک لە موسڵمانە پاک و چاکەخوازەکان.

## ٢٤٠. نە پەیمان دەشکێنم و نە ناپاکیشی لێدەکەم

ئەبو ڕافیع مەسەلەکەی خۆی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد، خستییە پێشچاوی کە حەزدەکات موسڵمان ببێ، تا لە مەدینە بە بەختەوەری بمێنێتەوەو ببێتە یەکێک لەو موسڵمانانە.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((من نە پەیمان دەشکێنم و نە ناپاکیشی لێدەکەم، نە ڕێگیریش دەکەم لە پۆستەچییان و نە دەستە بەسەر نێردراواندا دەگرم، بەڵکو بەپەرۆشم بگەڕێنەوە ناو قەومەکانیان، تۆیش بگەڕێرەوە ناو قورەیش و ئەو وەڵامەیان پێبگەیەنە کە تۆیان لەپێناویدا ناردووە، جا ئەگەر لە مەککە لە دڵتدا بەدیت کرد کە حەز بەو ئیسلامە دەکەیت لێرە لە مەدینە خۆت بینیوتە، ئەوا ئەوکات وەرە موسڵمان ببە)).

ئەو هەڵوێستە ئەوەندەیتر پێغەمبەری(ﷺ) لای ئەبو ڕافیع گەورەترو و شکۆمەندتر کرد، متمانەی بە ڕاستێتی پێغەمبەرێتییەکەی زیاتر بوو، زیاتر بەپەرۆش بوو شوێنکەوتەی بێت، ئەبو ڕافیع گەڕایەوە بۆ مەککە، قورەیشی ئاگادارکرد بەو وەڵامە کە ناردبووی بۆی، پاشان خێرا گەڕایەوە بۆ مەدینە چونکە تامەزرۆی ئەو ڕووناکی و پاکێتی و جوانیی و چاکەکارییە بوو کە لە مەدینە بە چاوی خۆی بینی، هەڵاتن بوو لە تاریکایی هاوەڵگەریی و گەندەڵی لە زەویدا، ئەو هۆکارە هەڵیانپێچا تا گەیشتەوە مەدینە، ئەوکات لەسەر ئیسلامەتی و کۆچکردن و جیهاد بەیعەتی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دا، چووە ڕیزی ئەو موسڵمانە کارایانەوە کە باشترین ئوممەتێکن بۆ خەڵکی ڕەوانەکرابن.

## ٢٤١. سەری وشترەکەت بگرە هی تۆیە!

ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ جابیر کە لە خزمەتیدا بوو ڕۆیشتن بۆ گەشتێک. لە ڕێگای گەڕانەوەدا، پارەکەی جابیر تەواو بوو، کەوتە تەنگانەوە، نەیدەتوانی بەبێ پارە درێژەبدات بە سەفەرەکە، ناچاربوو پێغەمبەری خوای(ﷺ) ئاگادار کرد، پێغەمبەر ڕێنمایی بە جابیردا کە وشترەکەی بفرۆشێ، ئەویش وشترەکەیی پێفرۆشت، بەو پارەیە کە لە پێغەمبەری(ﷺ) وەرگرت، خەرجییەکانی سەفەرەکەی بەڕێکرد تا گەیشتنەوە مەدینە. بەڵام هەر بەردەوامبوو لە سواربوونی ئەو وشترە کە فرۆشتبووی، کاتێ گەیشتنەوە مەدینە لە وشترەکە دابەزی و بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەو وشترەماڵی تۆیە، من لە ماوەی گەشتەکەمدا بەکارمهێناوە، بەڵام ئێستە ڕادەستی خاونەکەی دەکەمەوە).

پێغەمبەر(ﷺ) سەیرێکی جابیری کرد، پاشان زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: ((برازاکەم سەری وشترەکەت بگرە هی تۆیە)). جابیر سەری سوڕما لەو هەڵسوکەوتە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوکاری کرد لەسەر چارەسەرکردنی کێشەکەی، وا ئێستاش وشترەکەی بۆ دەگێڕێتەوە. ئەویش سوپاسی پێغەمبەری کرد، ئینجا وشترەکەی وەرگرت و گەڕایەوە ماڵی خۆی.

## ٢٤٢. باجی لێدانی قامچی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەوڵیدەدا ئاینی ئیسلام بە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوبکاتەوە. ئەوەی لە توانایدا بوو کردی. هەستا بە چەندین سەفەری تولانی و سەخت، لەو پێناوەدا بەرگەی دنیایەک نارەحەتی و ماندووبوونی گرت. جارێکیان لەگەڵ هاوەڵاندا ڕۆیشت بە گەشتێکی هاوشێوە، وشترەکان لەسەر لمی سوتێنەری بیابان بە هێواشی ڕێیان دەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر پشتی وشترە گوێکەلەکەی دانیشت، هاوەڵێکیش بە تەنیشت پێغەمبەرەوە سواری وشترەکەی خۆی بوو، هاوەڵەکە زۆر نزیک بوو لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بەجۆرێ کە وشترەکەی دەیدا لە وشترەکەی پێغەمبەر، لایەکی پێڵاوی هاوەڵەکە دەتەقی بە قاچی پێغەمبەرەوە(ﷺ). ئەویش بە قامچییەکەی دەستی دای لە قاچی هاوەڵەکە تا ئاگاداری بکات و فەرمووی پێی ئەوە ئازارم دەدات. هاوەڵەکە بەئاگاهاتەوەو زۆر خەفەتی بە حاڵەتەکە خوارد، ئینجا ئیتر لەدوای پێغەمبەرەوە(ﷺ) ڕێی دەکرد و بەپەرۆشبوو کە پێغەمبەر ئیسراحەت بێت.

بۆ ڕۆژی دواتر پێیوترا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای بینینی دەکات، ئەویش ئەوەی کە ڕۆژی پێشو ڕوویدابوو بیریکەوتەوە، لە دڵی خۆیدا وتی: (مەعلوم پێغەمبەر بەهۆی ئەو کارەی دوێنێمەوە بانگم دەکات).

هاوەڵەکە بە پەلە کەوتەڕێ تا بگاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ، کە گەیشتە خزمەتی، پێغەمبەر بە زەردەخەنەوە سەیرێکی کردو فەرمووی پێی کە دوێنێ بە ئەسپایی قامچییەکی تێوەژەندووە

چونکە ئەو بە قاچی ئازاری پێگەیاندووە، بەوهۆیەوە دیارییەکی بەنرخی دەداتێ.

هاوەڵەکە زۆر تێکچوو، چونکە ئەو ئازاری پێغەمبەری خوای(ﷺ) دابوو، کەچی وا ئێستە پێغەمبەر دەیەوێت بۆی قەرەبوو بکاتەوە. ئا ئەوەیە پێغەمبەری بەزەیی. تەنانەت ئەگەر بەبێ ئەنقەستیش بووبێتە هۆکاری ئازار گەیاندن بە هاوەڵان دڵی داونەتەوە، چونکە بە پەرۆشبوو لەسەر بەدەستهێنانی خۆشەویستییان.

## ٢٤٣. وریابن ئەبوبەکر تورە نەکەن!

ئەبوبەکری صدیق و ڕەبیعەی ئەسلەمی دوو دراوسێ بوون، دیواری ماڵیان بەپاڵ یەکەوە بوو، ڕۆژێکیان لەسەر شتێک تێکچوون، وتەی زبرو زامدارکەر چوو بە بەینیاندا، ئەبوبەکر وشەیەکی سەختی بە ڕەبیعە وت، دواتر پەشیمانبوویەوە لەسەری، بە ڕەبیعەی وت: ئەی ڕەبیعە وەرە تۆش بەهەمانشێوە تۆڵەم لێبکەرەوە! بەڵام ڕەبیعە ڕەتیکردەوە وەک خۆی وەڵامیبداتەوە، ئینجا ئەبوبەکر وتی: یان پێمدەڵێیتەوە یان لای پێغەمبەری خوا سکاڵات لێدەکەم! بەڵام ڕەبیعە هەر ڕەتیکردەوە تۆڵەی لێبکاتەوە. ئەبوبەکر ڕۆیشت بۆ خزمەت پێغەمبەر(ﷺ)، ڕەبیعەش چوو بەدوایدا.

هەندێ کەس لە هۆزەکەی ڕەبیعە هاتنە لای ڕەبیعەو پێیانوت: ڕەحمەتی خوا لە ئەبوبەکر! ئەو لەسەر چی لای پێغەمبەری خوا سکاڵات لێدەکات لە کاتێکدا ئەو قسەی بە تۆ وتووە؟!

ڕەبیعە وتی: ئەزانن ئەوە کێیە؟! ئەوە ئەبوبەکری صدیقە، دووەمی دووەکەیە، ئەو ڕیش سپی موسڵمانانە، وریابن نەکەن ئاوڕتان لێبداتەوەو وابزانێ ئێوە لەسەر من دەکەنەوە ئەویش تورە ببێت، ئەوکات بێتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئەویش بە تورەبوونی ئەو تورە ببێت، خوای گەورەش بە تورەبوونی ئەوان تورە ببێت!چونکە ئەوکات هۆزەکەمان لەناودەچێت!!

وتیان ئەی دەڵێی ئێمە چیبکەین؟ وتی: بگەڕێنەوە.

ئەبوبەکر ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ڕەبیعەش بە تەنها بەدوایدا ڕۆیشت تا گەیشتنە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ)،

ئەبوبەکر ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە ڕوویدابوو، ئینجا پێغەمبەر سەری بەرزکردەوەو سەیری ڕەبیعەی کردو فەرمووی پێی: ((ربیعە تۆ و صدیق چیتانە؟)) ڕەبیعە ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە ڕوویدابوو، ڕەتیکردووەتەوە وشەکەی وەک خۆی پێبڵێتەوە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: باشت کردووە، نەکەی وەڵامی بدەیتەوە، بەڵکو بڵێ: ئەی ئەبوبەکر خوای گەورە لێت خۆش بێت)). ئینجا ڕەبیعە وتی: ئەی ئەبوبەکر خوای گەورە لێت خۆش بێت!

ئینجا ئەبوبەکر -خوا لێی ڕازی بێت- بەدەم گریانەوە ڕۆیشت چونکە هەڵوێستەکە زۆر کاری تێکرد!

ئەی ئەبوبەکر چۆن ئەو پلەو پایە بڵندو شکۆمەندیەی لە دڵی هاوەڵاندا نیە لە کاتێکدا کە دەزانن لەدوای پێغەمبەر(ﷺ) ئەو چاکترین کەسی ئەم ئوممەتەیە.

## ٢٤٤. پێغەمبەرێکی خاکیی

ڕۆژێکیان، جیرەئیل(ﷺ) لەگەڵ فریشتەیەکی تردا هاتن بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ). فریشتەکە سەلامێکی بۆ پێغەمبەر کرد، جبرەئیل پێیوت: (ئەم فریشتەیە لەو ڕۆژەوە کە دروستکراوە پێش ئەم سەعاتە دانەبەزیوەتە سەرزەوی، کاتێ هاتەخوارەوە وتی: ئەی موحەممەد، پەروەردگارت ڕەوانەیکردووم بۆ لای تۆ: ئایا تۆی بە پادشا کردووە یان بە بەندەیەکی پەیامبەر؟).

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) سەیرێکی جبرەئیلی کرد، ئەویش ئاگاداری کرد ژیانی وەک پێغەمبەرێکی بەندە باشترە. پێغەمبەریش(ﷺ) فەرمووی: ((نەخێر، بەڵکو بە بەندەیەکی پەیامبەر)). لەدوای ئەو ڕۆژەوە، پێغەمبەری خوا هەموو توانای خستەگەڕ تا لە ژیانێکی سادەو ساکاردا بژی.

ڕۆژێکیان خاتوو عائیشە لەبارەی هۆکاری حەزکردنی لە ژیانی سادەو ساکار پرسیاری لێکرد، لە وەڵامدا فەرمووی: ((من وەک کۆیلە خواردن دەخۆم و وەک کۆیلە دادەنیشم)). پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەزڵی بەندەبوونی خۆی بۆ خوای گەورە بە هەموو واتای وشەکە لا باشتر بووە لەوەی باڵاترین پلەو پایەی دنیای هەبێت. بە نیسبەت خۆیەوە(ﷺ) ئەوا پلەی بەندایەتی بۆ خوا لەلای باڵاترە لە پێگەو پایەی پادشاکان. چەندینجار فەرموویەتی ژیانی هەژاران باشترە لە ژیانی دەوڵەمەندان. هەروەک دەیفەرموو: ((سوێند بەخوا ئەگەر بمویستایە خوای گەورە کێوی ئاڵتون و زیوی پێدەبەخشیم!)).

لەڕاستیدا گەورەمان موحەممەد(ﷺ) گەورەی هەموو پێغەمبەرانە، ئەگەر بیویستایە ئەوا دەیتوانی لە ژیانێکی ڕابواردندا بژی، دەیتوانی دۆلی ئالتونی هەبێت یان شانشینییەک دابمەزرێنێ کە تەواوی جیهانی بگرتایەتەوە. بەڵام ئەو هەوڵی بۆ ئەوە نەداوە. ئەو(ﷺ) بە تەواوی ویستی خۆی ژیانێکی سادەو ساکاری هەڵبژارد. ژیانی سادەیی خۆشویستووە بۆئەوەی ببێتە پێشەنگ بۆ هەموو موسڵمانان. لەوانەیە هەر بەوهۆیەوە بێت کە خۆشەویستی هەمووانی بەدەستهێنابێت، لە دەوڵەمەندان و هەژاران، بەهێزان و لاوازان. لەبەرئەوە توانی دەوڵەتێک لە دڵی خەڵکیدا دابمەزرێنێ کە چەندین سەدەیە بەردەوامە.

## ٢٤٥. خوای گەورە پاداشتی پشتیوانان بداتەوە

پشتیوانان بەسۆزترینی خەڵکی بوون بۆ پێغەمبەری خوای گەورە(ﷺ)، لە خەمی جێبەجێکردنی پێویستییەکانیدا بوون، بە هەموو توانایان پێشبڕکێیان بووە لەسەر خزمەتکردنی.

جارێکیان عەبدوڵڵە کوڕی عەمرو کوڕی حەرام خواردنێکی بە ناوی خەزیرە دروستکردو بە جابیری کوڕیدا ناردی بۆ پێغەمبەر(ﷺ). جابیر وتی: هاتمە خزمەتی و لە ماڵەوە بوو، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێم: ((جابیر چیت پێیە؟ ئەوە گۆشتە؟)) جابیر دەڵێ وتم: (نەخێر). ئینجا جابیر گەڕاوەتەوە بۆ ماڵی باوکی، باوکی پرسیاری لێکردووە ئایا چاوی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتووە؟ ئایا گوێی لێبووە شتێ بفەرموێ؟ جابیر دەڵێ وتم: بەڵێ باوکە، پێیوتم: ((جابیر چیت پێیە؟ ئەوە گۆشتە؟)).

لێرەدا عەبدوڵڵە بە ئاگاهاتەوەو وتی: لەوانەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە گۆشت بێت! ئینجا فەرمانیدا مەڕێکی دابەستە سەربڕن، پاشان فەرمانیدا بیبرژێنن، پاشتر بە جابیری وت ڕۆڵە بیبە بۆ خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کاتێک پێغەمبەری خوا جابیری بینی فەرمووی پێی: ((جابیر چیت پێیە؟)) ئەویش وتی گۆشتی برژاو، پێغەمبەر(ﷺ) ئەو دیارییەی پێخۆشبوو و دۆعای خێری بۆ خانەوادەی جابیر کرد، فەرمووی: ((خوای گەورە لەجیاتی ئێمە پاداشتی بەخێری پشتیوانان بداتەوە، بەتایبەتی عەبدوڵڵە کوڕی عەمرو کوڕی حەرام و سەعد کوڕی عوبادە)).

## ٢٤٦. کارکردن لە داواکردن لە خەڵکی چاکترە

دەگێڕنەوە پیاوێک لە پشتیوانان هاتووەتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و داوای لێکردووە شتی بداتێ، پێغەمبەر(ﷺ) فەرموویەتی پێی: ((ئایا هیچ لە ماڵەکەتدا هەیە؟)) کابرا وتویەتی: (بەڵێ، ڕاخەرێکی سادەمان هەیە لەسەر زەوی ڕایدەخەین، هەروەها جامێکمان هەیە ئاوی تێدا دەخۆینەوە). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بیانهێنە بۆم)). کابرا خێرا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەکەی و دەفرەکەو ڕاخەرەکەی هێنا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گرتنی بەدەستییەوەو هاواریکرد: ((کێ ئەم دووانە دەکڕێ؟))، کەسێک وتی: (من بە یەک پەنجایی هەردووکیان هەڵدەگرم). ئەو کەسە نرخێکی کەمی لەسەر دانان، پێغەمبەر(ﷺ) سەرلەنوێ هاواریکرد و فەرمووی: ((کێ زیاتر دەدات؟)). پیاوێکی تر وتی: (من بە دوو پەنجایی هەڵیاندەگرم). ئینجا شمەکەکانی کابرای نەداری کڕی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوو پەنجاییەکەی دا بە کابرای پشتیوان و فەرمووی پێی: ((بە پەنجاییەکیان خواردن بکڕەو بیدەرە خێزانەکەت، بەویتریان تەورزینێک بکڕەو بۆم بێنە)).

پیاوەکە هیچ تێنەگەیشت، بەڵام ئەوەی پێغەمبەر(ﷺ) فەرمانی پێکرد بەجێیگەیاند، هەندێ خواردەمەنی کڕی و بە ئەویتری تەورزینێکی کڕی. پاشان هاتەوە خزمەتی پێغەمبەری خوا، پێغەمبەر(ﷺ) دەسکێکی بۆ تەورزینەکە کرد و فەرمووی: ((بڕۆ چیلکە کۆبکەرەوەو بیفرۆشە، تا پازدە ڕۆژیتر نەتبینم)).

کابرا ڕۆیشت، دوای دوو هەفتە هاتەوەو زەردەخەنە لەسەر ڕوخساری بوو، دە درهەمی پەیدا کردبوو. پێغەمبەر(ﷺ) بە بینینی

دڵخۆشبوو و پرسیاری لێکرد لەو ماوەیەدا چ کارێکی کردووە. کابرا وتی: (هەندێ چیلکەم بەو تەورزینە کە پێتدام کۆدەکردەوە، پاشان دەمبردە ناوشارو لە بازاڕ دەمفرۆشت، لە ماوەی دوو هەفتەدا پارەیەکی زۆرم دەستکەوتووە، هەندێ خواردن و پۆشاکم بۆ خێزانەکەم کڕیوە). پێغەمبەر(ﷺ) پێکەنی و فەرمووی: ((ئەگەر یەکێک لە ئێوە گوریسەکەی هەڵبگرێ و بچێتە کێو و باوەشێ چیلکە لەسەر پشتی بێنێت و بیفرۆشێ، ئەوا بەوە خوای گەورە ڕوخساری دەپارێزێ، چونکە ئەوەی باشترە تا بێت داوا لە خەڵکی بکات، ئایا دەیدەنێ یان نایدەنێ)).

## ٢٤٧. جوانترین باخ

هاوەڵان تێر نەدەبوون لە هاوەڵێتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، تەنها بەشداربوونیان لە گوێڕادێران بۆ گوتەکانی خۆی لەخۆیدا بەختەوەرییەکی گەورە بوو، گوێڕادێران بۆی حەوانەوەو ئاسودەیی پێدەبەخشین، بەڵکو تەنها تەماشاکردنی وەک ئەوە وابوو هەمووی جیهانیان دەستکەوتبێ.

جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم ئایەتەی بەسەر هاوەڵاندا دەخوێندەوە کە دەفەرموێ: ﴿لَن تَنَالُوا۟ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُوا۟ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُوا۟ مِن شَىْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ )آل عمران: ٩٢ (ئەبو تەڵحە کە یەکێک بوو لە هاوەڵان بە وردی گوێیڕادێرا بۆ گوفتارەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ئەم هاوەڵە بەڕێزە خاوەنی جوانترین باخ بوو لە مەدینەدا. باخەکەی ناوی بەیرەحا بوو، باخەکەی شەش سەد دارخورمای بەری تێدابوو. خێرا هەستاو وتی: (خۆشەویسترین ماڵ و سامانم بەیرەحایە، ئەوا بە خۆی و بەروبوومیەوە کردمە خێر).

دوای ئەوە ئەبو تەڵحە بە خەیاڵی ئاسودەوە چووە دەرەوەو ڕاستەخۆ ڕۆیشت بۆ باخەکەی، ڕومەیسای خێزانی لەوێ بوو، لە سێبەری درەختێکدا دەحەوایەوە. کاتێ ئەبو تەڵحەی لە دەرەوەی باخەکە بینی، بانگیکردو وتی: (ئەبو تەڵحە وەرە ژوورەوە، بۆ لە دەرەوە وەستاویت؟) ئەویش وەڵامیدایەوە کە: (ئەی ڕومەیسا، ئەو باخە ئیتر هی ئێمە نیە، لەبەرئەوە نایەمە ژوورەوە، تۆیش هەروەها کەلوپەلەکەت هەڵگرەو لێی دەرچۆ).

ڕومەیسا تێنەگەیشت، بەڵکو پرسیاری لێکرد: (بۆچی؟) وتی: (من ئەم باخەم لەپێناوی خوای گەورەدا کردووەتە خێر).

ڕومەیسا ئافرەتێکی باوەڕدارو پارێزکار بوو، بە مێردەکەیی وت: (ئەبو تەڵحە خوای گەورە لێت قوبوڵ بکات. سوێند بەخوا کاتێ هەژارو نەدارانم لە دەرەوەی باخەکە دەبینی ئاواتم دەخواست خۆزگایە دەمانکردە خێر، لە کاتێکدا دەزانم کە لای تۆ خۆشەویسترین ماڵ و سامانتە).

ڕومەیسا لەگەڵ مێردەکەیدا باخەکەی جێهێشت بێئەوەی ئاوڕی لێبداتەوە، پێکەوە بە دڵخۆشی و ڕەزامەندییەکی زۆرەوە گەڕانەوە ماڵی خۆیان.

لەڕاستیدا ئەم دوو هاوسەرە بەڕێزە دوو موسڵمانی ڕاستەقینە بوون، ڕێنماییەکانی خوای گەورەو پێغەمبەریان لە ژیانیاندا بە کردار جێبەجێ کرد. بەو کردەوە چاکانەش تامی شیرینی باوەڕیان چەشت.

## ٢٤٨. منداڵان لەگەڵ باوکیان کۆدەبنەوە

ئوم سەلەمە بێوەژنێکی هەژار و تەمەن بەساڵاچوو بوو، لە ژیانیدا تووشی چەندەها ناڕەحەتی و سەختی ژیان بوو، مێردەکەی لە یەکێک لە غەزاکاندا شەهید بوو، چوار منداڵی هەبوو، منداڵەکان دوای باوکیان بێباوک کەوتن، پێویستییان بە کەسێ بوو سەرپەرشتییان بکات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزیکرد پارێزگاری لە منداڵەکانی ئوم سەلەمە بکات، ویستی بە پەروەردەیەکی جوان لەماڵێکی ئاسودەدا گەورە ببن. بۆ ئەوەی ئەو خێزانە لەوە زیاتر تووشی ناڕەحەتی و مەینەتی نەبن، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشنیاری هاوسەرگیری خستە بەردەم ئوم سەلەمە. ئوم سەلەمە دڵخۆشبوو بەو داوایە، بەڵام نەیدەویست ببێتە مایەی هیچ جۆرە ناڕەحەتییەک بۆ پێغەمبەر(ﷺ)، هەربۆیە ناردییە لای و وتی: ((کەسی وەک من بۆ هاوسەرگیری ناشێت، من تەمەنم تێپەڕیوە، ئافرەتێکیشم غیرەم تێدایەو منداڵم هەیە)). کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم هەواڵەی پێگەیشت، بۆی دەرکەوت کە ئوم سەلەمە لە مەبەستی هاوسەرگیرییەکە تێنەگەیشتووە، چونکە ئەو(ﷺ) دەیویست ئوم سەلەمەو منداڵەکانی لە ناڕەحەتی ڕزگار بکات، لەبەرئەوە خۆی ڕۆیشت بۆ ماڵەکەی. ئینجا داواکەی لێ دووبارەکردەوە و فەرمووی: ((من تەمەنم لە تۆ گەورەترەو منداڵەکان لەسەر خواو پێغەمبەری خوان، بۆ مەسەلەی غیرەکەش، ئومێدەوارم خوای گەورە نەیهێڵێ)). ئەوکات ئوم سەلەمە قەناعەتی کردو داواکەی پەسەند کرد. منداڵەکانیش دڵخۆشبوون

بەو هاوسەرگیرییەی، چونکە خوای گەورە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) قەرەبووی باوکیانی بۆ کردنەوە.

منداڵەکان ئەو بڕیارەیان پێخۆشبوو چونکە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) زۆر خۆشدەویست. لێرە بەولاوە شان لەسەر سنگی فراوانی دادەدەن و دەچنە ژێر سەرپەرشتی ئەوەوە، بە پەروەردە چاکەکەی ئەو(ﷺ) گەورە دەبن، بە چاوانێکی گەشاوەو خۆشییەوە ڕایانکرد بۆ لای، چونکە ئیتر ئەوە نەما بێباوک بن، خوای گەورە کارەساتی بێباوکی بە کەسایەتییەک بۆ قەرەبوو کردنەوە کە هیچ کەسێ لەم جیهانەدا هاوتای ئەو نیە.

## ٢٤٩. شاری مەدینە بێ خاوەن نیە

تا دەهات ژمارەی موسڵمانان لە زیادبووندا بوو، ئەم مەسەلەیە بێباوەڕانی مەککەی تا ئاستێکی زۆر بێتاقەت و ناڕەحەت کردبوو، ئەوانیش وەک ئەو جولەکانە وابوون کە لە مەدینەی مونەووەرە دەرکران.

لەو کاتەوە کە هۆزی بەنو نەزیر لە مەدینە دەرکران، خێرا کەوتنە داڕێژانی پلانی خواروخێچ، بیریان کردەوە کە ئەگەر بێتو لەگەڵ ئەو هۆزانەی تردا کە دژن بە ئاینی نوێ یەکبگرن ئەوا دەتوانن دژ بە موسڵمانان جێبەجێیان بکەن. ئەمەش بیرۆکەیەکی زۆر گڵاو بوو.

جووەکان ڕۆیشتن بۆ مەککەو قورەیشیان بە بیرۆکەکەیان ئاگادارکرد، ئەبو سوفیان پێشوازی لێکردن و وتی: (دوژمنانی موحەممەد دۆستمانن). دەستوبرد دانیشتنیان کرد و گەیشتنە ڕێکەوتن. هەرچییان هەبوو کۆیانکردەوە تا سود لە هێزی ئەو یەکگرتنە وەربگرن، هاتن لە شارە نزیکەکانیشەوە سەربازیان بە کرێ گرت، لە ماوەیەکی کورتدا، سوپایەکی دە هەزار سەربازییان پێکەوەنا. ئەبو سوفیان کرایە سەرکردەی سوپاکە، ڕاستەوخۆ بە سوپاکەیەوە ڕۆیشت بەرەو مەدینەی مونەووەرە بەو هیوایە لەناکاودا لەبەردەم موسڵماندا خۆیان پیشانبدەن و کات لەبەردەم موسڵمانان نەمێنێتەوە تا ئامادەباشی بۆ شەڕکردن وەربگرن.

لە مەککە کەسانێکی عەرەب هەبوون کە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) خۆشدەویست، ئەوانە هەواڵیان بۆ نارد کە وا سوپای دوژمن

نزیککەوتووەتەوە لە مەدینەی مونەووەرە. پۆستەچییەکە لە ماوەی چوار ڕۆژدا خۆی گەیاندە مەدینە، لە ماوەی چوار ڕۆژدا ماوەیەکی بڕی کە پێویستی بە دوازدە ڕۆژ ڕێکردن هەیە. ئینجا پێغەمبەری خوای(ﷺ) ئاگادارکرد کە وا بێباوەڕان بە سوپایەکی زەبەلاحەوە کشاون بەرەو مەدینە، ئەوکات خێرا پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی کۆکردەوەو بارودۆخەکەی بۆ باسکردن. چونکە موسڵمانان پێشبینی هیچ جۆرە هێرشێکیان نەدەکرد، ئامادەباش نەبوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوە.

بۆ ماوەیەکی زۆر تاوتوێی چۆنێتی بەرنگاربوونەوەی دوژمنیان کرد. چەندەها ڕاو بیرۆکە خرانەڕوو، دواجار ، یەکێک لە هاوەڵان هەستایە سەرپێ کە ناوی سەلمانی فارسی بوو، وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! ئێمە کاتێ لە وڵاتی فارس بووین و ئەسپ بیترساندینایە، خەنەکمان لێدەدا بەڕوویاندا. ئەی پێغەمبەری خوا ئایا دەکرێ خەنەک لێبدەیت؟).

ئەمەش فێڵێک بوو نەدەهات بەخەیاڵی دوژمندا، چونکە بەو ڕێگایە، ئیتر موسڵمانان ڕێگای چوونەدەرەوەیان نەبوو لە شارەکەیان، هاوکات دەتوانن دوژمن لە دەرەوەی مەدینە بوەستێنن، ئەم بیرۆکەیە بە دڵی هەمووان بوو و پەسەندییان کرد. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئەمشێوازەی وەها بینی کە موسڵمانان بەدوور دەگرێ لە مردنی ژمارەیەکی زۆریان. ئەمەش ئەو ئامانجە بوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدرێژایی ژیانی هەوڵی بۆ دەدا. هەروەها بە هەڵکەندنی خەنەک بە دەوری مەدینەدا پەیامێکی ڕوون و ئاشکرا بە بێباوەڕانی مەککە دەدات کە مەدینە لەسەر پشت و بێ خاوەن نیە.

## ٢٥٠. خەنەک لێدان بە دەوری مەدینەدا

لە هەموولایەکی شارەکەوە دەستکرا بە هەڵکەندنی خەنەک، هەموو موسڵمانان تیایدا بەشداربوون، لە کاتێکدا کە دوژمن بە دە هەزار جەنگاوەرەوە دەکشا بەرەو مەدینە، موسڵمانان گەورەو بچوک وەک هەنگ سەرقاڵی چاڵ هەڵکەندن بوون. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بەشداری دەکردن و هانیدەدان تا بەوپەڕی لێبڕان کاربکەن.

موسڵمانان لەسەر گردێک چادرێکی بچوکیان هەڵدا، زۆرجار پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەڕۆیشت بۆ ئەوێ تا چاودێری بەرەوپێشچوونی کارەکە بکات و دڵنیا ببێت لە گەیشتنی دوژمن. هەموو ئەو هەوڵانە بەو ئامانجە بوون تا مەدینەی مونەووەرە بپارێزن و ڕێگیری بکەن لە هەڵگیرساندنی جەنگ، پێغەمبەریش حاڵی وەک حاڵی هاوەڵان بوو، جلوبەرگەکەی پیس و تۆزاوی بوون. باکی بە برسێتی و ماندوبوون و کەمخەوی نەبوو، بەڵکو بە خەیاڵێکی ئاسودەو دڵێکی ئارامەوە ڕووبەڕووی هەموو ناڕەحەتییەکان بوویەوە، بەنێو هاوەڵاندا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێک تر دەچوو. کاتێک هاوەڵان بینییان، پێیانوت: (ئەی پێغەمبەری خوا تۆ ئیش مەکە، هەوڵ و ڕەنجدانی ئێمە بەسە، تۆ بحەوێرەوەو خۆت ماندوو مەکە).

بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان لە کاتێکدا کە هاوەڵان ئارەقیان دەڕشت و دووچاری برسێتی و کەمخەوی بووبوونەوە ئەو نەیدەتوانی دابنیشێ. قوبوڵی نەبوو دابنیشێ و بحەوێتەوە، بەڵکو پێیدەوتن کە حەزدەکات هاوبەشی ئەو خێرو چاکەیە بێت.

بە کۆتاییهاتنی شەشەم ڕۆژ، مەدینەی مونەووەرە دەورەدرا بە خەنەکێکی گەورەو قوڵ. بەجۆرێ کە مەحاڵ بوو دوژمن بتوانێت بازبدات بەسەر ئەو خەنکە قوڵەداو بیشکێنێ. لە بەشی باشوری مەدینەوە باخێکی چڕوپڕ هەبوو، بەو هۆیەوە، تەنها خەنەکێکی بچوک لەو بەشە بەرتەسکەدا لێدرا. بەڵام لەبارەی ئەو جولەکانەوە کە تا ئەوکاتە لە مەدینەی مونەووەرەدا مابوونەوە، ڕێگای مانەوەیان پێدرا بمێننەوە چونکە ئەوان ڕێکەوتنەکەیان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) پێشێل نەکردبوو، خیانەتیان لە موسڵمانان نەکردبوو. بەمجۆرە مەسەلەکە گەیشتە ئاستێ کە دوژمن نەتوانێت بێتە ناو مەدینەوە. هەمووانیش بە ورياییەوە چاوەڕوانی گەیشتنی سوپای دوژمن بوون بۆ دەورەبەری مەدینە.

## ٢٥١. خواردنێکی بەرەکەتدار بە دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

موسڵمانان چەند ڕۆژێک لە برسێتی و ماندووبوونێکی سەختدا بوون. چونکە کاری بەردەوام هەڵکەندن شەکەتی کردبوون. جابیر سەیرێکی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کردو بەزەیی بە حاڵیدا هاتەوە، ڕۆیشتەوە بۆ ماڵەوەو بە خێزانەکەیی وت: (شتێکم بە پێغەمبەرەوە(ﷺ) بینی ئارامم لێبڕا. ئایا هیچت لایە؟) خێزانەکەی وتی: (جۆم لایە). هەروەها کارێکی بچوکیشیان لەناو بڕکە ئاژەڵەکەدا هەبوو. جابیر هەستا سەری بڕی، ژنەکەشی جۆکەی هاڕی و هەویرێکی لێ حازرکرد. ئینجا گۆشت و هەویرەکەی خستە ناو تەنورەوە.

جابیر ڕاستەوخۆ ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). چپاندی بە گوێیداو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! بڕێ خواردنم هەیە، دەی فەرموو تۆ و کەسێک تا دوو کەس وەرن). پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) داب و نەریتی وابوو یەکەمجار بیری لە غەیری خۆی دەکردەوە، چونکە ئەو موسڵمانانەش کە سەرقاڵی هەڵکەندنی خەنەکەکە بوون ئەوانیش هەر برسییان بوو، چۆن دەبێت بەڕلەوە ئەوان تێربخۆن ئەو نانبخوات؟ بۆیە پرسیاری لە جابیر کرد: (ئەو چەندە؟) جابیر وتی: (هەندێ نان و گۆشتە). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((زۆرێکی حەلاڵە)). فەرمووی: ((بە خێزانەکەت بڵێ گۆشت و نانەکە لە تەنورەکە نەکاتەوە تا خۆم دێم)).

لە کاتێکدا جابیر دەگەڕایەوە بۆ ماڵ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی لە کۆچبەران و پشتیوانان بانگکرد بۆ ماڵی جابیر و فەرمووی: ((هەستن)). هەر هەموو لە کارکردن وەستان و شوێن پێغەمبەر کەوتن.

جابیر کە ئەو هەموو موسڵمانەی بینی هەستی بە شڵەژان کرد، چونکە بەشی ئەو هەمووە خواردنی نەبوو، ئینجا بە خێزانەکەیی وت: (نەگبەت، ئەوا هەموو هاوەڵان لە کۆچبەران و پشتیوانان لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) هاتن). بەڵام خێزانە باوەڕدارەکەی زۆر لەسەرخۆ بوو و تێکنەچوو، ترس و شڵەژانەکەی جابیری هێورکردەوەو وتی: پێغەمبەری خوا(ﷺ) خۆی دەزانێ چیدەکات. کاتێک پێغەمبەر و هاوەڵان گەیشتنە ماڵی جابیر، فەرمووی پێیان: ((بڕۆنە ژوورەوەو پاڵەپەستۆ مەکەن)). دوای ئەوە، ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنە کە خواردنەکەی تێدا دانرابوو، دۆعای فەڕو بەرەکەتی لەسەر کرد، ئینجا لەتە نانێکی هەڵگرت و بڕێ گۆشتی خستەسەر و کەوتە دابەشکردنی بەسەر هاوەڵاندا. تام و چێژی ئەو خواردنەی دەستی ئەو(ﷺ) تامێکی جیاوازی هەبوو. دوای ئەوە کە هاوەڵان تێریان خوارد، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) نانیخوارد و نانیشی دەرخواردی دانیشتوانی ماڵەکەدا. موسڵمانان سوپاسی جابیریان کردو چوونە دەرەوە. بەڵام جابیر هەر لەژێر کاریگەری ئەو بەرکەوتەیەدا مایەوە. لەژێر لێوەوە هەر دەیوت: (بەخوا ئەوانەی کە هاتن نزیکەی هەزار کەس بوون. هەر هەموویان تێریان خوارد. لە خواردنەکەش مایەوە. نانەکەش هەر وەک خۆی بوو وەک بڵێی کەس دەستی لێنەداوە، گۆشتەکەش هەروەک خۆی وابوو. ئینجا بڕێکیمان دا بە دراوسێکان). ئەمە موعجیزەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو. جابیرو خێزانەکەشی هەستیان بەوە کرد.

## ٢٥٢. پێغەمبەر(ﷺ) بە نۆرە ئێشکی دەگرت

کاتێ سەربازانی دوژمن گەیشتنە مەدینەی مونەووەرە، سەریان تەقی بەو خەنەکەوە کە دەورەی مەدینەی دابوو و سەرسام بوون. هیچ بژاردەیەکیان لەبەردەمدا نەمایەوە جگە لە هەڵدانی چادر لەبەردەم خەنەکەکەدا. لێرەوە کەوتنە گەڕان بەدوای ڕێگای تردا تا بچنە ناو مەدینەی مونەووەرەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدرێژایی شەو بەئاگابوو و لە تەسکترین بەشی خەنەکەکەوە ئێشکی دەگرت، چونکە دوژمن هەوڵیدەدا لەوێوە بچێتە ناو شارەکە.

پێش بەرەبەیان، کەشوهەوا زۆر زۆر ساردی کرد، پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە چادرەکەی خۆی تا کەمێ گەرمی بێتەوەو دواتر بگەڕێتەوە سەر سەرەی ئێشکگرتنی خۆی. سەعد کوڕی ئەبو وەققاص چاوی پێیکەوت و هات لەجیاتی ئەو ئێشکی گرت.

بۆ بەیانی ڕۆژی دواتر، شڵەژاوی و شپرزییەک لەنێوان سەربازە موسڵمانەکاندا ڕوویدا، دووڕووەکان لەنێوان خۆیاندا کەوتبوونە قسەوباس، هەوڵیاندەدا لە غیرەت و لێبڕانی موسڵمانان کەمبکەنەوە، دەیانوت: (ئێمە چۆن دەتوانین لەگەڵ سوپایەکی دە هەزار سەربازیدا بجەنگین؟ هەر لە ئێستەوە ئەنجامی شەڕەکە ڕوونە، مەعلوم کە زاڵدەبن بەسەرماندا ، کەواتە با بگەڕێینەوەماڵەکانمان).

ئینجا هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و پێیانوت: (تۆ دەزانی کە دوژمن زۆر نزیکە، ماڵەکانیشمان بێ پاسەوانن، لەبەرئەوە، ئێمە حەزدەکەین سوپاکە جێبێڵین). ئەوکات پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێگای پێدان بگەڕێنەوە ماڵەکانی خۆیان. چونکە ئەو کەسی ناچار نەدەکرد

## ٢٥٣. عەلی و عەمری کوڕی عەبد لە شەڕێکی دەستەویەخەدا

عەمر ئازاترین سوارچاکی دوژمن بوو. کەلێنێکی لە بەرتەسکترین شوێنی خەنەکەکەدا دۆزییەوە، سواری ئەسپەکەی بوو و ڕۆیشت بۆی، تا ئەو ڕۆژە، کەس نەیتوانیبوو لە ڕمبازیدا زاڵببێت بەسەر عەمردا، ئەو جەنگاوەرێکی بەهێز بوو، بەسەر ئەسپەکەیەوە دهات و دەچوو، بانگی موسڵمانانی دەکرد بۆ ڕمبازی و لاقرتی بە ئاینەکەیان دەکردو دەیوت: (ئەوە پیاوێکیان تێدا نیە؟) کەوتە جنێودان و سوکایەتی پێکردنیان ، کەس جورئەتی ئەوەی نەبوو بەرەنگاری بێتەوە.

عەلی بە ئازایەتییەکەوە ڕۆیشت بەرەو عەمر، کاتێ عەمر چاوی پێیکەوت زەردەخەنەیەکی کرد، ڕەتیکردەوە بجەنگێ لەگەڵیداو بە لەخۆباییبوونەوە دەیوت ئەو هێشتا مێردمنداڵە.

عەلی بایەخی بە گوتەکەی عەمر نەدا، بەڵکو بە هەڕەشەوە پێیوت: (بانگت دەکەم بۆ ڕمبازایی لەسەر زەوی).

عەمر بەو جورئەتەی عەلی زۆر تورە بوو ئینجا بە جوڵەیەکی خێراو هەڕەشە ئامێزەوە لە ئەسپەکەی هاتە خوارەوەو شمشێرەکەیی هەڵکێشا، بەو چاوانەی کە غەزەبیان لێدەباری نزیککەوتەوە لە عەلی، عەلی هەوڵیدا دووربێت لە خوێنرشتن، هەروەک پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری کردبوو، هەربۆیە بژاردەیەکی تری خستە بەردەم عەمر، پێیوت: (داوات لێدەکەم موسڵمان ببی). عەمر وتی: (واز لەوە بێنە)، عەلی وتی: (داوات لێدەکەم خۆت و ئەوانەی شوێنت کەوتوون

لە قورەیشییەکان بگەڕێیتەوە بۆ مەککە). عەمر وتی: (ئەوکات ئافرەتانی قورەیش پێمدەڵێن گەنجێکی منداڵ خەڵەتاندی، شاعیرانیش دەکەونە شیعر هۆنینەوە لەسەرم کە ترسنۆک بووم، چونکە لە جەنگدا پاشەوپاش گەڕاومەتەوە، قەومێکم نائومێد کردووە کە بە سەرۆکی خۆیانم دەزانن). ئینجا عەلی داوای ڕمبازێنی لێکرد، عەمر وتی: (گومانم وانەبوو کەس لەنێو عەرەبدا جورئەت بەخۆی بدات داوای ڕمبازێنم لێبکات، ئینجا بە شمشێرەکەی هێرشیکردە سەر عەلی، شمشێرەکە بەر مێزەرەکەی عەلی کەوت و گەیشتە سەری عەلی، بەڵام بەرلەوە عەمر هێرشێکیتر بکات، عەلی شمشێرەکەیی بەرزکردەوەو دای لە عەمر، بە یەکەم لێدان عەمر تەختی زەوی بوو، ئیتر نەیتوانی هەستێتەوە.

کوشتنی عەمر بووە هۆی ئەوە هاوەڵگەران تووشی بەرکەوتنێکی سەخت ببن چونکە لەوبەری خەنەکەکەوە سەیری ڕمبازێنەکەیان دەکرد، چونکە کاتێ گەورەترین سوارچاکیان بە بەرچاوانی خۆیانەوە بینی کە تێکشکا هەستییان بە ترسێکی زۆر کرد. ئینجا سەربازێکی تریان نارد تا دژ بە عەلی بجەنگێ، بەڵام ئەویش هەر نەیتوانی عەلی بشکێنێ، جگە لە هەڵاتن لەبەردەمیدا هیچ بژاردەیەکی تری بۆ نەمایەوە.

سەرکردەی سوپای دوژمنان کە ئەبو سوفیان بوو بە نائومێدی و ڕوخاوییەوە لەبەرخۆیەوە دەیوت: (ئەمە بۆ ئێمە ڕۆژێکی زۆر شومە). موسڵمانانیش لەبەرانبەرەوە دڵیان پڕبوو لە خۆشی و شادی و کەوتنە هاواری (الله أكبر! الله أكبر! الله أكبر!).

## ٢٥٤. سەربازانی ڕەشەبا

موسڵمانان لەلایەکەوە، گیرۆدەی برسێتی و کەمخەوی و سەرماوسۆڵە بوو بوون، لەلایەکی ترەوە، لە بەرانبەر دوژمنەوە وەستابوون، بۆ چەند ڕۆژێک لە بارودۆخێکی سەختدا بەرگرییان لە شاری مەدینە کرد، ئا لەو کاتەدا، هۆزی بەنو قورەیزە کە ئەو جولەکانە بوون هێشتا لە مەدینەدا نیشتەجێبوون ئەو بارودۆخەیان بە هەل قۆستەوەو کەوتنە کێشە نانەوە بۆ موسڵمانان.

بەمجۆرە موسڵمانان کەوتنە بارێکەوە کە لەلایەکەوە ڕووبەڕووی دوژمنێکی دەرەکی بووبوونەوەو لەلایەکی ترەوە دوژمنێک لە ناوخۆدا بوونی هەیە، تیر هەروەک باران بەسەر چادرەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) دەباری، بەڵام ئەو هەر خۆڕاگر بوو و سەرکردایەتی سوپاکەیی دەکرد، کاتێک نارەحەتییەکان لەسەر موسڵمانان زیاتریان کردو تاد هات چڕتر دەبوون کەوتنە پرسیارکردن ئایا ئەم شەڕە تاکەی بەردەوام دەبێت.

ئەوکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناو تیربارانەدا دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو کەوتە پاڕانەوەو فەرمووی: ((ئەی پەروەردگاری دابەزێنەری قورئان، ئەی خاوەن بڕیاری کاربەجێ و خێرا، ئەم حیزبانە تێکبشکێنە، پەروەردگارا تێکیانبشکێنەو لە ڕەگ و ڕیشە دەریانبێنە)).

ئەو شەوە شەوێکی زۆر تاریک و سارد بوو، لە درەنگانێکی شەودا، جبرەئیل(ﷺ) هات و مژدەیەکی بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێنا. پێیوت کە خوای گەورە یارمەتی بۆ موسڵمانان دەنێرێ.

پێغەمبەر(ﷺ) زۆری پێخۆشبوو و سوپاسی خوای گەورەی کرد.

ئینجا ڕەشەبایەکی زۆر توندو سەخت و سارد هەڵیکردە سەر ئەوبەری خەنەکەکە، تا دەهات توندتر دەبوو، ئەوکات دوژمنان هەستییان بە ترس و بیم کرد، لەم هەڵیکردە سەر دەموچاو و جەستەیان، لە سەختی ڕەشەباکە چادرەکانی هاوەڵگەران لەبن دەرهاتن. تۆقین سەراپای دڵ و جەستەیانی گرتەوە، ئەسپەکانیان کەوتنە هەڵاتن و نەیاندەتوانی کۆنترۆڵیان بکەن.

ئەبو سوفیان کە سەرکردەی سوپای دوژمن بوو هەستی بە ترس و تۆقین کرد، چووە سەر پشتی وشترەکەی و هاواری لە سەربازەکانی کردو وتی: (با خێرا ئەم جێگایە جێبێڵین). ئا بەمشێوەیە، خوای گەورە سوپای دوژمنی تەفرو توناکرد و لە گۆڕپانی جەنگەکە بە تێکشکاوی بێ ئاوڕدانەوەو گەڕانەوە هەڵاتن و ملیان شکاند.

خوای گەورە بەڵێنەکەی خۆی بۆ پێغەمبەرەکەی بردەسەر، موسڵمانانیش خەنەکەکەیان جێهێشت و بە خۆشی سەرکەوتنەوە گەڕانەوە ماڵەکانیان. منداڵان دەستیانکردە ملی باوکانیان، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) سوپاسی خوای گەورەی کرد کە شاری مەدینەی لە ستەمی بێباوەڕان پاراست. ئەو جەنگە ناونرا بە (جەنگی خەندەق).

## ٢٥٥. ڕوخسارت خۆشەویستترین شتە لە دڵمدا

ڕۆژێکیان، موسڵمانان پیاوێکی بێباوەڕیان بەناوی سومامە (ثُمامة) لە نزیکی مەدینەی مونەووەرە بینی، بەدیلیان گرت و هێنایان بۆ مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سومامە لە مردن دەترسا، کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەواڵی بەدیلگرتنەکەی بیست، هاتە لای و پرسیاری لێکرد: ((سومامە چیت لایە؟)) وتی: (ئەی موحەممەد خێرم پێیە، ئەگەر بمکوژی ئەوا خوێنێک دەڕێژی، ئەگەر ببەخشیت ئەوا فەزڵێکە بەسەر سوپاسگوزارێکەوە، ئەگەر ماڵ و سامانیشت دەوێ ئەوا چیت دەوێ داوای بکە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی بێئەوەی هیچیتر بفەرموێ.

سومامە ئەم هەڵسوکەوتەی بەلاوە سەیر بوو. چونکە ئەگەر سومامە خۆی لە جێگای پێغەمبەردا بوایە کە کەسێ هاتبێ بۆ کوشتنی ئەوا ڕاستەوخۆ دیلەکەی دەکوشت. بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە خۆشەویستی هەڵسوکەوتی لەگەڵدا کرد، سۆزو بەزەیی بۆ نواند. سێ ڕۆژ بەسەر ئەو حاڵەتەدا تێپەڕی و بەردەوام پێغەمبەر(ﷺ) داوای لە سومامە دەکرد موسڵمان بێ ئەویش ڕەتیدەکردەوە، دواجار پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئازادی بکەن)).

هاوەڵان دەرگای مزگەوتەکەیان کردەوە و لێگەڕان تا سومامە بڕوات، شوێنەکەی جێهێشت بێئەوەی سوپاسیشیان بکات، ئەو زۆر سەرسامبوو بەو هەڵسوکەوتە کە لەماوەی ئەو سێ ڕۆژەدا کردیان لەگەڵیدا، وەک بڵێی میوانێکی زۆر ڕێزدار بێت، چونکە

هەموو بەیانییەک پێغەمبەر(ﷺ) دەهاتە لای و پرسیاری لێدەکرد کە ئایا پێویستی بە شتێک هەیە یان نا. لە سەردانەکانیدا هیچ جۆرە ئاماژەیەکی تورەیی یان ڕق بە نێوچاوانیەوە دیار نەبوو.

سومامە دوای ئازادکردنی لە باخێکی دارخورمادا دانیشتبوو، بیری لە هەموو مەسەلەکان کردەوە، دواجار خۆی شۆری بە ئاوێک کە لەو شوێنەدا هەبوو، پاشان گەڕایەوە بۆ مزگەوتەکە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەوێ ئامادەبوو. بەڵام ئەو سومامەیە کە پێشتر بۆ چەندینجار هەوڵیدا پێغەمبەر بکوژێ، وا ئێستە ئامادەیە لەپێناو ڕزگارکردنی پێغەمبەردا(ﷺ) گیانی خۆی بکاتە قوربانی. نزیککەوتەوە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە سەیری ڕوخساری کرد، ئینجا وتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأنك رسول الله).



پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشبوو بە موسڵمانبوونی سومامە، سومامە وتی: ((ئێستە وام لێهاتووە هیچ دەموچاوێک بەڕادەی دەموچاوی تۆ لام خۆشەویست نیە، هیچ ئاینێک بەڕادەی ئاینی تۆ لام خۆشەویست نیە، هیچ شارێک بەڕادەی شارەکەی تۆ لام خۆشەویست نیە).

ئینجا پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) پرەنسیپەکانی ئاینی ئیسلامی فێرکرد، پاشان ڕەوانەیکردەوە بۆ وڵاتی خۆی، سومامە بە دڵێکی خۆش و پڕ لە وزەو تواناوە گەڕایەوە ناوچەکەی خۆی. وەک بڵێی تازە لەدایکبووە، بەدرێژایی ماوەی سەفەری گەڕانەوەی بەردەوام دەیوتەوە کە ئەم ئاینە جوانترین ئاینە، موحەممەد پێغەمبەریش گەورەترینی پێغەمبەرانە-سەلامی خوایان لەسەر بێت-.

## ٢٥٦. ڕەنج و کاسبی حەڵاڵیش هەر لەپێناوی خوادایە

گەنجێکی بەتوانـاو بەهێـز هاتـە خزمەتـی پێغەمبـەر(ﷺ)، زۆر زوویـش لـە خزمەتـی چـووەدەرەوە چونکـە لـە هەوڵـی پەیداکردنـی بژێویـدا بـوو، هاوەڵانی پێغەمبـەر(ﷺ) هێزو چالاکییەکی بێ وێنەیـان تێـدا بەدیکـرد، پاشـان وتیـان: ئـەی پێغەمبـەری خـوا خۆزگایـە ئـەو چالاکیـی و هێـزەی لەپێنـاوی خـوادا بوایـە!

پێغەمبـەر(ﷺ) فەرمـووی: ((وا مەڵێن، ئەگـەر ڕەنـج بۆ ئـەوە بدات تـا خـۆی لـە دەسـتپانکردنەوە لـە خەڵکـی بپارێـزێ و بێنیـاز بێـت بـە خەڵکی، ئـەوا لەپێنـاوی خوادایە، وە ئەگـەر ڕەنجبدات لەپێنـاو بـاوک و دایکێکی نەتوانـادا یـان بۆ منداڵـە لاوازەکانی تـا پێویسـتییان جێبەجێ بـکات و نەهێڵـێ پێویسـتییان بـە خەڵکـی هەبێـت ئـەوا ئـەوەش هـەر لەپێنـاوی خوادایـە)).

لەڕاستیدا پێغەمبـەری دانامـان فەرمانمـان پێدەدات کاربکەیـن و بـە باشـترین شـێوە پشـت بـە خـوای گـەورە ببەسـتین، لێببڕێیـن و قۆڵـی لێهەڵماڵیـن ڕەنجبدەیـن، پاشـان پشـت بـە خـوای گـەورە ببەسـتین، بەوپـەڕی لێبـڕان و گەرموگوڕییـەوە دەسـتبدەینە کارەکانمـان، چونکـە پشتبەسـتن بەخـوای گـەورە بـە مانـای پاڵدانـەوەو دانیشـتن و تەمبەڵـی نیـە!

پێغەمبەر(ﷺ) هانمان دەدات لەسـەر کارکردن و کاسـبی سـودمەند وەک کشـتوکاڵ و بازرگانـی و پیشەسـازی و هـەر کارێکـی تـر کـە ڕزقـی حـەڵاڵ دەسـتبخات بـۆ خـۆی و بـۆ سـودی هەمـووی خەڵکـی..

## ٢٥٧. بەرهەمی ڕەنجی خودی مرۆڤ خۆشترین و حەڵاڵترین ڕزقە

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ چەند هاوەڵێکدا ڕۆیشت بۆ بازاڕ تا هەندێ مەڕ بکرن، پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاریکردن و فەرمووی: ((ئاگاتان لێبێت با ڕەشەکەی بێت، چونکە خۆشترینیانە)).

هاوەڵان وتیان: (ئایا تۆ ئەی پێغەمبەری خوا شوانی مەڕت کردووە؟ پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بەڵێ، من لەسەر چەند قیراتێک بەخێوم دەکرد بۆ خەڵکی مەککە، خوای گەورە هەر پێغەمبەرێکی ڕەوانە کردبێت شوانی مەڕی کردووە)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوا لە موسڵمانان دەکات بۆ پەیداکردنی بژێوییان کاربکەن و پشت بەخۆیان ببەستن، فەرموویەتی: ((هیچ خواردنێک لەو خواردنە چاکترو حەڵاڵتر نیە کە مرۆڤ بەدەستی خۆی پەیدای دەکات، داود پێغەمبەر(ﷺ) بەری ڕەنجی دەستی خۆی دەخوارد)).

هاوەڵانیش بە جوانی لەو ڕێنماییە پێغەمبەرانەیە تێگەیشتن، لێرەوە بۆ پەیداکردنی ڕزقی حەڵاڵ هەستاون بە کاری جۆراوجۆر، ئەبوبەکری صدیق بازرگانی دەکرد، قوماشفرۆش بوو و پۆشاکی دەفرۆشت، دوای ئەوەش کە بەیعەتی جێنشینی پێدرا هەر دەڕۆیشت بۆ بازاڕ و پۆشاکی هەڵدەگرت و دەیفرۆشت. عومەری کوڕی خەتتاب پێیگەیشت داوای لێکرد یەکلابێتەوە بۆ کاری جێنشینی، ئەبوبەکر پێیوت: ئەی لەچی خەرجی خانەوادەکەم بکێشم؟ من

ئەگەر گوێ بەوان نەدەم ئەوا گوێ بە موسڵمانانیش نادەم! ئینجا موسڵمانان لە بەیتولماڵ ئەوەندەیان بۆ بڕییەوە کە پێویستی بە کارکردن نەبێت.

عوسمانی کوڕی عەففان و عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف لە بازرگانە گەورەکان بوون، سەعد کوڕی ئەبو وەققاص تیری تیژ دەکرد، عەمری کوڕی عاص قەساب بوو، ئابەمشێوە هاوەڵانی تریش هەریەکەیان کارێکی بۆ بژێوی خۆی و ماڵ و منداڵی گرتبووە دەست -خوا لێیان ڕازی بێت-.

## ٢٥٨. تامەزرۆبوون بۆ کەعبە

شەش ساڵ تێپەڕی بەسەر کۆچی پێغەمبەردا(ﷺ) بۆ مەدینەی مونەووەرە، لەو ماوەیەدا، بێباوەڕان ڕێگایان بە موسڵمانان نەدەدا بچنەناو مەککەوە، ئەوانیش زۆر بێتاقەت و تامەزرۆبوون بۆ ئەو شارە کە تیایدا لەدایکبوون و گەورە بوون، تامەزرۆی بینینی کەعبەی پیرۆز بوون. پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی دەزانی، بەڵام چاوەڕێی مۆڵەتی خوای گەورەی دەکرد، هەروەها چاوەڕێی هاتنە پێشی کاتێکی گونجاو بوو بۆ ڕۆیشتن بۆ مەککە.

ڕۆژێکیان خەوێکی بینی کە لەگەڵ هاوەڵان چووە بۆ تەوافی کەعبە، بۆ ڕۆژی دواتر خەوەکەی بۆ گێڕانەوە، ئەوانیش زۆر دڵخۆشبوون چونکە خەوەکانی پێغەمبەر(ﷺ) جێبەجێ دەبن، ئەم خەوەشی هەر جێبەجێ دەبێت. دڵیان پڕبوو لە هیوا چونکە سەرلەنوێ کەعبەی پیرۆز و مەککەی ڕێزلێگیراو دەبینن، ئەو خەوەی کە پێغەمبەر(ﷺ) بینی ئاماژەیەک بوو کە خوای گەورە مۆڵەتی چوون بۆ مەککەی پێدەدات.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانیدا بە هاوەڵان خۆیان حازربکەن بۆ سەفەر. جەختی لێکردنەوە کە بەتەنهاو بەبێ چەک دەڕۆن، هاوەڵان کەوتنە خۆئامادەکردن، وشترەکانیان بە قوماشی ڕەنگاو ڕەنگ و گوڵ ڕازاندەوە، پێغەمبەریش(ﷺ) ئوم سەلەمەی هاوسەری لەگەڵ خۆی برد. بەرلەوە سەفەرەکە دەستپێبکرێ، پێشەوا عومەر وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! ئەوان شەڕیان لەدژی ئێمە ڕاگەیاندووە، ئێمەش بەبێ چەک دەڕۆین. ئەی ئەگەر ئازاریاندایین چی؟ ئەی

باشترنیە بۆمان کە چەکەکانمان پێبێت؟ بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو پێشنیارەی ڕەتکردەوەو فەرمووی کە جگە لە تەوافی کەعبە هیچ مەبەستێکی تری نیە، هەربۆیە هیچ جۆرە چەکێک هەڵناگری.

موسڵمانان بە شاندێکی گەورەوە کەوتنە سەفەر بەرەو مەککە، لەپاش گەشتێکی تولانی، گەیشتنە جێگایەکی نزیک لە مەککە، هەموو بە یەک دەنگ دەیانوت: ((الله أكبر! الله أكبر! لبيك اللّهم لبّيك!)).

هەر زوو هەواڵەکە گەیشتە قورەیش و وتیان: (وا موحەممەد بە کۆمەڵێکی زۆرەوە دێت بۆ کەعبە). ئەم هەواڵە وەک ئاگر بەربدەیتە پوش ئاوەها بڵاوبوویەوە. بێباوەڕان هەڵچوون و تورەبوون و هاواریان کردو وتیان: (هەرگیز ڕێگایان نادەین بێنە ناو مەککەو کەعبە ببینن).

کاتێ دەنگوباسی قورەیش گەیشتەوە بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر خەمبار بوو، چونکە ئەو بە نیەتی شەڕ نەهاتووە بەڵکو نیەتی ئاشتییە. ئەو نایەوێت ڕق و کینەکان زیاتر ببن، بەڵکو حەزدەکات لەگەڵیاندا بگاتە ڕێکەوتنێک.

هاوەڵانیش بەهەمانشێوە دڵتەنگ بوون، چونکە لە تامەزرۆبوون بۆ کەعبە دڵیان تاوابوویەوە. بەڵام ناچار بەبێ چارەو بێ بێدەستەڵات دانیشتن و چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد بەڵکو باودۆخەکە بگۆڕدرێ. ئەوان دەیانتوانی لە دوورەوە کەعبە ببینن کە وەک ئەڵماسێکی ڕەش وابوو. هەستیان کرد کە ئامادەن هەموو شتێک بکەن تەنها لەپێناو نزیککەوتنەوە لێی و دەستلێدانی و هێنانی دەموچاویان پیایدا، بەڵام جگە لە پاڕانەوەو ئارامگرتن هیچ بژاردەیەکی تر لەبەردەمیاندا نەبوو.

## ٢٥٩. وشترە گوێکەلەکە ناچێتە ناو مەککە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵان لە نزیکی مەککە لە شوێنێک کە پێیدەوترێ حودەیبیە وەستان، لەو شوێنەدا بۆ چەند ڕۆژێ چاوەڕێیان کرد، بەڵام قورەیش هەر ڕێگای نەدان بچنەناو مەککەوە، ئەو هەڵوێستەی قورەیش ستەمێکی گەورە بوو.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی دەربارەی هەنگاوی داهاتوویان ڕای هاوەڵان بزانێ، کێ دەڵێ لەوانەیە تێیاندا هەبێت گەڕانەوەی بۆ مەدینەی مونەووەرەی پێباش بێت، بەڵام ئەوان بەوپەڕی متمانەو ئازایەتییەوە وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا ئێمە بۆ خوێنڕشتن نەهاتووینەتە ئێرە، بەڵکو بۆ عومرەکردن هاتووین، جا ئەگەر قورەیش ڕێگیرییمان لێبکات ئێمە هەر ناگەڕێینەوە، بەڵکو تا کۆتایی هەر بەرگری دەکەین).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو هەڵوێستەی هاوەڵانی زۆر پێخۆشبوو، هەربۆیە وەستاو داوای لێکردن بڕۆن بەرەو مەککە.

هەر هەموو بەدەم وتنەوەی الله أکبر ڕوویان لە مەککە کرد، تامەزرۆیی و بێتاقەتییان بۆ بینینی کەعبە پێشیان کەوتبوو، ئا لەو گەشتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سواری وشترە گوێکەلەکەی بوو بوو، بەڵام کاتێ موسڵمانان نزیککەوتنەوە لە مەککە، وشترەکە چۆکیدادا. هەڵنەسایەوە، هاوەڵان بەدەوریدا کۆبوونەوەو هەوڵێکی زۆریان لەگەڵدا تا هەستێ و درێژە بە گەشتەکەی بدات بەڵام بێهودە بوو.

یەکێکیان وتی: (وشترە گوێکەلەکە بەگوێمان ناکات، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((وشترەکە بێ گوێی ناکات، ئەوە تەبیعەتی ئەویش نیە، بەڵکو ساڵی فیلەکە وەستانویەتی)). پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەبەستی ئەوەبوو کە بێگوێی عادەتی ئەو نیە بەڵکو ئەوە خوای گەورە ڕێگیری لێکردووە بچێتەناو مەککە، ئەویش وەک فیلی سوپاکەی ئەبرەهە وایە کە لە ڕابردوودا نەچووە ناو مەککەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) نزیککەوتەوە لە وشترەکەی و بە ئەسپایی دەستی هێنا بەسەر ملیدا، هەروەها بەدەنگێکی بەسۆزەوە قسەی لەگەڵدا کرد، ئەوکات هەستایەوەو بە هێواشی هەنگاوی دەنا بەرەو حودەیبیە. موسڵمانانیش بەدوایدا ڕۆیشتن تا دواجار وەستاو سەرلەنوێ لە نزیکی جۆگەلەیەک چۆکیدادا، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵان چادرگایەکیان هەڵداو بڕیاریاندا چاوەڕوانی بکەن.

## ٣٦٠. ئاو لە بیرێکی وشک هەڵدەقوڵێ

حودەیبیە ناوچەیەکی بێ ئاو بوو، هاوەڵان لێرەو لەوێ کەوتنە گەڕان بەدوای سەرچاوەیەکی ئاوی خواردنەوەدا. کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بینینی کە لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر ڕادەکەن، پرسیاری هۆیەکەی لێکردن، ئەوانیش وتیان: (ئێمە تەواوبووین ئەی پێغەمبەری خوا. ئاومان لێبڕاوە، ئیتر نە دەتوانین ئاو بخۆینەوەو نە دەستنوێژ بگرین).

بیرێکی وشک لە نزیک چادرگای موسڵمانانەوە هەبوو. کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی لەو حاڵەدا بینی، لە خوای گەورە پاڕایەوە، پاشان کەمێ لەو ئاوەی هەڵگرت کە پێیان بوو، ئینجا فەرمووی بەناوی خوا، پاشان ڕشتییە ناو بیرەکەوە. لەبەرئەنجامی ئەوە موعجیزەیەک ڕوویدا! ئاوێکی پاک و شیرین لە بیرەکە سەرڕێژ بوو.

هاوەڵان بە سەرسوڕمانەوە لە دەوری بیرەکە کۆبوونەوە، لێیانخواردەوە تا تێرئاو بوون، ئینجا دەستنوێژیان گرت. دەفرەکانیان لێ پڕکرد، وڵاغەکانیان ئاودا، هەرگیز تامی شیرینی ئەو ئاوەیان لەبیر نەدەچوو کە لەسەر دەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو بیرە وشکەوە هەڵقوڵا.

## ٢٦١. سەرسوڕمانی عوروەی سەقەفی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە حودەیبیە لەگەڵ هاوەڵاندا چاوەڕوانی گەیشتنی دەنگوباسی مەککەیان دەکرد تا مۆڵەتیان پێبدرێ بچنەناوی. بەڵام قورەیش هەڵوێستێکی ڕەقی نواند، موسڵمانانی ناچارکرد زیاتر چاوەڕوانی بکەن. لێرەدا هەردوولا نوێنەریان ناردە لای یەکتر تا بگەنە ڕێکەوتنێک.

عوروەی سەقەفی یەکێک بوو لە شاندەکەی قورەیش بۆ حودەیبیە. بۆ ئەوە ڕۆیشت تا موسڵمانان قەناعەت پێبکات بگەڕێنەوە. عوروە متمانەی بەخۆی زۆر بوو. کاتێ گەیشتە چادرگای موسڵمانان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕوخسارێکی زەردەخەنە ئامێزەوە پێشوازی لێکرد. ئەویش لە نزیکییەوە دانیشت و کەوتە قسەکردن. سەرەتا ڕەفتارو شێوازی قسەکردنەکەی ڕەق بوو، بەڵام پاش ماوەیەک بۆی دەرکەوت کە دەبێت بە ئەدەب و ڕێزێکی زۆرەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ پێغەمبەردا(ﷺ) بکات، ئەویش بەهۆی ئەو ڕێزە گەورەیەوە کە هاوەڵان بەرانبەر بە پێغەمبەرەکەیان هەیانبوو. چونکە کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەکەوتە ئاخاوتن ئەوان بەتەواوەتی بێ جوڵە گوێیان لێدەگرت وەک چۆلەکە لەسەر سەریان نیشتبێتەوە، تەنها یەک وشەیان لە گوفتاری لێ ون نەدەبوو.

عوروە بەڵێنی بە قورەیش دابوو کە هەرچی لە موسڵمانانەوە دەبیستێ و دەبینێ بۆیان بگێڕێتەوە. لەبەرئەوە ئەو ماوەیە کە لەلایان مایەوە هەموو گەورەو بچوکێکی لای خۆی تۆمار دەکرد. کاتێ گەڕایەوە بۆ مەککە، بە هاوەڵەکانی خۆی وت: (ئەمانە چ

قەومێکن، سوێند بەخوا من چووم بۆ لای هەریەک لە پادشایان کیسرا، قەیصەر و نەجاشی، بەخوا هیچ پادشایەک لەوانەم نەبینیوە هاوەڵانی ڕێزی بگرن وەها کە هاوەڵانی موحەممەد ڕێز لە موحەممەد دەگرن). سەرکردەکانی قورەیش پێیانوت: (مەبەستت چییە بۆمان ڕوونبکەرەوە). عوروە وتی: (سوێند بەخوا چاوی لێ کلا ناکەن، لە لایدا دەنگ بەرزناکەنەوە، هەر ئەوەندەی بەسە کە ئاماژە بدات بە کارێ ئیتر جێبەجێ کراوە... هەرکات دەستنوێژ بگرێ شانەخڕێیانە لەسەر دەستخستنی کەمێک لە ئاوی دەستنوێژەکەی. ئێستە ئەویش پلانێکی ژیرانەی خستووەتە بەردەمتان دەی قوبوڵی بکەن).

بەڵام قورەیش ئامۆژگاریەکەی عوروەیان وەرنەگرت، بەڵکو بە یاخیبوونەوە داواکەی پێغەمبەریان بە چوونەناو مەککە ڕەتکردەوە. بەڵام وێڕای ئەوەش هەر قسەکانی عوروەیان لەبیر نەچوویەوە.

## ٢٦٢. بەیعەتی ژێر درەختەکە

چاوەڕوانی موسڵمانان لە حودەیبیە چەند ڕۆژێکی خایاند، پیغەمبەریش(ﷺ) هەر بەدوای ڕێگاچارەیەکدا دەگەڕا بچنەناو مەککەوە بێئەوەی کێشە ڕووبدات. لەو پێناوەدا عوسمانی وەک نێردراوێکی موسڵمانان نارد کە خۆشەویستییەکی زۆری بۆی هەبوو.

عوسمان لای قورەیش کەسێکی خاوەن ڕێز بوو، کاتێک ڕۆیشت بۆ لای پیاوماقوڵانی قورەیش، ئاگاداری کردن کە ئامانجی موسڵمانان شەڕ نیەو ئاشتییە، داوای لێکردن ڕێگا بە موسڵمانان بدەن عومرە بکەن. بەڵام بێباوەڕان وازیان لە قیرسیچمەیی خۆیان نەهێنا، بەڵکو وتیان هەرگیز ڕێگا بە موحەممەد نادەین کەعبە ببینێ. جگە لەوەش هەستان بە دەستبەسەرکردنی عوسمان و هێشتنەوەی بۆ ماوەی سێ ڕۆژ.

موسڵمانان لەبەرئەنجامی پچڕانی پەیوەندییان بە عوسمانەوە کەوتنە دڵەڕاوکەو زۆر بێتاقەت بوون، چاووڕاوێک بڵاوبوویەوە کە عوسمان کوژراوە، زۆر زۆر غەمبار بوون، خودی پێغەمبەریش(ﷺ) هەر ناڕەحەت بوو، چونکە ئەگەر ڕاست بێت عوسمان کوژرابێت ئەوا تاکە بژاردەیەک کە لەبەردەمدا مابێتەوە شەڕکردنە. ئەمەش ئەو مەسەلەیە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) هەوڵیدەدا ڕوونەدات، هەر بۆیە ویستی هاوەڵان ئامادەباش بن بەلانیکەوە بۆ بەرگریکردن لە خۆیان نەبادا لەگەڵ بێباوەڕاندا بجەنگن.

ئەمەش هەمان ویستی خوای گەورە بوو. ئەو ڕووداوانە لە سەرەتا ڕۆژەکانی وەرزی بەهاردا ڕوویاندا. لەو کاتەدا، هەڵاڵەو گوڵەکان لەسەر درەختەکان و نێوان گژوگیادا کەوتبوونە پشکوتن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی لەژێر درەختێکدا کۆکردەوە، داوای لێکردن بەیعەتی پێبدەن. لەو بەیعەیەدا، موسڵمانان پەیمانیاندا کە لە هەموو بارودۆخێکدا بە یەکگرتوویی بمێننەوەو بەرگری لە یەکتری و لە پێغەمبەرەکەیان بکەن(ﷺ)، هاوەڵان یەک لەدوای یەک هاتنە پێش و ئەو بەڵێنەیان لەسەر خۆیان دا.

موسڵمانان سوێندیان خوارد لەسەر شوێنکەوتنی فەرمانەکانی خواو پێغەمبەرەکەی، لەسەر هەڵنەهاتن لەبەردەم بێباوەڕاندا، لەسەر بەرەنگاربوونەوەی هەموو ڕووداوەکان بە ئارامگرتن و ئازایەتی. ئەو بەیعەیە ناونرا (بەیعەی ڕەزوان)، چونکە خوای گەورەو پێغەمبەرەکەیی ڕازیکرد.

کاتێ هاوەڵگەران بیستییان کە هاوەڵان لەژێر هیچ بارودۆخێکدا دەستبەرداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) نابن، تووشی شپرزی و ترس هاتن. چونکە کاتێ موسڵمانان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) کۆدەبنەوە دەتوانن هەر شتێک بیانەوێ بیکەن، ئەوکات هاتن عوسمانیان لەدوای سێ ڕۆژ بەندکردن ئازاد کرد، ئەویش خێرا گەڕایەوە بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەمووان بە بینینی دڵیان خۆشبوو کە نەکوژراوە، بە شادییەکی زۆرەوە باوەشیان پێداکردو پرسیاریان لێکرد ئایا توانیویەتی تەوافی کەعبەی پیرۆز بکات، لە وەڵامدا وتی: ئەگەر یەک ساڵی ڕەبەق لە مەککە بمایەتەوە هەر تەوافی کەعبەی نەدەکرد لە کاتێکدا کە پێغەمبەر(ﷺ) لێرە زۆر تامەزرۆی تەواف کردن و بینینیەتی.

## ٣٦٣. ڕێکەوتننامەی ئاشتەوایی

قورەیش هەستی بە نائارامی و ترس دەکرد، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) هێشتا لە حودەیبیە لەگەڵ هاوەڵانیدا لە چاوەڕوانیدا بوون، لەبەردەم ئەو بارودۆخەدا هیچ ڕێگاچاریەکیان لەبەردەمدا نەمایەوە جگە لە گرێدانی ئاشتەوایی.

لەگەڵ کۆتاییهاتنی ڕۆژی بیستەم، قورەیش نێردراوێکیان بەناوی سوهەیل ناردە لای موسڵمانان، سوهەیل لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دانیشت، پەیماننامەی ئاشتەوایی پێشکەشکرد، دوای ئەوە هات خاڵی یەکەمی لە ڕێکەوتننامەکە خوێندەوە کە: وەستانی شەڕ ماوەی دە ساڵ لەنێوان موسڵمانان و قورەیشدا.

ئەمە گۆڕانکارییەکی ئەرێنی بوو، چونکە پێشتر هەمیشە بێباوەڕان دەستپێشخەربوون لە شەڕەکاندا، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە لایەنی ئاشتی و برایەتی گرتووە، دوای ئەوە خاڵی دووەمی بۆ خوێندنەوە کە دەڵێ: پێغەمبەری خوا ئەمساڵ بگەڕێتەوەو تا ساڵی ئایندە نەچێتە ناو مەککەوە، ئەوکات موسڵمانان دەتوانن تەوافی کەعبە بکەن بێئەوەی قورەیش هیچ جۆرە سەغڵەتییەکیان بۆ دروستبکات، بە مەرجێ لە سێ ڕۆژ زیاتر تیایدا نەمێننەوە.

کاتێ هاوەڵان ئەوەیان بیست، بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکتریان کرد، ئایا چی ڕێگرە لەوەی ئێستە بچنەناو کەعبە لە کاتێکدا ئەوان لەسەر دەرگای مەککە وەستاون، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو مەرجانەی قوبوڵکرد کە قورەیش سەپاندنی، بەمشێوەیە ڕێکەوتنێک لەنێوان هەردوولادا بەسترا ئەگەرچی ستەمی بەرانبەر

بە موسڵمانان تێدابوو، بەڵام گرنگ بوو، لەسەر ئەم بنەمایە هەردوولا ڕێکەوتنەکەیان واژۆ کرد.

دوای ئەوە، هەرچەندە موسڵمانان زۆر شەیدای بینینی کەعبە بوون، بەڵام هەر خۆیان ئامادەکرد بگەڕێنەوە، ناچاربوون شوێنەکە جێبێڵن، موسڵمانان سەرسامبوون و بەهۆی ئەو مەرجە ستەمکارانەوە هەستیان بە غەمبارییەکی زۆر کرد، تاکە سەرەخۆشی و دڵدانەوەیەک بۆیان ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) قوبوڵیکردووە، مەعلومیشە کە ئەو دەزانی چیدەکات.

لە ڕێگای گەڕانەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە مژدە بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هات، خوای گەورە بە جبرەئیلدا ئەم ئایەتەی ناردە خوارەوە کە دەفەرموێ: ﴿إِنَّا فَتَحْنَا لَكَ فَتْحًا مُّبِينًا﴾ (الفتح: ١). ئەمەش مانای ئەوەیە کە هەموو بەربەستەکانی بەردەم ئاشتی هەڵگیراون، دەرگاکانی سەرکەوتن کراوەن. بەم پێیە ئەوا خەوەکەی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بەمزووانە جێبەجێ دەبێت، موسڵمانانیش دەتوانن مەککەی پیرۆز ڕزگاربکەن.

جا هەرچەندە مەرجەکانی ڕێکەوتننامەی حودەیبیە لە بەرژەوەندی موسڵمانان نەبوو، بەلایانەوە قورس بوو قوبوڵی بکەن، بەڵام هەر بووە هەوڵێک بۆ بەرپاکردنی ئاشتی. ئەمەش بووە سەرەتایەک. چونکە ئەوانەی کە بەڕووی پێغەمبەردا(ﷺ) وەستان و ڕێگیرییان کرد بچێتەناو مەککە ئێستە ڕەزامەندن دواتر بگەڕێتەوەو بچێتەناوی، با دوای ساڵێکیش بێت، بەمجۆرە مژدەکانی ئاشتی و برایەتی و سەرکەوتن لە ئاسۆوە دەرکەوتن.

## ٢٦٤. نامەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بۆ پادشاکانی سەر زەوی

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ هەمووی جیهان ڕەوانەکراوە، ئاینەکەشی کە پێی ڕەوانەکراوە ئاینی هەمووی بونەوەرو مرۆڤەکانە. چونکە ئیسلام هیچ جیاوازییەک لەنێوان زمانەکان یان ڕەنگەکان یان نەژادەکان ناکات بەڵکو سەراپای مرۆڤایەتی دەگرێتەوە.

دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێکەوتننامەی ئاشتی لەگەڵ قورەیش گرێدا، هەموو موسڵمانان هەستیان بە حەوانەوەو دڵئارامییەک کرد، جا با ئەو ڕێکەوتننامەیەش کاتی بێت بەڵام ئەرێنی بوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیویست هەمووی خەڵکی سودمەندبن لەو ئاشتییە، بۆیە هەستا بە کۆکردنەوەی هاوەڵان و فەرمووی پێیان کە خوای گەورە ئەوی ناردووە تا پێغەمبەری هەمووی مرۆڤایەتی بێت، داوای لێکردن یارمەتیدەری بن لەسەر بڵاوکردنەوەی ئەم ئاینە جوانە بە سەرتاسەری جیهاندا. هاوەڵان ڕازیبوون و پێیانوت ئەوان پشتگیری دەکەن و هاوکاری دەبن لە هەر شتێکدا ئەو فەرمانی پێبدات.

لەبەردەم ئەو هەڵوێستەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوایکرد نامە بۆ هەموو سەرۆکەکانی جیهان بنێرێت، لەو نامانەدا پێغەمبەر(ﷺ) بنەماکانی ئیسلامی باسکرد، داوای لەو سەرۆکانە کرد باوەڕ بە ئاینی خوای گەورە بێنن، دوای ئەوە، هەستا بە دیاریکردنی کەسانێک بۆ گەیاندنی ئەو نامانە بە خاوەنەکانیان. ئەو کەسانەش ئەوانە بوون کە زمانە بیانییەکانیان دەزانی.

کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ویستی نامە بۆ پادشای ڕۆم بنوسێ، هاوەڵان پێیانوت: ئەوانە نامەیەک ناخوێننەوە مۆر نەکرابێت. پێغەمبەریش(ﷺ) ئەنگوستیلەیەکی زیوینی بەکارهێنا، دەستەواژەی (محمد ڕسول الله) ی لەسەری نەخشاند تا ئەو نامانەی پێ مۆر بکات کە بۆ ئەو پادشایانەی دەنێرێ.

## ٣٦٥. کچی سەرکردەی دوژمنان

ئەبو سوفیان کچێکی زیرەک و ڕووگەش و بریقەداری بەناوی ئوم حەبیبە هەبوو. بەپێچەوانەی باوکییەوە بوو، خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووبووە دڵی و باوەڕی بە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هێنا. لەبەرئەوە، باوکی و هاوەڵگەرانی تریش چەندین کێشەیان بۆ دروستکرد، ئەوەی لە توانایاندا بوو بە خەرجیاندا تا ڕێگیری لێبکەن باوەڕ بەم ئاینە نوێیە بێنێ.

بەڵام ئوم حەبیبە بە ئارامگرتنێکی زۆرەوە بەرەنگاری ئەو هەموو ئاستەنگانە بوویەوە، پشتی لە ئیسلام هەڵنەکرد، دواجار، لەگەڵ کۆمەڵێ موسڵمانی تردا کۆچیکرد بۆ حەبەشە، ماوەیەکی زۆر لەوێ مایەوە، بێتاقەت و شەیدای هاوڕێ و خزمەکانی بوو، بەتایبەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). دوای ماوەیەک مێردەکەی مرد، بەیەکجاری بەتەنها مایەوە. پێویستی بە کەسێک بوو بیپارێزێ و سەرپەرشتی بەخێوکردنی بکات.

لەدوای ماوەیەک، چەندجارێک خەونێکی بۆ دەهات، تیایدا کەسێکی دەبینی کە بەناوی (دایکی باوەڕداران) بانگی دەکات، لە مانای خەوەکە تێنەگەیشت، چاوانی وابەستەبوون بە ئاسۆیەکەوە. کەوتە بیرکردنەوە لەو شوێنە کە تیایدا لەدایکبووەو گەورەبووە تیایدا، وابەستە بە یادەوەری منداڵییەوە، بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیەوە، زۆر بێتاقەت بوو کە ئاوا لەو(ﷺ) و لە موسڵمانی تریش دوورە.

بەڵام مەعلومە خوای گەورە لێناگەڕێ بەندەکانی ڕووبەڕووی چارەنووسی تەنیایی ببنەوە، بەتایبەتی ئوم حەبیبە کە چەرمەسەری زۆری

لەپێناو ئاینەکەیدا کێشا، پەروەردگار فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی(ﷺ) دا ببێتە سەرپەرشتکاری ئوم حەبیبەو هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات. ئەوکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەسێکی نارد بۆ لای تا ئوم حەبیبە ئاگادار بکات بەو هاوسەرگیرییە، ئوم حەبیبە ئەقڵی بڕوای نەکرد بەوەی کە بیستی، چونکە داوایەکی هاوسەرگیری لە شوێنێکی زۆر دوورەوە پێگەیشتووە، بەڵام تەواو ڕاستە، ئەو داوایە لە هیچ پیاوێکەوە نەبووە جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) و بە فەرمانی خوای گەورەی بووە.

هەستەکانی ئوم حەبیبە لەنێوان دوودڵی و خۆشی و سەرسامیدا دەیاندا لەیەک، چونکە ئەو کچی ئەبو سوفیانی دوژمنی ئیسلامە، کە بووە هۆی کوشتنی سەدان موسڵمان، هەروەها ئەوەی لە توانایدا بوو بۆ کوشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) درێغی لێنەکرد.

بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هیچ جۆرە غەرەزو ڕقێکی بەرانبەر بە هیچ کەس هەڵنەگرتبوو، تاوانی کەسی نەدەکردە کۆڵی کەسیتر، ئەمەش خودی دادپەروەرییە، پێغەمبەری بەزەیی و خۆشەویستی باوەش دەکاتەوە بۆ هەموو باوەڕداران، ئوم حەبیبە بەمشێوەیە سەرلەنوێ لە گەورەیی ئەو کەسایەتییە تێگەیشت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە نەجاشی کرد ئوم حەبیبە بنێرێ بۆ مەدینەی مونەووەرە، پادشا فەرمانی بە خزمەتکارەکانیدا هەموو ئامادەباشییەک بۆ ئەو مەسەلەیە بکەن، چونکە لە ناخی دڵییەوە حەزیدەکرد موسڵمانان لەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا کۆببنەوە. بەمجۆرە موسڵمانانی خستە سەرپشتی کەشتییەک و ڕەوانەی مەدینەی مونەووەرەی کردن، دڵی ئوم حەبیبە لەخۆشیدا بەپەلە لێیدەدا، نزیکبووتەوە لەوەی هاوسەرگیری لەگەڵ پێغەمبەری ئەم ئوممەتەدا بکات. وا ئێستە لە مانای خەونەکەی تێگەیشت، چونکە خێزانەکانی پێغەمبەر(ﷺ) دادەنرێن بە دایکی باوەڕداران، بەم پێیەش ژیانێکی نوێ دەستپێدەکات.

## ٢٦٦. وەڵامی هیرەقلی پادشا

پێویست بوو ئاینی ئیسلام بە هەمووی جیهاندا بڵاوببێتەوە، تا سنورێک بۆ داماوی و ستەمکردن لەسەر ڕووی زەوی دابنێ. بەو هۆیەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە هاوەڵانی کرد نامەکان بنوسرێن، کەوتە ناردنی نامە بۆ هەموو سەرۆکەکانی جیهان، پێغەمبەر(ﷺ) دەحیەی کەلەبی ڕاسپارد بە گەیاندنی نامەکەی هیرەقلی پادشای ڕۆم لە بیزەنتە.

دەحیە سواری ئەسپەکەی بوو، بروسکە ئاسا بۆی دەرچوو، کێو و بیابان و دەشتەکانی یەک لەدوای پێچایەوە تا نامەکەی گەیاندە پادشای ڕۆم، هیرەقل نامەکەی کردەوەو خوێندیەوە، ئینجا ڕاستەوخۆ کەوتە لێکۆڵینەوە لە ناسنامەی خاوەن نامە، چونکە دەیویست دڵنیا ببێت لە ڕاستێتی ئەو کەسە کە بانگی دەکات بۆسەر ئاینی نوێ.

ئا لەو کاتەدا، ئەبو سوفیان هێشتا کەسێکی هاوەڵگەرو گەورەی قورەیش بوو. وا ڕێکەوت بە مەبەستی کاری بازرگانی لە سەردانی شامدا بوو. کاتێ هیرەقل پێیزانی، داوای لە پیاوەکانی کرد ئەبو سوفیان بێنن بۆ لای. پاشان کۆمەڵێ پرسیاری لەبارەی ئاینی نوێ و ئەو پێغەمبەرەوە لێکرد کە ئەو ئاینەی هێناوە، پێیوت: (بیستومە پیاوێکتان تێدایە دەڵێت پێغەمبەرم، حەزدەکەم لەبارەیەوە کۆمەڵێ پرسیارت لێبکەم، بەس نەکەیت درۆ بکەیت).

ئەبو سوفیان لەبەردەم ئەو هەڕەشەیەدا هەستی بە ترس کرد. بڕیاریدا لەبارەی ئەو پێغەمبەرەوە ڕاستی بڵێت، با خۆیشی ڕازی

نەبێ بەوەی کە دەیڵێ. هیرەقل وتی: (نەژادی لەناوتاندا چۆنە؟).

ئەبو سوفیان بە زۆرلەخۆکردنەوە وتی: (ئەو خاوەن نەژادێکی ڕەسەنە).

هیرەقل بەردەوامبوو و پرسی: (ئایا پێش ئەوەی ئەوە بڵێ کە پێیگوتن ئێوە تۆمەتبارتان دەکرد بە درۆزنی؟) ئەبو سوفیان وتی: (نەخێر).

هیرەقل وتی: (ئایا کەسانی ناودارو پیاوماقوڵ شوێنی دەکەون یان کەسانی لاوازو داماو؟) ئەبو سوفیان وتی: بەڵکو لاوازو داماوەکان).

هیرەقل وتی: (ئایا ژمارەیان زیاد دەکات یان کەم دەکات؟) ئەبو سوفیان وتی: (زیاد دەکات). پادشا لێی پرسی: (ئایا ناپاکی دەکات؟) ئەبو سوفیان وتی: (نەخێر). ئەو پیاوە کە پادشا داوای وەڵامدانەوەی پرسیارەکانی لێکرد گەورەترین دوژمنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو. بەڵام بڕیاریدا ڕاستی بڵێ چونکە دەترسا درۆ بۆ پادشا بکات.

هیرەقل باش باش بیری لێکردەوە، پاشان پرسیاری لێکرد: (چ فەرمانێکتان پێدەکات؟) ئەبو سوفیان وتی: (دەڵێ خوای تاک و تەنها بپەرستن و هاوەڵی بۆ بڕیار مەدەن، واز لەوە بێنن باو و باپیرانتان پێتان دەڵێن، پێماندەڵێ نوێژ بکەن، ڕاستگۆ و داوێنپاک بن و سیلەی ڕەحم بەجێبگەیەنن). ئەوکات هیرەقل بۆ ماوەیەک بێدەنگ بوو، پاشان وتی: (ئەگەر بەڕاستی وەها بێت تۆ دەڵێیت ئەوا ئەم جێ پێیانەی منیش دەبێتە دەستەڵاتی، من وامدەزانی لە دەرەوەی ئێوەوە ڕەوانە دەکرێ، گومانم وانەبوو لە ئێوەیە، ئەگەر بزانم کە دەگەمە لای، ئەوا لەو پێناوەدا نارەحەتییەکانم دەگرتە ئەستۆ، وە ئەگەر لای ئەو بوومایە ئەوا فەرمانبەرداری بەرپێی دەبووم).

کاتێ ئەبو سوفیان ئەم قسانەی لە هیرەقلەوە بیست، هەستی بە بێتاقەتییەکی زۆر کرد، ئینجا گەڕایەوە ناو هاوەڵەکانی و وتی:

موحەممەد ئەوندە لەم مەسەلەیەدا بە ئاستێکی وەها ڕۆچووە کە گەورەترین پادشای سەر زەوی وایلێهاتووە لێی بترسێ.

ئێستە وا ئیسلام بە هەمووی جیهاندا بڵاودەبێتەوە، بێباوەڕانیش بە بێتاقەتییەکی زۆرەوە بەدواداچوونیان بۆ هەواڵەکانی بڵاوبوونەوەی ئەو ئاینە دەکرد کە دژایەتیان دەکرد. بەڵام تازە ئیتر لە توانایاندا نیە دژ بەم ئاینە مەزنە بوەستن، بەڵکو بە دەست بەستراوی بەدواداچوونیان بۆ گۆڕانکارییەکان دەکردو بەس.

## ٢٦٧. هیرەقل و زەغاتر

هیرەقل زۆر دڵخۆشبوو بەو نامەیەی لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) پێگەیشت. باوەڕی هێنا کە موحەممەد پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، پیاوەکانی خۆی کۆکردەوەو ئاگاداریکردن بەو بانگهێشتەی پێگەیشتووەو وتی: (ئەی قەومی ڕۆم، ئەگەر دەتانەوێ بە هەتا هەتایی ڕزگارو سەرفرازو ژیربن و دەستەڵاتتان بەردەوام بێت ئەوا بەیعەت بەم پێغەمبەرە بدەن).

بەڵام پیاوەکانی لەدژی وەستانەوە، کەوتنە چپەچپ لەنێوان خۆیاندا، پاشانیش دەنگە دەنگ بەرزبوویەوە، هیرەقلیش لەبەردەم ئەم هەڵوێستە توندو سەختگیرەدا ترسی کورسیەکەیی لە پیاوەکانیەوە لێنیشت. بەڵام ئەو نامەیەی کە لە پێغەمبەری خۆشەویستمانەوە پێگەیشت هەڵیگرت و قوماشێکی ئاوریشمی پێچا پێیەوە، ئینجا خستییە ناو قوتویەکی ئاڵتونی و لە شوێنێکی ئەمیندا شاردییەوە، باوەڕی وەهابوو کە تا ئەو نامەیەی لەگەڵدا بێت دەستەڵاتەکەشی هەر دەمێنێ.

هیرەقل فەرمانیدا دیاری پڕ بەها بنێردرێت بۆ موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ)، نامەو دیارییەکانی بە دەحیەی کەلەبیدا نارد. پێیوت: (سوێند بەخوا من باش دەزانم کە گەورەکەی تۆ پێغەمبەرە، ئەو ئەو کەسەیە ئێمە چاوەڕێمان دەکردو لە کتێبەکەماندا دەیبینین، بەڵام لە ڕۆمەکان دەترسم، ئەگەر لەبەرئەوە نەبوایە شوێنی دەکەوتم). پاشان ڕێنمایی پێدا بچێتە لای (زەغاتر) کە یەکێک بوو لە پیاوە ئاینییە بەڕێزەکان.

زەغاتر قەشەیەکی پیری زۆرزان بوو، لەبەرئەوە لە هەموو ئەو قسانەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشت کە لە نامەکەیدا هاتبوون، دوای ئەوە کە خوێندییەوە وتی: (سوێند بەخوا گەورەکەت پێغەمبەرێکی ڕەوانەکراوە، بە نیشانەکانیدا دەیناسین، لە کتێبەکەشماندا بەناوی خۆیەوە دەیبینین)، ئینجا پۆشاکە ڕەشەکەی لەبەر خۆی داکەندو لەجێگایدا پۆشاکی سپی پۆشی.

پاشان، ڕۆیشت بۆ کەنیسە کە خەڵکی لەوێ کۆبوبوونەوە، بەبێ دوودڵی پێیوتن: (ئەی قەومی ڕۆم! ئێمە نامەی ئەحمەدمان بۆ هاتووە، بانگمان دەکات بۆ لای خوای گەورە، منیش دەڵێم أشهد أن لا إله إلا الله وأشهد أن أحمد رسول الله). ئامادەبووان توڕەبوون و هەڵپژان بەڕووی زەغاتردا، بەڵام ئەم پیاوە ئایینییە خۆی هەستی بە ئاسودەیی کرد چونکە ئەو نامەیەی لە پێغەمبەری خواوە پێیگەیشتبوو ڕایگەیاند.

مەعلومیشە، کە چاوەڕێ دەکرا هەندێ کەس لەم بانگەوازە یاخی ببن، هەندێکیش پەسەندی بکەن، بەڵام ئەو پیاوە ئازایە ئامادەبوو بەرەنگاری توڕەبوونی خەڵکی بێتەوە دوای ئەوە کە دڵ و ڕۆحی لەگەڵ موحەممەد پێغەمبەردا کۆبوونەوە.

## ٣٦٨. مەقۆقس، پادشای میسر

پێغەمبەر خوا(ﷺ) بەردەوامبوو لە ناردنی نامە بۆ پادشایانی جیهان، لەنێویشیاندا مەقۆقسی میسر، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵێکی بەناوی (حاتەب) ڕاسپارد بە گەیاندنی ئەو نامەیە، هەرکە مەقۆقس نامەکەی وەرگرت، داوای لە پیاوەکانی کرد بیخوێننەوە بۆی. دوای ئەوە، بە حاتەبی وت: (ئێمە چاوەڕێمان دەکرد بەم نزیکانە دەربکەوێ، بەڵام پێشبینیمان نەدەکرد لە مەککە دەربکەوێ بەڵکو واماندەزانی لە شام دەردەکەوێ).

دوای ئەوە نامەکەی پێغەمبەری(ﷺ) وەرگرت و خستییە ناو سندوقێکی عاجەوە، ئینجا شاردییەوە، هەندێ دیاری نارد بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەنێویاندا ماریای قیبتی بوو کە دەکاتە دایکی ئیبراهیم کوڕی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، بەڵام مەخابن خۆی باوەڕی بە ئیسلام نەهێنا.

ئەو دیاری و سەروەتانە هیچ بایەخێکیان لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەبوو، چونکە مەقۆقس گەورەترین سەروەتی جیهانی لەدەستدا ئەویش باوەڕهێنان بوو بە خواو بە پێغەمبەرەکەی. پێغەمبەری خوا غەمباربوو بە دوودڵی مەقۆقس لە باوەڕهێنان و بەزەیی پێیداهاتەوە. چونکە پادشای میسر نەیتوانی قوربانی بە کورسییەکەی بدات. مەعلومیشە ئەو دەستەڵاتەی کە لەسەر دڵی بەنرخە زۆر درێژەناکێشێ بۆی.

جگە لەوانە پێغەمبەری خوا نامەی نارد بۆ کیسرای پادشای وڵاتی فارس، بۆ فەرمانڕەوای یەمەن و داوای لێکردن باوەڕ

بە ئیسلام بێنن، بەم پێیە دەنگوباسی ئەم ئاینە جوانە گەیشتە سەرتاسەری زەوی. چونکە باوەڕهێنان بە ئیسلام لە هەموو پلەو پایەیەکی ئەم دنیایە بەنرخترە. ئەوانەی لەم حەقیقەتە تێگەیشتن هەموو شتێکیان کردە قوربانی تا ببنە موسڵمان، بۆیان دەرکەوت کە بوونەتە خاوەنی گەورەترین و بەنرخترین گەنجینەی ئەم سەرزەوییە. بەمجۆرە ژمارەی موسڵمانان لە جیهاندا ڕۆژ لەدوای ڕۆژ لە زیادبووندا بوو، ناوی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە هەمووی جیهاندا دەنگیدایەوە. جیهانی دێرینیش وردە وردە ئاشنابوو بە پێغەمبەری خاتەم.

## ٣٦٩. شێرێک دەبێتە ڕێنیشاندەری هاوەڵێک

ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا چوو بۆ گەشتێک، هاوەڵێک لەنێویاندا بوو بە خۆبەخشی ئەو شمەکانەی هەڵدەگرت کە خاوەنەکانیان ماندوو دەبوون لە هەڵگرتنیان، ئەوەندەی هەڵگرت تا شمەکێکی زۆر لەسەر پشتی کۆدەبوویەوە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە سوعبەتەوە فەرمووی پێی: (تۆ کەشتیت))، ئیتر لەو ڕۆژەوە لەناو خەڵکیدا بەناوی (کەشتی) ناوبانگی دەکرد.

ڕۆژێکیان (کەشتی) هاوەڵ چووە سەر بەلەمێک لە دەریادا، بەلەمەکە شکا! ئەویش سواری یەکێک لە تەختەکانی بوو تا گەیشتە دوورگەیەک، لەناکاو شێرێکی بینی. کەشتی هاوەڵ هەستی بە ترس و بیم کرد، نەیدەزانی چیبکات، لەترساندا دەلەرزی، وای بۆچوو کە ئەو شێرە برسییە بە ئاسانی قوتی دەدات. شێرەکە بە هەڵپەی خواردن و حەزێکی زۆرەوە سەیری دەکرد، ئینجا کەشتی هاوەڵ بیری بەدوای جێگایەکدا بوو ڕابکات، بەڵام هیچ چارەیەکی دەستنەکەوت.

پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیرکەوتەوە، زانی کە ئیتر ناتوانێت ئەو ئەرکەی پێیسپێاردووە جێبەجێی بکات، ئینجا کەوتە سەیرکردنی چاوانی شێرەکە و وتی: (ئەی ئەبو حارس، من کەشتیم، کارگوزاری پێغەمبەری خوام(ﷺ)، شێرەکەش سەیرێکی کردو چەند دەنگێکی ناڕوونی لێ هاتەدەر.

شێرەکە بۆ ماوەیەکی زۆر هەر سەیری کەشتی هاوەڵی دەکرد، پاشان لێی نزیکبوویەوە، ئینجا بە شانەکانی کەوتە پاڵپێوەنانی

کەشتی بەرەو ئاراستەیەکی دیاریکراو، ئینجا کەشتی شوێن شێرەکە کەوت وەک بڵێی ئەمە ڕێنیشاندەریەتی لە بیاباندا، ئەویش بۆ ماوەیەکی زۆر بەدوایەوە ڕێیکرد. لەپاش ماوەیەک، ڕێگاکەی دۆزییەوە، زۆر زۆر دڵخۆشبوو، ئینجا ڕۆیشت بەرەو ئەو ناوچەیە کە مەبەستی بوو، شێرەکەش ڕۆیشت بەڕێی خۆیەوە، ئەگەر ئەوە بەڵگە بێت لەسەر شتێک، ئەوا بە حەتمی بەڵگەیە کە ئەویش پێغەمبەری خوای(ﷺ) ناسیوە، حاڵی شێرەکەش وەک حاڵی هەموو دروستکراوانی تری سەرزەوی وایە کە بە ڕێزو شکۆمەندییەوە دەڕواننە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) و ئازاری هاوەڵەکەیی نەدا.

## ٢٧٠. پێغەمبەر گرانیی ناهێڵێ

ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە بازاڕی مەدینەدا هەستایە سەرپێ و ئامۆژگاری بازرگانەکانی کردو فەرمووی: ((نەکەن مامەڵەی کڕین لەگەڵ کاروانی فرۆشیاران بکەن و بچن بەپیریانەوە بەرلەوە بگەنەوە شوێنی مەبەستییان، -واتە ئێوە پێشتر بێن شمەکەکانیان بە هەرزان لێبکڕن کە ئەوان نرخەکەی نازانن و دواتر خۆتان بە گرانتر بیفرۆشن بە خەڵکی-. با کەسیشتان مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لەسەر مامەڵەی کەسیترتان نەکات، نەکەن نرخ لەسەر یەکتر زیاد مەکەن. با کەسی شاریش هەموو ئەو شمەکەی بەتایبەتی خواردەمەنی کە هەیەتی نەیفرۆشێ بە دەشتەکی و دوورە دەست و هیچی نەمێنێ بۆ خەڵکی ناوشار)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیدەویست نرخ گران بکرێ، لەبەرئەوە ڕێگیری لە بازرگانان کردووە زوو خۆیان بگەیەننە کاروانەکانی شمەک بەرلەوە خۆیان بێنە ناو شاری مەدینەوە، چونکە مەبەستیان ئەوەیە تا شمەکەکان بکڕن و دواتر بە نرخێکی گران بیفرۆشن، بەم کارەش هەژاران توانایان نابێت لەسەر کڕینی پێویستییەکانیان، ئەو ڕێگیریکردنە کاریگەری باشی هەبوو لەسەر دابەزاندنی نرخی شمەکەکان لە مەدینەدا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەروەها هانی فرۆشیارانی داوە کە ڕێز لەیەکتری بگرن، ئەگەر کەسێکیان شتێکی بە نرخێک فرۆشت ئەوا با کەسێکیتر هەوڵنەدات کڕیار قەناعەت پێبکات کە فرۆشتنەکە هەڵبوەشێنێتەوەو بە نرخێکی کەمتر لەوی بکڕێ، چونکە ئەم کارە دەبێتە هۆی ڕق و کینەو پەرتبوونی کۆمەڵگاو ناسەقامگیری.

## ٢٧١. ئەنگوستیلەی بریسکەدار

ئومامە کچەزای پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە، کە زۆری خۆشویستووە، کاتێک ئەو(ﷺ) نوێژی دەکرد ئەم کچۆڵە بچوکە لێی نزیکدەبوویەوەو لە باوەشیدا دادەنیشت، کاتێکیش بڕۆیشتایەتە سوژدەوە دەچووە سەر پشتی. پێغەمبەریش(ﷺ) توڕە نەدەبوو، بەڵکو درێژەی دەدا بە نوێژەکەی.

پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری دایبابەکانی دەکرد ڕێز لە کچەکانیان بگرن، بە چاوی کەم سەیریان نەکەن. زۆرجار پێی دەفەرموون: ((کچان نەتۆرێنن، چونکە ئەوان مایەی دڵئاسودەیین و بەڕێزو بەهان)).

بە تێپەڕبوونی کات ئومامە گەورە بوو و تەمەنی گەیشتە دە ساڵ، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) لە هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیدا هەروەک لە منداڵیدا چۆن بوو لەگەڵی بە هەمان خۆشەویستی و تێگەیشتن بەردەوامبوو. ئەوەی لە توانایدا بوو بەخەرجی دەدا تا ئاسودەو بەختەوەری بکات. ڕۆژێکیان دیارییەک لە نەجاشی پادشای حەبەشەوە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) هات. ئەویش بریتی بوو لە ئەنگوستیلەیەکی ئاڵتون کە بە نقێمێکی حەبەشی ڕازێنرابوویەوە. ئومامە ئەنگوستیلەکەی بینی، خێرا حەزی لێکرد، نەیتوانی چاوانی لێ کل بکات. چونکە درەوشاوەیی و بریسکەی تیشک لەسەری بەنجی کردبوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانی کە ئومامە زۆر حەزی لە ئەنگوستیلەکەیە. لەبەرئەوە بانگیکرد و دیارییەکەی پێشکەشکرد. کچە بچوکەکەش زۆر دڵخۆشبوو بە دیارییەکەی باوەگەورەی و بە خۆشییەوە وەریگرت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەروەک منداڵی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەموو منداڵاندا دەکرد. جیاوازی نەکردووە لەنێوان کچ و کچەزاکانیدا یان کچانی کەسانیتردا. بەڵکو بەهەمان خۆشەویستی و بەخشندەیی هەڵسوکەوتی لەگەڵ هەمووانـدا دەکرد.

ئومامە زۆر سوپاسی باوەگەورەیی کرد، بۆی دەرکەوت کە باوەگەورەی چەندە بەخشندەیەو خۆشیدەوێ. تا لەژیانـدا بوو پارێزگاری لەو دیارییە کرد.

## ٢٧٢. جوانترین دیاری

هاوەڵان بێ وەڕەس بوون ڕاهاتبوون لەسەر بەرگەگرتنی هەموو سەختی و نارەحەتییەکان لەپێناوی خوادا. کاتێک بە گەشتێکی تولانی و سەخت لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) دەڕۆیشتن، چاویان لەسەر ڕەفتارەکانی بوو، بێ بێزاربوون گوێبیستی گوفتارەکانی بوون، بەو شێوازە دەگەیشتنە کۆتایی گەشتەکەیان بێئەوەی هەست بە ماندوویەتی بکەن.

لە یەکێک لەو گەشتانەدا، کاروانەکەیان بە خاوی و وردە وردە بە بیابانی پان و بەریندا ڕێیدەکرد، هیچ دەنگێک لە کاروانچییانەوە نەدەبیسترا، بەڵکو بێدەنگییەکی تەواو سەراپای کاروانەکەی گرتبووەوە.

جگە لە یەک وشتر ئیتر کەس ئاستی خاوی بەرەوپێشچوونی کاروانەکەی نەشکاند، ئەو وشترە کە گەنجێک لەسەر پشتی بوو پێش کاروانەکە کەوت و پێشی وشترەکانی تری دایەوە، کاروانچییەکان هۆشدارییان بەو گەنجە داو وتیان: (پەلەمەکە، پێش پێغەمبەری خوا مەکەوە!) بەڵام گەنجەکە هەرچەندە هەوڵیدەدا هەر نەیتوانی وشترەکەی وا لێبکات بەگوێی بکات، وشترەکە لە کاتێکدا کە خاوەنەکەی ورياکردنەوەی پێدەدرا هەر بەردەوام دەکەوتە پێش هەموو وشترەکانەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشت کە گەنجەکە ڕووبەڕووی کاتێکی سەخت بووەتەوە لەگەڵ وشترەکەیدا. کاتێ کاروانەکە پشووی حەوانەوەی وەرگرت، پێغەمبەر(ﷺ) لە گەنجەکە نزیککەوتەوەو

پرسیاری لێکرد ئایا ئەو وشترە خێرایە مولکی خۆیەتی یان نا. گەنجەکە وتی: (بەڵێ، ئەی پێغەمبەری خوا)، پێغەمبەر پرسیاری لێکرد ئایا حەزدەکات بیفرۆشێت بەو. گەنجەکە بە خۆشییەوە ڕەزامەندی دەربڕی، وشترەکەی فرۆشت بە پێغەمبەر(ﷺ). دوای ئەوە، پێغەمبەر(ﷺ) لایکردەوە بەلای گەنجەکەداو فەرمووی پێی: ئەم وشترەت بە دیاری دەدەمێ، ئەوکات دەتوانێ چۆنت پێخۆشە وەها سواری ببی و لێیخوڕی.

گەنجەکە سەرسامبوو، توانای قسەکردنی نەما، زۆر سەری سوڕما بەو هەڵسوکەوتەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چونکە بەو کارەی ڕزگاریکرد لە ورپاکردنەوەی لەلایەن کاروانچییەکانەوە، ئەوەش جوانترین دیاری بوو کە لەژیانیدا دەستی کەوتووە.

## ٢٧٣. بەزەییهاتنەوە بە گیانداراندا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەزەیی بە هەموو دروستکراواندا هاتووەتەوە، زماندارو بێ زمان، بە بەردارو بێبەردا چوونیەک، ئامۆژگاری خەڵکی کردووە چاکە بکەن، درەخت و گیانداران و مرۆڤ و هەموو دروستکراوانی تری خۆشویستووە، هەرگیز ئەو وڵاغی سواری و بارهەڵگرانەی بەکاریهێناون ئازاری نەداون و زیاد لە توانایان باری نەخستوونەتە سەر. ئەگەر لە گەشتەکانیدا بەلای لەوەڕگا گشتییەکاندا تێپەڕیبێت وەستاوە تا وڵاغەکان بلەوەڕێن و بحەوێنەوە.



ڕۆژێکیان، تێپەڕی بەلای وشترێکی زۆر لەڕو لاوازدا، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) چاوی پێیکەوت چاوانی وشترەکە پڕبوون لە فرمێسک، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە خاوەنەکەیی فەرموو: ((ئایا لە خوای گەورە ناترسی بەرانبەر بەو بێزمانە کە خوای گەورە پێیداویت. ئەو سکاڵای لای من کرد کە تۆ برسی دەکەیت و سزای دەدەیت)).

ڕۆژێکیان هاوەڵان پرسیاریان لە پێغەمبەری خوا کردو وتیان: (ئەی پێغەمبەری خوا، ئایا لە بێزمانانیشدا پاداشتمان هەیە؟) فەرمووی: ((لە هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕدا پاداشت هەیە)).

پاشان باسی سەرگوزەشتەیەکی بۆ گێڕانەوە کە لە دێرین زەماندا ڕوویداوەو فەرمووی: ((لە کاتێکدا پیاوێ بە ڕێگایەکدا ڕۆیشتووە، تینویەتی زۆری بۆهێناوە، بیرێکی دۆزیوەتەوەو چووەتەناوی، ئاوی لێخواردوەتەوەو هاتووتە دەرەوە، بینیویەتی وا سەگێک هەناسەبڕکێیەتی و لە تینویەتیدا خۆڵ دەخوات، پیاوەکە

وتوویەتی: ئەم سەگە بەڕادەی تینویەتییەکەی من تینویەتی، ئینجا چووەتەوە ناو بیرەکەو تاکە پێڵاوێکی پڕکردووە لە ئاو و بە دەمی گرتوویەتی تا هاتووەتەوە سەرەوە، ئاوەکەی داوە بە سەگەکە، ئینجا سوپاسی خوای گەورەی کردووە، خوا گەورەش لە گوناهەکانی خۆشبووە)).

ئەم سەرگوزەشتەیە کاریگەرییەکی گەورەی لە دەروونی هاوەڵاندا دروستکرد. چونکە بۆیان مەعلوم بوو کە خوای گەورە هیچ کردەوەیەکی چاک بەفیڕۆ نادات، با لە ڕزگارکردنی سەگ یا مێروولەیەکیشدا بێت هەر پاداشتی چاکەکارەکە دەداتەوە. لەوانەیە خوای گەورە بەهۆی کارێکی سادەو ساکارەوە کە بەرانبەر بە ئاژەڵێک کراوە لە گوناهەکان خۆش ببێت. لەبەرئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەمیشە بیری دەخستنەوە کە: ((خوا گەورە ئەگەر چاکەی بۆ خانەوادەیەک بوێت ئەوا بەزەیی و نەرمونیانی دەخاتە دڵیانەوە)).

لەو کاتەوە کە هاوەڵان ئەو فەرموودەیەیان لێبیست ئیتر بەپەرۆشبوون لەسەر بەگوێکردنی، جورئەتیان نەکردووە ئازاری ئاژەڵان و گیانداران بدەن. بەڵکو بە وریاییەکی زیاترەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ گیاندارانادا دەکرد چونکە ئاینەکەیان فەرمانیان پێدەکات.

## ٢٧٤. ناتەوێ هاوڕێکەت چاکەیەکی هەبێت؟!

ئەبو زەڕی غەفاری لە چاکترینی ئەو هاوەڵانە بوو کە بەدرێژایی کاروانی بانگەواز هەر لە مەککەوە لە خزمەت پێغەمبەردا(ﷺ) ژیاوە. بەردەوام پرسیاری لەبارەی چاکەکردنەوە دەکرد تا ئەنجامی بدات و بچێتە بەهەشت. ڕۆژێکیان لە پێغەمبەری(ﷺ) پرسی: ئەی پێغەمبەری خوا ڕێنماییم بکە بۆ کارێک کە ئەگەر کەسێک بیکات پێی دەچێتە بەهەشت.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((باوەڕی بە خوای گەورەو ڕۆژی دوایی هەبێت)).

ئەبو زەڕ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا لەگەڵ باوەڕدا کردار هەیە.

فەرمووی: ((ببەخشێ لەوەی خوای گەورە پێیبەخشیوە)).

ئەبو زەڕ وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر کەسێکی هەژار بوو شتێکی نەبێت ببەخشێ؟

فەرمووی: ((فەرمانبدات بە چاکەو ڕێگیری بکات لە خراپە)).

ئەبو زەڕ وتی: ئەی پێغەمبەری خوا، ئەی ئەگەر نەتوانا بوو نەتوانێت فەرمان بە چاکە بکات و ڕێگیری لە خراپە بکات.

فەرمووی: ((شتێ بۆ داماوێک بکات)).

ئەبو زەڕ وتی: ئەی ئەگەر خۆی داماو بوو نەیتوانی شتێک بکات؟

فەرمووی: (پشتگیری لە ژێردەستەیەک بکات)).

ئەبو زەڕ وتی: ئەی ئەگەر کەسێکی لاواز بوو نەتوانێت هاوکاری ژێردەستە بکات؟

فەرمووی: ((ناتەوێت هاوڕێکەت چاکەیەکی تێدا بێت؟! دەی با ئازاری خەڵکی نەدات)).

ئەبو زەڕ وتی: ئەگەر ئەوە بکات دەچێتە بەهەشت؟

فەرمووی: ((هەر موسڵمانێک یەکێک لەو سیفەتانە ئەنجامبدات ئەوا ئەو چاکەیە دەستی دەگرێت تا دەیباتە بەهەشتەوە)).

## ٢٧٥. شاری خەیبەر و حەوت قەڵاکەی

خەیبەر شارێکی جوان بوو، دەورەدرابوو بە حەوت قەڵای سالارو گەورە، خەیبەر دەکەوێتە باکوری مەدینەی مونەووەرە. دوای ئەوە جووەکانی بەنو قورەیزە ئەو ڕێکەوتنەکەیان شکاند کە لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) واژۆیان کردبوو، واتە لە جەنگی خەندەقدا هاوکاری قورەیشیان کرد، ئیتر لە مەدینە دەرکران و لەو شارە جێگیربوون. پاشان کەوتنە پیلانگێڕی بۆ ڕوخاندنی موسڵمانان. پێغەمبەری خوا(ﷺ) زانی کە بەنو قورەیزە واز لە موسڵمانان ناهێنن، بیری لە ڕێگایەک کردەوە تا پارێززراوبن لە خراپەکارییان، بەو مەبەستە کۆبوونەوەی بە هاوەڵان کرد، بەدرێژی تاوتوێی ئەو مەسەلەیەیان کرد.

دواجار، گەیشتنە بڕیارێک کە موسڵمانان گەمارۆی خەیبەر بدەن، بەو پێیە کەوتنە خۆئامادەکردن، ئینجا ڕۆیشتن بەرەو خەیبەر، لەماوەی سەفەرەکەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەپاڕایەوەو دەیفەرموو: ((پەروەردگارا من پەنات پێدەگرم لە خەم و خەفەت، پەنات پێدەگرم لە پەککەوتەیی و تەمبەڵی، پەنات پێدەگرم لە ترسنۆکی و ڕژدی، پەنات پێدەگرم لە قەرزاری و ستەمی خەڵکی)). سوپای موسڵمانانیش لەدوایەوە دەیانوت: (ئامین).

هاوەڵان بە ئازایەتییەکی بێ وێنە درێژەیاندا بە سەفەرەکەیان، دواجار لە شەوێکدا، چادرەکانیان لەبەردەم شاری خەیبەردا هەڵدا، دوای ئەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو ئەم دوعایەی فەرموو: ((ئەی پەروەردگاری ئاسمانەکان و ئەوەی

لەژێریاندایە، پەروەردگاری زەوی و ئەوەی لەناویدایە، پەروەردگاری شەیتانەکان و ئەوەی لە دەستەڵاتیاندایە، پەروەردگاری ڕەشەباو ئەوەی دەیکات، ئێمە داوای خێرو چاکە بۆ ئەم شارە دەکەین، چاکە بۆ دانیشتوانەکەی و ئەوەش کە تێیدایە، پەنات پێدەگرین لە خراپەکانی و خراپی خەڵکەکەی و ئەوەی کە تێیدایە)). ئای ئەمە چ پێغەمبەرێکی چاکەخوازە! چاکەی بۆ ئەو خەڵکانە دەوێ کە هەوڵیاندا ئازاری بدەن، جگە لە نیەتی خێرو چاکەو نەهێشتنی سەرچاوەی مەترسی نیەتێکی تری نەبوو.

کاتێ جووەکانی خەیبەر بەیانی بەئاگاهاتنەوە سەرسامبوون بە بینینی سوپای موسڵمانان کە بەتەواوەتی گەمارۆی شارەکەیان داوە، ئەوکات هەستیان بە تۆقین و ترسێکی گەورە کرد، لە هەمووڵایەکەوە کەوتنە ڕاکردن تا خۆیان بگەیەننە قەڵا قایمەکانیان، کاتێ گەیشتنە ناویان هەروەک لێزمەی باران کەوتنە تیربارانکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و سوپاکەی.

هەمووان بە بارودۆخێکی زۆر سەخت و نارەحەتدا تێپەڕین، چونکە ئەو شارە جوانە بەهۆی ڕەفتاری جووە ناپاکەکانەوە گۆڕدرا بۆ شارێکی مەترسیدار. ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) و هاوەڵانی داوای یارمەتی و سەرکەوتنیان لە خوای گەورە دەکرد.

## ٢٧٦. ڕزگارکردنی خەیبەر

ئابلۆقەدانی خەیبەر بۆ چەند ڕۆژێک بەردەوامبوو. تیایدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاڵای سوپاکەی دایە دەست چەند هاوەڵێک یەک لەدوای یەک، بەڵام هیچ ئەنجامێک بەدەست نەهات، سەرکردەکانی گۆڕی، ئەمجارەش هەر سەرکەوتن بەدەست نەهات، بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان، شمەک و خواردەمەنی موسڵمانان لە تەواوبووندا بوو، برسێتی و تینویەتی هەڕەشەیان لە سەربازان دەکرد.

ئێوارەی ڕۆژێک، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((سبەینێ ئاڵاکە دەدەمە دەست پیاوێک کە خواو پێغەمبەرەکەیی خۆشدەوێت، خواو پێغەمبەرەکەشی ئەویان خۆشدەوێت)).

خێرا گوفتارەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەنێو سەربازەکاندا بڵاوەیکرد، ئۆقرەیان لێبڕاو چاوەڕوانی بەرەبەیان بوون، دڵیان پڕبوو لە ئومێد، چونکە هەریەکەیان خواو پێغەمبەرەکەییان زیاتر لەخۆی خۆشدەویست. هەریەکەشیان دەیویست خۆی ئەو کەسە بێت پێەمبەر(ﷺ) باسیکردووە. کەوتنە پرسیارکردن ئایا دەبێ ئەو پیاوە کێبێت وا پێغەمبەری خوا ئەوەندە باسی باشەی کرد.

بۆ بەیانی، هەموو سەربازەکان لەبەردەم چادرەکەی پێغەمبەردا(ﷺ) کۆبوونەوە، بەڵام پێغەمبەر ئەو کەسەی بەدینەکرد کە دەیویست، دواجار فەرمووی: (عەلیم بۆ بانگبکەن)). حەزی زانین لای هاوەڵان گەیشتبووە هەموو ئاستێک، بەڵام مەسەلەکە لەو ساتەدا ڕوونبوویەوە. لێیان مەعلوم بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاڵاکە ڕادەستی عەلی دەکات. پێیانوت: (عەلی تووشی چاوئێشە

بووەو چاوەکانی ئازاری دەدەن). بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر داکۆکیکرد لەسەر هێنانی.

هاوەڵان ڕۆیشتن بەدوایدا کاتێ چاویان پێیکەوت عەلی لە حاڵەتێکدا بوو گریانت بۆی دەهات، چاوەکانی ئاوسابوون، نەیدەتوانی بیانکاتەوە، دەستیانگرت و هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێغەمبەر دەستی هێنا بەسەر چاوانی عەلیدا و دۆعای چاکبوونەوەی بۆکرد. لە کتوپڕدا ئاوسانەکە نەماو ئێش و ئازاریان وەستا، گەڕایەوە سەر باری سروشتی خۆی. موسڵمانان زۆریان پێخۆشبوو، مژدەی باشیان پێبرد، ئایا ڕزگارکردنی خەیبەر لەسەر دەستی عەلیدا جێبەجێ دەبێت؟

لەو ڕۆژەدا، لەژێر فەرماندەیی عەلیدا، موسڵمانان توانیان خەیبەر ڕزگاربکەن. جووەکانیش هەموو شتێکی بەنرخ و کەلوپەلێکیان بۆ موسڵمانان جێهێشت و بە ملشکاوی هەڵاتن. ئەو چەرمەسەری و نارەحەتییە لە برسێتی و تینویەتی کە موسڵمانانی تەواو ماندووکردبوو کۆتاییهات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە هاوەڵاندا هەڵسوکەوتیان لەگەڵ منداڵان و ئافرەتان و پیرو نەخۆش و پەککەوتەکان باش و جوان بێت، ئەوانیش دەقاودەق ڕێنماییەکانیان جێبەجێ کرد. زانیان ئەو سەرکەوتنەی بەدەستیان هێنا بەهۆی بەهێزی باوەڕەکەیان بووە.

## ٢٧٧. تەڵەی ئافرەتێکی جولەکە

دوای جەنگی خەیبەر سوپای موسڵمانان حەوانەوەیەکی وەرگرت. بەڕاستی شەڕەکە بە هیچ جۆر ئاسان نەبوو، لەو کاتەدا، ئافرەتێکی جولەکە هات کە سینییەکی گەورەی پڕ لە خواردنی هەڵگرتبوو. بانگی پێغەمبەری(ﷺ) کردو وتی: (ئەم خوادنەم بە دیاری بۆ تۆ هێناوە).

لەڕاستیدا، نیەتی ئافرەتەکە پێشکەشکردنی دیاری نەبوو، بەڵکو کوشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو، کە هەستابوو بە برژاندنی بڕێ گۆشت و زەهری پژاندبوو بەسەریدا.

پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵان وەک خۆ حازرکردنێ بۆ خواردنی لەسەر خواردنەکە کۆبوونەوە، پێغەمبەر(ﷺ) پاروویەکی خستە دەمی، بەڵام بەرلەوە قوتی بدات تفییەوە، ئینجا خێرا بە هاوەڵانی فەرموو: ((دەستهەڵگرن، ئەم دەستە پێمدەڵێ زەهراوییە)). هاوەڵان بەلایانەوە سەیربوو، بە شپرزییەوە سەیری یەکتریان دەکرد.

خێرا دەستیان لە خواردنەکە هەڵگرت. بەڵام یەکێک لە هاوەڵان پاروویەکی خواردبوو و قوتی دابوو. زەهرەکە ئەوەندە کاریگەری بەهێز بوو هەرلەوێدا مرد، ئینجا هاوەڵان کەوتنە پرسیارکردن لەبارەی ناسنامەی بکەرو پاڵنەرەکانی.

پێغەمبەر(ﷺ) داوای هێنانی ئەو ئافرەتەی کرد خواردنەکەی هێنابوو، ئینجا پرسیاری لێکرد: ((چی وایلێکردی ئەوە بکەیت؟)) ئافرەتەکە وەڵامیدایەوە کە: (ئەگەر تۆ پێغەمبەر بیت ئەوا زەهر زیانت پێناگەیەنێ، ئەگەر پادشایش بیت ئەوا ڕزگارمان دەبێت لێت).

خوای گەورە ئەمجارەش بەمجۆرە پێغەمبەرەکەیی پاراست، ڕێگای نەدا تووشی زەحمەت ببێت.

## ٢٧٨. موعجیزەی تێرئاوکردنی سوپایەکی مەزن

سوپای موسڵمانان خەیبەریان جێهێشت و لە ڕێگایەکی تولانییەوە کە دەگمەن بوو ئاوی تێدا بێت گەڕانەوە بەرەوە مەدینە، لە نیوەڕۆی ڕۆژی دواتردا گەرمایی خۆر گەیشتبووە ئەوپەڕی، سەربازان دەیانوت: ئەی پێغەمبەری خوا! فەوتاین! تینوومانە! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: (نافەوتێن)). پاشان داوای جامە بچوکەکەی خۆی کرد، ئینجا بانگی ئەبو قەتادەی کردو داوای ئەو دەفرەیی لێکرد کە کەمێ ئاوی تێدابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاوەکەی بە جامەکەی خۆی دادەکردو ئەبو قەتادەش ئاوی بە سوپاکە دەدا. کاتێ سەربازان بینیان ئاو لە دەفرەکەدایە کەڵەکەیان کرد لەسەری، پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((جوان ڕیزبگرن، هەمووتان تێرئاو دەکات)) . هاوەڵان خۆیان ڕێکخست. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ئاوی دادەکردو ئەبو قەتادەش دەیدا پێیان، هەموویان تێرئاو بوون جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) و ئەبو قەتادە کە نەیانخواردبووەوە، ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) ئاوی داکردو بە ئەبو قەتادەی فەرموو: (بخۆرەوە)). ئەبو قەتادە وتی تا تۆ ئەی پێغەمبەری خوا نەخۆیتەوە من ناخۆمەوە!. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئاوگێڕی قەوم دوایەمین دەخواتەوە)). ئەبو قەتادە خواردییەوە، پاشان پێغەمبەریش(ﷺ) خواردییەوە، هەموو سوپاکەش تێرئاو بوو.

## ٢٧٩. دەستکەوتەکانی ساڵێک

موسڵمانان زۆر تامەزرۆ و بێتاقەتی مەککە بوون، پێشتر بێباوەڕان ڕێگایان نەدا بچنەناوی، بەڵکو وایان لێکردن چەندەها ڕۆژ لە حودەیبیە لە چاوەڕوانیدا بوون، دواجار، ئەوەبوو کە هەردوولا گەیشتنە ڕێکەوتن، ئەو ڕێکەوتننامەیە ڕێگیری لە موسڵمانان کرد کە تا ساڵێکی تر نابێت بچنەناو مەککەوە، کاتێکیش کە دێنە سەردانی مەککە دەبێت بێچەک بێن و سێ ڕۆژ زیاتر تیایدا نەمێننەوە.

لەماوەی چاوەڕوانی ئەو ساڵەدا، موسڵمانان دەستکەوتی گەورەیان بەدەستهێنا، لە سایەی ئاشتییەوە گرژی کەمبوویەوە، داوا لە سەرۆکەکانی جیهان کرا باوەڕ بە ئیسلام بێنن، هەروەها موسڵمانان خەیبەریان ڕزگارکرد، سنورێکیان بۆ فێڵ و تەڵەکەکانی جولەکە دانا، توانای سەربازیان بەهێزتر بوو، ورەیان بەرزتر بوویەوە.

وا کاتی عومرەکەیان نزیکبووەتەوە کە چاوەڕوانیان بۆی زۆری خایاند، ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لە هاوەڵان کرد خۆیان ئامادە بکەن، ئەوانیش ئامادەباشی بۆ سەفەری تولانییان وەرگرت، لەخۆشیدا دڵیان سەمای دەکرد. بەم نزیکانە دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان. حەوت ساڵی ڕەبەق تێپەڕیوە بەسەر دەرچوونیان لەو شارە، وا ئێستە لەدوای پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیانەوە(ﷺ) دەکشێن بەرەو گردۆڵکەکانی مەککە.

## ٢٨٠. ڕەوشتجوانیی پێغەمبەر(ﷺ)

هاوەڵگەران کە دڵیان پڕبوو لە ڕق و کینەو ئیرەیی، چوونەسەر گردۆڵکەکانی مەککە، کەوتنە چاودێریکردنی موسڵمانان کە بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا تەوافیان دەکرد، لەناو خۆیاندا چپەچپیان بوو: (سەیرە! نە کۆچ و نە جەنگ لاوازی نەکردوون، بڕوانن بزانن چەندە بەختەوەرن، چەندە بەتوانا دەبینرێن).

لەبەرانبەرەوە، موسڵمانان لەزەتیان برد لە بینینی کەعبەی پیرۆز سەرلەنوێ، ئەوان زۆر شەیدای بینینی بوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ ماوەیەکی زۆر چاوی بڕییە بەیتولحەرام، حەزی بە نوێژکردن بوو تیایدا، داوای لە بیلال کرد بڕواتە سەربانی کەعبەو بانگبدات.

بیلال فەرمانەکەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بەجێگەیاند، بە دەنگە بڵندەکەی کەوتە بانگدان، بانگ بە مەککەو دەوروبەریدا دەنگی دەدایەوە. عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل وتی: (سوپاس بۆ خوا باوکم نەژیا تا ئەمڕۆ ئەمە ببینێ). موسڵمانان لەماوەی سێ ڕۆژی مانەوەیان لە مەککە لەزەتی گەورەیان برد. ئێستە ئیتر بەپێی ڕێکەوتننامەکە کاتی ئەوە هاتووە جێیبێڵن.

بێباوەڕان لەوە دەترسان موسڵمانان لە مەککە جێگیرببن و نەگەڕێنەوە بۆ مەدینە، هەربۆیە دوو کەسیان ناردە لایان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە چادرێکدا کە یەکێک لە هاوەڵان بۆی هەڵدابوو دانیشتبوو، کاتێک دوو پیاوەکەی قورەیش هاتنە خزمەتی وتیان ئەو ماوەیە کە درابوو بە موسڵمانان تەواو بوو، دەبێت هەر ئێستە مەککە جێبێڵن. ئەم هەڵسوکەوتەیان هاوەڵانی بێتاقەت کرد،

چونکە ئەوان خۆیان حازرکردبوو بڕۆن. سەعد وەڵامیدانەوە کە ئەم خاکە مولکی تەنها ئێوە نیە، پێغەمبەری خوایش(ﷺ) ڕێز لە ڕێکەوتننامەکان دەگرێت و بەپێی ڕێکەوتنەکە دەڕوات.

ئەوکات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کرد، پاشان سەیرێکی سەعدی کرد، داوای لێکرد بە کەم سەیری میوانەکان نەکات، لەڕاستیدا، ئامانجی دوو پیاوەکە سەردانەکە نەبوو، بەڵکو بۆ بێتاقەتکردن و بێزارکردنی پێغەمبەر(ﷺ) هاتبوون، خۆیشی ئەوەی دەزانی. بەڵام بەجۆرێ هەڵسوکەوتی لەگەڵکردن وەک بڵێی نیەتیانی نەزانیوە، بە خۆشی و خۆشەویستی و ڕێزو برایەتییەوە مامەڵەی لەگەڵکردن، لەبەردەم ئەم هەڵسوکەوتەدا دوو پیاوەکە نەیاندەزانی چۆن بجوڵێنەوە.

دوو بێباوەڕەکە کاتێ کە پێغەمبەریان بینی بە ئەدەب و بە ڕێزەوە هەڵسوکەتیان لەگەڵدا دەکات، بێدەنگێ لە چادرەکە چوونەدەرەوە، ئەوەشیان زانی کە موسڵمانان هەر لە بنەڕەتدا خۆیان ئامادەکردووە بۆ گەڕانەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە.

## ٢٨١. دڵخۆشبوونی ئومامە

کاتێ موسڵمانان ئامادەکاریی گەڕانەوەیان بۆ مەدینەی مونەووەرە تەواوکرد. بەهۆی جیابوونەوەیان لە کەعبەی پیرۆز دڵیان خەمباربوو، کەوتنە جوڵەو هەروەک چۆن هاتن هەروا بەدەم سبحان الله و الحمد لله وە گەڕانەوە.

لە سەرتای ڕێگای گەڕانەوەیاندا گوێبیستی کچۆڵەیەک بوون کە بەدوایاندا دەرۆیشت و بانگی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەکردو دەیوت: (مامە، مامە) ئەو کچەش ئومامەی کچی حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ) بوو کە لە غەزای ئوحود شەهید بوو، ئەو لە مەککە دەژیا، کاتێ بیستی پێغەمبەری خوا هاتووە بۆ مەککە ویستی لەگەڵیدا بڕوات بۆ مەدینەی مونەووەرە، ئەو ئیتر ناتوانێت لەگەڵ هاوەڵگەرانی مەککەدا ژیان بەسەربەرێ.

کچە بچوکەکە پێغەمبەری خوای(ﷺ) ئاگادارکرد کە حەزدەکات هەڵیبگرێ و بیخاتە سەر پشتی وشترەکەی. موسڵمانان لەگەڵ ئومامە بەردەوامبوون لە سەفەریاندا بەرەو مەدینەی مونەووەرە. کاتێ گەیشتنە مەدینە، خزمانی کچەکە زۆر دڵخۆشبوون بە بینینی، هەریەکەیان پێیخۆشبوو کە ئومامە لە ماڵی ئەواندا بێت.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەموویانی هێورکردنەوە، پێیوتن دەبێت ئومامە لە ماڵی جەعفەر بێت چونکە مێردی پوریەتی لە دایکەوە. فەرمووی: ((پور لە جێگای دایکە)). جەعفەریش زۆری پێخۆشبوو.

## ٢٨٢. بەهاری ئیسلام

هەموو ڕۆژە سەخت و تاریکەکان بوونە بەشێک لە ڕابردوو. ئیسلام وەها دەبینرا وەک بڵێی لە بەهاری خۆیدایە. لەو ماوەیەدا، خەڵکی لە شوێنە دوورەکانەوە بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام دەهاتنە مەدینەی مونەووەرە.

لەنێو ئەو خەڵکەدا کە ڕووناکی ئیسلام کەمەندکێشی کردن چەند کەسایەتییەکی مەککە بوون، یەکێک لەوان سەرکردەی سوپای بێباوەڕان خالیدی کوڕی وەلید بوو. کە لە جەنگی ئوحودا پلانە فێڵبازانەکەی زیانی زۆری بە موسڵمانان گەیاند، دواتر زۆر زۆر پەشیمان بوو لەو کارەی، ئێستەش وا باوەڕی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێناوەو نکولی لە پێغەمبەرایەتییەکەی ناکات. ئینجا ڕۆیشت بەرەو مەدینە تا باوەڕ بێنێ.

لە ڕێگادا، چاوی بە دوژمنێکی پێغەمبەر(ﷺ) عەمری کوڕی عاص کەوت، ئەمەشی بەلاوە سەیر بوو چونکە پێشبینی نەکراو بوو. عەمر پرسیاری لێکرد: (ئەبو سولەیمان بۆ کوێ؟)، خالید بێئەوەی لە هیچ بترسێ وتی: (سوێند بەخوا ڕێگاو ڕێبازەکە ڕاستە، ئەو پیاوە پێغەمبەرە، بەخوا موسڵمان دەبم، ئەی ئێتر تاکەی؟).

خالید وای بۆدەچوو کە عەمر تورە دەبێت بەڵام سەرسامبوو لەوە کە ئەویش قسەکانی خالیدی پێخۆشبوو و وتی: (دەی بەخوا منیش هەر بۆ ئەوە هاتووم موسڵمان ببم). خالید ئەوەی کە گوێبیستی بوو بڕوای پێنەکرد، ئایا ئەمە هەڵوێستی عەمری کوڕی عاصە، کە لە ڕابردوودا وتبووی ئەگەر تەواوی جیهان موسڵمان

بێ من هەرگیز موسڵمان نابم؟ عەمر چەندەها پیلان و پلانی دانا تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناوببات. کەچی وا ئێستە دەگۆڕدرێ بۆ پیاوێکی دڵنەرم، ئامادەی موسڵمانبوونە. بەمشێوەیە هەردوو هاوڕێ بە ڕەزامەندییەوە ڕۆیشتن بەرەو شاری مەدینە.

کاتێ گەیشتنەجێ، پێغەمبەریان(ﷺ) ئاگادارکرد کە دەیانەوێ باوەڕ بە ئیسلام بێنن. ئەویش پێشوازی لێکردن و هەڵسوکەوتی جوانی نواند لەگەڵیاندا، پیرۆزبایی لێکردن لەسەر ئەوە کە ڕێبازی ڕاستییان هەڵبژاردووە.

موسڵمانان بەم ڕووداوە زۆر دڵخۆشبوون. کاتێ خالیدی کوڕی وەلید شایەتومانی هێنا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێی دەمێکە چاوەڕوانی ئەم ڕۆژە دەکەم.

خالید هەستی بە دڵئارامیی کرد کە هاتە ڕیزی موسڵمانانەوە، بەم پێیە سوپای ئیسلام یەکێک لە سەربازە هەرە بەهێزەکانی دەستکەوت. جا بۆئەوەی ئەو هەڵانەی لە ڕابردوودا بەرانبەر بە موسڵمانان ئەنجامیداون بشواتەوە ئەوا هەموو توانای دەخاتەگەڕ لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاڵای ئیسلام.

## ٢٨٣. پێغەمبەری خۆشەویستیی و بەزەیی

دووان لە گەورەکانی قورەیش لەبەردەم پێغەمبەری خۆشەویستماندا(ﷺ) وەستان. خالیدی کوڕی وەلید شایەتومانی هێناو باوەڕی بە ئیسلام کرد. سەرە هاتە سەر عەمری کوڕی عاص، عەمر لە زۆری خەجاڵەتی خۆیدا نەیدەتوانی چاوی لە زەوی هەڵبگرێ. چونکە هەوڵێکی زۆریدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بکوژێ. لەوپێناوەشدا هاوکاری زۆری بێباوەڕانی کرد. وا ئێستە پەشیمانە لە هەموو ئەو هەڵانەی ڕابردووی. لەبەرخۆیەوە دەیوت: (خۆزگایە ئەوەو ئەوەم نەکردایە).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی نەبوو هیچ کەس بەهۆی هەڵەکانییەوە سەغڵەت بکات، یان سەرزەنشتی بکات. بانگی عەمری کردو فەرمووی: ((ئەی عەمر بەیعەت بدە، چونکە ئیسلام هەر کردەوەیەکی پێش خۆی دەسڕێتەوە، کۆچیش ئەوەی پێش خۆی لادەبات)). عەمر کاتێ ئەوەی بیست دڵی حەوایەوە، بیریکردەوە کە خوای گەورە چەندە لێخۆشبوو و بەبەزەییە. هەروەها لێبوردن و تێگەیشتوویی پێغەمبەری خوا(ﷺ) چوو بەدڵیدا. ئینجا بێئەوەی کاتی زیاتر بکوژێت باوەڕی بە ئیسلام هێنا.

عەمری کوڕی عاص وەک کەسێکی تینوو وابوو کە بەدوای ئاودا بگەڕێ، وا ئێستە خواستەکەی خۆی دۆزیوەتەوە. لە ئیسلام هەڵدەگۆزێ تا تێر دەبێت، ئەوەی لە توانایدایە هەوڵدەدات بۆ سەرخستنی خواو پێغەمبەرەکەی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بووە خۆشەویستترین کەس لەسەر دڵی عەمر، چاوانی تێر نەدەبوون

لە سەیرکردنی. سەرسامبوونی پێی بە تێپەڕبوونی کات تادەهات زیاتر دەبوو، پێغەمبەریش بەوپەڕی خۆشەویستی و لێبوردەییەوە باوەشی بۆگرتەوە. عەمریش گەنجینەی پڕبەهای ئیسلامی دۆزییەوە کە تەواوبوونی نیە.

## ٢٨٤. سەرکردەی بەجەرگ

دوای ئاشتەوایی حودەیبیبیە، پێغەمبەر(ﷺ) نێردراوی نارد بۆ هەموو جیهان تا بانگی سەرۆکانی ئەو وڵاتانە بکەن بۆ سەر ئیسلام. حارس یەکێک بوو لەو نێردراوانە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نامەیەکی پێدا نارد بۆ شورەحبیل فەرمانڕەوای بوصرا، شورەحبیل کەسێکی گاور بوو، کاتێ نامەکەی پێغەمبەری(ﷺ) پێگەیشت زۆر زۆر تووڕە بوو، بێبەزەییانە حارسی کوشت.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو هەواڵەی بیست زۆر غەمبار بوو، چونکە پێشتر ڕووینەدابوو دەوڵەتێک نێردراو بکوژێ، با ئەو کەسەش دوژمن بێت. موسڵمانان بەو چاوە سەیری ئەم ڕووداوەیان کرد کە سوکایەتییەکی گەورەو هەڕەشەیەکی ئاشکرایە بۆ سەر موسڵمانان.

لەبەردەم ئەو هەڵسوکەوتە قێزەونەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانیدا بە ڕێکخستنی سوپایەک بە سەرکردایەتی زەیدی کوڕی حاریسە. پاشان زەیدی ڕاسپارد بە سوپاکەیەوە بڕوات بەرەو (مۆتە) کە حارسی تێدا کوژرا، ئینجا بانگهێشتکردنی شورەحبیل و گەلەکەی کە باوەڕ بە ئیسلام بێنن. جا ئەگەر ڕەتیانکردەوە ئەوا بابزانن سوپای موسڵمانان بەهۆی کوشتنی نێردراوەکەوە لەدژیان دەجەنگێ. بەرلەوە موسڵمانان بڕۆن بۆ ئەو هێرشە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتاری بۆ سوپاکەداو فەرمووی: ((بەناوی خواوە بجەنگن، بجەنگن لەپێناوی خوادا، بجەنگن لەدژی هەرکەسێ باوەڕی بە خوای گەورە نیە، پەیمانشکێن نەبن، زیادەڕۆیی مەکەن،

جەستەی کوژراو نەشێوێنن، منداڵ مەکوژن)) هاوەڵان بەوردی گوێیان ڕادێرا بۆ ڕێنماییەکانی پێغەمبەر(ﷺ) کە بەردەوامبوو لە وتارەکەیداو فەرمووی: ((ئەگەر زەید کوژرا ئەوا جەعفەر دەبێتە سەرکردە، ئەگەر جەعفەریش کوژرا ئەوا عەبدوالله کوڕی ڕەواحە سەرکردەیە)). کاتێ هەموو ئامادەکارییەکان تەواوبوون، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خواحافیزی لە سوپاکەی کردو دۆعای سەرکەوتنی بۆ خواستن، موسڵمانان لەسەر تەقەی سمی ئەسپەکان کەوتنەڕێ، لە کاتێکدا کە دڵیان پڕبوو لە ئومێدی سەرکەوتن، هەر زیکری خوای گەورە لەسەر زمانیان جیانەدەبوویەوە. ئا لەو کاتەدا شورەحبیل هەواڵی بیست کە موسڵمانان هێرشدەکەنە سەریان، داوای یارمەتی لە پادشای ڕۆم کرد.

کاتێ موسڵمانان گەیشتنە موئتە، زانیان کە سوپایەکی دووسەد هەزار سەربازی لەبەردەمیاندایە، ئەمە لە کاتێکدا کە سوپای موسڵمانان لە سێ هەزار سەرباز تێپەڕی نەکردبوو، بەڵام ئەم سوپا بچوکە توانی ئازایانە بەرەنگاری دوژمن ببێتەوە، هێزی خۆی لە باوەڕە گەورەو پتەوەکەیەوە وەرگرت، چونکە موسڵمانان نەدەترسان لە شەهیدبوون لەپێناوی خوای گەورەدا. زەید ئاڵایەکی سپی گرت بەدەستییەوە، هێشتا شەڕ دەستی پێنەکردبوو.

دەنگ و زرەنگەی شمشێرەکان تێکەڵ بە حیلە حیلی ئەسپەکان بوو، لە کاتێکدا موسڵمانان بەوپەڕی ئازایەتی لە موئتە دەجەنگان، خوای گەورە پێغەمبەرەکەیی ئاگادارکرد بەوەی کە لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا ڕوویدەدا، پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوەی کە ڕوویدەدا بۆ هاوەڵانی دەیگێڕایەوە، فەرمووی: ((زەید ئاڵاکەی وەرگرت و شەهیدبوو، پاشان جەعفەر وەریگرت و ئەویش شەهیدبوو، پاشا عەبدوالله کوڕی ڕەواحە وەریگرت و شەهیدبوو)). فرمێسکەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەر ڕوومەتیدا دەهاتنە خوارەوە بەڵام هەر

درێژەیدا بە باسەکەو فەرمووی: ((تا شمشێرێک لە شمشێرەکانی خوای گەورە وەریگرت و خوای گەورە سەرکەتنی پێبەخشین)).
پێغەمبەری خوا(ﷺ) مەبەستی خالیدی کوڕی وەلید بوو کە سەرکردەیەکی نەبەردو بەجەرگ بوو! ماوەیەکی کەمیش بوو هاتبووە ناو ئیسلام، بەڵام بەهۆی ڕاستگۆیی باوەڕەکەی ئامادەبوو ژیانی خۆی بکاتە قوربانی ئاینەکەی.

## ٢٨٥. ٢٠٠٠ سەرباز بە شکستخواردوی هەڵدێن

لە موئتە جەنگێکی توندو سەخت ڕوویدا، موسڵمانان تیایدا بە ئازایەتی و نەبەردی دژ بە سوپایەکی زەبەلاح دەجەنگان. دوای ئەوە هەر سێ سەرکردەکەیان یەک لەدوای یەک شەهیدبوون، ئاڵاکە درایە دەست خالیدی کوڕی وەلید. خالید بە سواری ئەسپەکەی بە خێرایی ڕوویکردە دوژمن، کاتێک موسڵمانان هێرشە دلێرەکەییان بینی ئەوانیش چوون بەدوایدا. ترس و بیم بەنێو ڕیزەکانی سوپای دوژمندا بڵاوبوویەوە. دوژمن کاتێکی زانی، سەربازەکانی یەک بەدوای یەکدا تەختی زەوی دەبن. لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا، هەردوولا ماندووبوون، بڕیاردرا حەوانەوەیەک وەربگرن، بەڵام پێڵوی چاوانی خالید نەنیشتن، بەدرێژایی شەو لە بیرکردنەوەدا بوو، هات پلانێکی نوێی دارشت. بۆ ڕاپەڕاندنی پلانە نوێیەکە سەربازەکانی پێش بەرەبەیان ئامادەکرد بۆ شەڕ، خالید چووە لای سەربازەکانی و جێگاکەیانی گۆڕی، پێشەوەی سوپاکەی بردە دواوە، لای ڕاستی برد بۆ لای چەپ، بەپێچەوانەشەوە، هەروەها پۆشاکی سەربازەکانی گۆڕی. کاتێک خۆرهەڵهات دوژمنان سەرسامبوون، باوەڕیان وابوو کە ڕووبەڕووی سوپایەکی نوێ دەبنەوە، لەنێو خۆیاندا کەوتنە چپەچپ: (ئەوا یارمەتیان بۆ هات). بەمەش تووشی تۆقین بوون. وورەی دوژمن داڕوخا ئەویش کاتێک وایانزانی کە سەربای نوێ شەو گەیشتوونەتە سەریان و چوونەتە ڕیزی موسڵمانانەوە. لەبەرئەوە کاتێک موسڵمانان بە ئازایەتییەکی بێ وێنە هێرشیان کردە سەریان ئەوان پاشەوپاش هەڵاتن و ڕایانکرد، سوپا زەبەلاحەکەی

ڕۆم لەبەردەم باوەڕی پتەوی موسڵمانان و خۆڕاگریاندا ڕوخا، جا بۆئەوەی خالید ورەی سوپاکەی بەرزبکاتەوە، خۆی لەپێشەوەی شەڕەکە دەجەنگا. لە ماوەی شەڕەکەدا نۆ شمشێر بەدەستییەوە شکان، سوپایەکی دووسەد هەزار کەسی لەبەردەم سوپایەکی سێ هەزار کەسیدا تێکشکا.

شەڕەکە دوژمنی سەرسامکرد، لە کاتێکدا کە سوپای ڕۆم بە ترسەوە کەوتە پاشەکشە، خالید هەستا بە کۆکردنەوەی سەربازەکانی و گەڕانەوە بۆ مەدینە.

## ٢٨٦. شادبوونی بێباوکان

دەنگوباسی سەرکەوتنی موسڵمانان لە شەقامەکانی مەدینەی مونەووەرەدا کەوتە سەر زمانی خەڵکی، موسڵمانان زۆر خۆشحاڵبوون، هەربۆیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕیاریدا لە دەرەوەی مەدینە پێشوازی لە سوپای گەڕاوە لە گۆڕەپانی جەنگ بکات، خەڵکانێکی زۆر لە موسڵمانان یاوەری بوون.

منداڵانیش بە دەوری خۆیان بۆ بەشداریکردن لەو ئاهەنگەدا کۆبوونەوە، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەیدەویست ماندویان بکات، لەبەرئەوە سواری ئەسپ و وشترەکانی کردن، کچە بچوکەکەی زەیدیش کە باوکی لە جەنگەکەدا شەهید بووبوو هات، پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە بۆی ڕوانی، کچەکە بۆ باوکی دەگریا کە لە جەنگەکەدا لەدەستیداوە، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) بینی کە دەگری، فرمێسک لە چاوانی پیرۆزی هاتنەخوار، ئینجا دەستیکرد بە دڵدانەوەو سوککردنی بارە قورسەکەی سەرشانی، تا دواجار ژێربوویەوە. هەروەها لەو شوێنەدا کوڕەکەی جەعفەری بینی، ئەو جەعفەرە کە دووەم سەرکردەی سوپاکە بوو و شەهیدبوو، پێغەمبەر(ﷺ) کردییە باوەش و سواری وشترەکەی خۆی کرد ئینجا بەڕێگادا بەرەو مەدینە گەڕایەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرەخۆشی لێدەکردو دڵیدەدایەوەو پێیوت کە باوکی دوو باڵی پێبەخشراوەو لە بەهەشتدا پێیان دەفڕێ، بەوهۆیەوە ئەم هاوەڵە نازناوی (جەعفەری باڵفڕ-جعفر الطیار)ی وەرگرت، ئەم قسەیە کەمێ

کوڕەکەی دڵخۆشکرد، کەوتە بیرکردنەوە لە باوکی لە بەهەشتداو بەوە سەرەخۆشی لەخۆی دەکرد.

موسڵمانان بە خۆشییەکی زۆرەوە پێشوازییان لە سوپاکەیان کرد و پیرۆزبایی سەرکەوتنیان بەسەر ڕۆمدا لێکرد. خۆشی و شادی خالیدی کوڕی وەلیدیش وەسفناکرێ چونکە توانی سەرکەوتنێک بۆ ئیسلام دەستەبەر بکات.

## ٢٨٧. ئامادەکاریی گەورە

هەشت ساڵی ڕەبەق بەسەر کۆچکردنی موسڵمانان لە شاری مەککە تێپەڕبوو، لەو ماوەیەدا موسڵمانان بوونە خاوەنی هێزێکی گەورە، ڕێکەوتننامەیان لەگەڵ قورەیش مۆرکرد، ئەو جووانەیان تێکشکاند کە پیلانی لەناوبردنیان دادەڕشت بۆیان، بانگهێشتی سەرۆکەکانی جیهان کرا بۆ باوەڕهێنان بە ئیسلام، خەڵکانێکی زۆر لە شوێنانی دوورەوە هاتن بۆ ناو ئاینی نوێ، هەروەها سوپای ڕۆم تێکشکێنرا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) و موسڵمانان دڵخۆشبوون بەو دەستکەوتانە، بەڵام وێڕای ئەوە هەر چەردەیەک خەفەت لەسەر دڵیان هەبوو ئەویش ئەوەبوو کە هەرکات بیانەوێ ناتوانن تەوافی کەعبەی پیرۆز بکەن. ئەم مەسەلەیە ئارامی لێبڕیبوون. چونکە کەعبە هەر لە سەردەمی ئادەم پێغەمبەرەوە(ﷺ) یەکەمین ماڵە بۆ پەرستنی خوای گەورە، بەڵام وا ئێستا بەدەست بێباوەڕانەوەیە کە لەجیاتی ئەوە خوای گەورەی تێدا بپەرستن هاتوون ناو و دەوروبەریان کردووەتە بتخانە، ئەو بتە کەڕو کوێرو بێگیانانەیان دەپەرست تیایدا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بیریکردەوە کە کەعبە شایانی تەنها ئەوەیە لەلایەن خەڵکانی باوەڕدارەوە خوای گەورەی تێدا بپەرسترێ، نەک بێباوەڕان بتی تێدا دابنێن. حەزیدەکرد ئەو شوێنە لە بت و خراپەکارییەکان پاکبکاتەوە. بەڵام ئەوەش مەسەلەیەکی هەروا ئاسان نەبوو. چونکە قورەیش ڕێگای بە کەس نەدەدا نزیکبێتەوە لە کەعبە. موسڵمانانیش ئەگەر نەیەن مەککەی پیرۆز ڕزگاربکەن ئەوا ناتوانن ئەو بارودۆخەی کەعبەی پیرۆزی تێدایە بیگۆڕن. چونکە بەهاتنیان بتەکان دەشکێنن و دەتوانن بە ئازادییەکی تەواوەوە خوای گەورە بپەرستن. ئێستەش، موسڵمانان ئەوەندە بەهێز بوون بتوانن ئەو

مەسەلەیە جێبەجێ بکەن، چونکە بوونەتە خاوەنی سوپایەکی زۆر بەهێز، بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) حەزینەدەکرد ئەو ڕێکەوتننامەیە بشکێنێ کە لەگەڵ قورەیش مۆری کردووە.

لە کاتێکدا کە موسڵمانان ڕێزی تەواویان لە هەموو خاڵەکانی ڕێکەوتننامەی ئاشتی دەگرت، ڕۆژێکیان چەند بێباوەڕێک کەوتنە ئازاردانی چەند هاوەڵێک، ئەمەش لەکاتێکدا کە بەڵێنیان دابوو لەماوەی دە ساڵی ئایندەدا ئازار بە هیچ کەس نەگەیەنن، بەڵام بەو هەڵسوکەوتە دوژمنکارانەیان کە خوێنی موسڵمانانیان ڕشت ڕێکەوتننامەکەیان شکاند. کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو مەسەلەیەی زانی زۆر غەمبار بوو، خێرا نامەیەکی بۆ قورەیش نارد، ئاگاداریکردن ئەوان بەم کارە خراپەیان ئەو ڕێکەوتننامەیەیان شکاندووە کە لە حودەیبیە بەستراوە، جا ئەگەر بەردەوامبن لەسەر ئەو ڕەفتارەیان ئەوا موسڵمانان ناچار دەکەن لەدژیان بجەنگن.

کاتێ بێباوەڕان ئەوەیان بیست ترسیان لێنیشت، زۆربەیان دەیانزانی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر حەقە، بەڵام کەسایەتییەکانی مەککە هەر بەردەوامبوون لەسەر لوتبەرزیان، وتیان ئامادەن شەڕبکەن. ئیتر پێغەمبەر(ﷺ) بڕیاری خۆیدا کە دەڕوات بەرەو مەککە، بەڕاستی کاتی ئەوە هاتووە وانەیەک بە قورەیش بدرێ هەرگیز لەبیری نەچێتەوە. بەو مەبەستە داوای لە هاوەڵان کرد زوو بەزوو ئامادەسازی بکەن. بەڵام نەیفەرموو پێیان کە بەرەو کوێ دەڕۆن. ئەوەش وەک ویستێکی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) کە نایەوێت خوێن بڕژێ. دەیویست لەناکاودا هەڵکوتێتە سەر قورەیش تا کاتی ئەوەیان بەدەستەوە نەمێنێ خۆیان بۆ شەڕ ئامادە بکەن و خوێنێکی زۆر بڕژێ.

موسڵمانان لە ماوەیەکی کەمدا ئامادەکارییان تەواوکرد. پێغەمبەری خوا(ﷺ) توانی سوپایەکی دە هەزار کەسی کۆبکاتەوە. موسڵمانان لە هەموولایەکەوە هاتن و چوونە ڕیزی سوپاکەوە، کێ دەزانێ. بەڵکو بەم نزیکانە کەعبە ڕووناکی تێبکەوێتەوە.

## ٢٨٨. سوپایەک لە ١٠٠٠٠ جەنگاوەر

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سوپایەکەوە کە پێکهاتبوو لە دە هەزار جەنگاوەر ڕۆیشت بەرەو مەککەی پیرۆز. کەشوهەوا زۆر گەرم بوو. بەڵام موسڵمانان گوێیان نەدەدا نە بە گەرماو نە بە ماندوویەتی، بەڵکو بە خۆشییەکی زۆرەوەو بە وتنەوەی الله أکبر بەرەوپێش دەچوون.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەبو زەڕی غەفاری کردە ئەمیری شاری مەدینە. خۆی و سوپاکەی لە دەی مانگی ڕەمەزان کەوتنەڕێ، خۆی و موسڵمانان بەڕۆژوو بوون. ڕۆیشت تا گەیشتە (کودەید)، داوای جامێ ئاوی کرد و خواردییەوە تا خەڵکی بیبینن، کاتێ بینیان ئیتر هەمووان ڕۆژووەکەیان شکاند تا بەرگەی شەڕکردن لەدژی بێباوەڕان بگرن.

## ٢٨٩. ١٠٠٠٠ سەرچاوەی ڕووناکیی

سوپای موسڵمانان بە باوەڕێکی دامەزراو و لێبڕانێکی گەورەو پلانی ڕێکوپێکەوە ڕۆیشتن بەرەو مەککە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی کەعبەی پیرۆز لە بتەکان پاکبکاتەوە بە بێئەوەی خوێن بڕژێ یان ئازاری هیچ کەس بدات، دەمەو خۆرئاوا هات و کاتەکە یارمەتی نەدەدا ئەو ڕۆژە بچنەناو مەککەوە، بەڵام زۆر نزیکبوونەوە لێی، لەدوای ماوەیەکی زۆر کەمیش دەچنە مەککەوە بێئەوەی قورەیش پێیان بزانێ.

کاتێک تاریکایی باڵیکێشا بەسەر ناوچەکەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە سەربازەکانیدا ئاگربکەنەوە. هاوەڵان داواکەیان جێبەجێ کرد، لەیەک کاتدا ئاگریان کردەوە، لە کتوپڕدا مەککە بە ڕۆشنایی دە هەزار ئاگر ڕۆشنبوویەوە، قورەیش سەرسامبوو بەو ئاگرانە لە دەرەوەی شارەکە هەڵگیرساون، نەیدەزانی چین و هی کێن و مانایان چییە.

لەپاش ماوەیەک قورەیش بۆی مەعلوم بوو کە موسڵمانان گەمارۆی مەککەیان داوە. ئای ئەمە چ سوپایەکی زەبەلاحە! تەنها پێش دوو ساڵ لەمەوبەر موسڵمانان ئەم سوپا بەهێزەیان نەبوو. ئەی چۆن چۆنی لە ماوەیەکی کورتدا بوونە خاوەنی ئەم سوپایە؟ قورەیش زۆر پەشیمانبوو لەوەی کە ڕێکەوتننامەی حودەیبیەیان شکاند، بەڵام تازە کات تێپەڕیوە، هەربۆیە قورەیش خێرا هەستا ئەبو سوفیانی سەرکردەی خۆی نارد بۆ لای پێغەمبەر(ﷺ).

کاتێ ئەبو سوفیان هاتە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەر

فەرمووی پێی: ((ئەی ئەبو سوفیان هاوار بۆ تۆ! ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بڵێیت لا إله إلا الله؟)) ئەبو سوفیان خۆی لە هەڵویستێکی سەختدا بینییەوە، بە شپرزییەکەوە وتی: (باوک و دایکم بە قوربانت بێت سوێند بەخوا ئێستە ئیتر بۆ مەعلوم بوو ئەگەر جگە لە خوا خوایەکی تر ببوایە ئەوا دوای تۆ بێنیاز دەبووم پێی).

ئەبو سوفیان دواجار گەیشتبووە ئەوە لە حەقیقەت تێبگات، بۆیە پێغەمبەر(ﷺ) سەرلەنوێ پرسیاری لێکردو فەرمووی: ((ئەبو سوفیان هاوار بۆ تۆ!ئایا ئیتر کاتی ئەوە نەهاتووە بزانیت کە من پێغەمبەری خوام؟)) کەمێک بیریکردەوە پاشان وتی: (باوک و دایکم بە قوربانت بێت ئای تۆ چەندە کەسێکی نەرمونیان و بەڕێزو خزمدۆستی، بەڵام بۆ ئەو بتانە بەخوا تا ئێستەش شتێک لە دروونمدا هەیە).

لەو کاتەدا عەبباسی مامی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە ئامادەبوو پێیوت: (هاوار بۆ تۆ دەی موسڵمان ببەو بڵێ أشهد أن لا إله إلا الله وأن محمداً رسول الله بەرلەوە لە گەردنت بدرێ). لەبەردەم ئەو هاندانەی عەبباسدا، ئەبو سوفیان موسڵمان بوو و شایەتومانی هێنا.

بەم پێیە، ئەو سەرکردەیە کە قورەیش ناردی بۆ لای سوپای موسڵمانان تا هەواڵی بۆ بێنێتەوە خودی خۆی باوەڕی بە ئیسلام هێنا.

## ٢٩٠. سەرسامبوونی ئەبو سوفیان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی ئەبو سوفیان بە چاوی خۆی هێزی سوپای موسڵمانان ببینێ. هەربۆیە عەبباسی ڕاسپارد لەگەڵیدا بچێت بۆ ئەو شوێنە کە ئەسپەکان وەستابوون تیایدا، دوای ئەوان، خۆیشی(ﷺ) چووە ناو سوپاکەوە تا سوپاکە بە بەردەم ئەبو سوفیاندا تێپەڕێت.

سەربازەکان ئامادەبوون بچنەناو مەککەوە، عەبباس ئەبو سوفیانی برد بۆ بەرتەسکترین شوێن لە دۆڵەکەدا. چونکە لەوێوە دەیتوانی بە باشترین شێوە سوپاکە ببینێ. کاتێ ئەبو سوفیان ئەو سوپا بەهێزو سامدارەی بینی چاوانی بڕوایان نەدەکرد. زۆرێک لە سەربازانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سواری ئەسپە زۆر بەهێزەکان دەچوونە پێش. ژمارەی هەموویان نزیکەی دە هەزار سەرباز بوون، هەموو پێکەوە دەنگیان بە الله أکبر، الله أکبر بەرزدەبوویەوە).

ئەبو سوفیان کەوتە بیرکردنەوە لەوە کە موحەممەدی دوژمنی قورەیش چۆن توانی ئەم ژمارە زەبەلاحە کۆبکاتەوەو چۆن دوژمنانی دوێنێی لە ئەمڕۆدا بوونەتە دۆستی.

کاتێ سەربازەکان یەک بەدوای یەکدا بە بەردەم ئەبو سوفیاندا تێدەپەڕین، پرسیاری لە عەبباس کرد: (ئایا موحەممەد تێپەڕیوە؟) عەبباس وتی: (هێشتا نەخێر). ئەبو سوفیان وەستاو لە چاوەڕوانی تێپەڕبوونی موحەممەد ئارامی لێبڕابوو. لە دەمی ڕێڕەوی دۆڵەکەدا نزیکەی سەد سەربازی بە سواری ئەسپ بینی کە قەڵغان و ئاڵاکانیان هەڵگرتبوو. لە کاتێکدا کە بە ڕێکوپێکییەکی زۆرەوە بە

دۆڵەکەدا تێدەپەڕین تیشکی خۆر دەیدا لە قەڵغانەکان و بریقەیان دەدا، ئەبو سوفیان لە ناوەڕاستیاندا کەسێکی بینی کە سواری وشترێک بوو، وەها دەبینرا کە گرنگییەکی زۆریان پێدەدا، وتی(سبحان الله ئەی عەبباس، ئەوانە کێن؟) عەبباس زەردەخەنەیەکی کردو وتی: (ئەوە پێغەمبەری خوایە(ﷺ) لەنێو کۆچبەران و پشتیوانانندایە). ئەبو سوفیان زیاتر سەری سوڕماو وتی: (کەس توانای ناشکێ بەسەر ئەمانەدا، ئەبولفەزڵ سوێند بەخوا دەستەڵاتی برازاکەت ئێستە گەیشتووەتە ئاستێکی گەورە). عەبباس وتی: (ئەی ئەبو سوفیان، ئەوە پێغەمبەرایەتییە). ئەبو سوفیانیش وتی: (کەواتە زۆر باشە).

دوای ئەوە، ئەبو سوفیان گەڕایەوە بۆ مەککە، کاتێ کەسایەتییە دیارەکانی قورەیش لە دەوری کۆبوونەوە، پێیوتن کە خۆی باوەڕی بە ئیسلام هێناوە، شڵەژاویی بێباوەڕان زیاتری کرد، بەڵام ئەبو سوفیان درێژەی پێداو وتی: (ئەی قەومی قورەیش، ئەوا موحەممەد بە خۆی و سوپایەکەوە هات کە پێشتر شتی واتان نەدیوە. جا هەرکەس بچێتە ماڵی ئەبو سوفیان ئەوا پارێزراوە، هەرکەس بچێتە مزگەوتی حەرام ئەوا پارێزراوە، هەرکەسیش دەرگای ماڵەکەی دابخات و لەماڵەوە دەرنەچێ ئەویش پارێزراوە).

بێباوەڕان تووشی شۆک هاتن و گەڕانەوە ماڵەکانیان بێئەوەی یەک وشە لە زاریان بێتەدەر. هەندێکیان پێشنیاری شەڕیان کرد، بەڵام کەس گوێی بۆ نەگرتن. چونکە دەیانزانی لە ئەمڕۆ بەولاوە ناتوانن ڕووبەڕووی موسڵمانان ببنەوە.

## ٢٩١. خۆشترین ڕۆژی موسڵمانان

لە بەیانی ڕۆژی هەینیدا، دڵی هاوەڵان لەخۆشیدا هاتبوونە جۆش. ئەوان نزیککەوتبوونەوە لە بینینی کەعبە کە بۆ ماوەیەکی زۆر دووربوون لێیەوە. زەردەخەنەی ڕەزامەندی و سوپاسگوزاریی لەسەر ڕوخساری پێغەمبەریش(ﷺ) دەبینرا. سواری وشترە گوێکەلەکەی بوو، کەوتە حەمدو سەنای خوای گەورە، سورەتی الفتح ی دەخوێند تا فەڕوبەرەکەت بخاتە ئەو ڕۆژەیان، سوپاکە بە یەکگرتوویی و یەک ئاوازی چووە ناو مەککەوە، ئا لەو کاتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک کەسێکی خۆبەکەمزان و سوپاسگوزارێ سەری بۆ پەروەردگاری دانەواند، ئەو دەیزانی ئەو ڕزگارکردنە دیاری و بەخششێکی خواییە. لایکردەوە بەلای سەربازەکانیداو فەرمانی پێدان لەدژی کەس نەجەنگن، مەگەر تەنها کەسێک نەبێت کە لەدژیان بجەنگێ. موسڵمانان چوونە ناو شەقامەکانی مەدینەوەو دەموچاویان سەرڕێژ بوو لە شادی و بەختەوەریی. ئەوان سالانێک بوو چاوەڕوانی هاتنی ئەو ڕۆژەیان دەکرد. بەڵام هەر بە شێوازی خۆبەکەمزانیی و گەردنکەچییەوە ئاهەنگیان بۆ گێڕا.

شمشێریان دژ بە هیچ کەس لە خەڵکی مەککە بەکارنەهێنا جگە لە کەسێ بە شمشێر لەدژیان وەستابێتەوە، سوپاکە وردە وردە نزیککەوتەوە لە کەعبەی پیرۆز، مەککەیش لە خۆشترینی ڕۆژەکانیدا دەژیا، چونکە ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) کە تیایدا گەورەبوو بوو و بەزۆر دەریانکرد وا ئەمڕۆ بە سەرۆکایەتی سوپایەکی ڕزگارکەرو سەرکەوتووەوە دەگەڕێتەوە ناوی. بێباوەڕان بێدەنگیان هەڵبژاردو

چوونـەوە ماڵەکانـی خۆیـان، شـادیی و کامەرانـی دڵـی موسـڵمانانی پڕکـرد، کاتـێ منداڵانـی هۆزەکـەی پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بیسـتییان کـە گەڕاوەتـەوە ناویـان لـە ماڵەکانیـان هاتنـەدەر و لـە شـەقامەکاندا ڕیزیـان بەسـت، ئەوەبـوو لـە ڕۆژی کۆچکردنـدا منداڵانـی مەدینـەی مونـەووەرە پێشـوازییان لێکرد، وا ئەمـڕۆش منداڵانی مەککـە پێشـوازی لـە گەڕانـەوەی دەکـەن.

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) لـە کاتێکدا لەسـەر وشـترەکەی بەرەو کەعبـەی پیرۆز دەڕۆیشـت بـەدەم ڕێگاوە زەردەخەنـەی بـۆ منداڵان دەکرد. هیچ جـۆرە لەخۆباییبـوون یـان لوتبەرزییـەک تیایـدا بـەدی نەدەکـرا، بەڵکـو ئـەو هـەر ئـەو کەسـە بـوو کـە هەشـت سـاڵ لەوەوبـەر ناسـیبوویان. پێغەمبـەر(ﷺ) ئوسـامەی کـوڕی زەیـدی سـواری وشـترەکەی خـۆی کـرد، ئەویـش زۆری پێخۆشـبوو، زۆر بەجوانـی کەوتـە گوێڕادێـران لـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ). کاتێـک پێغەمبـەری خـوا چـاوی بـە کەعبـەی پیـرۆز کـەوت، بـە دەنگـی بـەرز فەرمـووی: (اللـه أکبـر، اللـه أکبـر))، خێـرا دە هـەزار موسـڵمان لەدوایـەوە دەیانوتـەوە، دەنگـی اللـه أکبـر لـە سـەرتاسـەری مەککـەدا دەنگیدایـەوە.

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) تەوافـی کەعبـەی پیـرۆزی کـرد، ئینجـا ڕوویکـردە ئـاوی زەمـزەم، لێیخـواردەوەو دەسـتنوێژی لێگـرت و سوپاسـی خـوای گـەورەی کـرد. هاوەڵانیـش هەمـان کاریـان ئەنجامـدا، بەمجـۆرە پێغەمبـەر(ﷺ) بـە سـەرکەوتوویی گەڕایـەوە مەککـەی پیـرۆز، هـەر بەوجـۆرە کـە خـوای گـەورە بەڵێنـی پێدابـوو، کەعبـەی پیرۆزیـش کـە گەوهـەری سـەرزەوییە کەوتـەوە دەسـت موسـڵمانان، زمـان و دڵیـان پـڕ پڕبـوو لـە سوپاسـگوزاریی بـۆ پـەروەردگاری جیهانیـان.

## ٢٩٢. دڵسۆزیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گەڕایەوە بۆ ئەو شوێنە تیایدا لەدایک بوو بوو. ئەو لە کاتێکدا لە کێوی صەفاوە سەیری مەککەی دەکرد کەوتە سوپاسکردنی خوای گەورە لەسەر ئەو نیعمەتە. لەو کاتەدا، هەندێ لە پشتیوانان هەستییان بە بێتاقەتی دەکرد، لەنێوان خۆیاندا کەوتنە چپەچپ و بەیەکتریان دەوت: (وا نابینن پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە خوا خاک و شارەکەیی بۆ ڕزگارکرد ئیتر نیشتەجێ ببێت تیایدا؟) لەو کاتەدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەر کێوی صەفاوە دەستی بۆ ئاسمان بەرزکردبوونەوەو لە پاڕانەوەدا بوو، لە ئاسمانەوە وەحی بۆ هات و ئاگادارکرا بەوەی پشتیوانان دەیانوت، کاتێ پاڕانەوەکەی تەواوکرد، هاتەلایان و پرسیاری ئەوەی لێکردن کە خەیاڵیانی سەرقاڵکردووە، بەڵام پشتیوانان حەزیان نەدەکرد پێغەمبەر سەغڵەت بکەن، بۆیە وتیان: (هیچ نیە ئەی پێغەمبەری خوا). بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەر لەسەریان چوو تا ئەوانیش هۆکارەکەیان پێوت. ئەویش فەرمووی پێیان: ((پەنا بەخوا، ژیانم لەگەڵ ژیانتانە، مردنم لەگەڵ مردنتانە)). ئەوە زۆر کاریکردە سەر پشتیوانان، هاتن و لە دەورەی کۆبوونەوە و چاویان پڕبوو لە فرمێسک و پێیانوت کە زۆریان خۆشدەوێ، هەربۆیە ترساون لەوەی لە مەککەدا بمێنێتەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە خۆشەویستی و دڵسۆزییەکی زۆرەوە سەیریکردن کە چۆن جیادەبێتەوە لەو خەڵکە چاکانەی لە سەختترین کاتەکاندا باوەشیان بۆ گرتووەتەوە؟ بەڕاستی پشتیوانان قوربانی زۆریاندا لەپێناو ئیسلامدا، لەبەرئەوە،

تا هەرئاستێ خۆشەویستی بۆ شوێنی لەدایکبوونی زۆربێت هەر ناتوانێت مەدینەییەکان بەجێبێڵێ و بگەڕێتەوە بۆ سەربردنی ژیان لە مەککەدا.. ئەو بیری نەدەکردەوە لە دوورکەوتنەوە لە مەدینەی مونەووەرە. کاتێ پشتیوانان ئەوەیان زانی خەیاڵیان ئاسودە بوو و زەردەخەنە گەڕایەوە سەر ڕوخساریان.

## ٢٩٣. تورەیی بێباوەڕان

ڕق و کینە بوو بووە خۆرەو بەربووبووە جەستەی بێباوەڕان، چونکە نەیانتوانی ڕووبەڕووی سوپای موسڵمانان ببنەوە، کەسانێکیان تێدابوو هەوڵیاندەدا تۆڵە لە پێغەمبەری خۆشەویستمان بکەنەوە، کەوتنە گەڕان بەدوای دەرفەتێکدا تا بیکوژن.

لەنێو ئەو کەسانەدا کەسێک هەبوو بەناوی فوزالەی کوڕی عومەیر، لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) تەوافی کەعبەی دەکرد، فوزالە بە وردی چاودێری دەکرد، بیرە ڕەشەکانی لە مێشکیدا کەڵەکەیان کردبوو، تا هەلێکی بۆ بڕەخسی و هەڵکوتێتە سەر پێغەمبەر(ﷺ). دوای ماوەیەک چاوەڕوانیکردن، ئەو ساتەی بۆ هاتەپێش کە چاوەڕوانی دەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە بەردەمیدا تێپەڕی، لەو چرکەساتەدا کە دیویست هێرشی بۆ بەرێ ، پێغەمبەر(ﷺ) ئاوڕی لێدایەوەو زەردەخەنەیەکی بۆکرد. بە دەنگێکی ڕاستگۆیانەو گەرموگوڕییەوە فەرمووی: ((تۆ فوزالەیت؟)) بە سەرسوڕمانەوە وتی: (بەڵێ فوزالەم ئەی پێغەمبەری خوا). پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکردو فەرمووی: ((لە دڵی خۆتدا چیت دەوت؟)). لە کاتێکدا کە ئیدیعای ئیسلامەتی دەکرد وتی: (هیچ خەریکی زیکرکردن بووم). مەعلوم بوو فوزالە درۆیکرد، خوای گەورەش پێغەمبەرەکەیی ئاگادار کردبوو بەوە. فوزالە دوو هەڵەی کرد، یەکەمیان نیەتی کوشتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، دووەمیش درۆکردن. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویستمان زۆر لێبوردە بوو، بە چاوێکی خۆشەویستییەوە سەیری کردو فەرمووی: ((أستغفر الله)).

ئینجا لێی نزیکبوویەوە و دەستی خستە سەر سنگی و دۆعای بۆکرد.

فوزالە زانی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە نیەتە خراپەکانی زانیوە، ئینجا زۆر پەشیمانبوو، پێغەمبەر سزای نەدا لەسەر ئەو نیەتەی پلانی بۆ کێشابوو. بەڵکو دۆعای چاکەی بۆکرد، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خستە سەر سنگی فوزالە ئیتر هەر هەستێکی ڕقلێبوون و کینە لەدڵیدا بوو نەما. سەری بەرزکردەوەو بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە سەیرێکی دەموچاوی پێغەمبەری(ﷺ) کرد. لە کاتێکدا کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆیشت بەڕێگای خۆیەوە فوزالە دەیوت: (سوێند بەخوا تا من وام لێنەهات ئەو ببێتە خۆشەویستترین کەسێ لە لام کە خوای گەورە دروستی کردبێت دەستی لەسەر سنگم بەرزنەکردەوە).

## ٢٩٤. موسڵمانبوونی هیند، هاوسەری ئەبو سوفیان

پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککە دانیشت بەیعەتی لە ئافرەتان وەردەگرت. دەیفەرموو پێیان: ((بەیعەتم بدەنێ هیچ هاوەڵێک بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، منداڵەکانتان نەکوژن، سەرپێچی نەکەن لە کاری چاکە...))، هەروەها بەیعەتی لەسەر چەند مەسەلەیەکی تر لێوەرگرتن، فەرمووی پێیان: ((بۆ ئەوەی کە دەتوانن بڵێن بەڵێ)).

هیند کچی عوتبە خێزانی ئەبو سوفیان بوو، لە هەرە سەرسەختترینی ئەو ئافرەتانە بوو کە دژ بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەجەنگان، بەڵام دوای ڕزگارکردنی مەککە لە هەموو دڵییەوە باوەڕی بە ئیسلام هێناو دڵنیابوو کە جگە لە الله هیچ خوایەکیتر بوونی نیەو موحەممەدیش پێغەمبەری خوایە. ئەویش لەگەڵ هەموو ئافرەتانی تردا ڕۆیشت تا بەیعەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدات، وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، لە سەرزەویدا ماڵە دەوارێک نەبووە بەڕادەی ئەو ماڵە دەوارە لام خۆشەویست بێت کە هەستاوە بە زەلیلکردنی ماڵە دەوارەکانی تۆ، ئەمڕۆش لە سەرزەویدا ماڵە دەوارێک نیە بەڕادەی ئەو ماڵە دەوارە لام خۆشەویست بێت کە ببێتە مایەی سەربەرزی ماڵە دەوارەکانی تۆ). پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشوازی لێکردو بەیعەتی لێوەرگرت.

## ٢٩٥. ئەڵماسە ڕەشەکە

کەعبە قیبلەی موسڵمانانە. خوای باڵادەست فەرمانی بە بەندەکانی کردووە ڕۆژانە پێنج فەرزە ڕووبکەنەماڵەکەی. هەرکەسیش دەتوانێت با بۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج تەوافی بکات بەلانیکەمەوە یەک جار لە تەمەنیدا. مەعلومیشە پاڕانەوە لە پەنای کەعبەدا بە ویستی خوا هەرگیز ڕەتکردنەوەی نیە.

لەپێش لەدایکبوونی موحەممەد(ﷺ) باپیرانی هەڵدەستان بە پاراستنی کەعبەی پیرۆز. جا بەو پێیە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە مەککەی پیرۆز لەدایکبووە ئەوا لەسەر خۆشەویستی کەعبەو ڕێزلێگرتنی پەروەردە بووە، کاتێکیش لە مەککە کۆچیکرد، زۆر بێتاقەتی بوو، لەبەرئەوە، دڵخۆشبوو بە گەڕانەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونی. چونکە کەعبە بەنرخترین گەوهەری خوایە لە سەرزەویدا.

مەخابن، کەعبە دەیەها ساڵ لە بندەستی بێباوەڕاندا بوو، ئەو شوێنە پیرۆزەیان پڕکردبوو لە جۆرەها بت، لە ڕۆژی ڕزگارکردنی مەککەدا سێسەدو شەست بت بەدەوری کەعبەدا بوون. ئەم دیمەنە پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر بێتاقەت کردبوو، چونکە هەرگیز گونجاو نیە بت لە نزیک ئەو ماڵە پیرۆزەدا بێت. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا کە عاسایەکی بەدەستەوە گرتبوو نزیککەوتەوە لە بتە کەڕو لاڵ و بێگیانەکان، بە عاساکە ئاماژەی بە بتەکان دەدا و ئەم ئایەتە پیرۆزەی دەخوێند: ﴿...جَآءَ ٱلۡحَقُّ وَزَهَقَ ٱلۡبَٰطِلُۚ إِنَّ ٱلۡبَٰطِلَ كَانَ زَهُوقٗا﴾ (الإسراء: ٨١) هەردەبێت ئەو ڕۆژە بێت کە ناڕەوا لەناو دەچێت. بەوشێوەیە بتەکان لەناوبران.

کەعبەی پیرۆز لەو بتانە پاککرایەوە کە پیس و پۆخڵیان کردبوو. وەک ئەڵماسێکی ڕەش گەڕایەوە بۆ ڕووناکی جارانی.

## ٢٩٦. بانگدانی بیلال

دڵەکان پڕبوون لە شادیی و کامەرانیی، چاوانی باوەڕداران کە سەرقاڵبوون بە حەمدو سەنای خوای گەورە دەدرەوشانەوە. دوای ڕزگارکردنی مەککە، کەعبەی پیرۆز لە بتەکان پاککرایەوە، دڵی موسڵمانان ئاسودە بوو بەو دەستکەوتە گەورەیە. کاتی نوێژی نیوەڕۆ هات، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانی بە بیلال دا بانگبدات، بیلال زۆری پێخۆشبوو، بە جۆش و خرۆشەوە سەرکەوتە سەربانی کەعبە، بە دەنگە خۆش و زوڵاڵەکەی بانگیداو خەڵکی بانگکرد بۆ نوێژ، ئینجا بیری لە ڕابردوو دەکردەوە، زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد. لە سەرتای وەحیدا، گوریس ئاڵێنرا بە گەردنییەوە، بە کۆڵانەکانی مەککەدا ڕایانکێشا تەنها لەبەرئەوە کە وتی(أحدٌ أحدٌ). ئەوەی بێت بە خەیاڵی مرۆڤدا بە هەموو جۆرێ کەوتەبەر ئەشکەنجەو ئازاردان. بەڵام وا ئەمڕۆ بەوپەڕی متمانە بەخۆبوونەوە سەردەکەوێتە سەربانی کەعبەو بانگدەدات بێئەوەی لە هیچ یەک لە بێباوەڕان بترسێ.

دەنگی بیلال بە سەرتاسەری مەککەدا دەنگیدایەوە. خەڵکی بانگکرد بۆ نوێژکردن و سەرفەرازی، ئا لەو ساتەدا، کۆمەڵێک لە بێباوەڕان سەیریان دەکرد، ئەبو سوفیانیش یەکێکیان بوو کە تازە بەتازە موسڵمان بوو بوو، یەکێکیان وتی: (خوای گەورە باوکمی خۆشویست ئەمەی نەبیست). یەکێکیتریان وتی: (بەخوا ئەگەر بمزانیایە لەسەر حەقە شوێنی دەکەوتم). ئەبو سوفیان بێدەنگ بوو، کاتێک پرسیاریان لێکرد کە بۆ بێدەنگە، وتی: (بەخوا من هیچ

شتێک ناڵێم، ئەگەر قسە بکەم ئەو زیخە بچوکانە خەبەرم لێدەدەن).

زۆری نەخایاند پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە لایان، پێیوتن: (دەزانم چیتان وتووە)، ئینجا هەواڵی پێدان بە هەموو ئەوەی کە وتبوویان. ئەوانیش بە سەرسوڕمانەوە سەیری یەکترییان دەکرد، هیچ جۆرە گومانێک لە دڵیاندا نەمابوویەوە. چونکە جگە لە پێغەمبەر(ﷺ) کەسیتر توانای نیە ئەوە بزانێت. بەمجۆرە هەموو بێباوەڕەکان دەستوبرد باوەڕیان هێنا.

ئەبو سوفیان پێیخۆشبوو چونکە هیچی نەوتبوو. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) بە زەردەخەنەوە جێیهێشتن.

## ٢٩٧. کلیلی کەعبەی پیرۆز

کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتە مەککە و خەڵکی دڵنیاکرد، ڕۆیشت تا گەیشتە کەعبە، حەوتجار لەسەر وشترەکەی بە دەوری کەعبەدا تەوافی کرد، کە تەوافەکەیی تەواوکرد، بانگی عوسمانی کوڕی تەڵحەی کرد، کلیلی کەعبەی لێوەرگرت و دەرگای کەعبەی بۆکرایەوە، بەڵام نەچووە ناویەوە چونکە بتەکانی تێدابوو، هەربۆیە فەرمانیدا هەموو بتەکان بێننەدەر و فڕێیاندەن.

وێنەیەکی درۆینەی ئیبراهیم و ئیسماعیلیان(ﷺ) دەرهێنا کە پێکی ئارەقیان بەدەستەوە گرتبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((خوا بیانکوژێ! سوێند بەخوا خۆیان باش دەزانن کە ئەوان هەرگیز نەیانخواردووەتەوە)).

پاشان چووە ناو کەعبەوە، کۆترێکی دارینی تیادا بینی و بەدەستی خۆی(ﷺ) شکاندی، ئینجا فڕێیدا، بەمجۆرە کەعبەی پیرۆز پاککرایەوە لە پیسی بتەکان.

چەند ساڵێک بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی، بە تێپەڕبوونی کات عوسمانی کوڕی تەڵحە هەستی بە هەڵەی خۆیکردو موسڵمانبوو. کلیلی کەعبە هەر لای ئەو مایەوە، ئێستەش لەدوای هاتنی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ مەککە، عوسمان چووە لای و کلیلەکەی کەعبەی لەگەڵ خۆی برد و پێشکەشی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد. پێغەمبەری خوا(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی پێی: ((ئایا وادەرنەچوو کە پێموتی؟)) عوسمان هەموو شتێکی بیرکەوتەوە، هەروەها بەهۆی ئەو هەڵسوکەوتە ڕەقەیەوە لەو کاتەدا هەستی بە سەغڵەتی کرد.

لە کاتێکدا کە بە دوو چاوی پڕ لە هیواوە سەیری پێغەمبەری(ﷺ) دەکرد، پرسیاری لێکرد ئایا کلیلەکە لەمەولا ڕادەستی کێدەکات، پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی بۆ عوسمانی کوڕی تەڵحە کرد، ئینجا کلیلی کەعبەی گێڕایەوە بۆی.

## ٢٩٨. لێبوردەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە یاوەری عوسمانی کوڕی تەڵحەو بیلال و ئوسامەی بچوک چووە ناو کەعبەوە، هەندێ بەردە شکاوی بتەکان لەسەر زەوی مابوونەوە. هەستان بە کۆکردنەوەو فڕێدانیان بۆ دەرەوەی کەعبە، ئینجا هەر چوارلای کەعبەی پیرۆزیان پاککردەوە. پێغەمبەر(ﷺ) زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد، کاتێ لە کەعبە چووەدەرەوە، بینی وا خەڵکەکە لە دەرەوە کۆبوونەتەوە. ترس لە چاوانیاندا بەدیدەکرا، چونکە لە سەرئەنجامی ئەو ئازارو ئەشکەنجەیە دەترسان کە کاتی خۆی تووشی موسڵمانانیان کرد. پرسیاریان دەکرد ئایا پێغەمبەر تۆڵەیان لێدەکاتەوە، ئایا بە برسێتی و تینویەتی سزایان دەدات یان بە دەرکردنیان لە مەککە هەروەک چۆن ئەوان لەگەڵ موسڵماناندا کردیان؟

پێغەمبەر(ﷺ) پێغەمبەری خۆشەویستی و لێبوردەییە. خوای گەورە ڕەوانەیکردووە بەزەیی بێت بۆ جیهانیان. ڕق و کینەو تۆڵەسەندنەوە سیفەتی ئەو نەبوون، هەموو ئەوەی هەوڵی بۆدەدا بەرقەرارکردنی ئاشتی و برایەتی بوو لەنێوان خەڵکیدا، هەرگیز خراپە بەرانبەر بە قورەیش ئەنجام نادات، وێڕای ئەو هەموو ئازارو ناڕەحەتیانەی هێنایان بەسەر موسڵمانان، ئەو(ﷺ) لە هەموو خەڵکی مەککە خۆشبوو جگە لە چەند کەسێکی کەم نەبێت ئەوانیش ئەوانەبوون کە سەرسەختترین دژایەتیان بەرانبەر بە بانگەوازی ئیسلام نواند. لە خەڵکی مەککە خۆشبوو چونکە تەماعی موسڵمانبوون و بوونیان بە بانگخوازی ئەم ئاینەی پێیان هەبوو، خەڵکی مەککە لەبەردەم

ئەو بەخشندەییەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) بەرانبەریان کردی گوێیان بڕوای نەدەکرد، هەستییان بە سەغڵەتبوونێکی زۆر زۆر کرد. بە خۆشی و شادییەوە گەڕانەوەماڵەکانیان، بەمشێوەیە بۆ جارێکیتر بە چاوی خۆیان بەزەیی و سۆزو حەزکردنی پێغەمبەری ئیسلامیان بە ئاشتی بینی.

## ٢٩٩. هەڵاتنی عەکرەمە

عەکرەمە کوڕی ئەبو جەهل بوو. تا ئەو ڕۆژە سوکایەتی و خراپەیەک نەما ئاراستەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) نەکات. لەبەرئەوە، کاتێ مەککە ڕزگارکرا، لە ترسی گیانی خۆی لە شارەکە هەڵات، هاوسەرەکەی عەکرەمە موسڵمانبوو، هەستی بە ئاستی گەورەیی و لێبوردەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد، چووە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و ئەوەی ڕوویدابوو بۆی باسکرد. وتی: (عەکرمە لە ترسی تۆ ڕایکردووە بۆ یەمەن، ترسی ئەوەی بوو بیکوژیت، پاراستنی بدەرێ). پێغەمبەری بەزەیی ئەوەی پێباش بوو لە خەڵکی ببورێ با تەنانەت دڕندەترینی دوژمنەکانیشی بووبن. لەبەرئەوە بەدەم داواکەیەوە چوو و بەڵێنی پارێزگاری پێدا. ئەوکات، ئەو ئافرەتە داماوە کەوتە گەڕان بەدوای مێردەکەیدا.

دواجار لە شارێکی قەراغ دەریا دۆزییەوە، عەکرەمە سواری کەشتییەک بوو بوو بڕوات بۆ یەمەن، خێزانەکەی بانگیکرد: (ئامۆزا، من لە لای بەڕەحمترین و چاکترین مرۆڤەوە هاتووم، خۆت مەفەوتێنە، من ئەمانەتپارێزیم لە موحەممەدەوە(ﷺ) بۆ وەرگرتوویت، عەکرمە بڕوای نەکرد بەوە کە بیستی. ئایا ئەمە ئەقڵگیرە؟ شادی و خۆشییەکەی وەسف نەدەکرا، خێرا لە پاپۆڕەکە هاتەخوارو لەگەڵ خێزانەکەیدا گەڕانەوە بۆ مەککە.

کاتێک گەیشتن، ڕۆیشتن بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). ئەویش(ﷺ) بە شەوقێکی زۆرەوە هەستا بە پێشوازیکردنی عەکرەمە. عەکرمە هەستی بە سەغڵەتبوونێکی زۆر کرد

ئەویش بەهۆی ڕەفتارەکانی کە لە ڕابردوودا دژ بە موسڵمانان ئەنجامیدابوون، سەری دانەواند وداوای لێبوردنی کردو وتی: (من داوات لێدەکەم بمبوری لە هەموو دوژمنایەتییەک بەرانبەرتان کردوومە، یان شوێنێک ڕێگام لێگرتبی، یان شوێنێک گەیشتبم پێت تیایدا، یان قسەیەکم بەرانبەرت کردبێ، یان لە هەڵویستێکدا تۆ ئامادە نەبوو‌بیت تیایدا). پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستەکانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو دوعای بۆکردو فەرمووی: ((پەروەردگارا لێی خۆشببە لە هەموو دوژمنایەتییەک کە دژایەتی کردبین، لە هەموو چوونێکی بۆ هەر شوێنێک کە ویستبێتی بەو ڕۆیشتنەی ڕووناکی تۆ بکوژێنێتەوە، لێی خۆشببە لە هەر زامدارکردنێکی ڕووبەڕوویم، یان من ئامادە نەبووبم )). عەکرمە وتی: (بۆ چ شتێک بانگم دەکەیت ئەی موحەممەد؟).فەرمووی: ((بانگت دەکەم شایەتومان بێنی و بڵێی أشهد أن لا إلـه إلا اللـه وأني رسـول اللـه، نوێژ بکەیت، زەکات بدەیت)). یەک بە یەکی فەرزەکانی تری ئیسلامی بۆ ژمارد. عەکرەمە وتی: (کەواتە من بۆ جگە لە هەق و ڕاستی و بۆ کارێکی جوان و چاک نەبێت بۆ شتێکیتر بانگ نەکراوم، بەخوا کاتێکیش لەناوماندا بوویت هەر بۆ ئەمە بانگت دەکردین، تۆ ڕاستگۆترینمانی، چاکترین چاکەکارمانی، ئەوا شایەتومان دێنم و دەڵێم: أشـهد أن لا إلـه إلا اللـه وأشـهد أن محمـداً عبـده ورسـوله).

بەمجۆرە عەکرەمە بەهۆی هەڵسوکەوتی جوانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەرانبەری لە بێباوەڕییەوە گواستییەوە بۆ ئیسلام.

## ٣٠٠. ئاشتی لە مەککەی پیرۆزدا

دوو ڕۆژ بەسەر ڕزگارکردنی مەککەدا تێپەڕی. کەعبەی پیرۆز کەوتە دەستی موسڵمانان، خەڵکی شارەکەش زۆریان پێخۆشبوو، موسڵمانان حەوانەوە چونکە گەڕانەوە بۆ شوێنی لەدایکبوونیان، قورەیشیش هەستی بە پاڵدانەوەیەک کرد دوای ئەوە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) لێیان خۆشبوو.

دوژمنایەتی قورەیش و موسڵمانان چەند ساڵێک درێژەی کێشا، بەڵام وا ئێستە تامی شیرینی ئاشتی دەچێژن، کەس نەکەوتەبەر ئازاردان یان سوکایەتی پێکردن، یەک دڵۆپ خوێن نەڕژرا، ئەمە هەمووی بە فەزڵی لێبوردەیی پێغەمبەرو(ﷺ) ئەو سۆزو بەزەییەیەوە کە لای ئەو سنوری دیاریکراوی نەبوو.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەرکەوتە سەر ئەو پلیکانانە کە دەچوون بەرەو دەرگای کەعبەی پیرۆز. خەڵکی بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە سەیریان دەکرد. فەرمووی پێیان: ((ئەی خەڵکینە، خوای گەورە ئەو ڕۆژە کە ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوە مەککەی بە پیرۆز ڕاگرتووە. پیرۆزکردنیشی لەلایەن خوای گەورەوە مانای ئەوەیە کە تا ڕۆژی قیامەت پیرۆزە. هەرکەس باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەبێت بۆی نیە خوێنی تێدا بڕێژێ، یان درەختێکی ببڕێ... دەبا ئەوەتان کە ئێستە لێرە حازرە ئەوەتان ئاگادار بکات کە حازر نیە)).

کەواتە مەککە شارێکی پیرۆزە، نەگونجاو و ناڕەوایە جۆرە کارێکی خراپ و قێزەونی تێدا ئەنجامبدرێ. دەبێت پاک بێت لە

ڕق و کینەو خراپەکاریی و دوژمنایەتی. ئەم کەشو هەوای برایەتی و ئاشتییە کە باڵی بەسەر تەواوی مەککەو گشت دانیشتوانەکەیدا کێشا کاریگەرییەکی زۆری هەبوو لەسەر دەروونی بێباوەڕان. سەرسامبوون بە لێبوردەیی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە ئەگەر بیویستایە زۆر بە ئاسانی دەیتوانی تۆڵەیان لێبسێنێ. بەڵام ئەوەی نەکرد، کەسیشی ناچار نەکرد باوەڕ بە ئیسلام بێنێ. شیرینی باوەڕ بەم شێوازە جوانە وردە وردە چووە دڵیانەوە.

مەککە سەرڕێژ بوو بە خۆشیی و بەختەوەریی و دڵەکان کەمەندکێشی بوون، مەککە بە ڕووناکی دەدرەوشایەوە، چونکە سەرلەنوێ باوەشی بۆ ئەو پێغەمبەرە گرتەوە کە خوای گەورە لە قورئانە پیرۆزەکەیدا ڕێنمایی پێدەدات و دەفەرموێ: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْجَٰهِلِينَ ﴾ (الأعراف: ١٩٩)

## ٣٠١. بێباوەڕان عەودالْن بگەنە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ)

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر کێوی صەفا بوو، لە هەمان ئەو شوێنەدا وەستا کە ساڵانێکی زوو تێیدا وەستاو خەڵکی بۆ ئیسلام بانگ دەکرد. بەڵام ئەوکات ئەوان گوێیان بۆ نەگرت، گوێی خۆیان کەڕکردو بەجێیان هێشت.

ئەمجارە، بارودۆخەکە تەواو جیاوازە، ئەوانەی بینیان بە هەڵەداوان خۆیان گەیاندە لای، خەڵکی دەستە دەستە بە لێشاو دەهاتنە ناو ئاینی ئیسلام. کێوی صەفا ئەمجارە جمەی دەهات بە لاوان و بەساڵاچووان. منداڵانیش پێشبڕکێیان بوو لەسەر بینینی پێغەمبەر(ﷺ) و بەدەستهێنانی دوعاکانی.

ئەو خەڵکانەی هاتنە ناو ئیسلام یەک یەک بەیعەتیان بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەدا کە دەستهەڵگرن لە بێباوەڕی و ئەنجامدانی گوناهەکان. بەڵێنیان بە پێغەمبەر(ﷺ) دەدا هاوەڵ بۆ خوای گەورە بڕیار نەدەن، دزی نەکەن، هەڵسوکەوتی خراپ لەگەڵ کچانیاندا نەکەن، خۆیان بە ڕەوشتە بەرزەکان بڕازێننەوە، بۆ چاکەکاری سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەکەن.

لەنێو ئەو ئافرەتانەدا کە هاتن بەیعەت بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بدەن ئافرەتێک بوو دەموچاوی خۆی داپۆشیبوو تا کەس نەیناسێت. چونکە خۆی بە هۆی کردەوەکانی ڕابردوویەوە هەستی بە سەغڵەتی دەکرد. ئەو ئافرەتە ناوی هیند بوو، کە بووە هۆی کوشتنی حەمزەی مامی پێغەمبەر(ﷺ). بەڵام دوای ئەوە کە خوای گەورە بە ئیسلام ڕێزی لێگرت زۆر زۆر پەشیمان بوو لەو کارانەی پێشووی.

کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆی مەعلوم بوو هیند موسڵمانبووە لێی خۆشبوو، پێغەمبەرمان(ﷺ) ڕقی لە کینەو تۆڵەسەندنەوە نەبوو تەنانەت لەگەڵ ئەو ئافرەتەشدا کە مامی خۆشەویستی کوشت و جەستەیی شێواند. ئەمە نمونەی هەڵسوکەوتی جوان و ڕەوشتبەرزییە.

لەگەڵ تەواوبوونی ئەو ڕۆژەدا قورەیش تامێکی تری بەختەوەرییان چەشت ئەویش ئەوەبوو کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستی درێژکرد بۆ ئەو خەڵکەی نوقمی زەلکاوی بێباوەڕی و گوناهکاری بووبوون و ڕزگاریکردن. کاتێک ئێوارە هات و پەردە بەسەر مەککەی پیرۆزدا دادرایەوە هاواری خۆشی و شادی خەڵکەکە بەسەر کێوی صەفاوە بەرزبوویەوە.

## ٣٠٢. پادشا نیە، پێغەمبەرە(ﷺ)

ئەوە یەکەمجارە مەککەی پیرۆز لە سایەی ئیسلامدا تامی بەختەوەریی ژیان بچێژێ. کە بووە باشترین شوێن لەسەر ڕووی زەوی. کەسێکی نەدارو داماو لە بیابان دەژیا کاتێ بیستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاتووە بۆ مەککە، کە تا ئەوکاتە زۆر شتی لەبارەیەوە بیستبوو. تامەزرۆی بینین و ناسینی بوو. لەبەرئەوە خێرا خۆی گەیاندە لای.

خەڵکی بردیانە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، لەبەردەمیدا وەستاو لە جۆش و خرۆشی خۆی و شڵەژانی دڵی پەلەپەل لێیدەدا. نەیدەزانی چیبڵێت. کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەو حاڵەیەوە چاوی پێیکەوت، ویستی کەمێ شڵەژاوی لابەرێ و هێوری بکاتەوە، داوای لێکرد خۆڕاگر بێت، بۆیە فەرمووی پێی کە ئەو(ﷺ) پادشا نیە بەڵکو کوڕی ئافرەتێکە گۆشتی لەژێر تیشکی خۆردا وشکدەکردەوەو لەگەڵ نانەڕەقەدا دەرخواردی داوە.

ئینجا، کابرا هاتەوە سەرخۆی و زاڵبوو بەسەر شڵەژانەکەیدا. چونکە ئەو ئێستە لەبەردەم پێغەمبەرێکدایە نەک پادشا، کە بەهۆی خاکیبوونی و خۆ بەکەمزانی و نزیکییەوە لە خەڵکی زۆر سەرسامبوو پێی.

## ٣٠٣. شادبوونی ئەبوبەکر

ساڵانێکی زۆر بەسەر ماوەی دوورکەوتنەوەی ئەبوبەکر لە باوکی تێپەڕی، چونکە کاتێک لە خزمەت پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کۆچیکرد بۆ مەدینەی مونەووەرە، ئەبو قوحافەی باوکی لە مەککە مایەوە. باوەڕیشی بە ئیسلام نەهێنابوو، ئەبوبەکر زۆر لە خوای گەورە پاڕایەوە تا دڵی باوکی نەرم بکات و تامی شیرینی باوەڕ بچێژێ.

ئەبو قوحافە ئێستە پیرێکی بەساڵاچووە. لەگەڵ یەکەم دەرفەتدا ئەبوبەکر ڕۆیشت بۆ لای باوکی، بەوپەڕی ڕێزەوە دەستی ماچکرد، بە شەوق و خۆشییەوە باوەشی بۆ گرتەوە تا قەرەبووی ساڵانی دوورکەوتنەوە بکاتەوە، باوک و کوڕ بۆ ماوەیەکی زۆر وتووێژیان کرد، ئەبوبەکر نەیدەویست مەسەلەی موسڵمانبوونی باوکی لەوە زیاتر دوابکەوێت، لەبەرئەوە بە سۆزو و ڕێزەوە دەستی گرت و هێنای بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ).

پێغەمبەر(ﷺ) بەزەیی و ڕێزێکی زۆری هەبوو بۆ کەسە بەتەمەنەکان. کاتێک باوکی ئەبوبەکری بینی هات بۆ لای، بە هاوڕێکەیی فەرموو: ((بۆ لێنەگەڕای ئەو پیاوە بەتەمەنە لە ماڵی خۆیدا دابنیشێ و من بێم بۆ لای ئەو)).

بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پێگەو پایەیەکی تایبەتی هەبوو و ئەبوبەکر ئەوەی دەزانی، هەربۆیە وەڵامیدایەوە کە: (ئەی پێغەمبەری خوا، حەقی ئەوە بێتە خزمەتی تۆ نەک تۆ بچیتە لای ئەو).

لەو کاتەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستاو دەستی هێنا بەسەر سنگی پیاوە پیرەکەدا و پێی فەرموو: ((موسڵمان ببە)). جوانیی ئەتەکێتی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر کاریکردە سەر ئەبو قوحافە، ڕاستەوخۆ موسڵمانبوو. شادمانیی ئەبوبەکریش لەو ڕۆژەدا وەسف نەدەکرا.

### ٣٠٤. ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات...

پێغەمبەر(ﷺ) زوو مەککەی جێنەهێشت، بەڵکو بۆ ماوەیەک تیایدا مایەوە، چونکە سەرقاڵی فێرکردنی موسڵمانە نوێیەکان بوو بە ڕێنماییە ئاینییەکان و فەرماندان بە چاکەکاریی و ڕێگیری لە خراپەکاریی. بەڵام هەروا ئاسان نەبوو ئەو کەسانە داب و نەریتە کۆنەکانیان بگۆڕن.

ئافرەتێکیان لەناودا بوو ناوی فاتیمە بوو، شتێکی دزیبوو، بەوهۆیەوە، دەبوو سزابدرێ بۆئەوەی دووبارەی نەکاتەوە، بەڵام هەندێ کەس قوبوڵیان نەبوو سزابدرێ، بەو بیانووە کە سەر بە خانەوادەیەکی ناسراو و ماقوڵ و ناوبانگدارە.

لەبەرئەوە هاتن ئوسامەیان ناردە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، گومانیان وابوو بەگوێی دەکات چونکە ئوسامەی زۆر خۆشدەویست. ئوسامە کێشەکەی بۆ پێغەمبەر(ﷺ) باسکرد، ئینجا داوای لێخۆشبوونی بۆ ئەو ئافرەتە کرد چونکە لە خانەوادەیەکی دیارو گەورە بوو.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی بیست، زۆر تووڕە بوو و فەرمووی: ((ئایا تکا لەسەر یاسایەک لە یاساکانی خوای گەورە دەکەیت؟)) ئوسامە زۆر غەمبار بوو و پەشیمانبوو لە داواکەی و داوای لێبووردنی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پۆزشەکەی ئوسامەی قوبوڵکرد. پاشان خەڵکی کۆکردەوەو فەرمووی پێیان: ((ئوممەتانی پێش ئێوە بۆیە لەناوچوون چونکە کاتێ کەسێکی دەستەڵاتدارو خاوەن بنەماڵە دزی

کردبێت ئەوان وازیان لێهێناوە، بەڵام ئەگەر کەسێکی لاواز دزی کردبێت سزایاندوە. سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەممەد دزی بکات دەستی دەبڕم)).

پیادەکردنی پرەنسیپی دادپەروەری و یەکسانی کە ئیسلام فەرزیکردووە زۆر کاری کردەسەر ئامادەبووان، ئەو فاتیمەیە کە دزییەکەی کردبوو ئەو سزایەی وەرگرت کە شایستەی بوو، دوای ئەوە، تەوبەی کردو داوای لێخۆشبوونی لە خوای گەورە کرد، لێرە بەولاوە ئیتر هەرگیز سەرپێچی لە فەرمانی خوای گەورە ناکات.

ئەوانەش کە لە نیەتیاندا بوو دزی بکەن وازیان هێنا لە ترسی ئەو سزایە کە دانراوە، بەمجۆرە ئیسلام سنوری دانا بۆ دزی و ستەم و ئازاردان لە مەککەی پیرۆزدا. شارەکە ڕوخسارێکی تەواو جیاوازی بەخۆیەوە بینی، لایەنی خێرو چاکە لەناو دانیشتوانەکەیدا گەشەی کرد.

## ٣٠٥. جەنگی حونەین

دوای ڕزگارکردنی مەککەی پیرۆز، لەو ڕۆژانەدا سروشتی بوو کەسانێک هەبن کە بێتاقەت و ناڕەحەت بن لەو دەستکەوتانەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و فراوانبوونی خاک و دەستەڵاتی ئیسلام. ماوەیەک بەسەر ڕزگارکردنی مەککەی پیرۆزدا تێپەڕی، لەو ماوەیەدا قورەیش هەستی بە هەڵەی خۆیکردو باوەڕی بە ئیسلام هێنا. بەڵام هێشتا لە ناوچە دراوسێکانی مەککەی پیرۆز زۆرێک لە بێباوەڕان بوونیان هەبوو.

لەنێو ئەوانەدا هۆزی هەوازن، ئەم هۆزە بڕیاریدا سوپایەکی گەورە کۆبکاتەوەو بە سەرکردایەتی مالیکی کوڕی عەوف هێرش بکاتە سەر مەککە. مالیک بڕیاریدا ئەو وێنەیە بدات بە سوپای ئیسلام کە خاوەنی سوپایەکی بەهێزو گەورەیە ئەویش لەڕێگای بوونی ئافرەتان و منداڵان و جۆرەها وڵاغ لەناو سوپاکەیدا. دەیوت ئەم شەڕە کۆتا شەڕە لەدژی موحەممەد، تا ئێستەش کە ئەو لە جەنگەکاندا سەرکەوتوو بووە هۆیەکەی ئەوەبووە جەنگی لەگەڵ جەنگاوەرانی ڕاستەقینەدا نەکردووە.

پاش ماوەیەکی کورت، خەڵکی مەککە بیستیان کە هۆزەکانی هەوازن بەنیازن هێرشێکی گەورە دژ بە شارەکەیان ئەنجامبدەن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی شەڕکردنی نەبوو، بەڵام ناچارە جیهاد بکات و دژ بەو بێباوەڕانە بجەنگێ کە دژایەتی ئاینی ئیسلام دەکەن.

خێرا موسڵمانان بە هاوکاری موسڵمانە نوێیەکانی مەککە ئامادەباشیان وەرگرت. کەسانێک لە مەککە هاتنەناو سوپای ئیسلام کە پێشتر لەدژی پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەجەنگان. کاتێ هەموو ئامادەکارییەکان تەواوبوون، ژمارەی ئەو جەنگاوەرانەی کە بەدوای پێغەمبەرەوە بوون گەیشتبووە دوازدە هەزار جەنگاوەر.

هەردوو سوپاکە لەپێش بەیانیدا لە دۆڵی حونەین بەرانبەر یەکتری وەستان. سوپای هەوازن لەپێش بەرەبەیاندا هێرشی خۆیکرد تا موسڵمانان نەتوانن لە تاریکاییدا فێڵەکەیان بزانن، دوو هەزار سەرباز هەڵیانکوتایە سەر سوپای موسڵمانان. ئەمەش بووە هۆی ئەوە سوپای موسڵمانان ببێتە دوو بەش، بۆ ماوەیەک پەرتەوازەو شپرزبوون، لە گەرمەی ئەو پشێوییەدا، موسڵمانان بە هەموولایەکدا کەوتنە ڕاکردن و هەڵاتن، حیلەی ئەسپەکان لەناو تەپوتۆزی دۆڵی حونەیندا تێکەڵ بە قیژەو هاواری سەربازەکان بوو، دەنگی شمشێرەکان لە هەردوولاوە دەنگیان دەدایەوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە لێبڕان و وورەی بەرزو دامەزراوییەوە سواری ئەسپەکەی بوو، کاتێک موسڵمانانی بینی کە ڕادەکەن، بە عەبباسی مامی فەرموو: ((ئەی عەبباس، هاوەڵانی سومرە -واتە درەختەکە- بانگ بکە)). عەبباسیش کە دەنگێکی زوڵاڵی هەبوو بە هەموو توانای وتی: هاوەڵانی سومرە کوان؟ دەڵێ سوێند بەخوا کاتێ گوێیان لە دەنگم بوو هەروەک چۆن مانگا بادەداتەوە بەلای بەچکەکانیدا ئاوا بایاندایەوە! وتیان: ئا بەڵێ! ئا بەڵێ!

خێرا، موسڵمانان لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کۆبوونەوە، پێیانوت: (ئەی پێغەمبەری خوا، بە خوای کەعبە بەخوا وا هاتین). پێغەمبەر(ﷺ) وەها هاتە پێشچاو وەک بڵێی بەو ئازایەتییە بەرەنگاری هەمووی دوژمن دەبێتەوە. هاوەڵان هێزو ئازایەتییان لێیەوە وەرگرت، دەستوبرد بە گەرموگوڕییەکی زۆرەوە کەوتنە شەڕ لەگەڵ دوژمندا. کاتێ سوپای هەوازن خۆڕاگری و بەرەنگاری موسڵمانانیان بینی، ئیتر توانای خۆڕاگری و شەڕیان نەماو تێکشکان.

سوپای هەوازن بە ترس و بیمێکی زۆرەوە دۆڵی حونەینیان جێهێشت. موسڵمانان سەرکەوتنیان بەدەستهێنا. ئەوەش دامەزراویی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو کە لە سەختترین ساتەکاندا ئەو ئازایەتییەی بە موسڵمانان بەخشی.

## ٣٠٦. شایەتی بەهەقی عەکرەمە

لە ڕابردوودا عەکرەمەی کوڕی ئەبو جەهل، ئەویش وەک باوکی بەڕووی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) وەستا. بەڵام دوای ڕزگارکردنی مەککە باوەڕی بە پێغەمبەر(ﷺ) هێناو موسڵمانبوو، یەکێک بوو لەوانەی لە جەنگی حونەیندا دژ بە هۆزی هەوازن جەنگا. سوهەیلی هاوڕێیشی هەر لە ڕیزی سوپای موسڵماناندا دەجەنگا. لە کاتێکدا کە موسڵمانیش نەبوو، بەڵام بە مەبەستی بەرگری لە شاری مەککە بەشداریکرد لە جەنگەکەدا. کاتێ سوهەیل موسڵمانانی بینی ئاوا شپرزو پەرتەوازە بوون، نزیککەوتەوە لە عەکرمەو پێیوت موحەممەدو هاوەڵانی لەدوای ئەم جەنگە ئیتر هەرگیز ناتوانن بینەوە بە خاوەنی هێزو هەستنەوە، عەکرەمە وەڵامیدایەوە کە: (ئەوە بەدەستی خوایە، موحەممەد هیچ دەستەڵاتێکی تێیدا نیە، ئەگەر ئەمڕۆش لەسەری بکەوێ، ئەوا پاداشتی دوایی هەیە). ئینجا سوهەیل پرسیاری لێکرد: بەخوا تۆیش ماوەیەکی کەمە موسڵمان بوویت). عەکرەمە بە ژیرییەکەوە پێیوت: (ئەی ئەبو یەزید، ئێمە پێشتر لەسەر هیچ بووین، ئەقڵمان ڕۆیشتبوو، بەردەمان دەپەرست کە نە زیانی هەیە نە قازانج).

سوهەیل سەری سوڕما لە قسەکەی عەکرەمە. بۆی مەعلوم بوو ئەو کەسەی کە توانیویەتی ڕای هاوڕێکەی بەو شێوەیە بگۆڕێ کەسێکی گەورەیە.

## ٣٠٧. خوشکی شیریی

سەربازانی هەوازن ڕایانکردو گۆڕەپانی شەڕەکەیان جێهێشت، ژن و کوڕ و پێداویستییەکانیان لەدوایانەوە جێهێشت. ئەسپ و وشترەکان بەبێ خاوەن کەوتنە سوڕانەوە بە دۆڵی حونەیندا.

پێغەمبەری خوا هەڵسوکەوتی چاکی لەگەڵ دیلەکاندا کرد. منداڵ و ئافرەت و مەڕوماڵاتیانی خستنە ژێر دەستی خۆیەوەو پاراستنی. فەرمانی بە سەربازاندا هەڵسوکەوتی جوانیان لەگەڵدا بکەن و ئازارو زیانیان پێنەگەیەنن. هاوەڵانی پێیانوت: (ئەی پێغەمبەری خوا ئەوانە منداڵی بێباوەڕانن). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((کاتێ منداڵێک لەدایک دەبێت لەسەر سروشتی پاک لەدایک دەبێت تا ئەوکاتە زمانی خۆی گوزارشی لێدەکات، ئەوە دایبابیەتی دەیکەنە جولەکە یان گاور یان ئاگرپەرست)).

هاوەڵان گوێیان گرت بۆ فەرموودەکەی پێغەمبەر و گوێڕایەڵی بوون. مامەڵەی جوانیان لەگەڵ منداڵان و ئافرەتان و خزمەتکار و ئاژەڵەکاندا کرد. لەنێو ئەو ئافرەتە دیلانەدا ئافرەتێکیان تێدابوو هەر دەیوت: (ئایا ئێوە دەزانن من خوشکی شیری گەورەکەی ئێوەم؟).

کاتێ هاوەڵان گوێبیستی ئەو گوتەیەی بوون هێنایانە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێغەمبەر(ﷺ) ناسییەوە، ئەو ئافرەتە ناوی شەیما بوو، کچی حولەیمەی سەعدییەی دایەنی پێغەمبەر(ﷺ) بوو، چونکە پێغەمبەری خوا ماوەیەک لە تەمەنی لەگەڵ ئەو خێزانەدا لە دەرەوەی مەککە ژیانی بەسەربرد.

لە نزیکی خۆیەوە داینا، هەواڵی ساغو سەلامەتی و پێویستییەکانی لێپرسی. ئینجا داوایلێکرد باوەڕ بە ئیسلام بێنێ.

شەیما لەبیری مێرد و ماڵ و منداڵەکانیدا بوو کە جێیهێشتبوون، پاشان وتی: من دەمەوێت ئازادم بکەیت و بمگێڕیتەوە بۆ ناو قەومەکەم). پێغەمبەر(ﷺ) حەزەکەیی جێبەجێ کرد.

شەیما زۆر سەرسامبوو بەو بەخشندەییەی پێغەمبەر(ﷺ) و بە وەفاداریی بۆ خێزانەکەی. ئینجا شایەتومانی هێناو موسڵمانبوو، دوای ئەوە گەڕایەوە بۆ ئەو جێگایە لێیەوە هاتبوو، دیارییەکی زۆریشی لەگەڵ خۆی برد کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێی بەخشی.

## ٣٠٨. دڵخۆشیی دیلەکانی جەنگەکە

هەموو ئەو دەستکەوتە جەنگییانەی هۆزەکانی هەوازن لە گۆڕەپانی شەڕەکەدا جێیانهێشتبوو بوونە موڵکی موسڵمانان. شەش سەد دیلیان هەبوو، زۆربەیان ژن و منداڵی سەبازانی دوژمن بوون.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پۆشاکی پاکوخاوێنی بۆ ئامادەکردن، پاشان ئەوەندەی لە توانایدا بوو بەخەرجیدا تا شوێنی حەوانەوەو دڵئارامییان بۆ دابین بکات، کەس وەک دیل هەڵسوکەوتی لەگەڵ نەدەکردن. بەڵکو حیسابی میوانیان بۆ دەکرا. ئەوانیش پێزانینی خۆیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) و بۆ هاوەڵانی دەربڕی.

دوای ئەوە کە سەربازانی هەوازن لە گۆڕەپانی شەڕەکە هەڵاتن لە قەڵای تائیف خۆیان شاردەوە. نێردراویان ناردە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەو نێردراوانە هەواڵی خۆشیان پێبوو، دەیانوت کە هۆزەکانی هەوازن باوەڕیان بە ئیسلام هێناوە.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر دڵخۆشبوو بە تەوبەکردنیان و بە هەڵبژاردنی ڕێگای ڕاستی. ئینجا دیلەکانی ڕادەست کردنەوە، بەمەش شادییەکەیان بووە دوو شادی، چونکە ئاشنابوون بە جوانی و چاکی ئیسلام، سەرلەنوێ لەگەڵ کەسوکاریاندا یەکیانگرتەوە. جا هەرچەندە لە ڕابردوودا شەڕیان لەدژی ڕاگەیاند بەڵام دواجار تێگەیشتن کە پێغەمبەر(ﷺ) چەندە بەبەزەیی و بەسۆزەو موسڵمانانی چەندە خۆشدەوێ.

## ٣٠٩. وشترەکەی سوراقە

لە سەروبەندی گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە تائیفەوە، هاوەڵان پیاوێکیان بینی بەرەو لایان ڕادەکات، خێرا وەستاندیان، پرسیاریان لێکرد تۆ کێیت، وتی: (من سوراقەم).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) گورج ناسی، ئەمە ئەو کەسەیە کە کاتی کۆچکردنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ ئەبوبەکری هاوەڵیدا لە مەککەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە شوێنیان کەوتبوو. کاتێک قاچی ئەسپەکەی چەقییە ناو لم، باوەڕی بە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەر(ﷺ) هێنا، ڕێگای بەخۆی نەدا دەنگوباسی ئەوەی کە بینی بە قورەیشی بڵێ، جگە لەوەش، بەڵێنی بە پێغەمبەر(ﷺ) کە هەرکات موسڵمانان بەهێزتر بوون موسڵمان ببێ.

پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((بیهێنن بۆم)). کاتێ سوراقە لەبەردەمیدا وەستا پێغەمبەر فەرمووی پێی: ((نزیکبەرەوە ئەمڕۆ ڕۆژی بەجێگەیاندنی وەفاداریی و چاکەیە)). سوراقە نزیککەوتەوە ئینجا شایەتومانی هێنا.

سوراقە وەفای بە بەڵێنەکەی خۆیکرد کە چەند ساڵێک لەوەوپێش بڕیاری دابوو. لەو ماوەیەدا. تێگەیشت کە ئیسلام کۆتا ئاین و کامڵترینیانە. پێغەمبەر(ﷺ) دڵخۆشبوو بەو کارەی چونکە ئەم پیاوە ڕاستگۆیە ڕێگای ڕاستی دۆزییەوە.

سوراقە دەربارەی پاداشتی ئاودانی وشتری ونبوو پرسیاری لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کردو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! وشتری ونبوو دەچنەناو حەوزە ئاوەکەم، منیش بۆ وشترەکانم پڕکردووە، ئایا ئەگەر ئاویانبدەم پاداشتم هەیە؟).

پێغەمبەری خۆشەویستمان زۆر بەزەیی بە ئاژەڵاندا دەهاتەوە، ئەوانیش وەک مرۆڤ جێگای بەزەیی بوون. فەرمووی: ((بەڵێ، بۆ هەموو خاوەن جگەرێکی تەڕ پاداشت هەیە)).

سوراقە بە شادی و خۆشییەوە ڕۆیشت و وەک باوەڕداری گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی. بۆ لەوەو پاشیش پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبێتە پێشەنگی.

## ٣١٠. تیشکی خۆشەویستیی بەستەڵەک دەتاوێنێتەوە

مالیکی کوڕی عەوف، سەرکردەی هەوازن، زۆر توڕەبوو، چا وێڕای موسڵمانبوونی هۆزەکەی هێشتا هەستی ڕق و کینە هەر لە دڵیدا کاری خۆیان دەکرد. قوبوڵی نەبوو لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) تێکبشکێ. پێغەمبەر لە سەربازەکانی خۆشبوو، بەڵێنی پێدان دیلەکان و کەلوپەلەکانیان بۆ بگێڕێتەوە. بەڵام مالیک گومانی وابوو پێغەمبەر(ﷺ) ئەوە لەگەڵ ئەودا ناکات. هەرکات بیری بکردایەتەوە کە خێزان و ماڵ و موڵکەکەی لە دەستی موسڵمانانداپە، ئەوەندەیتر ڕقی لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبوویەوە، لەبەرخۆیەوە دەیوت: کێ لە سەرکردەیەک خۆشدەبێت کە جەنگی لەدژی ڕاگەیاندووە؟

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەوەی زانی، دەیویست کەسێکی ئازاو زیرەکی وەک مالیک ڕێگای ڕاستی بدۆزێتەوە. کاتێک ئەو کەسانە هاتن کە دیلەکان ببەنەوە هەواڵی مالیکی لێپرسین، ئەوانیش وتیان: (ئەو لە تائیفە لەناو قەڵای قایمدایە، لە خۆی دەترسێ). پێغەمبەر(ﷺ) بڕیارێکی دەرکردبوو کە هەرکەس پەشیمانبێتەوەو موسڵمان ببێ پێشوازی لێدەکات.

کاتێ پیاوەکان گەڕانەوە، پەیامی پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بە مالیک گەیاند، زۆر سەری سوڕما. چونکە ئەم هەڵوێستەی پێغەمبەر (ﷺ) لەپاش هەڕەشەو هێرشکردنی ئەو بوو بۆ سەر پێغەمبەر و ڕاگەیاندنی شەڕ لەدژی و زیانگەیاندنی زۆری بە موسڵمانان هات، کەچی وا ئێستە بانگیدەکات و لێی خۆشدەبێت و نایکوژێ.

ماليک سواری ئەسپەکەی بوو، زوو بەزوو ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). لەبەردەم پێغەمبەردا(ﷺ) هەستی بە سەغڵەتی دەکرد. وەک پەشیمانییەک سەری دانەواند. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست و لێبوردەمان هیچ پرسیارێکی لێنەکرد، لێپێچینەوەی لەگەڵ نەکرد، بەڵکو بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە پێشوازی لێکرد، ئەمە بووە هۆی بەدڵاچوون و پێزانینی زۆری ماليک، ئینجا شايەتومانی هێناو هاتەناو ئیسلام. پێغەمبەری خوایش(ﷺ) سەروەت و ماڵ و منداڵەکانی بۆ گێڕايەوە، هاوکات سەد وشتریشی بەدياری پێدا، ماليک زۆر سەرسامبوو بەو بەخشندەییە بێسنورەی پێغەمبەری خوا(ﷺ). جا هەروەک چۆن بەستەڵەک لەبەر تیشکی خۆردا دەتاوێتەوە ئاوا هەرچی هەستی ڕق و کینە لە دڵیدا هەبوو توایەوە. ئەو دوژمنایەتەی نەما کە بەرانبەر بە موسڵمانان هەیبوو، هیچ ئاسەوارێکی لەسەری نەما. هات ئەم چەند دێڕە شیعرێکی بەسەر پێغەمبەری خوادا(ﷺ) هۆنییەوە کە ئەمە واتای کوردی ئەو دوو دێڕە شیعرەیە، دەڵێ:

هەموو ئەوەی دەربارەی خەڵکی بینیومەو بیستوومە...لە هەموويانداا ئەوەم نەبينيوەو نەبيستووە کە لە موحەممەد دا بوونی هەيە

گەر داوای لێکرا بەوەفاترین و بەخشندەترین کەسە...هەرکاتیش بیەوێت ئاگادارت دەکات بەوەی سبەینێ ڕوودەدات

دوای ئەوە، ئاشتی و برايەتی و ڕێز لە هەموولايەک باڵیکێشا بەسەر موسڵماناندا. ماليک پەی بە هەڵەی خۆیبرد و قەناعەتی هێنا بە پێغەمبەرايەتی موحەممەد. لەوکاتەوە ئیتر ئامادەباش بوو لەپێناوی ئیسلامدا قوربانی بە گیانی خۆی بدات.

## ٣١١. بڕکەیەک وشتر

دوای تەواوبوونی جەنگ لەگەڵ هەوازندا، سەروەت و سامان و ئاژەڵێکی زۆر کەوتە دەست موسڵمانان. لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە دۆڵێکی نزیک بە بڕکە وشترێکی زۆر وەستابوو، صەفوانی کوڕی ئومەییە کە هێشتا موسڵمان نەبوو بوو هاتە لای، هەر چاودێری ڕەفتاری پێغەمبەر(ﷺ) دەکرد و گوێی لە قسەکانی گرتبوو. دەیویست زیاتر ئاشنا ببێت بە ئیسلام.

صەفوان بە دیمەنی وشترەکان ئەبلەق بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) سەد وشتری پێدا. صەفوان پێی سەیر بوو، نەیدەزانی چۆن وەڵامبداتەوە، چونکە بەخشندەییەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تووشی شڵەژانی کرد، ئەو ڕاستییەی بۆ ڕوونبوویەوە کە بەدرێژایی ساڵانی پێشوو نەیدەبینی. هات موسڵمانبوو. دوای ئەو کارەی دەیوت: (سوێند بەخوا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی پێدام کە پێیدام، کەچی من لە هەموو کەس زیاتر ڕقم لێیبوو، ئەویش هەر بەردەوام دەیدامێ تا وایلێهات بووە خۆشەویستترین کەس لە لام.

## ٣١٢. واق وڕمانی قورەیش

کاتـی ئـەوە هـات ئـەو دەسـتکەوتە جەنگییانـە کـە موسـڵمانان لـە جەنگی حونەینـدا بەدەسـتیان هێنابـوون دابەشـبکرێن. لەنێـو سـوپای موسـڵماناندا کەسـانێک هەبـوون کـە دوای ڕزگارکردنـی مەککـە موسـڵمان بـوو بوون. لـە مەککەشدا کەسـانێک هەبـوون هێشتا خوای گـەورە لەزەتـی نیعمەتـی ئیسـلامی نەبەخشـیبوو پێیـان.

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دەیویسـت بـاوەڕی تـازە موسـڵمانەکان بەهێـز بکات، هەروەهـا حەزیدەکرد دڵی ئەوانـە نـەرم بکات کە هێشـتا موسـڵمان نەبـوو بوون. لەبەرئـەوە، بڕیاریدا هـەموو دەسـتەکەوتەکان دابەشـبکات بەسـەر قورەیشـدا. هیچـی لێنـەدا بـە پشـتیوانان.

موسـڵمانە قورەیشـییەکان بـە کـۆڵ و بـاری دەسـتەکەوتەکانەوە لـە وشتر و ئەسپ و زیو گەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان، هەمووان سەراسیمە بـوون لـەوەی ڕوویـدا، چونکـە قورەیـش تـا ئـەو ڕۆژە لـە هەمـووی ژیانیـدا بەخشـندەیی وەهـای نەبینیبوو. ئەبو سـوفیان هـاواری دەکردو دەیـوت: (بەڕاسـتی تـۆ بەخشـندەیت، بـاوک و دایکـم بەقوربانـت بێت ئـەی پێغەمبـەری خـوا!) چونکـە لـەو سـەردەمەدا خەڵکـی بـەو شـێوازە گوزارشـیان لـە لایەنداریـی و خۆشەویسـتییان بـۆ یەکتـری دەکـرد.

درێژەی پێداو وتـی: (کاتێ لـەدژت جەنـگام، تـۆ باشـترین جەنگاوەر بوویـت، پاشـان ئاشـتیم لەگەڵـت کـرد، باشـترین ئاشـتیخواز بوویـت، خـوای گـەورە پاداشـتی چاکـەت بداتـەوە).

## ٣١٣. شادمانیی پشتیوانان

لـە کاتێکدا کـە موسـڵمانانی مەککـە لەنێوان خۆیانـدا سـەرقاڵی دابەشـکردنی دەسـتکەوتەکان بـوون، پشـتیوانان لەلایەکـەوە وەسـتان، سـەریان سـوڕما کـە هیـچ پشـکێکیان پێنـەدرا. هەندێکیـان تێنەگەیشـتن کـە پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) بۆچـی وەهـا هەڵسـوکەوتی کـرد. باوەڕیـان وابـوو فەزڵـی قورەیشـی داوە بەسـەریاندا. ئـەوەش غەمبـاری کـردن.

کاتێک پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) هەسـتی بـەو غەمباریەیـان کـرد، هـات هۆکاری دابەشکردنی دەستەکەوتەکانی بەسـەر قورەیشدا لـە کاتێکدا ئەوانـە تـازە بـە تـازە موسـڵمانبوو بـوون بـۆ باسـکردن. بـە پشـتیوانانی فەرمـوو: ((مـن بـە کەسـانێک دەبەخشـم کـە تـازە لـە بێباوەڕییـەوە هاتـوون و فێـری ئەمـە نەبـوون)). پاشـانیش فەرمـووی: ((ئـەوەی وتتـان پێمگەیشـتەوە، غیرەتێـک بـوو لـە خۆتانـدا دەیبینـن، ئایـا کاتـێ هاتمـە ناوتـان ئێـوە لەسـەر گومڕایـی نەبـوون، خـوای گـەورە هیدایەتیـدان؟ ئـەی نـەدار نەبـوون خـوای گـەورە دەوڵەمەنـدی کـردن؟ ئـەی دوژمنـی یەکتـری بـوون خـوای گـەورە دڵەکانتانـی کـرد بەیـەک؟ ئـەی پشـتیوانان ئـەوە بـۆ وەڵاممنادەنـەوە؟)).

ئەوانیش بەوپـەڕی ڕێـزو ئەدەبـەوە وتیـان: (ئـەی پێغەمبـەری خـوا چ وەڵامێکـت بدەینـەوە؟ خـوا و پێغەمبەرەکـەی چاکـەو فەزڵـی زۆریـان لەسـەرمانە، ئـەوەی پێشـتر وەرمانگرتـووە لـەوە زۆرتـرە کـە ئەمـڕۆ نامانـدرێتـێ).

پێغەمبـەری خـوا(ﷺ) دڵخۆشـبوو بـە تێگەیشـتوویی پشـتیوانان و وەڵامەکەیـان. ئینجـا فەرمـووی: ((بـەڵام بەخـوا ئەگـەر بتانـەوێ شـتێک

بلێن ئەوا بۆتان هەیەو منیش بڕواتان پێدەکەم، دەی بلێن تۆ هاتیتە ناومان دەرکراو بوویت ئێمە پەنامان دایت، نەداربوویت دڵنەواییمان کردیت، لە ترسدا دەژیایت پاراستمانی، بەکەم سەیر دەکرایت سەرمانخستی، بەدرۆیان خستیتەوە ئێمە بڕوامان پێکردیت)).

پشتیوان گوێیان ڕادێرا لە گوفتاری پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا بەردەوامبوو و فەرمووی: ((ئەی پشتیوانان ئایا بەوە ڕازی نین خەڵکی بە مەڕو وشترەوە بگەڕێنەوەو ئێوەش بە پێغەمبەری خواوە بگەڕێنەوە شوێنی خۆتان؟)). پاشتر پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆکردن و فەرمووی: ((پەروەردگارا بەزەییت بە پشتیوانان و منداڵانی پشتیوانان و منداڵی منداڵانی پشتیوانانیشدا بێتەوە)). ئەوانیش بە یەکدەنگ وتیان: (ئێمە بە دابەشکردن و بەشی پێغەمبەری خوا ڕازین).

ئەو دوعا جوانە زۆر کاری کردە سەر پشتیوانان، بە ئاستێ هەندێکیان دایانە قوڵپەی گریان. چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) شوێنی لەدایکبوونی خۆی کە زۆری خۆشدەویت جێدەهێڵێ و لەگەڵ ئەواندا دەگەڕێتەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە. بەمەش ئەو بەڵێنەی جێبەجێ دەکات کە چەندین ساڵ پێش ئێستە پێیدابوون. ئەگەر بیویستایە ئەوا دەبووە گەورەیەکی گوێڕایەڵ لە مەککەدا. بەڵام ئەو پێغەمبەرێکی(ﷺ) خاکییە. ژیانی لەگەڵ پشتیوانانیدا هەروەک یەکێک بێت لەوان لە هەر شتێکیتر پێباشتر بوو.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) یەکێک لە هاوەڵانی کردە سەرۆکی مەککەی پیرۆز، ئەو شوێنە پیرۆزەی دایە دەستی ئەمین. پاشان تەوافی کەعبەی کردو خواحافیزی لە خۆشەویستانی کردو گەڕایەوە بۆ مەدینەی مونەووەرە. پشتیوانان زۆر شادو کامەران بوون بەو هەڵسوکەوتەی و چاوانیان پڕبوو لە فرمێسک. چونکە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان(ﷺ) لەگەڵیاندا دەگەڕێتەوە مەدینەو لەگەڵ ئەواندا ژیان دەباتەسەر.

## ٣١٤. میوانپەزێریی پێغەمبەر(ﷺ)

خەڵکی کەوتنە گواستنەوەی هەواڵی ڕزگارکردنی مەککەو ئەو سەرکەوتنەی موسڵمانان لە جەنگی حونەیندا بەدەستیانهێنا. دەستە دەستە ڕوویانکردە مەدینەی مونەووەرە بۆ بینینی پێغەمبەر(ﷺ) کە لەوێ دەژی و بۆ ئاشنابوون بە ئیسلام، جا بەو سیفەتە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەمیشە میوانپەزێر بووەو خزمەتی میوانی کردووە ئەوا زۆر بەگەرمی پێشوازی لێکردن.

فەرمانیدا بە خەڵکی پێشوازی لە میوانەکان بکەن و میوانداریيان بکەن، چونکە ئەم کارە لە باشترینی کارەکانەو پاداشتی زیاترە. هاوەڵان چاویان لە پێغەمبەر(ﷺ) کردو باوەشیان بۆ میوانەکان گرتەوەو دەرگای ماڵەکانیان واڵاکرد بۆ ئەو میوانانەی ڕوویان لە مەدینە کرد. میوانەکانیش ئەو هەڵسوکەوتەی لە پێغەمبەرو(ﷺ) هاوەڵانەوە بەدییانکرد زۆر چوو یەدڵیاندا. دوای ئەو میوانداری و ئاشنابوونەیان بە ئیسلام، بە نواندنی ڕێزو حورمەت بۆ پێغەمبەر(ﷺ) گەڕانەوە ناوچەکانی خۆیان.

لەو کاتەدا، چەندین دەوڵەتی ناوچەیی لە نیوە دوورگەی عەرەب باوەڕیان بە ئیسلام هێنا. بۆیە دەبوو فێری ڕێنماییەکانی ئاین بکرانایە، لەبەرئەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانڕەوای نوێی لەسەر ئەو ناوچانە دانا و چەندین هاوەڵی بۆ ڕەوانەکردن. ئەو هاوەڵانەی کە ئەو ئەرکە قورسەی دەسپارد پێیان ئامۆژگاری دەکردن و دەیفەرموو: ((ئاسانکاربن و شت قورس مەکەن، نزیککەرەوە بن و دوورخەرەوە مەبن)).

هاوەڵان ڕۆیشتن بۆ ئەو ناوچەو شارانەو باسی حەلال حەرامەکانی ئیسلامیان بۆ خەڵکی دەکرد. خەڵکی ئەو ناوچانەش کۆمەڵە مەسەلەیەکی جوانیان دەبیست کە پێشتر نەیانبیستبوو. ڕەفتارەکانی ئیسلام و ڕەوشتە نایابەکەییان بینی، ئاشنابوون بە جوانی برایەتی لەم ئاینەدا. بەم پێیە باری ڕۆژانەی ژیانیان گۆڕدرا. ئەو سەروەت و سامانەی کە دەوڵەمەندان هەیانبوو بەشیانکرد لەگەڵ هەژارانەکانداو بووە مایەی دڵخۆشی نەداران، هاوکات دەوڵەمەندانیش هەستیان بە شیرینی بەخشین کرد.

خەڵکی بە تێپەڕبوونی کات ئەو پێغەمبەر(ﷺ) چووە دڵیان کە بانگەشەی بۆ ئەم ئاینە نوێیە دەکرد. ستەمکردن و چەوساندنەوەو دزی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بەرەو نەمان چوون. بەڕاستی لە مەدینەوە ڕووناکییەکی درەوشاوە پرشنگی خۆیدا. ئەو ڕووناکییە وردە وردە بە سەرتاسەری جیهاندا بڵاوبوویەوە.

## ٣١٥. دڵخۆشبوونی سیفانە

وێڕای باوەڕهێنانی خەڵکانێکی ئێجگار زۆر بە ئاینی ئیسلام، بەڵام هەر هەندێ لە هۆزەکان درێژەیاندا بە دوژمنایەتیکردنی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، چەندین هێرشیان کردە سەر موسڵمانان. لە یەکێک لەو جەنگانەدا موسڵمانان ئافرەتێکیان بەناوی سیفانە بەدیلگرت، سیفانە ئافرەتێکی زیرەک و ڕۆشنبیر بوو. کاتێ چاوی بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوت، هاتە لای و پێیوت: (ئەی موحەممەد، باوکم لەناوچوو، ئەوەی بەرگری لێدەکردم نەما. ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکە ئازادم بکە، دڵی هۆزە عەرەبەکانم پێخۆش مەکە، من کچی گەورەی قەومەکەی خۆمم، باوکم خەڵکی لە تەنگانە ڕزگار دەکرد، ناموسی دەپاراست، ڕێزی میوانی دەگرت، برسی تێردەکرد، خاوەن کێشەی دڵخۆش دەکرد، نانی بە خەڵکی دەدا، سڵاوی لە خەڵکی دەکرد، هەرگیز داواکاری خاوەن پێداویستی ڕەتنەکردووەتەوە، من کچی حاتەمی تائیم).

پێغەمبەری خوا پێشوازی گەرمی لێکرد، داوای لێکرد موسڵمان بێ، سیفانە لەبەردەم ئەو سۆزو ڕەوشتە بەرزەی پێغەمبەردا(ﷺ) خێرا باوەڕی بە ئیسلام هێنا، دوای ئەوە، گەڕا بەدوای براکەیداو دواجار دۆزییەوە، براکەی ناوی عەدی کوڕی حاتەمی تائی بوو، گەورەی هۆزی تائی کە بەناوبانگن بە میوانپەزێری و بەخشندەیی، سیفانە ئەوەی بۆ گێڕایەوە کە ڕوویدابوو، کاتێک عەدی ئەو لێبوردەیی و نەرمونیانیەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) بیست پێیخۆشبوو، حەزیکرد بە زووترین کات چاوی پێی بکەوێت. خێرا ڕۆیشت بەرەو مەدینەی مونەووەرە.

کاتێ عەدی گەیشتە مەدینە، ڕۆیشت بۆ بینینی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، سڵاوی لێکرد، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) ناسی کە کێیە، میوانداری کرد بۆماڵەکەی خۆی. لە کاتێکدا پێکەوە بە ڕێگادا دەڕۆیشتن، پیرەژنێک وەستاندنی، لەبارەی پێویستییەکی خۆیەوە کەوتە قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەری خوا(ﷺ). عەدی زۆر سەری سورما لە ئارامگرتن و گوێگرتن و تێگەیشتوویی پێغەمبەر(ﷺ)، چونکە خۆیشی گەورەی قەومەکەی خۆی بووە، خەڵکانی لاوازو داماو ئا بەوشێوەیە نەیانوەستاندووە. ئەگەر ئەوەشیان کردبێ ئەو گوێی بۆ نەگرتوون، بەڵکو ناردوونی بۆ لای وەزیرەکانی، بەڵام ئەم پیاوەی بینی کە زۆر بەسۆزو بە ئارامە بەرانبەر بە پیرەژنێک. دوای ئەوە پیرەژنەکە ڕۆیشت کەوتنەوە ڕۆیشتن.

ئەو ڕووداوە زۆر کاریکردە سەر عەدی، لەبەرخۆیەوە دەیوت (سوێند بەخوا ئەمە پادشایەتی نیە. مەعلوم پێغەمبەرە!). دوای گەیشتنیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پشتییەکی لە پێست دروستکراوی هێناو خستییە ژێر عەدی، خۆیشی لەسەر زەوی دانیشت، عەدی ئەو میوانپەزێری و خاکیبوونەی پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چوو بەدڵیدا!

ئێستە ئیتر عەدی باوەڕی هێنا کە ئەم پیاوە پادشا نیەو پێغەمبەرێکی ڕاستەقینەیە. ئەویش چوون سیفانەی خوشکی شایەتومانی هێناو موسڵمانبوو.

## ٣٦٦. حەزکردنی پێغەمبەر(ﷺ) بە ژیانی سادەو ساکاریی

پرەنسیپەکانی برایەتی ئیسلامی لە سەرتاسەری جیهاندا بڵاودەبوونەوە. هاوکات زۆرێک لە هۆکارەکانی ژیانی خۆشگوزەرانی لەبەردەستی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بوونیان هەبوو. چونکە دەوڵەتی ئیسلامی بەهێزتر بوو بوو. مەترسی برسێتی و هەژاری لەنێو موسڵماندا نەمابوون.

بەڵام تەنانەت لەو ڕۆژانەشدا کە هەرزانی و دەوڵەمەندیی باڵیکێشا بەسەر جیهانی ئیسلامیدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ خانەوادەکەیدا هەر لە ژیانێکی خاکیی و سادەو ساکاردا دەژیا. ڕۆژێکیان، عومەر هاتە خزمەتی و پێغەمبەریش(ﷺ) لەسەر ڕاخەرێکی حەسیر ڕاکشابوو. کاتێ عومەر گەیشت، هەستایەوەو بانگیکرد دابنیشێ، عومەر شوێنەواری حەسیرەکەی لەسەر پێستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەدیکرد، ئەوکات، خۆی بۆ نەگیراو گریا. کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) عومەری لەو حاڵەتەدا بینی، پرسیاری لێکرد کە بۆچی دەگری. عومەر سەیرێکی کردو وتی کاتێ تۆم لەو حاڵەدا بینی، پادشاکانی ڕۆم و فارسم بیرکەوتەوە، چونکە ئەوان لەسەر تەختی ئاڵتونی دادەنیشن و لەسەر ڕاخەری ئاورێشم دەخەون، کەچی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەو ژیانە تەواو سادەو ساکارەدا ژیان دەباتەسەر.

ئینجا پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو پێیوت خۆشیی و زرق و برقی دنیا بۆ ئەوانەیە هەوڵی بۆ دەدەن، بەڵام باوەڕداران ئەوا ئەو بەختەوەریی هەتا هەتاییەیان لە ڕۆژی دواییدا دەرخوارد دەدرێ کە چاوەڕێیانە.

عومەر لە کرۆک و مەبەستی گوتەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشت، چونکە مادامێ ئەم جیهانە هەژارو برسی تێدایە ئەوا پێغەمبەر نایەوێت لە ژیانی خۆشگوزەرانی و هەرزانی و ڕابوردندا بژی. لەبەرئەوە، هەرچی هەبوایە دابەشیدەکرد بەسەر هەژاران و نەداراندا. ئەو هەوڵی دەستخستنی ژیانی خۆشی قیامەتی دەدا، چونکە ژیانی دنیا کاتییەو بە هەموو ئەوەش کە تێیدایە هەر دوابڕاوە.

## ٣١٧. ڕەوشتە جوانەکانی ئیسلام

خەڵکی لە شوێنە دوورە دەستەکانەوە دەهاتنە مەدینە تا فێری ڕێنماییەکانی ئیسلام ببن. پاشان، دەگەڕانەوە بۆ شارو ناوچەکانی خۆیان بۆ بڵاوکردنەوەی ئەو ڕێنماییانە بەنێو ئەو خەڵکانەدا کە نەیانتوانیوە بێن بۆ مەدینەی مونەووەرە.

ڕۆژێکیان، کۆمەڵە کەسانێک بە شاندێک هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). یەکێکیان پرسیاری لەبارەی ڕێزگرتنی میوانەوە لێکرد. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەرکەس باوەڕی بە خواو بە ڕۆژی دوایی هەیە با ڕێز لە میوانەکەی بگریَ)). کابرا دڵخۆشبوو بە وەڵامەکە، دیسان پرسی: (ئەی ماوەکەی چەندە؟) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((میوانداریی سێ ڕۆژە، لانیکەمی شەو و ڕۆژێکە، دروست نیە موسڵمان زیاتر لەوە لای براکەی بمێنێتەوە نەبادا هیچی نەبێت بتوانێ خزمەتی بکات)).

بەمشێوەیە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) باشەی ئەو خاوەن ماڵەی فەرموو کە لە ماڵی خۆیدا پێشوازی لە خەڵکی دەکات، هەروەها هۆشداری بە میوانەکان داوە کە با زۆر نەمێننەوە نەبادا خاوەن ماڵ تووشی سەغڵەتی بکەن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فێری ئاکارە کۆمەڵایەتییە جوانەکانمان دەکات، فەرمانی پێداوین مامناوەند بین لە هەڵسوکەوتماندا، بەڵکو دەبێ هەردەم بیر لەوانیتریش بکەینەوە.

ئەو شاندە سێ ڕۆژ لە مەدینەی مونەووەرە مانەوە، پاشان گەڕانەوە بۆ شوێنی خۆیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) دیاری پێشکەشکردن و بەوپەڕی ڕێزەوە خواحافیزی لێکردن.

ئەو خەڵکانە لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) کۆمەڵە سیفەتێکی جوان فێربوون لەوانە بەخشندەیی و مرۆڤدۆستی و گۆڕینەوەی دیاری. بە گەڕانەوەیان پێغەمبەر(ﷺ) زۆر چووە دڵیانەوە. موسڵمانان بە فەزڵی پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ژیارێکی تەواو نوێیان وەرگرت. ئەویش ژیاری ئیسلامییە کە لە سەرتاسەری جیهاندا دەنگیدایەوە.

## ٣١٨. پێشبڕکێ بۆ ئەنجامدانی کاری چاکە

لە مانگی ڕەجەبی ساڵی نۆی کۆچی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمانیدا بە خۆئامادەکردن بۆ جەنگی ڕۆم، ئەمەش لە کاتێکدا بوو کە باری بژێوی خەڵکی سەخت بوو، گەرما بەتین بوو، وڵات دووچاری وشکەساڵی و گرانی هاتبوو.

جا بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی هێزی ڕۆم، دەبوو موسڵمانان ئامادەسازییەکی زۆر باش وەربگرن. بۆ ئەو مەبەستە پێویستییان بە قەڵغانی زۆر هەبوو. هەروەها دەبوا کەلوپەلێکی زۆر لە خواردەمەنی و خواردنەوە ئامادن بکەن، ئیتر جگە لە ژمارەیەکی زۆر لە ئەسپ و وشتری بەهێز.

بۆ دابینکردنی هەموو ئەو پێداویستییانە، هاوەڵان شەویان دایە دەم ڕۆژ، هەموو ئەوەی هەیانبوو حازریان کردو لەبەردەم پێغەمبەری خوادا(ﷺ) دایاننا، تەنانەت هەژارەکانیشیان. هەر هەموو ویستییان بە شتێک پشکیان هەبێت بۆ سوپای موسڵمانان تا پادشت لەسەری وەربگرن، لەگەڵ هەموو ئەو هەوڵانەدا ئافرەتان هەرچییان هەبوو لە خشڵ و شتی بەنرخ هەموویان نارد تا ئەوانیش پشکیان هەبێت.

عوسمانی زاوای پێغەمبەر، کاروانێکی بازرگانی ڕێکخست، ئەمە لە کاتێکدا بەنیازبوو کاروانێکی بازرگانی کە پێکهاتبوو لە باری سێسەد وشتر لە شمەکی نەختینەو پڕبەها بنێرێت بۆ شام. هەرکە بیستی کە پێغەمبەر(ﷺ) خەریکی ئامادەسازییە بۆ جەنگ هەموو وشترەکانی هێنایە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پێغەمبەریش بەو

بەشدارییەی عوسمان زۆر دڵخۆشبوو و فەرمووی: ((لەمەوپاش عوسمان هەرچییەک بکات زەرەری لێناکات)).

عومەریش بەهەمانشێوە نیوەی سەروەت و سامانەکەیی دایە پێغەمبەر(ﷺ) بۆ خزمەتی سوپاکە. پاشان ئەبوبەکریش هاتە خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و هەموو ئەوماڵەی هەیبوو ئامادەی کرد. ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) پرسیاری لێکرد: ((ئەی ئەبوبەکر چیت بۆ ماڵ و منداڵ بەجێهێشتووە؟)) ئەبوبەکر بە متمانەیەکی زۆرەوە وتی: (خواو پێغەمبەری خوام بۆ جێهێشتوون). ئەو کارەی ئەبوبەکر زۆر کاریگەری لەسەر عومەر دروستکرد و وتی: (ئەی ئەبوبەکر سوێند بەخوا هەرگیز لە کاری چاکەدا پێش تۆ نەکەوتووم، چونکە هەرکات پێشبڕکێم لەگەڵتدا کردبێت ئەوا هەر تۆ پێشکەوتوویت).

## ٣١٩. نائومێدبوونی سوپای ڕۆم

دووڕووەکان وەک عادەتی هەمیشەیی خۆیان، لە ئان و ساتی ئامادەسازی موسڵمانان بۆ جەنگ دەستەوسان دانەنیشتوون، عەبدوللە کوڕی ئوبەی کەوتە بڵاوکردنەوەی بیرە ژەهراویەکانی لەنێو موسڵماناندا تا ورەیان لاواز بکات، پێیوتن: (ئایا موحەممەد وادەزانی شەڕکردن لەگەڵ ڕۆم گاڵتەیە؟ من دڵنیام هاوەڵەکانی یەک لەدوای یەک لەبەردەم ڕۆمدا تەختی زەوی دەبن).

کوڕەکەی ئوبەی توانی کاربکاتە سەر هەندێ کەس، ئەوانیش کەوتنە دۆزینەوەی بڕوبیانوو تا بەشداری نەکەن لەو هێرشەدا. زۆرێکیان نەچوونە ناو سوپاکەوە ئەویش بە بیانووی بوونی گەرمای بەتین. موسڵمانان بەو هەڵسوکەوتەیان غەمباربوون.

موسڵمانان پلانیان دارشت تا لە ناوچەی تەبوک ڕووبەڕووی دوژمن ببنەوە. زۆرێک لە موسڵمانان لە هەموو ناوچەکانەوە کاتێ زانیان کە ڕۆم شەڕی لە دژیان ڕاگەیاندووە چوونە ناو سوپاکەوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە ماوەیەکی کورتدا، سوپایەکی گەورەی کۆکردەوە، بەدەم زیکردن و اللە ئەکبەر بە دەنگە بڵندەکەیان ڕۆیشتن بەرەو تەبوک. پێغەمبەری خوا(ﷺ) باوەڕی وابوو کە سوپایەکی زەبەلاح لە تەبوک چاوەڕێیانە بەڵام جگە لە دۆڵێکی خاڵی هیچیتریان نەبینی. لەبەرئەوە موسڵمانان دانیشتن و چاوەڕێیان دەکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستیکرد بە هاندانی موسڵمانان و بەرزکردنەوەی ورەیان.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) و سوپاکەی ماوەی بیست ڕۆژ لە تەبوک مانەوەو هەر لە چاوەڕوانی ئەو دوژمنەدا بوون کە هەر نەهات. ئینجا سوپاکە دەستکۆتا بوون و لەکوێوە هاتبوون بەشوێنی خۆیاندا گەڕانەوە. ئەوەش بەهۆی هەڵوێستی ژیرانەو دانایانەو ئازایانەی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو. موسڵمانان سەرلەنوێ هەستییان بە سەرکەوتنێکی گەورە کرد. چونکە ئەم پێغەمبەرە خاتەمی پێغەمبەرانە. خوای گەورە نیعمەتی ئازایەتی و لێبڕان و لێبوردەیی و دانایی پێبەخشیوە.

ئیمپراتۆری ڕۆم هەستی بە ئازایەتی و ڕێزداری پێغەمبەری خوا(ﷺ) کرد، لەبەردەم هەڵوێستی نەگۆڕیدا هەستی بە هەڕەشە دەکرد. لەبەرئەوە وازی هێنا لە بیرۆکەی هێرشکردنە سەر موسڵمانان. لەو ڕۆژەدا خوای گەورە پاڵپشتی پێغەمبەر(ﷺ) و سوپاکەیی کرد، شەڕو کوشتار لێ دوورخستنەوە.

## ٣٢٠. پێغەمبەری خوا(ﷺ) وشترەکەی وندەکات

لە کاتێکدا سوپای موسڵمانان لە تەبوک لە چاوەڕوانی هاتنی سوپای ڕۆمدا بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) وشترەکەیی ونکرد. لەگەڵ موسڵماناندا هەموو شوێنێکی بۆ گەڕان، بەڵام نەیدۆزییەوە. چەند دووڕوویەک وتیان: (ئەوە موحەممەدە کە پێماندەڵێ پێغەمبەرم، گوایا هەواڵی ئاسمانتان دەداتێ، بەڵام نازانێ وشترەکەی خۆی لەکوێیە؟).

پێغەمبەری خوا ئەو قسەیەی بیست، فەرمووی: ((بەڵێ بەخوا من هیچ نازانم، مەگەر خوای گەورە فێرم بکات)).

کاتێ هاوەڵان بە سەرسوڕمانەوە دیانڕوانی بۆی، درێژەی بە گوتەکانیداو فەرمووی: ((ئەوا پیشانیدام، ئەو لەو دوڵەدایە ڕەشۆکەی ئالاوە بە درەختێکەوە)).

هاوەڵان ڕۆیشتن بۆ ئەو شوێنە کە پێغەمبەر(ﷺ) ناونیشانەکەیی دا، لەوێ وشترەکەیان دۆزییەوە. هەر بەڕاستی ڕەشۆکەی چەند دەورێک ئاڵێنرابوو بە دەوری درەختەکەدا. هەستان گوریسەکەیان کردەوەو گێڕایانەوە بۆ خاوەنەکەی. ئەوکات دووڕووەکان بە بێتاقەتییەوە ڕۆیشتن.

## ٣٢١. ئەو خورمایە بەشی هەمووی جیهان دەکات

سوپای تەبوک لە ڕێگای گەڕانەوەیدا تووشی کەمی خۆراک هات. هاوەڵان ئەم باسەیان گەیاندە پێغەمبەری خوا(ﷺ)، داوایان لێکرد ڕێگایان بدات وشترەکان سەرببڕن. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) داوای لێکردن هەر خۆراکێک کە لەلایان ماوەتەوە بیهێنن بۆی.

سەربازەکان هەستان بە هێنانی هەر خواردنێک کە هەیانبوو. باشترینیان کەسێک بوو کە مشتێ تا دوو مشت خورمای لا مابوو. هەموو خواردنەکەیان خستە سەر پارچە پێستێکی بچوک. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دۆعای کرد تا فەڕو بەرەکەتی تێبکەوێ. پاشان فەرمانی پێدان و فەرمووی: ((دەفرەکانتانی لێ پڕبکەن)). هەموو سوپاکە هات و هەر سەربازەو دەفر یان کیس یان جانتای خۆی هێناو پڕیکرد لە خواردن. دوای ئەوە کە هەریەکەیان پشکی خۆی برد هێشتا بڕێکی زۆر خورما مابوویەوە.

ئەمەش موعجیزەیەکە لە موعجیزەکانی پێغەمبەر(ﷺ)، سەربازان لەکاتێکدا سەرقاڵی خواردن بوون، سەریان سوڕما لەوەی ئەو خواردنەیان دوای ئەوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دۆعای بەسەردا خوێند چەند قات زیادی کرد. وا هەستیانکرد کە ئەگەر هەمووی جیهان بهاتایە ئەوا ئەو چەند دنکە خورمایە بەشی خواردنی هەموویی دەکرد، دوای ئەوە سەربازەکان سکیان تێرکرد کەوتنەوە ڕۆیشتن.

دوای سەفەرێکی سەخت و ماندوکەر، گەیشتنەوە قەراغی مەدینەی مونەووەرە، کاتێ نزیکبوونەوە لە کێوی ئوحود پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێیان: ((ئەوە ئوحودە، کێوێکە خۆشیدەوێین و

خۆشماندەوێ)). هاوەڵان هەستیان وابوو کە کێوی ئوحود سڵاویان لێدەکات.

هەواڵی گەڕانەوەی سوپاکە دەمێک بوو گەیشتبووە مەدینەی مونەووەرە، خۆشی و شادی کەوتە ناو خەڵکەکەی، هەستییان بە شانازییەکی گەورە کرد چونکە دوژمن جورئەتی ئەوەی نەبوو ڕووبەڕووی سوپای موسڵمانان بێتەوە. جا بۆ پێشوازیکردن لە سوپاکە، ئافرەتان و منداڵان و هەرکەسێکیتر لە مەدینە بوو کۆبوونەوە بۆ پێشوازیکردن لێی.

منداڵان بە هەڵەداوان گەیشتنە پێغەمبەری خوا(ﷺ) و دەنگی شادی و خۆشییان بەرزبوویەوە. موسڵمانانی مەدینە بۆ جارێکیتر لەگەڵ پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان و باوکان و منداڵان و کەسوکاریان کۆبوونەوە.

## ٣٢٢. بەرهەمی ئارامگرتن و خۆڕاگریی

کەسانێکی نیەت پیس و خراپ تێکەڵ بە موسڵمانان بوون و لەگەڵیاندا دەژیان. بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەڵسوکەوتی لەگەڵ خەڵکیدا هەر بە سۆزو خۆشەویستی و ڕێز بوو، بە خراپە ڕووبەڕووی خراپەکانیان نەبوویەوە.

عەبدوڵڵە کوڕی ئوبەی ژیانی خۆی لە خراپەکردن بەرانبەر بە پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەربرد. ساڵانێکی زۆر دژی ئیسلام کاری کرد، نهێنی موسڵمانانی دایە دەست دوژمنەکانیان. جا لەگەڵ ئەوەدا کە پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی دەزانی، بەڵام هەر هەڵسوکەوتی جوانی نەگۆڕی لەگەڵی، بەپەرۆشبوو لەسەر ئەوە کە نهێنی گرنگی نەکەوێتە دەست. ئەو هاوەڵانەی کە ئیبن ئوبەیان وەک خۆی دەناسی بە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) وت: (ئەی پێغەمبەری خوا، لێمانگەڕێ با ئێمە چارەی بکەین). بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) داواکەی ڕەتکردنەوە، بەڵکو وەها فەرمانی پێدەدان کە مادامێ لەناویاندا دەژی با هەڵسوکەوتیان جوان بێت لەگەڵیداو هاوڕێیەتی بپارێزن.

عەبدوڵڵە کوڕی ئوبەی کوڕێکی زۆر زیرەکی هەبوو ئەویش هەر ناوی عەبدوڵڵە بوو. کەچی ئەم مێردمنداڵە بە پێچەوانەی باوکییەوە باوەڕێکی پتەوی هەبوو، پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر خۆشدەویست. ئەگەر پێغەمبەر(ﷺ) عەبدوڵڵە کوڕی ئوبەی لە کۆمەڵگای موسڵمانان دەربکردایە، ئەوا عەبدوڵڵە ی کوڕی ناچار دەبوو دوور لە پێغەمبەری خوای گەورە بژی. ئەوکات وەک حەقیقەتی خۆی نەیدەناسی. ئەو موسڵمانانەی لە سەرەتاوە

سەرسامبوون بە ئارامگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) بەرانبەر بە عەبدوللە ی باوک ئێستە حیکمەتی ئەو هەڵسوکەوتەیان بۆ دەرکەوت کاتێک خۆشەویستی عەبدوللە ی بچوک و لایەنداریی بۆ پێغەمبەریان بە چاوی خۆیان بینی.

عەبدوللە ی بچوک هەستی بە هەموو ئەو خراپانە دەکرد کە باوکی دژ بە موسڵمانان و بێتاقەتکردنیان ئەنجامی دەدان. ڕاستە ئەوەی لە توانایدا بوو بۆ دژایەتیکردنی ئیسلام بە خەرجیدا. بەڵام سەرکەوتوو نەبوو، لەدوای ئەو تەمەنەی کە لە دووڕوویی و ناپاکیدا بەخەرجیدا، خەڵکی ڕۆژێک هەواڵی مردنی عەبدوللە کوڕی ئوبەییان بیست، ئەوکات کوڕەکەی هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئاگاداریکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر داوای کوڕەکەی کراسەکەی بەری خۆی داکەندو دایە کوڕەکەی بۆ کفن کردنی باوکی. نەک تەنها ئەوە، بەڵکو نوێژی جەنازەشی لەسەر عەبدوللە کرد.

لەبەردەم ئەو هەڵسوکەوتەدا کە بەرانبەر بە عەبدوللە کوڕی ئوبەی کرا، هاوەڵە دووڕووەکانی هەستیان بە سەغڵەتییەکی زۆر کرد. کاتێک پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بینی کە نوێژی جەنازە لەسەر کەسێک دەکات کە ڕاهاتبوو لەسەر بەردەوام غەیبەتکردنی پێغەمبەر(ﷺ)، دڵەکانیان پەرتەوازەبوون و زۆرێک لەوان بڕیاریاندا ببنە موسڵمانی ڕاستەقینە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هەڵەکانی عەبدوللە کوڕی ئوبەی ڕووبەڕووی نەبوویەوە، بەڵکو بە ئارامگرتنێکی زۆرەوە چاوەڕوانی دەکرد تا دواجار یەکێک لە کوڕەکانی باوەڕی بە ئیسلام هێنا، جا بەهۆی ئەو تێگەیشتنە بێسنورەوە، دواجار زۆرێک لە دووڕووەکان ڕێگای ڕاستییان گرتەبەر. ئەمەش هەموو بە فەزڵی ئارامگرتن و خۆشەویستی و لێبوردەیی پێغەمبەرەوە(ﷺ) بوو.

## ٢٢٣. مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

مزگەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە نوێژەکانی بەیانی و خەوتناندا تاریک بوو. هاوەڵان لە لقە دارخورما مۆمی ڕۆشنکەرەوەیان بۆ دروستکردبوو.

ڕۆژێکیان، هۆزی تەمیم کە مەسیحی بوون لە یەمەنەوە هاتبوونە مەدینەی مونەووەرە، باوەڕیان بە ئیسلام هێنا. لەنێو ئەندامانی هۆزەکەدا پیاوێکیان تێدابوو بەناوی تەمیمی داری. کاتێک لە یەمەنەوە هات، هەندێ مۆم و فتیلەو نەوتی هێنابوو. لە شەوی هەینیدا فەرمانی بە خزمەتکارەکەی دەکرد مۆمەکان بە دیواری مزگەوتەکەوە هەڵواسێ، خزمەتکارەکە فەرمانی گەورەکەیی جێبەجێ کرد، مۆمەکانی هێناو دایگرساندن و هەڵیواسین بە مزگەوتەکەوە، بەمەش مزگەوتی پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆشن دەبوویەوەو ڕووناکی دەدا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشتر بەپێوە وتاری دەدا، کاتێک چووە ساڵەوە تەمیمی داری پێشنیاری بۆکرد مینبەرێکی بۆ دروستبکات. ئینجا وتی: ئەی پێغەمبەری خوا ئایا مینبەرێکت بۆ دروست نەکەم بچیتە سەری؟ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕەزامەندی دا، ئەوسا تەمیم مینبەرێکی لە دوو پلە بۆ دروستکرد.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) پاداشتی تەمیمی داری و خزمەتکارەکەیی کرد لەسەر ئەو کارەیان، بەمەش خۆشەویستییانی بەدەستهێنا.

## ٣٢٤. مردنی ئیبراهیمی بچوک

لە بەشی سەرەوەی شاری مەدینەماڵێک هەبوو دەورە درابوو بە درەختی دارخورما. لەو ماڵەدا منداڵێکی کوڵم سور هەبوو ناوی ئیبراهیم بوو. ئەم منداڵە جوانە بچوکترینی منداڵەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بوو.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) وەک منداڵەکانی تری ئەم منداڵەی زۆر خۆشدەویست. ئەو ڕۆژەی لەدایکبوو، دوو بەرانی بۆ سەربڕی، گۆشتەکەیانی دابەشکرد بەسەر هەژاراندا، منداڵەکەی ناونا ئیبراهیم وەک ڕێزێک بۆ ناوی ئیبراهیم گەورەی پێغەمبەران(ﷺ)، کە باوباپیرانی پێغەمبەری خوایە(ﷺ)، زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد کە ئەو منداڵەی پێبەخشی، ئەوەی لە توانایدابوو بە خەرجیدا تا پەروەردەیەکی جوانی بکات، بەم مەبەستە دایەنێکی بۆ بەکرێ گرت، بەپەرۆشبوو هەموو پێداویستییەکانی ژیان و حەوانەوەی بۆ دابین بکات تا ببێتە منداڵێکی ساغ و سەلیم و بەهێز بێت، ئەم منداڵە بچوکە زۆر خۆشەویست بوو، هەمووان بایەخیان پێداو زۆریان خۆشدەویست، ئیبراهیم لەو ژینگەو کەشوهەوای خۆشەویستی و سۆزەدا گەورە بوو، تەمەنی گەیشتە شازدە مانگ، ڕۆژێکیان، خەڵکی بە هەڵەداوان هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و ئاگاداریان کرد کە ئیبراهیم نەخۆشە، ئەویش(ﷺ) خێرا چووە لای، تای ئیبراهیم بەرزبووبوویەوەو جەستەی گەرم بوو، درەوشاوەیی چاوەکانی نەمابوو، کەوتبووە سەرجێ و بێجوڵە بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەوەی زانی کە کورە تاقانەکەی لەوەدایە

کۆچبکات و نەمێنێ، هەربۆیە خستیە باوەشی و بەسۆزێکی ئێجگار زۆرەوە تەماشایەکی کرد، فەرمووی: ((ئەگەر لەبەرئەوە نەبێ کە فەرمانی پەروەردگارەو بەڵێنی ڕاستگۆییە کە دواییمان دەگاتەوە بەوەمان کە پێشتر ڕۆیشتووە ئەوا زۆر لەمە سەختتر خەمبار دەبووین)). ئەمەش فەرمانی خوای گەورەیە کە هەردەبێ ببێت و جێگای ڕەخنەلێگرتن نیە. ئیبراهیم ئەم دنیایەی جێهێشت و ڕۆیشت بۆ جیهانێکیتر. لە باوەشی باوکیدا هەروەک چۆلەکەیەکی بچوک فڕی بۆ ئەو دنیا. فرمێسکەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەسەر ڕوومەتیدا هاتنەخوار. بە دەنگێکی نزم بەدەم ئەسپەردەکردنی کوڕە بچوکەکەیەوە فەرمووی: ((چاوان فرمێسک دەڕێژن، دڵیش تەنگ و خەمبارە، بەڵام هیچ ناڵێین جگە لەوە کە خوای گەورە پێی ڕازییە، ئێمەش ئەی ئیبراهیم دڵتەنگین بە جیابوونەتەت لێمان)).

ڕاستە موحەممەدی سەردارمان پێغەمبەرە، بەڵام ئەویش مرۆڤێکە وەک ئێمە، لەبەرئەوە، هەندێجار هەستی بە ئازارو هەندێجاریتر بە شادمانی دەکرد، بەڵام ئێش و ئازاری تا هەرچەندە زۆر بووبێت، هەر هەرگیز ڕەخنەی لە فەرمانی خوای گەورە نەبووە یان ناڕازی نەبووە بە فەرمانەکانی، بەڵکو بە ئارامگرتن و ڕازیبوون ڕووبەڕووی تاقیکردنەوەکان دەبوویەوە. بەم ڕەفتارەی بووە پێشەنگێکی جوان و چاک بۆ هەموو ئەو خەڵکانەی بەدەوریدا بوون. ئیتر هەرکات لە خەم و خەفەت یان لە خۆشیدا بووبن لێیەوە فێری میانڕەوی و ناتوندوتیژی بوو بوون.

## ٣٢٥. گۆڕینەوەی دیاری و پیادەکردنی دادپەروەریی لەنێوان منداڵاندا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ویستی ڕایەڵەی خۆشەویستی و برایەتی لەنێوان خەڵکیدا پتەوترو بەهێزتر بێت. لەوپێناوەدا، هەڵسوکەوتی جوانی لەگەڵ خەڵکیدا دەکرد، دەیویست موسڵمانانیش شوێنپێی هەڵگرن.

دەیفەرموو پێیان: ((چاکترین کەستان ئەوەتانە بۆ خانەوادەی خۆی باشبێت، منیش بۆ ماڵ و منداڵم لە هەمووتان چاکترم)).

بەهەمانشێوە پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە گۆڕینەوەی دیاری بووە، خەڵکی هانداوە لەسەری. کاتێک دیارییەکی لە کەسێکەوە بۆ بهاتایە، شتی لەوە باشتری بۆ دەکردە دیاری، خەڵکیشی لەسەر ئەوە هەڵدەناو دەیفەرموو: ((دیاری بەیەکتر ببەخشن تا زیاتر یەکتریتان خۆشبوێت)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هانی خەڵکی دەدا کە دادپەروەریی و یەکسانی پیادە بکەن لەنێوان منداڵاندا، یەکێک لە هاوەڵان هەستا – ناوی بەشیری ئەنصاری بوو- بە بەخشینی هەندی لە ماڵەکەی بە نیعمانی کوڕی و نەیدا بە براکانی تری، عومرەی خێزانی پێیوت: من ڕازی نابم تا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەکەیتە شایەت، بەشیر ڕۆیشت بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) تا بیکاتە شایەت لەسەر ئەو بەخشینە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی پێی: ((ئایا ئەمەت لەگەڵ هەموو منداڵەکاندا کردووە؟)) بەشیر وتی: نەخێر. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((لەخوا بترسن و دادپەروەربن لەنێوان منداڵەکانتاندا)). ئینجا بەشیر گەڕایەوەو ئەو بەخشینەی هەڵوەشاندەوە.

## ٣٢٦. پێغەمبەرێکی بەخشندە(ﷺ)

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) وەک دەریا وابوو، بەخشندەیی و بەخششی لێدەڕژا. لە جیهاندا کەس لەو بەخشندەتر نەبووە. هەرکەس بۆ پێویستییەک هاتبێتە خزمەتی جوابی نەکردووەو چووە بەدەمیەوە.

ڕۆژێکیان، کەسێکی ناسراو هاتە لای کە لە ڕابردووشدا داوای شتانێکی زۆری لێکردبوو. ئێستەش هاتووەتەوە داوای شتێکیتری لێدەکات. بەڵام هەموو ئەوەی کە لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەبوو دابەشیکردبوو بەسەر هەژاراندا. بۆیە بە داواکارەکەی فەرموو لە ئێستادا شتێکی لا نیە بیداتێ، فەرمانی پێدا بڕوات بۆ بازاڕو هەرچی پێویستە لەوێ لەسەر حیسابی ئەو بیکڕێت.

لەو کاتەدا عومەر ئامادە بوو، چووەناو مەسەلەکەوەو پێیوت خۆ پێشتر شتیداوە بەو پیاوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) قسەکەی عومەری بەدڵ نەبوو.

یەکێک لە ئامادەبووان هەستی بەوە کردو وتی دەبێت سەرلەنوێ بیداتێ، نابێ لەوە بترسێ کە ماڵەکەی کەمدەکات. پێغەمبەری خوا(ﷺ) دڵخۆشبوو بە قسەی ئەم کەسە. بە زەردەخەنەوە سەیری کرد. واتە ئەو لەسەر هەقەو خوای گەورەش فەرمانی وەها بە پێغەمبەرەکەی کردووە.

عومەر جارێکیتر لە بەخشندەیی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و حەزکردنی لە ئەنجامدانی کاری چاکە تێگەیشت. بەڕاستی پێغەمبەر(ﷺ) بەدرێژایی ژیانی هەموو ئەو ماڵەی کە هەیبووە بەشیکردووە

لەگەڵ خەڵکیدا، لەبەرانبەرەوە چاوڕێی هیچی لەوان نەکردووە. هەروەها عادەتی وانەبووە خەڵکی بیربخاتەوە بەو چاکانەی کردوویەتی لەگەڵیاندا. خاوەن پێداویستی بە هەر شێوەیەک هاتبێتە خزمەتی ئەو هەستی هیچ کەسی بریندار نەکردووە. بە دەستی بەتاڵ نەیگێڕاوەتەوە. هەردەم بەخشندە بووە. دڵە زامدارەکانی سارێژکردووە.

## ٣٢٧. ئەو کەسەی ویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ماچ بکات

هەموو هاوەڵان لە ناخی دڵیانەوە پێغەمبەریان خۆشویستووە. لەنێویاندا کەسێک هەبوو بەناوی سەوواد کە پێغەمبەری خوای(ﷺ) زۆر زۆر خۆشدەویست.

لە جەنگی بەدردا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پارچەدارێکی بەدەستەوە بوو کە ڕیزی سەربازەکانی ڕێکدەخست، سەووادی بینی لە ڕیزەکە دەرچووە، ئەویش بە پارچەدارەکەی دەستی دای لە سکی سەوواد و فەرمووی پێی: ((ئەی سەوواد ڕێک بوەستە)).

سەوواد وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا ئازارتدام!) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((تۆڵەی خۆت بکەرەوە)). -تۆڵەش لە حوکمەکانی ئایندا بریتییە لە ئەنجامدانی هەمان کار لەگەڵ ئەو کەسەدا کە ئازاری پێگەیاندووە، یان هەڵەی بەرانبەر بە مافی کەسێکیتر کردبێ-. لەو حاڵەتەشدا پێغەمبەری خوا داوا لە سەوواد دەکات هەروەک چۆن ئەو کردی ئەویش لێیبداتەوە.

هاوەڵان بێدەنگ بوون، هەموو تێڕوانینەکان لەسەر سەوواد چڕبووبوونەوە، چونکە پێغەمبەر(ﷺ) کەسێک نیە بە ئەنقەست ئازاری هیچ کەس بدات، جگە لەوەش سەوواد ئازاری پێنەگەیشت. کەواتە بۆچی ئەوەی وت؟

سەوواد وتی: (تۆ کراست لەبەردایە، کاتێک لێتدام من کراسم لەبەردا نەبوو). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) کراسەکەی لەسەر سکی خۆی لابرد، ئەوکات سەوواد باوەشی پێداکردو

سکی ماچکرد. پاشان بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: (باوک و دایکم بە قوربانت بێت ئەی پێغەمبەری خوا، من لەو تۆڵەکردنەوەیە هەر ئەمەم دەویست).

فرمێسک لە چاوانی سەوواد خوڕەیان کرد لە کاتێکدا بۆنی خۆشی پێغەمبەری خۆشەویستمانی بۆندەکرد. لەو کاتەوە پێغەمبەری ناسیبوو ئەوە کۆتا ئاواتی بوو کە پێیبگات.

## ٣٢٨. جوانیی ڕواڵەت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی وابووە هەمیشە پۆشاکی پاکوخاوێن و گونجاوی بۆ هەر بۆنەیەک پۆشیوە ئینجا ڕۆیشتووە بۆی. ڕێنمایی بە خەڵکیداوە زیادەڕۆیی نەکەن یان لەخۆبایی ببن و بەخۆیاندا بنازن. زۆرترینی ئەو ڕەنگانەی کە پێغەمبەر(ﷺ) حەزی لێیان بووە ڕەنگی سەوز و سپی بوون. بەپێی شوێن و بارودۆخ پۆشاکەکەیی هەڵدەبژارد. جا بەو سیفەتە ئەو خاکە ئەوی تێدا ژیاوە گەرم بووە ئەوا بە گشتی پۆشاکی سپی پێباشتر بووە.

لە لایەکیترەوە، ڕەنگی سپی ئاماژە بووە بۆ پاکوخاوێنی، پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە لە ڕۆژانی هەینی و جەژنەکاندا جوانترین پۆشاک لەبەربکەن و بۆنخۆشترین بۆن بدەن لەخۆیان.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەپەرۆش بووە بە بەردەوامی پۆشاک پاکوخاوێن بێت و زیادەڕۆیی تێدا نەکرێ. فەرمانی بە خەڵکیداوە پۆشاک هەڵبژێرن بەڵام بێ زیادەڕۆیی کردن. ڕۆژێکیان، پیاوێک هاتە خزمەتی کە پۆشاکی پیس و چڵکن و نابوتی پۆشیبوو لە قەشمەر دەچوو. پێغەمبەر(ﷺ) بە هیچ جۆر حاڵەتەکەی نەچوو بەدڵیدا. پرسیاری لێکرد بێئەوەی هەستی زامدار بکات فەرمووی پێی: ((ئایا ماڵ و سامانت هەیە؟)) وتی: (بەڵێ). فەرمووی: ((چ جۆرە ماڵێک؟)). وتی: (خوای گەورە وشترو مەڕو ئەسپ و کۆیلەی پێداوم). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((مادامێ خوای گەورە ماڵ و سامانی پێداویت، با شوێنەواری نیعمەتی خوای گەورەو ڕێزگرتنی

پێتەوە دەربکەوێ)). بەم فەرموودەیە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئاماژەی پێدا کە گرنگی بدات بە پۆشاک و ڕواڵەتی.

پیاوەکە لە مەبەستی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشت. لەو ڕۆژەوە ئیتر وایلێهات زیاتر گرنگی دەدا بە پۆشاکەکەی و لەوە بەولاوە ئیتر پۆشاکی پیس و چڵکنی نەدەپۆشی.

## ٣٢٩. ئەدەبی نانخواردن لە ئیسلامدا

ڕەفتارەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ناوازە بوون، ئیتر لە شێوازی دانیشتنیدا بوبێت یان وەستانی بەپێوە یان گوفتاری یان لە شێوازی نانخواردی، هەر جوڵەیەک لە جوڵەکانی سودێکی بۆ موسڵمانان تێدابوو. لەبەرئەوە، ئەوانیش ڕەفتارەکانی ئەویان کردبوونە پێشەنگی خۆیان. پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەپەرۆش بوو کە خواردن و خواردنەوەی پاکوخاوێن بن، بەشێوازێکی جوان ئامادەکرابن و بخرانایەتە سەر سفرە. ڕازیکردنیشی شتێکی زەحمەت نەبوو، هەتا برسی نەبوایە لەسەر سفرەی خواردن دانەدەنیشت، کاتێکیش نانی بخواردایە بەتەواوەتی تێری نەدەخوارد، بەڵکو بەرلەوە تێری بخواردایە دەستی دەگرتەوە.

پێغەمبەر(ﷺ) عادەتی وابوو لەپێش و لەپاش نانخواردن ددانەکانی بە سیواک بە جوانی پاکدەکردەوە. جا بەو پێیە کە هەرچی هەبوایە دابەشیدەکرد بەسەر هەژاراندا، ئەوا زۆربەی کات برسی بوو. کاتێ شتێکی دەستنەکەوتایە بیخوات، نان و خورمای دەخوارد، سوپاسی خوای گەورەی دەکرد لەسەر نیعمەتەکانی. پێغەمبەری خوا(ﷺ) حەزی لە شیرینی بووە، بەتایبەتی هەنگوین. لەنێو میوەکانیشدا حەزی لە هەنجیر و ترێ و خورمای تەڕ و کاڵەک بووە. هەروەها عادەتی وابووە خورمای لەگەڵ کاڵەکی زەرد، یان سور یان خەیاردا خواردووە. لەنێو خواردنەوەکاندا حەزی لە شیر بووە، لە شەربەتی هەنگوین، عادەتی وابووە خورماو شیری پێکەوە خواردووە. هەروەها حەزی لەوە بووە پاشماوەی خواردنێ

بخوات کە لە بنی دەوری یان مەنجەڵدا مابێتەوە. هەرگیز فووی لە خواردن نەکردووە. بە دەستی چەپ خواردنی نەخواردووە.

لەنێو خواردنە کوڵاوەکاندا زۆر حەزی لە تشریبی گۆشت بووە. هەمیشە لە ئیشوکاری ماڵدا هاوکاری خێزانەکانی کردووە. لە کاتی پێویستدا مەڕی دەدۆشی، پێڵاوەکەیی پینە دەکرد، بەشداری دەکرد لە ئامادەکردنی خواردندا.

پێغەمبەر(ﷺ) ئامۆژگاری هاوەڵانی دەکردو دەیفەرموو: ((ئەگەر یەکێکتان خواردنێکی لە مەنجەڵدا لێنا با شلەکەی زۆر بێت، بەشی دراوسێکەیی لێبدات)).

هاوەڵان بەهامنشێوەی هەموو ئامۆژگاریەکانی تری بەتەواوەتی کاریان بەم ئامۆژگاریانەی دەکرد. بەمجۆرە شوێنپێی ئەویان هەڵگرت و لە ژیانێکی پڕ لە تەندروست و سەلامەت و فەڕو بەرەکەتداردا بوون.

## ٣٣٠. چوون بۆ مزگەوت و کۆڕەکان بە پۆشاکی پاک و بۆنخۆشەوە

پێغەمبەر(ﷺ) هانی موسڵمانانی دەدا پاکوخاوێن بن و گرنگی بە ڕواڵەتیان بدەن، چونکە ئەوە دەبێتە هۆی بەجێگەیاندنی خۆشەویستی و پێکەوەبوون و زیادبوونی سۆز لەناو موسڵماناندا، ڕواڵەتی جوان و بۆنخۆشی شتانێکن دەروونی مرۆڤ حەزی لێیانە. گومانی تێدا نیە بۆنی ناخۆشیش خاوەنەکەی ناشیرین دەکات. جا هەرچەندە لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) ژیان زەحمەت بوو و هەژاری و نەداریی ماوەیەک باڵیکێشابوو بەسەر موسڵماناندا بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) هەر بێدەنگ نەبوو لە هۆشداریدان لەو مەسەلەیە.

عەبدوالله کوڕی عەبباس دەڵێ: خەڵکی شەکەت و ماندوبوون، خورییان دەپۆشی، لەسەر پشتیان بژێویان دابین دەکرد، مزگەوتەکەیان تەسک و سەقفەکەی نزم بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕۆژێکی هەینی وتاری بۆ دان، ڕۆژێکی زۆر گەرم بوو، خەڵکیش نوقمی ئارەقاوی ئەو خورییە بوو بوون کە لەبەریاندا بوو بەجۆرێک بۆنی ناخۆشیان لێدەهات، بەهۆیەوە هەندێکیان ئازاری هەندێکی تریان دەدا، کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەو بۆنە ناخۆشەی بەدیکرد فەرمووی: ((ئەی خەڵکینە، ئەگەر ئەم ڕۆژە بوو ئەوا خۆتان بشۆن، با هەریەکەتان باشترینی ئەو زەیت و بۆنە خۆشە بدات لەخۆی کە هەیەتی)).

ئیبن عەبباس دەڵێ: پاشتر خوای گەورە خێرو بەرەکەتی ناردو ماڵ و سامان زیادبوو، باری بژێوی موسڵمانان باش بوو، ئەوکات پۆشاکی جوان و بۆنی خۆشیان بەکارهێنا، دەرئەنجام ئەو بۆنە ناخۆشە نەما کە ئازاری بەکترییان پێدەدا.

## ٢٣١. نزای دابەزینی فەڕو بەرەکەت بۆ بەروبووم

هاوەڵان پێغەمبەریان(ﷺ) خۆشدەویست و فەزڵی ئەویان دەدا بەسەر خۆیاندا. ئامادەبوون لەپێناوی ژیان لەگەڵیدا هەموو شتێک بکەنە قوربانی. لە بەرانبەرەوە پێغەمبەری خوایش(ﷺ) هەمان هەڵسوکەوتی لەگەڵ ئەوان دەکرد.

هەرکات هاوەڵان نۆبەرەی بەروبوومیان ببینیایە، یەکەم نۆبەرەیان بۆ پێغەمبەر(ﷺ) لێدەکردەوەو دەیانهێنا بۆی، هەرکە پێغەمبەر(ﷺ) وەریبگرتایە دەیفەرموو: ((پەروەردگارا بەرەکەت بخەرە بەروبووممان، بەرەکەت بخەرە شارەکەمان، بەرەکەت بخەرە پێوانەکاریمان، بەرەکەت بخەرە مەنەکەمان، پەروەردگارا ئیبراهیم بەندەو خۆشەویست و پێغەمبەری زاتی خۆتە، ئەو دوعای بۆ مەککە کردووە، منیش بە هەمان ئەو دوعایەی ئەو بۆ مەککەی کرد دوعا بۆ مەدینە دەکەم و بە ئەوەندەی تریش لێت دەپاڕێمەوە)).

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بانگی بچوکترین منداڵی دەکرد کە لەنێو ئەو خەڵکەدا بوو ئینجا یەکەمین دەنکی دەدا بەو.

## ٣٣٢. ئەدەبی ئاوخواردنەوە لە ئیسلامدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هاوەڵانی فێری کۆمەڵە ئاکارێک دەکرد کە لە زۆرێک لە هەڵسوکەوتی ڕۆژانەیاندا کاریان پێدەکردن، تەنانەت لە ئاوخواردنەوەشدا، بە پێوە ئاوی نەخواردووەتەوە. تینویەتی تا هەر ئاستێ زۆری بۆ هێنابێت هەتا ناوی خوای گەورەی لەسەر نەهێنابێت نەیخواردووەتەوە. لەسەرخۆو بە سێ وچان خواردوویەتییەوە. هەرگیز هەناسەی نەداوە لەو دەفرەدا کە ئاوی لێخواردووەتەوە. لەدوای تەواوبوونیش سوپاسی خوای گەورەی کردووە. چونکە ئەوە خوای گەورەیە ڕزقی ئێمەی داوە، تەنها ئەویش شایستەی سوپاسکردنە. لەبەرئەوە پێویستە موسڵمان سوپاسی بکات لەسەر هەموو شتێک تەنانەت لەسەر ئاو خواردنەوەش.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە بە یەک وچان وەک وشتر ئاونەخۆنەوە. فەرمانی پێداون بە سێ وچان بیخۆنەوە ئەوەش بە مەبەستی حەوانەوە بەخۆدان و هەناسەدان.

هەموو ئەو منداڵانە کە لەسەر پەروەردەی پێغەمبەر(ﷺ) گەورەبوون وەک عەلی، زەید، ئەنەس و ئەوانیتریش، ئەوپەڕی ڕێزو پێزانینیی گەورەیان بۆی هەبووە. لێیەوە فێری زۆرێک لە ئاکارە جوانەکان بوون. ئەو ئامۆژگاریانەی کە ماوە بەماوە پێیداون بە پارە مەزەندە ناکرێن. لە یەکێک لەو ئامۆژگاریانەیدا(ﷺ) دەفەرموێ:

((هەرکات شەو داهات -یان ئێوارەتان لێهات- منداڵەکانتان بەرنەماڵەوە، چونکە شەیتان و بچکەکانی لەو کاتەدا بڵاودەبنەوە، هەرکات ماوەیەک لە شەو تێپەڕی لێیانگەڕێن، دەرگاکان دابخەن،

ناوی خوای گەورە بێنن، چونکە شەیتان دەرگای داخراو ناکاتەوە، سەری کونەو مەشکەتان بنێنەوە، ناوی خوای گەورە بێنن، خوێ بکەنە قاپەکانتان و شتێکیشیان بخەنەسەر و ناوی خوای گەورە بێنن، چراکانتان بکوژێننەوە)).

منداڵان بە جوانی گوێڕادێری بوون، ئامۆژگارییەکانیان جێبەجێ کردووە، بەمجۆرە فەرمانەکانی پێغەمبەری خوا(ﷺ) گۆڕدراون بۆ عادەت لە ژیانیاندا. لێیەوە فێری ئەدەب و وریایی و ئارامگرتن بوون تەنانەت لە شێوازی ئاوخواردنەوەشدا.

## ٣٣٣. هاوڕێی هەموو کەس

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) کەسایەتییەکی ڕووخۆش و بەسۆز بووە لەگەڵ هەموو توێژەکانی کۆمەڵگادا. ئەو گەورەی پێغەمبەرانە(ﷺ) و شەرەفمەندترینی بەندەکانی خوایە، هەرکەس پێویستی یان داواکارییەکی بووبێت ڕووی لەو کردووە.

وێڕای گەورەیی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) بەڵام هەرگیز لە ژیانیدا فیزی نەکردەوەو خۆی بەزل نەگرتووە. کاتەکانی لەگەڵ خەڵکیدا بەسەربردووە، هەربۆیە منداڵانیش خۆشیان ویستووەو هەستیان بەسۆزو بەزەییەکەی کردووە. گەنجەکانیش بەهەمانشێوە خۆشیان ویستووە، چێژیان لە هاوەڵێتی وەرگرتووە. کاتێ ئافرەتان لە ژیانیاندا تووشی کێشەو گرفت ببوونایە بۆ داوای یارمەتیدان دەهاتنە خزمەتی. بووبووە جێگای ئومێدی کەسە پیرو بەتەمەنەکانیش. پێغەمبەریش(ﷺ) ئەوپەڕی خۆشەویستی و دڵدانەوەی پێبەخشیون و چارەسەری پێویستی بۆ کێشەکانیان پێشکەشکردوون.

پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆژێکی هەفتەی تەرخان کردبوو بۆ ئافرەتان. لەو ڕۆژەدا، ئافرەتانی مەدینە کۆدەبوونەوەو پرسیاریان ئاراستە دەکرد. ڕۆژێکیان، ئافرەتان لە دەوری پێغەمبەر(ﷺ) کۆبوونەوە، دایانە ڕازی قسە لەگەڵ یەکترداو پرسیاریان دەکرد، پاشان دەنگیان بەرزبوویەوە بەجۆرێک کە دەنگیان لە دەنگی پێغەمبەر(ﷺ) بەرزتر بوو، مەعلوم نەبوو کێ قسەکەرەو کێ بیسەرەو چ شتێ دەوترێ. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) توڕە نەبوو، بەڵکو گوێی لە هەموویان گرت و چارەسەری پێدان.

لەو ساتەدا، عومەر هات و مۆڵەتی خواست بچێتە ژوورەوە. ئافرەتەکان ترسان و وەک خۆسازدان بۆ هاتنی عومەر دەنگیان هێوربوویەوە، هەرکە عومەر هاتەژوورەوە بێدەنگییەکی تەواو باڵیکێشابوو بەسەر کۆبوونەوەکەدا، ئەو ئافرەتانەی کە پێش کەمێک قسەیان بەیەکتر دەبڕی و پێشبڕکێیان بوو لەسەر پرسیارکردن، ئێستە بەتەواوەتی گۆڕاون. ئێستە بێدەنگ و لەسەرخۆ و ڕێکوپێک دانیشتبوون، بێدەنگیی کەوتنە چپەچپ لەگەڵ یەکتردا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێبینی ئەو گۆڕانەی کرد کە دوای هاتنی عومەر ڕوویدا، ئینجا زەردەخەنە لەسەر ڕوومەتی دەرکەوت و فەرمووی: ((سەرسوڕما لەم ئافرەتانەی لەلامن، کاتێک گوێیان لە دەنگی تۆ بوو دەستپێشخەریان کردو خۆیان ڕێکوپێک کرد)). عومەر وتی: ((سوێند بەخوا تۆ هەقدارتری لەوەی ئەوانە سام و شەرمت لێبکەن). ئینجا ئاوڕیداوە بەلای ئافرەتەکانداو وتی: (ئەی ئەوانەی دوژمنی خۆتانن، ئایا سام و شەرم لە من دەکەن و لە پێغەمبەری خوای ناکەن؟). یەکێکیان وەڵامیدایەوەو وتی: (تۆ لە پێغەمبەری خوا تووڕەترو زبرتری).

ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە سەرنجێکی خۆش کۆتایی بەو ڕووداوە هێناو فەرمووی: ((ئەی عومەر، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە، شەیتان لە هەر ڕێگایکدا پێت بگات دەچێت ڕێگایەکی تر دەگرێتەبەر)).

## ٣٣٤. ئەمانەتپارێزیی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

ڕۆژێکیان، کاروانێک لە نزیک مەدینەی مونەووەرە وەستا بۆ پشودان. کاروانەکە وشترێکی تایبەت و ناوازەی تێدابوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێپەڕی بەو ناوچەیەدا ئەو وشترەی بینی، چووە دڵی. ئینجا نزیککەوتەوە لە خاوەنانی کاروانەکەو پرسیاری نرخی وشترەکەی لێکردن، ئەوانیش نرخەکەیان پێوت. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) پارەی لەگەڵ خۆی هەڵنەگرتبوو. فەرمووی پێیان کە دەگەڕێتەوە بۆماڵەوەو پارەکەیان بۆ دەنێرێ، ئەوانیش قوبوڵیان کرد و وشترەکەیان پێدا.

خاوەنانی کاروانەکە نەیاندەزانی ئەو کەسەی وشترەکەیان پێفرۆشتووە موحەممەدی گەورەمانە(ﷺ). لەبەرئەوە، بە ڕۆیشتنی تووشی دڵەڕاوکە بوون، کەوتنە لۆمەکردنی خۆیان و دەیانوت: (ئێمە چۆن ئەم کارەمان کرد؟) چۆن ئەم وشترەماندا بە کەسێک کە نایناسین. ئەی ئەگەر پارەکەیمان نەداتێ چیبکەین؟) ئافرەتێکیان پێیوتن: (ئەی نەتانبینی دەموچاوی وەک مانگی چواردە دەدرەوشایەوە؟ من پێشتر ڕوخساری لەم شێوەیەم نەدیوە. خەیاڵتان ئاسودە بێت. مەعلوم کە پارەکەیتان دەداتێ).

لەگەڵ هاتنی ئێوارەدا، گوتەی ئافرەتەکە ڕاست دەرچوو. پێغەمبەری خوا(ﷺ) نرخی وشترەکەی نارد بۆ بۆیان، جگە لەوەش ژەمی خواردنی ئێوارەی بۆ ناردن. خاوەنانی کاروانەکە سەرسامبوون لە ڕاستگۆیی بەڵێنەکەی و ئەمانەتپارێزیی و جوانیی ئەتەکێتی هەڵسوکەوتی.

## ٣٣٥. باوەڕدارانێ کە پێغەمبەریان(ﷺ) نەدیوە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) جاروبار پرسیاری ئاراستەی هاوەڵان دەکرد، وایلێدەکردن بکەونە بیرکردنەوە. ڕۆژێکیان پرسیاری لێکردن: ((ئایا چ جۆرە کەسانێ باوەڕیان لە باوەڕی هەموو کەس چاکترە؟)). وتیان: (فریشتەکان. فەرمووی: ((چۆن دەبێ فریشتەکان باوەڕیان چاکتر نەبێ؟!)). وتیان: پێغەمبەران. فەرمووی: ((پێغەمبەران وەحییان بۆ هاتووە چۆن دەبێ باوەڕیان چاکتر نەبێت؟!)). وتیان: (هاوەڵان). فەرمووی: ((هاوەڵان لەگەڵ پێغەمبەرانن چۆن دەبێ باوەڕیان چاکتر نەبێت؟. چاکترین باوەڕ: هی ئەو کەسانەیە کە لەدوای ئێوە دێن، پەڕاوێک لە وەحی دەبینن و باوەڕی پێدێنن و شوێنی دەکەون. باوەڕی ئەوانە لە باوەڕی هەموو کەس چاکترو دامەزراوترە)).

مەبەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو موسڵمانانە بووە کە لەدایکبووی سەردەمی ئەو نین و پاشتر دێنە دنیاوە، ئەوانە دێن و بێئەوەی چاویان بە پێغەمبەر(ﷺ) کەوتبێ باوەڕی پێدێنن. ئەوانە زۆریان خۆشدەوێ. قورئان دەخوێنن، فەرمانەکانی جێبەجێ دەکەن، باوەڕی ئەوانە لە باوەڕی هەموو کەس چاکترە.

هاوەڵان بیریان خستە سەر ئەو کەسانە کە دوای چەند سەدەیەک دێن. وا ئێستە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەیانناسێت چونکە لە قووڵایی دڵیانەوە بێئەوەی هاوەڵی بووبن باوەڕیان پێیهێناوە. هەر لەبەرئەوە خۆشەویستی پێغەمبەریان(ﷺ) دەستکەوت. ئیتر لەو ساتەوە هاوەڵان خۆشەویستی تایبەتیان هەبوو بۆ ئەو براو خوشکە ئیمانیانەیان کە هێشتا لەدایک نەبوون.

## ٢٣٦. ئەدەبی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

هاودەم لەگەڵ جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی پێغەمبەری خوا، کۆمەڵگای ئیسلامی ژیارێکی نوێ بەدەستدێنێ. هاوەڵان -خوا لێیان ڕازی بێت- فێربوون کە لە کۆمەڵگادا چۆن هەڵسوکەوت بکەن. فێری شێوازو ئەدەبی ناخواردن، قسەکردن، تێکەڵبوون بە خەڵکی ببن. پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێکردن بە ئەدەب و ڕێزەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ هەموو مرۆڤەکاندا بکەن. خودی خۆیشی هەموو ئەو ڕەفتارە جوانانەی پراکتیزە کردووە. ڕێزی گەورەو بچوکی گرتووە.

کاتێک پێغەمبەری خوا(ﷺ) بگەیشتایە بە کەسێک سڵاوی لێدەکردو تەوقەی لەگەڵ دەکرد. بەرلەوە بچێتەناو کۆڕێکەوە سڵاوی لە هاوەڵەکانی دەکرد، ئینجا مۆڵەتی چوونەژوورەوەی دەخواست، ئەگەر مۆڵەتیان بدایە دەچووە ژوورەوە. حەزیشی نەدەکرد ئەو ئاکارە جوانانە پشتگوێ بخرێن. بەڵکو بە ئەدەبەوە خەڵکی ئاگادار دەکردەوە بە چاککردنی ڕەفتارە هەڵەکانیان.

ڕۆژێکیان، پیاوێک بەناوی کیندە هاتە خزمەتی، ئەو پیاوە بەچکە ئاسکێک و بڕێ شیر و چەند پارچە چیلکەیەکی پێبوو. بێئەوەی مۆڵەت بخوازێ چووە ژوورەوەو نزیککەوتەوە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێغەمبەر بێزارو بێتاقەت بوو لەو هەڵسوکەوتەو داوای لێکرد بڕواتە دەرەوە، ئینجا داوای مۆڵەتی چوونە ژوورەوە بخوازێ. کیندە چووەدەرەوە، پاشان سڵاویکردو هاتەوە ژوورەوە. کیندە بەم شێوازە، لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) ئاکارەکانی چوونەناو خەڵکی

فێربوو. چونکە پێکەوەژیانی کۆمەڵگا هەندێ یاساو ڕێسای ڕێزلێگرتن دەسەپێنێ بەسەرماندا. هاوەڵانیش لە پێغەمبەری خواوە(ﷺ) فێری ئەو یاساو ڕێسایانە بوون. لە ژیانیشیاندا جێبەجێیان کردوون، بەم پێیە لە ژیانێکی خۆش و بەچێژدا ژیاون.

## ٢٣٧. ئارامگرتنی پێغەمبەر(ﷺ) لەگەڵ منداڵان

منداڵێکی زۆر هەژار لە مەدینەی مونەووەرەدا هەبوو. هەستی بە برسێتییەکی سەخت دەکرد. جارێکیان چووەناو باخێکەوە کە پڕبوو لە خورما، لەسەر لقێک فەریکە خورمایەکی ڕەنگ ئاڵتونی بینی و حەزی چووەسەری، دەمی لیکاوی بۆ ڕشت. ڕوانی بەملاولای خۆیدا، کەسی نەبینی، ئینجا بەردێکی لەسەر زەوی هەڵگرت و وەشاندی بۆ دارخورماکە. خێرا فەریکە خورماکە وەک باران دابارییە سەر زەوی. کوڕەکەش خورماکەی کۆکردەوەو کەوتە خواردنی.

لەو ساتەدا، خاوەن باخەکە هات، کوڕەکەی بە تاوانێکی دیارو بەرچاوەوە گرت، ئەویش ترساو کەوتە پاڕانەوە لێی و پێیوت: (مامە داوای لێبوردن دەکەم، جارێکیتر واناکەم، تکات لێدەکەم ئازارم مەدە. من جارێکیتر دزی ناکەم). بەڵام خاوەن باخەکە کەوتە لێدانی، بەوە سزایدا کە ئەو پۆشاکەی لەبەریدا بوو لەبری خورماکە لێیسەند. منداڵەکەش چوو بۆ خزمەتی پێغەمبەر(ﷺ) و سکاڵای کرد لەوەی ئەو خاوەن باخە پێیکرد. پێغەمبەر(ﷺ) خاوەن باخەکەی بانگکرد و پرسیاری لێکرد کە بۆ وات لەو کوڕە کردووە. خاوەن باخەکە وتی بەبێ مۆڵەت چووەتە ناو باخەکەی و خورمای بردووە. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی پێی: ((ئەی کە ئەو نەزان بوو بۆ تۆ فێرت نەکرد، ئەی کە ئەو برسی بوو بۆ تۆ تێرت نەکرد، پۆشاکەکەی بدەرەوە)). بەمجۆرە پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕێنمایی خاوەن

٦٣٢

باخەکەی کرد کە پێویست بوو هەڵەکەیی پێبڵێت، تێری بکات چونکە برسێتی بووە وایلێکردووە ئەو کارە هەڵەیە بکات، چونکە لێدانی کوڕەکەو بردنی پۆشاکەکەی هیچ سودێکی پێنەگەیاند.

پاشان پێغەمبەر(ﷺ) بە ڕادەی پێویست و زیاتریش خواردنی دا بە کوڕەکە.

## ٣٣٨. پیر ناچێتە بەهەشت

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە شێوازی حەکیمانە قسەی حەکیمانەی دەکرد. خەڵکی بێزار نەدەبوون لێی. جاروبار گاڵتەو سوعبەتی لەگەڵ باوەڕدارانیدا دەکرد. بەتایبەتی منداڵان، بەتەمەنەکان و هەژاران، ئەوانەی هەمیشە چاوەڕێی سۆزو خۆشەویستییان لێدەکرد.

ڕۆژێکیان، ئافرەتێکی بەساڵاچوو هاتە خزمەتی. پرسیارێکی هەبوو دەیویست لە پێغەمبەری(ﷺ) بکات. بەجۆرە سەغڵەتییەکەوە وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا دوعام بۆ بکە خوای گەورە بمخاتە بەهەشت). پێغەمبەر(ﷺ) بە زەردەخەنەوە سەیری کردو فەرمووی: ((پیر ناچێتە بەهەشت)).

ئافرەتە داماوەکە چاوەڕێی وەڵامی لەوجۆرەی نەدەکرد. زۆر خەمبار بوو و خێرا گەڕایەوە ماڵەکەی خۆی. دایە قوڵپەی گریان و بیری لەوە دەکردەوە کە ناتوانێت بچێتە بەهەشت. بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە ڕاستگۆیانە سوعبەتی لەگەڵ دەکرد. پاشتر فەرمووی: ((پێیبڵێن ئەو بە پیریی ناچێتە ناوی)). ئینجا پێغەمبەر(ﷺ) هەواڵیدا کە هەموو بەهەشتییان گەنج دەبنەوە.

کاتێک ئافرەتەکە لە مەبەستی فەرموودەکەی پێغەمبەری خوا تێگەیشت، گریانی نەما و خۆشی و شادی لەسەر ڕوخساری دەرکەوت. زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد. لەو ڕۆژە بەولاوە ئیتر پەرستش و نوێژ و دوعاکانی زیاتر و زیاتر کرد.

## ٣٣٩. پێغەمبەری خوا(ﷺ) پێشبڕکێ لەگەڵ هاوسەرەکەیدا دەکات

هەڵسوکەوتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ ئافرەتاندا زۆر بەسۆزو بەجوانی بوو. وەک گوڵ دەیپاراستن، نە ئازاری دەدان و نە سوکایەتی پێدەکردن، ئەو چ وەک مێردو چ وەک باوک کەسێکی نموونەیی بوو. خاتوو عائیشە لەدوای خاتوو خەدیجە خۆشەویستترینی هاوسەرەکانی بوو. عائیشە بەوە ناسرابوو کە زۆر زیرەک و تێگەیشتووە.

ڕۆژێکیان، پێکەوە بە چۆڵەوانییەکدا ڕێیاندەکرد، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هاوسەرەکەیی فەرموو: ((وەرە با پێشبڕکێ بکەین)). هەردووکیان بەسەر لمدا کەوتنە پێشبڕکێ. جا بەو سیفەتە کە عائیشە گەنج و بەهێزبوو لە کۆتایی پێشبڕکێیەکەدا کەوتە پێشەوە. پێغەمبەر(ﷺ) بە زەردەخەنەوە سەیرێکی عائیشەی کرد.

ماوەیەکی زۆر بەسەر ئەو ڕووداوەدا تێپەڕی، تا ڕۆژێکیان پێغەمبەر(ﷺ) جارێکیتر داوای پێشبڕکێی لە هاوسەرەکەی کرد. عائیشە ڕازی بوو، بەڵام بە تێپەڕبوونی کات عائیشە قورسایی جەستەی زیادی کردبوو، پێغەمبەر(ﷺ) پێشبڕکێی لەگەڵیدا کرد، بەڵام ئەمجارە، پێغەمبەر پێشکەوت، وەک دڵدانەوەیەک سەیری عائیشەی کرد و پێی فەرموو: ((ئەمەیان بەوەی پێشوو)).

## ٣٤٠. نزای پاراستنی موسڵمان

ئاشتی باڵیکێشا بەسەر مەدینەی مونەووەرەدا، هەرکەسێ بەدوای بەختەوەریدا بگەڕایە یان تووشی کێشەو نارەحەتی ببوایە پەنای بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەبرد و چارەسەری سارێژکەری دەست دەکەوت.

پێغەمبەر(ﷺ) بایەخێکی گەورەی بە نزاو پاڕانەوە دەدا. ڕێنمایی خەڵکی دەکرد کە هەر داوایەکیان لە دەروونی خۆیاندا هەیە با لە خوای گەورە بپاڕێنەوە بۆیان جێبەجێ بکات. با لە هەموو شتێکدا پەنا بۆ ئەو زاتە بەرن. هەرگیز زمانی بێتاقەت و وەڕەس نەدەبوو لە پاڕانەوەو زیکرکردنی خوای گەورە. ڕۆژێکیان ئامۆژگاری هاوەڵانی کرد کە پێش نوستن ئەم دۆعایە بکەن: ((هەرکەس چووە شوێنێک و مایەوە با بڵێ: پەنا دەگرم بە تەواوی گوفتارەکانی خوای گەورە لە قورئان و بونەوەردا کە بمپارێزێ لە هەر خراپەیەک دروستیکردووە، ئیتر هیچ شتێک زیانی پێناگەیەنێت تا لەو شوێنە دەڕوات)).

هەروەها فەرموویەتی: ((هەرکەستان هاتە سەرجێگای نوستن، با بە پۆشاکەکەی سێجار بیتەکێنێ، ئینجا بڵێ: پەروەردگارا بەناوی زاتی تۆوە لام خستووەتە زەوی و بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر گیانت کێشام ئەوا لە گوناهەکانم خۆشببە، وە ئەگەر پێدامەوەو نەتبردەوە ئەوا بیپارێزە هەروەک چۆن بەندە چاکەکارەکانت دەپارێزی)). موسڵمانانیش ئەو زیکرو نزایانە فێربوون لێیەوە، لەناو خۆیاندا بڵاویان کردوونەتەوە، بەهەمانشێوە منداڵەکانیشیان فێرکردووە.

## ٣٤١. هەرکەس ساختەمان لێبکات لە ئێمە نیە

ئاینی ئیسلام جەنگی لە دژی ستەمکردن و گەندەڵی بەرپاکردووە بە مەبەستی بنەبڕکردنیان، چەندەها پرەنسیپی دادپەروەریی لە کۆمەڵگادا هێناوەتە ئارا. پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) جار لەدوای جار چووەتە ناو خەڵکی و گەڕاوە بەدوای ئەو جێگایانەدا ستەمیان تێداکراوەو هەوڵی نەهێشتنیانی داوە.

ڕۆژێ لە ڕۆژان، پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتە بازاڕ، نزیککەوتەوە لە پیاوێک کە خواردنی وشکەی دەفرۆشت، کیسەکانی خستبووە سەریەک و پڕیکردبوون لە گەنم و گەنمەشامی و برنج. پێغەمبەر(ﷺ) دەستی خستە ناو کیسێکیانەوە، سەیریکرد ئەو دنکانە لە ناوەوەی کیسەکەدان تەڕن. ئینجا پرسیاری لە فرۆشیارەکە کردو فەرمووی: ((خاوەن خۆراک ئەمە چییە؟)) وتی: (باران تەڕی کردووە ئەی پێغەمبەری خوا). پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو کارەی زۆر پێناخۆشبوو. کابرا ڕاستگۆ نەبوو چونکە دنکە وشکەکانی خستبووە سەرەوەی کیسەکە، تەڕەکانی شاردبووەوە کە لە بنی کیسەکەدا بوون. ئەم کردەوەیەش بە هیچ جۆر قوبوڵ نیە.جا پێغەمبەر(ﷺ) بۆ هۆشداری پێدانی فەرمووی: ((ئەی بۆ نەتخستنە سەرەوەی خۆراکەکە تا خەڵکی ببینن؟!)) کابرا هەستی بە سەغڵەتییەکی زۆر کردو پەشیمان بوو لە کارەکەی. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەرکەسێ ساختەمان لێبکات لە ئێمە نیە)).

## ٣٤٢. ئەو سیفەتانەی دەبنە هۆی چوونە بەهەشت

بەیانییەک پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا دانیشتبوو، پرسیاری لێکردن کە: ((کام لە ئێوە ئەمڕۆ بەڕۆژووە؟)). ئەبوبەکر وتی: (من). پاشان فەرمووی: (کێ لە ئێوە ئەمڕۆ نانی بە نەدارێک داوە؟)). ئەبوبەکر وتی: (من). جارێکیتر پرسیاری کردو فەرمووی: ((کامتان ئەمڕۆ شوێن جەنازەیەک کەوتووە؟)). ئەبوبەکر وتی: (من). پاشان فەرمووی: ((کامتان ئەمڕۆ سەردانی نەخۆشێکی کردووە؟)). ئەبوبەکر وتی: (من). ئا لێرەدا پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((هەرکات لە ڕۆژێکدا ئەو سیفەتانە لە کەسێکدا کۆببنەوە ئەوا بە حەتمی دەچێتە بەهەشت)).

## ٣٤٣. خۆی جیانەکردووەتەوە

موسڵمانان لە شاری مەدینەوە ڕۆیشتن بەرەو خاکی بەدر کە ژمارەیان سێسەدو سیازدە کەس بوون، حەفتا وشتریان پێبوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەر وشترێکی دانا بۆ سێ کەس کە بەنۆرە سواری ببن، واتە: یەکێکیان سوار ببێت و دووانیان بەپێ بڕۆن، پاشان ئەوەی سوارە دابەزێ تا یەکێک لە دووانە پیادەکە سوار بێ، پاش ماوەیەک کەسی دووەمی سواربوو دابەزێت تا کەسی سێیەم کە تا ئێستە پیادەیە سوار بێ، ئابەمجۆرە نۆرەو بکەن و ڕێبکەن، بە نۆرە سواربن و بەنۆرە دابەزن.

لە کاتی ڕۆیشتندا سەرە هاتەسەر پێغەمبەر(ﷺ) کە دوای سواربوون دابەزێت، ئەو دوو کەسەی لەگەڵ وشترەکەدا بە پیادە دەڕۆیشتن بە پێغەمبەریان(ﷺ) وت: دامەبەزە ئەی پێغەمبەری خوا، چونکە ئێمە هەر بەپێ دەڕۆین. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئێوە لە ڕۆیشتن بە پیادە لە من بەتواناتر نین، منیش بۆ دەستخستنی پاداشت موحتاجیم لە ئێوە کەمتر نیە)). ئینجا لەسەر وشترەکە دابەزی و بەپێ ڕێیکرد. چونکە خوای گەورە پێغەمبەرەکەیی لە موسڵمانانیتر جیانەکردووەتەوە. هاوەڵان جارێکیتریش خاکیبوونی پێغەمبەری خوا(ﷺ) و حەزکردنی لە یەکسانیی چووە دڵیان. سەرکردەی دادپەروەر ئاوایە.

## ٣٤٤. چاکەکردن لەگەڵ دایبابدا

پێغەمبەری خوا(ﷺ) بەردەوام جەختیدەکرد لەسەر گرنگیدان بە چاکەکردن لەگەڵ دایبابدا، هەمیشە هاوەڵانی هاندەدا لەسەر جوان هەڵسوکەوتکردن لەگەڵیان و دەستخستنی ڕەزامەندییان. ڕۆژێکیان، کابرایەک لە یەمەنەوە هاتە خزمەتی، دوای ئەوە سڵاوی لێکردو هەواڵی سەلامەتی پرسی، وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا حەزدەکەم لێرە بەولاوە لەگەڵتدا بژیم، دەمەوێ بچمەناو سوپای موسڵمانان و بەشداری بکەم لە جەنگ و جیهاد تا ڕەزامەندی خوای گەورە بەدەستبێنم).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو گوتەیەی پێخۆشبوو، بەڵام پرسیاری لە کابرا کردو فەرمووی: ((ئایا کەست لە یەمەن هەیە؟)) وتی: (دایبابم). فەرمووی: ((بڕۆرەوە بۆ لایان و مۆڵەتیان لێوەربگرە، جا ئەگەر مۆڵەتیاندایت ئەوا جیهاد بکە ئەگەرنا ئەوا دڵی ئەوان ڕازیبکە)).

کابرا تێگەیشت کە ڕازیکردنی دڵی دایباب لە دیدی پێغەمبەرەوە(ﷺ) لە هەر شتێکیتر گرنگترە، هەربۆیە خێرا گەڕایەوە بۆ یەمەن، بڕیاریدا بە ڕێز و حورمەت و خۆشەویستی زیاترەوە هەڵسوکەوت لەگەڵ دایبابیدا بکات، هەروەها هەموو توانای بخاتەگەڕ تا بەختەوەریان بکات و دڵیان ڕازیبکات.

## ٣٤٥. ئەوەیە خۆشەویستیی ڕاستەقینە

جارێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەستاو دەستنوێژی گرت. هاوەڵان بینیان ئاو لەنێو دەست و قاچەکانی دادەچۆڕێ، ئەوانیش بەو ئاوە کەوتنە مەسحکردنی دەست و قاچیان. پێغەمبەر(ﷺ) کارەکەیانی پێباش نەبوو، لەبەرئەوە پرسیاری لێکردن: ((بۆ ئاوا دەکەن؟)). وتیان: (داوای فەڕو بەرەکەت دەکەین). ئینجا ئامۆژگاریکردن و فەرمووی: ((هەر کەسێ حەزدەکات خواو پێغەمبەرەکەی خۆشیان بوێت با ڕاستگۆ بێت، ئەمانتپارێز بێت، ئازاری دراوسێکەی نەدات)).

ئامادەبووان لە مەبەستەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشتن. کاریان بە ئامۆژگارییەکەی کرد، لەوەو پاش بەپەرۆشبوون لە ژیانیاندا ڕاستگۆبن، ئەمانەتپارێزبن، ڕێزی دراوسێ بگرن. ئەوان دەیانزانی هەرکەس پێغەمبەری خوای(ﷺ) خۆشبوێت دەبێت شوێنپێی ئەو هەڵبگرێ. هەربۆیە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی بوون و کاریان بە ڕێنمایی و ئامۆژگارییەکانی دەکرد.

## ٣٤٦. بەچکە وشتر

ڕۆژێکیان، کابرایەک هاتە خزمەت پێغەمبەری خوا(ﷺ) و داوای لێکرد وشترێکی بداتێ تا سواری بێت. پێغەمبەری خوا بە گوتەیەکی سەغڵەتکەر وەڵامیدایەوە. فەرمووی پێی: ((ئێمە دەتخەینە سەر پشتی بەچکە وشتر)). کابرا سەرسامبوو و وتی: (من چیبکەم لە بەچکە وشتر؟). پێغەمبەر(ﷺ) زەردەخەنەیەکی کردو فەرمووی: ((ئایا وشتر جگە لە بەچکە چیتری دەبێت)). کابرا لە سوعبەتەکەی پێغەمبەر(ﷺ) تێگەیشت. کابرا سواری ئەو وشترە بوو کە پێغەمبەر(ﷺ) پێیدا، هەر بەو وەڵامەی خۆی پێدەکەنی کە بە پێغەمبەری خوای(ﷺ) دا. پێغەمبەر تەنانەت سوعبەتکردنیشی هەر ڕاستگۆیانە بووە.

## ٣٤٧. بەهاداریی کەسی ناشیرین

بەتەنیشت شاری مەدینەی پیرۆزەوە کابرایەک هەبووە بەناوی زاهیر. زاهیر لە لادێدا ژیانێکی هەژارو داماویی بەسەر دەبرد، سیمای جوان نەبوو. لەبەرئەوە، هاوەڵی زۆری نەبوو. بەڵام خوای گەورە باشترین هاوەڵی بەرەهایی پێبەخشی ئەویش پێغەمبەری خوا بوو(ﷺ). زاهیر پێغەمبەری زۆر خۆشدەویست، جگە لە خاکیبوون و سۆزو بەزەیی هیچیتری لێنەدەبینی. هەندێجار لە دەغڵ و دانەکەی شتێکی دەهێنا بۆ پێغەمبەر(ﷺ). پێغەمبەریش لە بەرانبەرەوە هەرجارەی لەو شتانەی لە مەدینەدا بوونیان هەبوو شتێکی بەدیاری دەدا پێی. لەبارەیەوە دەیفەرموو: ((زاهیر لادێیمانە، ئێمەش شاریی ئەوین)).

ڕۆژێکیان، زاهیر ڕۆیشت بۆ بازاڕی مەدینە تا ئەو شتەی لە دەشتەوە هێناویەتی بیفرۆشێ. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەدوایەوە هات، باوەشی پێداکردو نای بەسنگییەوە. سەرەتا زاهیر نەیناسی، هەوڵیدا خۆی لێ ڕزگاربکات و وتی: (بەرمبدە، ئەوە کێیە؟). بەڵام کاتێ ئاوڕیدایەوە پێغەمبەری خوای(ﷺ) بینی. زۆری پێخۆشبوو. پێغەمبەر(ﷺ) کەوتە سوعبەتکردن لەگەڵیداو فەرمووی: ((کێ ئەم بەندەیە دەکڕێ؟)) زاهیر بە دەنگێکی خەمبارییی وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، کەواتە تۆ من بە ڕەجاڵ دەبینی). ئینجا پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەم گوتەیەی فەرموو پێی کە دڵی خۆشکرد: ((تۆ لای خوای گەورە قورس و بەهاداریی)).

کاتێ زاهیر ئەو گوفتارەی بیست ئیتر دڵنیابوو، تێگەیشت لەو بەهادارییەی کە بە دڵسۆزی خۆی بۆ خواو پێغەمبەرەکەی بەدەستیهێناوە. ئینجا زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد کە نیعمەتی ئیسلامی پێبەخشی. کاتێکیش پێغەمبەر(ﷺ) بەریدا زۆر بە چاوی پڕ لە خۆشەویستی و ڕێزەوە سەیری دەکرد.

## ٣٤٨. ڕێزگرتن لە کەسانی بە تەمەن

پێغەمبەری خوا(ﷺ) هەروەک منداڵانی خۆشدەویست بەهەمانشێوە کەسانی تەمەن گەورەشی خۆشدەویست و ڕێزی زۆری لێدەگرتن. زۆر بەپەرۆش بوو کە بێتاقەت نەکرێن و دڵیان نەڕەنجێ. هەروەها بەرگری دەکرد لە مافەکانیان و بۆ هەر لایەک بڕۆیشتایە فەرمانیدەدا بە پاراستنیان.

ڕۆژێکیان، لە کاتێکدا وتووێژی لەگەڵ هاوەڵاندا دەکرد، پیاوێکی بەساڵاچوو هات، درزی بە خەڵکەکەداو چووە پێش. وتی دەیەوێت پێغەمبەری خوا(ﷺ) ببینێ و قسەی لەگەڵ بکات. ئامادەبووان ئەو درزتێکردن و ڕێکردنەوەیەیان پێناخۆشبوو. زوو ڕێگایان بۆ نەکردەوە. پێغەمبەری خۆشەویستمان سەرنجی ڕەفتاری خەڵکەکەیدا. جا بۆ ئەوەی ئەو هەڵەیەیان بۆ بخاتەڕوو کە ئەنجامیاندا، فەرمووی پێیان: ((هەرکەس بەزەیی بە بچوکماندا نەیەتەوە و ڕێزی بەتەمەنەکانمان نەگرێ لە ئێمە نیە)). لەدوای ئەوە کە موسڵمانان ئەو فەرموودەیەیان بیست ئیتر هەڵسوکەوتی خۆیان لەگەڵ کەسە بەتەمەنەکان باشتر کرد و بەپەرۆشبوون لەسەر حەوانەوەیان.

## ٣٤٩. عەمر، پێشنوێژێکی تەمەن بچوک

عەمر کوڕە منداڵێکی زیرەک بوو، ڕاستە ئەو خەڵکی مەدینەی مونەووەرە نەبوو، بەڵام بیستبووی کە پێغەمبەر(ﷺ) لەو شارەدا دەژی. کردبوویە عادەت پرسیاری زۆری لەو کەسانە دەکرد کە دەچوونە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئینجا ڕاستەوخۆ دەکەوتە جێبەجێکردنی ئەوەی لەوانەوە فێری دەبوو. ئەوەی زانی کە قورئانی پیرۆز پەڕاوێکە لە خوای گەورەوە هاتووەتە خوارەوە. لێبڕا لەسەر فێربوونی جوان خوێندنەوەی، لەبەرئەوە، هەرکات کەسێکی ببینیایە قورئان دەخوێنێ، بە هەلی دەزانی بێت لێیەوە فێرببێت با یەک پیتیش بووبێ. دواجار، هەوڵ و ڕەنجی عەمر بەریگرت. تا وایلێهات بە جوانی و بە ڕەوانی قورئان بخوێنێت.

ڕۆژێکیان، عەمر چووە ناو کۆمەڵێکەوە کە بەنیازبوون بڕۆن بۆ مەدینەی مونەووەرە بۆ زیارەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێغەمبەر(ﷺ) پێشوازییەکی گەرمی لێکردن، پاشان پرسیاری لێکردن وەک بڵێی عەمر دەناسێ، ئایا باشترین قورئانخوێنتان کامەتانە.

لە کتوپڕدا، هەموو چاوەکان ڕوویان لە عەمر کرد. ئاماژەیان بۆکردو وتیان: (ئەم کوڕە، هەرچەندە بچوکترینمانە، بەڵام لە خوێندنەوەدا باشترینمانە). پێغەمبەر(ﷺ) بە خۆشەویستییەکی زۆرەوە سەیری عەمری کرد، ئینجا داوای لێکرد پێشنوێژی بۆ ئەو کۆمەڵە خەڵکە بکات. ئەویش بەخۆشییەوە ئەو ئەرکەی ڕاپەڕاند کە پێغەمبەر(ﷺ) پێیسپارد.

عەمر دڵخۆشبوو چونکە وێڕای تەمەنی بچوکی ڕەزامەندی پێغەمبەرمانی بەدەستهێنا. زۆر سوپاسی خوای گەورەی کرد لەسەر ئەو ئەرکە کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) سپاردی پێی.

## ٣٥٠. ئەوەیە خۆشەویستی ڕاستەقینە

منداڵانی مەدینەی مونەووەرە پێغەمبەری خوایان(ﷺ) زۆر خۆشدەویست، حەزیان لە زیارەتکردنی، لە گوێگرتن لە گوفتارەکانی دەکرد.

لەنێو ئەو منداڵانەدا کە دڵیان پڕبوو بە خۆشەویستی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، کچێکی بچوک بوو بەناوی ئوم خالید. ئەم کچە ڕۆژێکیان دەستی باوکی گرت و ڕۆیشت بۆ ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ). پێشتر پێیوترابوو کە مۆری پێغەمبەرایەتی لەنێوشانی پێغەمبەردا(ﷺ) هەیە، بە دەگمەن کەس بیبینێ. لەبەرئەوە، زۆر حەزی لەوەبوو بیبینێ.

لە کاتێکدا ئەو کچە بچوکە بیری لە هەموو ئەوە دەکردەوە، لەگەڵ باوکیدا گەیشتە ماڵی پێغەمبەر(ﷺ)، کچەکە پۆشاکێکی جوان و نوێ و بریقەداری ڕەنگ زەردی لەبەردا بوو، پێغەمبەری خوا(ﷺ) داوای لێکردن بچنەژوورەوە، سەیری کچەکەی کردو زەردەخەنەیەکی کرد. پێغەمبەر(ﷺ) ویستی کچەکە دڵخۆشبکات و وای پیشانبدات کە حاڵەتەکەی بەدڵی پێغەمبەرە(ﷺ)، بۆیە هەڵیدا بە کراسەکەیدا. ئوم خالید بە خۆشدوانی پێغەمبەری خوا زۆر دڵخۆشبوو. ئینجا لە نزیکییەوە دانیشت.

لە کاتێکدا باوکی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا خەریکی وتووێژ بوو، ئەو بەئەسپایی و بەهێمنی هەستا لە پشتی پێغەمبەرەوە(ﷺ) وەستا. لە پشتییەوە دەهات و دەچوو، وەها دەبینرا وەک بەدوای شتێکدا بگەڕێ، لەناکاودا، کراسەکەی پێغەمبەر(ﷺ) کەمێ لە سەرپشتی

داخزا، ئینجا نیشانەیەکی گەورەی لەنێو شانیدا بەدیکرد. مەعلوم کە ئەمە مۆری پێغەمبەرایەتییە. هەستی بە خۆشییەکی زۆر کرد، هەوڵیدا بە پەنجە بچکۆلەکانی دەستی لێبدا چونکە زۆر جوان بوو بەلایەوە.

ئا لەو ساتەدا، باوکی سەیرێکی کرد، بانگیکردو وتی: (کچەکەم، وەرە ئێرە، بێزارکردنی پێغەمبەری خوا بەسە. پێغەمبەر(ﷺ) هۆکاری حەزی زانینی لە کچە بچوکەکەیدا زانی، هەستی بە بێزاری نەکرد، ئینجا بە باوکی وت وازی لێبێنە با یاری بکات.

کچە بچوکەکە وا هەستیکرد وەک بڵێی هەمووی جیهان هی ئەوە، ئای دەبێ چەند منداڵ هەلی نزیکبوونەوەیان تا ئەو سنورە لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستکەوتبێ؟ لە کاتێکدا ئوم خالید سەرنجی مۆری پێغەمبەرایەتی دەدا، پێغەمبەر(ﷺ) ئاوڕی لێدایەوەو بە زەردەخەنەیەکەوە فەرمووی پێی: ((تەمەندرێژ بیت، بەڕەوشت و ئاسودەییەوە پۆشاکەکەت بپۆشی، تەمەندرێژ بیت، بەڕەوشت و ئاسودەییەوە پۆشاکەکەت بپۆشی، تەمەندرێژ بیت، بەڕەوشت و ئاسودەییەوە پۆشاکەکەت بپۆشی)).

بەم وشە جوانانە، پێغەمبەر(ﷺ) دوعای بۆ ئەم کچە کردو ئاواتەخواز بوو پۆشاکی نوێی بە تەندروستی و ئاسودەییەوە بپۆشی. ئینجا کچەکە سەیری پۆشاکەکەی خۆیکردو پاشان سەیری دەموچاوی زردەخەناوی پێغەمبەری(ﷺ) کرد. دواجار دوورکەوتەوەو بە خۆشییەوە وەک پەپولە ڕایکرد بۆ لای باوکی، ئەم کچە تەمەنێکی درێژی بەسەربرد ئەویش بە فەزڵی دۆعاکەی پێغەمبەر(ﷺ) بۆی.

## ٣٥١. بۆنی پێغەمبەر(ﷺ) وەک میسک بووە

جابیر یەکێک بوو لەو منداڵانەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) زۆر چووبووە ناو دڵیەوە. هەرکات چاوی پێیکەوتبێ ڕایکردووە بۆلای و دوعای بۆکردووە. خۆی ڕاهێنابوو هەمیشە بڕوات بۆ مزگەوت و نوێژی لەگەڵدا بکات.

ڕۆژێکیان، جابیر لە خزمەتی پێغەمبەردا(ﷺ) نوێژی نیوەڕۆی لە مزگەوتدا کرد. کاتێک چوونە دەرەوە گەیشتن بە منداڵان لە ڕێگاکەدا یارییان دەکرد. کاتێک پێغەمبەری خوایان(ﷺ) بەدیکرد، وازیان لە یارییەکە هێناو ڕایانکرد بۆلای، پێغەمبەر(ﷺ) عادەتی وابوو هەرکات منداڵێکی بینیبێ بە سۆزەوە دەستی هێناوە بەسەر ڕوومەتیدا، بەمەش بۆنی منداڵەکان وەک بۆنی گوڵی لێهاتووە. ئالەوێدا پێغەمبەر دەستی هێنا بەسەر ڕوومەتی یەک بەیەکی منداڵەکاندا، دوعای بۆکردن، ئینجا ئاوڕیدایەوە بەلای جابیردا و دەستی هێنا بەسەر ڕوومەتیدا. پاشان دوعای بەختەوەری دنیاو قیامەتی بۆ کرد، ئینجا بەجێیهێشت و ڕۆیشت.

جابیر بە هاوەڵەکانی وت: (لە دەستیدا جۆرە فێنکی و بۆنێکم بەدیکرد وەک بڵێی لە شوشەی بۆنفرۆشەوە دەریهێنابێت وەها بوو. هەموو منداڵەکان هاوڕای بوون چونکە بۆنی عەترێکی خۆشیان لێیەوە بۆنکرد.

ئەبو جوحەیفەش یەکێک بوو لە هاوەڵە تەمەن بچوکەکان. گێڕاویەتەوە کە جارێکیان پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەگەڵ هاوەڵانیدا بە گەشتێک چووەتە دەرەوە، ئەبو جوحەیفەشیان لەگەڵ بووە، کاتی

نوێژی نیوەڕۆ هاتووەتە پێش. لە شوێنێکدا لایانداوە کەمێ پشوو بدەن تا نوێژەکەیان بکەن.

بیلال هەندێ ئاوی ئامادەکردووە بۆ پێغەمبەر(ﷺ) تا دەستنوێژی پێبگرێ. خەڵکیش هەستاون ڕۆیشتوون تا دەست لە دەستە تەڕەکانی پێغەمبەر(ﷺ) بدەن و دەموچاو و دەستییان مەسح بکەن. ئەبو جوحەیفە منداڵێکی بچوک بووە. نەیتوانیوە نزیکبێتەوە، لە لایەکەوە وەستاوەو کەوتووەتە سەریکردنی خەڵکی، هەوڵیداوە دەرفەتێک وەربگرێ تا ئەویش وەک ئەوان بکات.

کاتێک هاوەڵان دوورکەوتوونەتەوە، ڕایکردووە بۆ لای پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەستیگرتووە و هێناویەتی بەسەر دەموچاوی خۆیدا، کاتێکی زانیوە لە بەفر ساردترەو لە میسک بۆنخۆشترە.

ئای ئەو منداڵانە چەندە خۆشبەخت بوون کە لە خزمەت پێغەمبەری خۆشەویستماندا ژیاون و لێیەوە فێربوون.

## ٣٥٢. چاکترینی بەندەکانی خوای گەورە ئەوانەن بەڵێن دەبەنەسەرو چاکەکارن

ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بڕێ گۆشتی لە عەرەبێکی دەشتەکی کڕی، ئەوەش لە بەرانبەر پێدانی بڕێ خورما پێی، کاتێک پێغەمبەر(ﷺ) گەڕایەوە ماڵەوە، گەڕا بەدوای خورماکەداو نەیدۆزییەوە! ئینجا چووە دەرەوە بۆ لای دەشتەکییەکەو پۆزشی بۆ هێنایەوە کە ئەو خورمایەی نەدیۆزیوەتەوە بەڵێنی پێدابوو.

بەڵام بەداخەوە کابرای دەشتەکی بە شێوازێکی زبر هەڵسوکەوتی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) کرد، هاوەڵان لێی ڕاستبوونەوەو هۆشداریان دایە لەو زبرییەی لەگەڵ پێغەمبەری خوادا(ﷺ) نواندی، بەڵام پێغەمبەری دانا فەرمووی: ((وازی لێبێنن، خاوەن ماف قسەی هەیە)). پێغەمبەر(ﷺ) دوو یان سێجار ئەم فەرموودەیەی دووبارەکردەوە، پاشان بە یەکێک لە هاوەڵانی فەرموو: ((بڕۆ بۆلای خەولەی کچی حەکیم و پێیبڵێ: پێغەمبەری خوا پێت دەڵێ: ئەگەر مەنێ خورمای هەیە هەڵیگرتبێ ئەوا با بماندات تا دوایی إن شاء الله بۆی دەگێڕینەوە)).

هاوەڵەکە ڕۆیشت بۆلای خەولە، وەڵامەکەی هێناو گەڕایەوە، خەولە وتبووی: بەڵێ، هەیە ئەی پێغەمبەری خوا، کەسێ بنێرە با بیدەمێ، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە هاوەڵەکەی فەرموو: ((کابرا ببەو ئەو مافەی بدەرێ کە هەیەتی)). ئەویش کابرای دەشتەکی بردو بەشە خورماکەی خۆیی پێدا، لە گەڕانەوەدا کابرای دەشتەکی بە پێغەمبەری(ﷺ) وت: (خوای گەورە پاداشتی خێرت بداتەوە بەڕاستی

بەڵێنت بردەسەرو چاکەکار بوویت).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) فەرمووی: ((چاکترینی بەندەکانی خوا لە ڕۆژی قیامەتدا لای خوای گەورە: ئەوانەن بەڵێن دەبەنەسەر و چاکەکارن)).

کاتێ موسڵمانان سەیری یەکتریان کرد، تێگەیشتن ئەو ڕەفتارەیان گونجاو نەبووە، چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) نایەوێت خەڵکی هەڵشاخێن بەیەکترداو پێویست ناکات دەمەقاڵە لەسەر شتاێ بکەن کە بێهودەیە. بۆی ڕوونکردنەوە چۆن چۆنی بتوانن بەچاکە و وشەی چاک بایەخ بە هەموو کاروبارەکانیان بدەن. ئەو پێغەمبەرە خۆشەویستە(ﷺ) خەڵکی بە دەمەقاڵەو پیاهەڵشاخان بانگ نەکردووە بۆ بەهەشت بەڵکو بە حیکمەت و بە ئامۆژگاری چاکە.

## ٣٥٣. ئەو کەسەی پێغەمبەری خوای(ﷺ) هێنایە پێکەنین

ڕۆژێ لە ڕۆژان، کەسێک هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە زۆر غەمبار بوو. هەر دەیوت: (ئەی پێغەمبەری خوا فەوتام!). پێغەمبەر بانگیکردە ژوورەوە، ئینجا پرسیاری کێشەکەیی لێکرد.

کابرا وتی گوناهێکی گەورەی کردووە، پرسیاری لە پێغەمبەر کرد کە چیبکات تا باجەکەی بدات و خوا لێی خۆشبێت. پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((ئایا کۆیلەت هەیە ئازادی بکەیت؟)) وتی: نەخێر. پێغەمبەر فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت دوو مانگ لەسەریەک بەڕۆژوو بیت؟)). کابرا وتی: نەخێر. فەرمووی: ((ئایا دەتوانیت نانی شەست نەدار بدەیت؟)) کابرا سەری دانەواندو وتی: نەخێر. کابرا بەهۆی زۆر هەژارییەوە نەیدەتوانی بەو پێشنیارانەی کە پێغەمبەری خوا(ﷺ) خستییە بەردەمی باجی ئەو تاوانەی بدات.

پاشان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کیسێک خورمای بە دیاری پێداو فەرمووی پێی: ((وەریگرەو بیکەرە خێر)). کابرا جارێکیتر ڕەزامەندی نەداو وتی: (ئایا دەکرێ بیدەم بە کەسێ کە لە من هەژارتر بێت ئەی پێغەمبەری خوا؟ سوێند بەخوا لە شاری مەدینەداماڵێک نیە لە من هەژارتر بێت)). ئینجا پێغەمبەری خوا پێکەنی و فەرمووی پێی: ((بیدەرە دەرخواردی ماڵ و منداڵت)).

## ٣٥٤. پێغەمبەر(ﷺ) تووڕەبوونی پێناخۆشە

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕقی لە تووڕەبوون و دڵڕەقی بووە. هەردەم بە هاوەڵانی فەرمووە کە تووڕەیی و خووی خراپ دڵی مرۆڤ دەغزدار دەکەن. ئەو(ﷺ) بە ڕەفتارە جوانەکانی جوانی نەرمونیانی و لێبوردەیی بۆ ڕوونکردونەتەوە، زۆرجار فەرموویەتی پێیان کە: ((پاڵەوان ئەوە نیە لە زۆرانبازیدا دەیباتەوە، بەڵکو پاڵەوان کەسێکە لە کاتی تووڕەییدا زاڵدەبێت بەسەر دەروونی خۆیدا)). هەمیشە خراپی سەرئەنجامی ڕەفتاری دوژمنکارانەی بیردەخستنەوە. باسی جوانی ڕەوشتە بەرزەکانی بۆ دەکردن.

ڕۆژێکیان، کەسێک هاتە لای، لەبەردەمیدا وەستاو وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، گوتەیەکم پێبڵێ با کورتیش بێت تا بەڵکو تێیبگەم). پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((تووڕە مەبە)). دیسان کابرا چەند جارێک قسەکەی لێ دووبارە کردەوە، هەمووجاریش پێغەمبەر(ﷺ) هەمان وەڵامیدەدایەوە کە: ((تووڕە مەبە)).

کابرا وانەیەکی گەورەی لە وەڵامەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر پرسیارەکەی بۆ چەند جارێ وەرگرت. ئینجا ئەتەکێتە جوانەکەی زۆر کاریکردە سەری، لێیەوە فێری گرنگی تووڕەنەبوون بوو.

## ٣٥٥. شایستەترینی ئەو کەسانەی دەبێ چاکبین لەگەڵیان

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ڕووخۆشبووە لەگەڵ هەموو کەسدا. بەجۆرێکی وەهابووە کە کەسە بچوکەکانی مەدینەی مونەووەرە دوودڵ نەبوون لەوەی دەستی بگرن و لەگەڵیدا بگەڕێن، یان هەر شتێکیان بوێت پێیبڵێن. لە ژیانیدا هەستی کەسی زامدار نەکردووەو سوکایەتی بە کەس نەکردووە، هەرگیز پێشوازیکردنی لە کەسێک ڕەتنەکردووەتەوە لە دوورەوە هاتبێتە خزمەتی.

ڕۆژێکیان، کەسێک هاتە خزمەتی و وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا، کێ شایستەترە چاکەی لەگەڵدا بکەم؟) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((دایکت)). کابرا دووبارە پرسیاری لێکردو وتی: (دوای ئەو کێ؟) پێغەمبەر وەڵامیدایەوە: ((دایکت)). جارێکیتر کابرا پرسیاری کردەوەو وتی: (پاشان کێ؟) فەرمووی: ((دایکت)). بۆ جاری چوارەم پرسیاری کردەوەو وتی: (دواتر کێ؟) پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: ((باوکت، ئینجا نزیکترو نزیکتر)).

ئەوکات کابرا تێگەیشت کە یەکەمجار دەبێت چاک بێت لەگەڵ دایکیدا، پاشان لەگەڵ باوکیدا، دواجار لەگەڵ خزمەکانیدا. کابرا سوپاسی پێغەمبەری خوای(ﷺ) کرد کە بەو ئارامگرتن و حیکمەتەوە وەڵامیدایەوە.

## ٣٥٦. اللهم صل على سيدنا محمد!

هەندێ لە هاوەڵان بە هیچ جۆر لە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دوور نەدەکەوتنەوە، حەزیان لەوەبوو خزمەتی بکەن، گرنگی بە پێویستییەکانی بدەن، هەرکات داوای کردبن خێرا چوون بەدەمییەوە.

یەکێک لەو هاوەڵانە عەبدوڕەحمانی کوڕی عەوف بوو. ڕۆژێکیان، پێغەمبەری خوا(ﷺ) چووە ناو حەوشەی ماڵەکەی، ئینجا لەوێ دەستیکرد بە نوێژکردن. عەبدوڕەحمان بە تەنیشتییەوە وەستا، چاوەڕێی دەکرد تا نوێژەکەی تەواو بکات. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) سوژدەکەی بە ئاستێ درێژکردەوە کە بووە مایەی بێتاقەتبوونی عەبدوڕەحمان. ئەم هاوەڵە ترساو کەوتە لەرزین. وا گومانی برد پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە سوژدەدا وەفاتیکردووە. لە کاتێکدا فرمێسک بەسەر ڕوومەتی عەبدوڕەحماندا دەهاتنە خوار، پێغەمبەر(ﷺ) سەری لە سوژدە بەرزکردەوە. ئینجا عەبدوڕەحمانی هەناسەیەکی حەوانەوەی دا، فرمێسکەکانی سەر ڕوومەتی سڕی. بەڵام پێغەمبەر(ﷺ) کە بینی دەگری پرسیاری لێکرد: ((چیتە؟)) عەبدوڕەحمان وتی: (ئەی پێغەمبەری خوا! سوژدەکەت درێژکردەوە منیش لەبەرخۆمەوە وتم مەعلوم خوای گەورە ڕۆحی پێغەمبەرەکەیی کێشاوە، ئیتر هەرگیز نایبینم)).

کاتێ پێغەمبەر(ﷺ) ئەوەی لێبیست زەردەخەنەیەکی کرد، ئەوەی گوزەرابوو بۆی باسکرد، فەرمووی: ((سوژدەی سوپاسگوزاریم بۆ پەروەردگارم برد لەوەی کە لە بۆ ئوممەتەکەمی داناوە، هەرکەس لە ئوممەتەکەم سەڵەواتێک لەسەرم بدات، خوای گەورە دە چاکەی بۆ دەنوسێت و دە خراپەی دەسڕێتەوە)).

لەبەرئەوە، با ئێمەش هەرکات ناوی پێغەمبەری خوامان(ﷺ) برد سەڵەواتی لەسەر بدەین، بڵێین: (صلى الله عليه وسلم)، یان (عليه الصلاة والسلام).

عەبدوڕەحمان بەم هەواڵە زۆر دڵخۆشبوو. چونکە خوای گەورە هەلێکی بۆ موسڵمانان ڕەخساندووە تا لە ڕێگای سەڵەواتدانەوە لەسەر پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە گوناهەکانیان خۆشببێ. ئەمەش بەڵگەیە لەسەر فراوانی بەزەیی خوای گەورە، چونکە هیچ دەرگایەک لە دەرگاکانی لێخۆشبوونی فەرامۆش نەکردووە نەیکردبێتەوە بۆ بەندەکانی.

## ٣٥٧. پێغەمبەر(ﷺ) حەزی بە پاکوخاوێنی بووە

پێغەمبەر(ﷺ) هەمیشە دەم بە زەردەخەنە بووە، هەرکات پێکەنیبێت، ددانە سپییەکانی وەک گەوهەر درەوشاونەتەوە. ددانەکانی بەردەوام بە بەرنامە پاکدەکردەوە، تەنانەت لە کاتی نەخۆشیشدا، هیچ کات پاککردنەوەی ددانی بە سیواک فەرامۆش نەکردووە، سیواک لقی درەختی سیواکە کە لەنیوە دوورگەی عەرەبی دەڕوێ، وەک فڵچەی ددان بەکار دەهێنرێ چونکە لقێکی نەرمە، شیلاوەکەی تەندروستە.

پێغەمبەر(ﷺ) گرنگی زۆریداوە بە پاکوخاوێنی، ئامۆژگاری خەڵکیشی کردووە پاکوخاوێن بن، دەیفەرموو: ((سیواک پاککەرەوەیە بۆ دەم و ددان و مایەی ڕەزامەندی خوای گەورەیە)).

ڕۆژێکیان، کەسێک هاتە خزمەتی کە پۆشاکێکی شپرزی لەبەردا بوو، عەترێکی سەیری لەخۆی دابوو، پڵەی ناشیرینی لەسەر پۆشاکەکەی جێهێشتبوو. ئەو حاڵەی نەچوو بەدڵی پێغەمبەردا، بەڵام نەیدەویست هەستی زامدار بکات، دوای ئەوە کە ڕۆیشت، داوای لە هاوەڵان کرد بەشێوەیەکی جوان نەک لەبەردەم خەڵکیدا سەرنجی بەلای ئەو حاڵەتەیدا ڕابکێشن.

ئەمە بووە وانەیەک بۆ هەموو ئامادەبووان. لێرەوە گرنگی زیاتریان بە پاکوخاوێنی خۆیان و ڕواڵەت جوانی خۆیان دەدا، هەوڵیاندا پێغەمبەری خوا(ﷺ) کە بایەخی زۆری بەو لایەنە دەدا بکەنە پێشەنگی خۆیان، هەروەک چۆن ئیسلام ڕێنمایی لەبارەوە داوە.

## ٣٥٨. سەردەمی ئاڵتونیی یان سەردەمی بەختەوەریی

ئەو سەردەمە کە پێغەمبەری خوای(ﷺ) تێدا ژیاوە ناونراوە بە سەردەمی بەختەوەریی. چونکە وەک ئەو خۆرە وابووە کە لەسەر مەککەی پیرۆز هەڵهاتووە. بە فەزڵی ئەو پێغەمبەرە، مرۆڤایەتی خواستی خۆی تیایدا دۆزییەوە کە سەردەمانێکی تولانی بوو بەدوایدا دەگەڕا. لە ماوەی بیست ساڵی یەکەمی ڕەوانەکردنی وەحی دا پێغەمبەر(ﷺ) و هاوەڵانی کەوتنەبەر سزاو ئازاردان و سوکایەتی پێکردن. لە شوێنی لەدایکبوونیان دەرکران، لەو شارەشدا کە کۆچیان بۆکرد هەر نەحەوانەوە چونکە بێباوەڕان دوایان کەوتن و شەڕیان لەدژیان بەرپاکرد. چەندین تەڵەیان بۆ پێغەمبەری خوا(ﷺ) نایەوە. بەڵام پێغەمبەری خۆشەویست بە ڕق و کینەو تورەیی ڕووبەڕوویان نەبوویەوە، بەڵکو هەر خۆشیدەویستن و بەردەوام لە خوای گەورە دەپاڕایەوە لێیان خۆشببێت. دواجار، لەدوای چەندین ساڵ کە پێغەمبەرو موسڵمانان تێیدا تووشی چەرمەسەری و ناڕەحەتی هاتن، قورەیش هاتەوە هۆش خۆی و باوەڕیان بە ئیسلام هێنا . پێغەمبەریش(ﷺ) وێڕای ئەو هەموو ستەم و گەندەڵیی و دوژمنایەتییەیان هەر لێیان خۆشبوو، ئەی چۆن واناکات لە کاتێکدا ئەو ڕەحمەتە بۆ هەمووی جیهانیان.

بەڕاستی ساڵانی ئارامگرتن لەسەر ئێش و ئازار ئێستە بەرهەمی خۆیدا، ئیتر بەهێز ناتوانێت لاواز بچەوسێنێتەوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە برایەتی و یەکسانی لەنێو خەڵکیدا چەسپا. دەوڵەمەند یارمەتی هەژاری دەدا، کەسانی بەساڵاچوو بوونە جێگای ڕێزو ویقار. ئیتر

پیاوان هەڵسوکەوتیان لەگەڵ ئافرەتاندا وەک کەلوپەلی ناوماڵ نەدەکرد، بەڵکو بوونە جێگای ڕێزو وەک گەوهەر سەیردەکران، ئیتر ئەو سەردەمە تێپەڕی کە کچ هیچ بەهایەکی نەبوو، بەڵکو یەکسانبوو بە کوڕ، دیاردەکانی تاوان و گەندەڵی و ستەم و ناپاکی لە کۆمەڵگای موسڵمانان‌دا بوونی نەما.

زەردەخەنە کەوتە سەرلێوی هەژاران چونکە پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەفەرموێ: ((باوەڕی تەواوی بە من نەهێناوە ئەو کەسە کە خۆی تێرە بەڵام دراوسێیەکەی بە تەنیشتییەوە برسییە لە کاتێکدا کە دەشزانێ برسییە)). خەڵکی وایان لێهات ئەو خواردنەی هەیانبوو دابەشیان دەکرد لەگەڵ دراوسێکانیاندا.

جگە لەوەش، پێغەمبەری خوا(ﷺ) خەڵکی هاندەدا لەسەر خوێندنەوەو نوسین. بەمشێوەیە دیاردەی نەخوێندەواری لەنێو موسڵماناندا بەرەو پوکانەوە چوو.

خۆرێکی نوێ بەڕووی جیهاندا هەڵهات، تاریکایی ڕەوییەوە، بەختەوەریی و دڵنیاییی باڵیکێشا بەسەر کۆمەڵگادا. ئەو ڕووناکییەی لە مەدینەی مونەووەرە پرشنگی دا سەراپای جیهانی ڕووناککردەوە، بۆچوون و چەمکەکانی خەڵکی گۆڕی. ئاشتی و خۆشەویستی و لێکتێگەیشتن لەنێویاندا بەرقەرار بوو. مرۆڤایەتیش چاکترین و پرشنگدارترین ڕۆژەکانی خۆی لە سایەی ئەم ئاینە جوانەدا ناسی. لەبەر ئەم هەموو هۆیانە، ئەو سەردەمە ناونرا بە سەردەمی بەختەوەریی یان سەردەمی ئاڵتونیی.

## ٣٥٩. کۆتا گەشت

ئەمجارە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) کەوتە خۆئامادەکردن بۆ مەسەلەیەکی جیاواز. وا دەبینرێ خوای گەورەو باڵادەست ئاگاداری کردبێ کە کاتی ڕۆیشتنی لەم دنیایە نزیکبووەتەوە. هەربۆیە تامەزرۆبوو بۆ دواجار کەعبەی پیرۆز ببینێت. لەبەرئەوە، خۆی ئامادەکرد بۆ سەفەرکردن بەرەو کەعبە.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بەو مەبەستە خۆی شۆری و بۆنی خۆشی لەخۆیدا، پاشان بەرلەوە خۆی و هاوەڵان بجوڵێن بەرەو مەککەی پیرۆز پۆشاکی ئیحرامی پۆشی کە پێکهاتووە لە دوو پارچە قوماش. پێغەمبەری خوا(ﷺ) جار لەسەر جار دەیفەرموو: ((لبّیک اللّهم لبّیک)) هاوەڵانیش لەدوایەوە دەیانوت: ((لبّیک اللّهم لبّیک، لبّیک لا شریک لک لبّیک). دەنگی هەزاران موسڵمان بەم ئاوازە جاویدانییە بە ئاسماندا بەرزبوویەوە.

ئەوەبوو پێش چەند ساڵێک، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بە تەنها دەستیکرد بە بڵاوکردنەوەی ئیسلام. وا ئەمڕۆ، نزیکەی سەد هەزار موسڵمان هاتوونەتە پاڵی. ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) کە بەویستی پەروەردگاری جیهانیان و یارمەتی هاوەڵان ئەو هەموو سەرکەوتنەی بەدەستهێنا، هیچ جۆرە خۆ بەزلزانی و لەخۆباییبوونێکی لێنەبینرا، چونکە لای مەعلوم بوو هەموو ئەو سەرکەوتنانەی موسڵمانان بەدەستیانهێناوە بە پشتیوانی و فەزڵی خوای گەورە بووە. لەبەرئەوە، لەپێش ئەوە بجوڵێ بەرەو گەشتەکەی بۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج، لە خوای گەورە پاڕایەوەو فەرمووی: ((پەروەردگارا

داوای حەجێکت لێدەکەم نە بۆ ڕووپامایی بێت و نە بۆ ناو و شۆرەت بێت)).

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) ژیانێکی سادەو ساکارانە دەژیا، خۆی بەدوورگرتووە لە زیادە خەرج و ڕابواردن. لە کاتێکدا ئەو کە سەد هەزار موسڵمانی لەگەڵدا بوو دەڕۆیشت بەرەو بەجێهێنانی فەرزی حەج، بە هیچ جۆر وەها هەستی نەکرد کە پادشایە، بەڵکو بەندەیەکی دڵسۆزی خوای باڵادەستە.

بە تێپەڕبوونی ئەو هەموو ساڵانە، ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) هەر لەسەر ئەو شێوەیە بوو کە خەڵکی لە سەرەتاوە ناسیبوویان و هیچ جۆرە گۆڕانێکی بەسەردا نەهات. ئەو سەرکەوتنە ڕاستەقینەیە کە دەستەبەری کرد بریتی بوو لە گۆڕینی ئەقڵ و دڵ و هەستی مرۆڤەکان، فێری خۆشەویستی و ڕێزو ترس لە خوای گەورەو فێربوونی قورئانی کردن. هەروەها فێری چۆنێتی ژیان بەسەربردنی بەپێی ڕێنماییەکانی قورئان کردن. ئەو دەیان هەزار موسڵمانەش کە لەدوایەوە ڕێیان دەکرد، لە واتای ڕاستەقینەی بەختەوەریی تێگەیشتبوون.

## ٣٦٠. بە ڕێگاوە بەرەو کەعبەی پیرۆز

ئەو موسڵمانانەی لە خزمەتی پێغەمبەری خوادا(ﷺ) بۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج ڕۆیشتن بۆ مەککە گەیشتنە گوندی (ئەبوا)، خوای گەورە فەرمانی پێداوین حەج بکەین با بۆ یەکجاریش بێت لە ژیانماندا. حەجیش بە شێوازێکی تایبەت و لە کاتێکی دیاریکراودا جێبەجێ دەکرێ و لە ساڵدا تەنها یەکجارەو دووبارە نابێتەوە.

گوندی (ئەبوا) ئەو گوندەیە کاتێ کە پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) منداڵ بوو دایکی تیایدا کۆچی دوایی کرد. ئا لێرە، پێش زیاتر لە پەنجا ساڵ خواحافیزی لە دایکی کرد. لەو شوێنەدا هاوەڵانی جێهێشت و ڕۆیشت بۆ سەردانی گۆڕی دایکی. پێغەمبەری خوا لەسەر گۆڕی دایکی غەمبار بوو و فرمێسکەکانی ڕژانە سەر زەوی. بۆ جارێکیتریش خواحافیزی لە دایکی کرد، پاشان لەگەڵ هاوەڵاندا گوندی ئەبوایان جێهێشت.

وشترە گوێکەلەکە پێغەمبەری خوای(ﷺ) لەسەر پشتی هەڵگرت و بە سەلامەتی ڕێیدەکرد لە ترسی ئەوە نەبادا ئازاری پێبگەیەنێ، هاوسەری پێغەمبەر(ﷺ) و فاتیمەی کچی و چەند ئافرەتێکی تری موسڵمان یاوەری ئەو گەشتەی بوون، کەسێکیش بەناوی ئەنجەشە کە لێخوڕی وشترەکانی ئافرەتان و منداڵان بوو. کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو وشترانەی بینی کە بەهۆی سرود خوێندنی ئەنجەشەوە خێرا دەڕۆن و پێشدەکەون، بانگیکردو فەرمووی: ((ئەنجەشە هاوار بۆ تۆ، ئەو شوشە ناسکانە لەسەرخۆ لێخوڕە)). مەبەستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) ئەو ئافرەت و منداڵانە بوو کە وەک شوشە ناسکن. ترسا لەوەی تووشی زیان ببن و بەهۆی خێرایی وشترەکانەوە بکەون. ئەنجەشە لەوە تێگەیشت و بە وریاییەکی زیاترەوە وشترەکانیانی لێدەخوڕی.

## ٣٦١. حەجی ماڵئاوایی

موسڵمانان گەیشتنە مەککەی پیرۆز، پێکەوە بە دڵێکی پڕ لە تامەزرۆیی تەوافیان بە دەوری کەعبەی پیرۆزدا کرد. زۆربەی منداڵەکان بۆ یەکەمجار بوو چاویان بە کەعبەی پیرۆز بکەوێت، بەخۆشی و شادییەوە لە ئامێزیان گرت، بە پاکی و بێتاوانی و سادەیی خۆیانەوە سروتەکانی حەجیان بەجێگەیاند.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) موسڵمانانی فێرکرد لە چۆنێتی جێبەجێکردنی سروتەکانی حەج، چونکە حەج یەکێکە لە پێنج پایەکانی ئاینی ئیسلام. بەمشێوازە، موسڵمانان پێکەوە هەستان بە بەجێگەیاندنی ئەو فەرزە.

دوای ئەوە، پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) وتاری بۆ خەڵکی دا. لەو وتارەدا چۆنێتی دەستەبەرکردنی ئاشتی و بەختەوەریی لە کۆمەڵگادا فێرکردن. ئەو وتارە تەنها بۆ ئەو موسڵمانانە نەبوو، بەڵکو بۆ هەمووی مرۆڤایەتی بوو. فەرمووی پێیان: ((ئەی خەڵکینە، گوێبیستی ئەم گوتارەم بن، چونکە من نازانم لەوانەیە لەدوای ئەم ساڵ ئیتر هەرگیز لەم هجێگایەدا نەگەمەوە پێتان، ئەی خەڵکینە بەدڵنیایی کە خوێن و ماڵ و سامانتان تا ئەو ڕۆژە دەگەنە خزمەتی خوای گەورە...بۆ یەکتری حەرامە، ئەوکات دەگەنە خزمەتی و پرسیاری کردەوەکانتان لێدەکات، ئەوا منیش گەیاندم پێتان. کەواتە هەرکەس لە ئێوە ئەمانەتێکی لایە با بیگەیەنێتەوە دەست ئەو کەسە پێیسپاردووە. هەموو سویەکیش حەرامە، چونکە خۆتان سەرمایەی خۆتانتان هەیە، نە ستەم بکەن و نە ستەمتان لێبکرێ... شتانێکتان بۆ جێدەهێڵم کە ئەگەر پابەندبن پێیانەوە ئەوا هەرگیز گومڕا نابن، فەرمانی ڕۆشن و ڕەوانن، پەڕاوەکەی

خوای گەورەو سوننەتی پێغەمبەرەکەی... ئەی خەڵکینە، بەدڵنیاییی کە یەک پەروەردگارتان هەیەو تاک و تەنهایە، باوەگەورەتان یەک کەسە، باوکتان ئادەمە، ئادەمیش لە خاک بەدیهێنراوە. چاکترین و بەڕێزترین کەستان لای خوای گەورە ئەوەتانە کە زیاتر لە خوای گەورە دەترسێ و پارێزکارترە. هیچ عەرەبێک لە هیچ عەجەمێک چاکتر نیە، هیچ سپییەک لە هیچ ڕەشپێستێک چاکتر نیە مەگەر بە پارێزکاری و لە خواترسان نەبێت، ئایا گەیاندم؟ ئێوە لە قیامەتدا پرسیاری منتان لێدەکرێ، ئەوکات ئێوە چیدەڵێن؟))

هەموو موسڵمانان پێکەوە بە یەکدەنگ وتیان: (شایەتی دەدەین کە پەیامەکەت پێگەیاندین، ئەمانەتەکەت بەجێگەیاند، ئامۆژگاری ئوممەتەکەتت کرد، هەوڵ و ڕەنجی خۆتت بە باشترین شێوە لەپێناوی ئاینەکەتدا جێبەجێ کرد).

دوای ئەوە، پێغەمبەری خوا(ﷺ) پەنجەی شایەتومانی بۆ ئاسمان بەرزکردەوەو فەرمووی: (پەروەردگار خۆت بە شایەت بە)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) وتارەکەیی تەواوکرد، ئینجا بیلال بانگی نیوەڕۆی بەرزکردەوە. موسڵمانان چەند ڕۆژێ لە مەککە مانەوە، یەکێک لە پێنج پایەکەی ئیسلامیان بەجێگەیاند. منداڵانیش زۆر دڵخۆشبوون چونکە لە تەمەنی بچوکیدا ئەو فەرزەیان ئەنجامدا. هەروەها لەزەتیان برد لەوەی کە زۆرێک لە موسڵمانانیان ناسی لەوانەی کە لە هەموو ناوچەکانی تری جیهانی ئیسلامییەوە هاتبوون بۆ بەجێگەیاندنی فەرزی حەج.

کاتی گەڕانەوەی موسڵمانان بۆ مەدینەی مونەووەرە هاتەپێش، پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ دواجارو لەپێش کۆتا خواحافیزی کردنی لە موسڵمانان و بەجێهێشتنی ئەم دنیایە بە یەکجاری، تەوافی کەعبەی پیرۆزی کرد. ئەو حەجە لەدوای ڕزگارکردنی مەککە یەکەمین و کۆتا حەجی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) بوو، ناونرا بە حەجیماڵئاوایی.

## ٣٦٢. سەرەتای نەخۆشکەوتنی پێغەمبەر(ﷺ)

دوای گەڕانەوەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) بۆ مەدینەی مونەووەرە، لە کۆتا ڕۆژەکانی مانگی سەفەری ساڵی یازدەی کۆچی، پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەخۆشکەوت، نەخۆشییەکەی بەردەوامبوو تا کۆچی دوایی کرد. بە تێپەڕبوونی ڕۆژەکان نەخۆشییەکەی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ تا دەهات سەختتر دەبوو. وایلێهات بە زەحمەت ڕێیدەکرد، لە ڕۆیشتنی بۆ مزگەوت خۆی دەدا بەسەرشانی عەلی و فەزڵی کوڕی عەبباسدا.

پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە کاتێکدا کە سەری خۆی بەستبوو ڕۆیشتە مزگەوت و لەسەر مینبەرەکە دانیشت. ئینجا یەکەمین وشە کە لە زاری هاتەدەر درودو دوعا بوو بۆ هاوەڵانی جەنگی ئوحود، داوای لێخۆشبوونی بۆکردن، زۆر بەباشە وەسفیکردن، ئینجا فەرمووی: ((خوای گەورە یەکێک لە بەندەکانی خۆی سەرپشک کردووە لەنێوان دنیاو ئەوەدا کە لای زاتی خۆیەتی، ئەویش ئەوەی هەڵبژاردووە کە لای خوای گەورەیە)).

ئەبوبەکر لە مەبەستەکەی پێغەمبەری خوا(ﷺ) تێگەیشت، چونکە لە هەموو کەس زیاتر دەیناسی، ئەوەی زانی کە مەبەستی بە خۆیەتی، ئینجا دایە قوڵپەی گریان و وتی: (بەس ئێمە ئەی پێغەمبەری خوا بە گیان و بە منداڵەکانمان دەبینە قوربانت). دوای ئەوە پێغەمبەر(ﷺ) ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی عائیشە(ﷺ).

## ٣٦٢. شادبوونی خاتوو فاتیمە(رضي الله عنها)

خاتو فاتیمە زیاتر لە هەموو منداڵەکانی تری پێغەمبەری خوا(ﷺ) دەچووەوە سەر خۆشەویستمان(ﷺ).

فاتیمە هاودەمە خۆشەویست و بەسۆزەکەی بوو، کاتێک کەوتە سەرجێگای نەخۆشی هەرگیز لێی دوورنەکەوتەوە.

لە کاتێکدا فاتیمە لە نزیکییەوە دانیشتبوو، پێغەمبەر(ﷺ) دانەوی و چپەیەکی دا بەگوێی خاتوو فاتیمەدا. بەمە فاتیمە دەستیکردە گریان. کاتێ پێغەمبەری خوا(ﷺ) فاتیمەی لەو حاڵەدا بینی، جارێکیتر چپاندی بەگوێیدا. ئەوکات، فاتیمە زەردەخەنەی کرد. خاتوو عائیشەش ئەوەی بینی کە ڕوویدا، هەربۆیە حەزیکرد بزانێ هۆکاری گریان و پاشانیش زەردەخەنەکەی چییە. لەبەرئەوە پرسیاری لە خاتوو فاتیمە کرد.

دواتر، خاتوو فاتیمە ئەوەی بە خاتوو عائیشە وت کە باوکی پێیوتبوو، وتی: (پێغەمبەری خوا ئاگاداریکردم کە مردنی نزیکبووتەوەو لەم نەخۆشییەیدا ڕۆحی دەفڕێ. منیش گریام، پاشان ئاگاداریکردم کە من لەنێو خانەوادەکەیدا یەکەمین کەس دەبم کە بەدوایدا دەچم، بەوەش پێکەنیم).

## ٣٦٤. ماڵئاوایی پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ)

لە ڕۆژە سەرەتاکانی مانگی ڕەبیعی یەکەم، شەماڵێکی سوک هەڵیکردە سەر مەدینە، وەها بۆنی دەکرا وەک بڵێی هەواڵی جیابوونەوەی لەگەڵ خۆی هێناوە. پێغەمبەری خوا(ﷺ) لە تەمەنی شەست و سێ ساڵیدا بوو. کە لە کۆتا ڕۆژەکانیدا، زۆرجار باسی مردنی دەکرد، بە خەڵکی دەفەرموو بەم نزیکانە جێیان دەهێڵێ. لە پاش ماوەیەک نەخۆشییەکەی سەختتر بوو. تایەکی سەختی گرت، نەیدەتوانی بڕوات بۆ مزگەوت، هەربۆیە داوای لە ئەبوبەکر کرد لەجیاتی ئەو پێشنوێژی بۆ خەڵک بکات.



لە ڕۆژێکی دووشەمەدا، پێغەمبەری خوا(ﷺ) تووشی سەرئێشەیەکی توند بوو. خانەوادەکەی لە دەوری کۆبوونەوە، پاڵیدا بە خاتوو عائیشەی هاوسەریەوە. تەنانەت لەو ساتانەشدا، هەر هەوڵیدا ئەرکی پێغەمبەرێتی خۆی بەجێبگەیەنێ. ئامۆژگاری ئەو خەڵکەی دەکرد کە دەهاتنە سەردانی و دەیفەرموو: ((نوێژەکانتان نوێژەکانتان، ئەمانەتی ئێوەو ئەو ئافرەتانەی لە گەردنتانداندان)). کاتێک پشتی لەم جیهانە هەڵکرد هەر زیکری خوای گەورە لەسەر لێوەکانی بوو. حەزیکرد بگاتە لای خوای باڵادەست و بە بەزەیی.

لە کاتێکدا پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەنێو خانەوادەی و موسڵمانانددا لە کۆتا ساتەکانی ژیانیدا بوو، فاتیمەی کچی دایە گریان، بەڵام پێغەمبەری خوا(ﷺ) هێوری کردەوەو فەرمووی پێی: ((لە ئەمڕۆ بەولاوە ئیتر هیچ ناڕەحەتییەک بەسەر باوکتدا نایەت)). لەو کۆتا

ساتانەی تەمەنیدا دەستی دەخستە ناو دەفرێکی ئاو، دەستی خۆی پێ تەڕ دەکردو دەیهێنا بەسەر ڕوومەتیدا و دەیفەرموو: ((لا إله إلا الله)).

پێغەمبەری خوا(ﷺ) ماوەی شەست و سێ ساڵ بەردەوامبوو لە بڵاوکردنەوەی ئاشتی و برایەتی لە جیهاندا و لەنێوان مرۆڤەکاندا، ئەو پێغەمبەرە(ﷺ) کە خوای گەورە هەڵیبژارد ئەو ئەرکەی خرایە سەرشانی بە کامڵترین شێوە بەجێبگەیاند. وا ئێستە ئەم جیهانە بەجێدێڵێ.

## ٣٦٥. بەردەوامین لەسەر ڕێبازەکەت ئەی پێغەمبەری خوا(ﷺ)

زۆر بەخێرایی هەواڵی کۆچی دوایی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەناو خەڵکیدا بڵاوبوویەوە. دەنگی گریانی موسڵمانان لەناو شاری مەدینەدا بەرزبوویەوە، خەم و پەژارە باڵیکێشا بەسەر هەمواندا.

ئەبوبەکر بە ڕاکردن خۆی گەیاندە ماڵی پێغەمبەری خوا(ﷺ)، پەردەی سەر دەموچاوی پیرۆزی لادا، وەها دەبینرا وەک بڵێی لە خەوێکی قووڵی خۆشدایە. ئەبوبەکر نەیتوانی فرمێسکەکانی خۆی ڕابگرێ و وتی: (پاکیی و چاکیی و خۆشنودیی بە زیندوویی و بە مردوویی بۆ تۆیە ئەی پێغەمبەری خوا!)

بەڵام لە هەمان کاتدا هەوڵیدەدا ئەوانەی کە بەدەوریدا بوون هێوریان بکاتەوە. عومەر هاواری دەکرد: (سوێند بەخوا پێغەمبەری خوا(ﷺ) نەمردووە!) چونکە نەیدەتوانی ڕاستێتی مردنی قوبوڵ بکات. ئەوکات، ئەبوبەکر لێی نزیکبوویەوەو پێیوت: (ئەی سوێندخۆر لەسەرخۆبە).

ئینجا ئەبوبەکر گوتاری بۆ خەڵکیداو فەرمووی: (موسڵمانان، با لاتان مەعلوم بێت ئەوەی کە موحەممەدی(ﷺ) دەپەرست وا موحەممەد مرد، ئەوەیش کە خوای گەورە دەپەرستێ خوای گەورە زیندووەو نامرێ).

قەدەر بەمجۆرە هات و پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) هەستا بە ئەنجامدانی کۆتا گەشتی لەم جیهانەوە بۆ ناو گۆڕ. بە هەزاران موسڵمان لەوێ کۆبوونەوە، لە کاتێکدا کە هەڵدەستان بە ئەنجامدانی

کۆتا ئەرکیان بەرانبەر بە پێغەمبەرە خۆشەویستەکەیان(ﷺ) فرمێسک لە چاوانیان دادەباری، نوێژی جەنازەیان لەسەر کرد، دەستیان بە دوعا و پاڕانەوە بۆی بەرزکردەوە. ئیتر تەواو. بەڕاستی پێغەمبەری خوا(ﷺ) جێیهێشتن، بەڵام لەدوای خۆی دوو دیاری گەورەی بۆ بەجێهێشتن ئەوانیش: قورئانی پیرۆز و سوننەتەکەیەتی(ﷺ). کە ئەم دووانە بوونە ڕێنیشاندەرو ڕێباز و هیدایەتدەری هاوەڵان و باوەڕدارانی نەوەکانی ئایندە هەتا ڕۆژی قیامەت.

** ** **

ئەی خوای گەورە، ئەی پەروەردگاری باڵادەست، ئەو کەسەی ڕەوانەت کرد بۆمان و کردتە پێشەنگمان، قورئانی پیرۆزت وەک هیدایەتدەرو بەزەیی نارده سەری، بە هۆیەوە فێری فەرمان بە چاکەو ڕێگیری لە خراپەی کردین، یارمەتیدەرمان بە لەسەر پەیڕەوکردنی ئەو پێغەمبەرە(ﷺ)، لە بەهەشتدا کۆمانبکەرەوە لە گەڵیدا، بێبەشمان مەکە لە شەفاعەتی ئەو، بێبەشمان مەکە لە هاودەمیکردنی.

پێغەمبەری خۆشەویستمان(ﷺ) پەیامی ئیسلامی جێهێشت بۆ مرۆڤایەتی. بەم ئاینە جوانە، یەکبوونی خستەناو دڵی مرۆڤایەتی، بە هەموو ڕەنگەکانیەوە، بوونە برا لە ئیسلامدا، ئەوانەی هاتن بەدەم بانگەوازەکەیەوە تامی بەختەوەرییان چەشت.

ئەمڕۆ، گوڵە بۆنخۆشەکان بیرمان دەخەنەوە کە ئەوان بە بۆنی خۆشی پێغەمبەری خوا(ﷺ) لەسەر ڕووی زەوی دەکرێنەوە. تا ئێستە کێوی ئوحود خۆشیدەوێ، ئەشکەوتی حەڕاش نهێنییەکەی دەپارێزێ. تا ئێستە کەعبە ناوی دەبیستێ کە خەڵکی بەردەوام سەڵەواتی لێدەدەن. تا ئێستە ئاوی زەمزەم لەپێناو ئوممەتەکەیدا هەر هەڵدەقوڵێ، ئەو خۆشەویستییەی کە فێری خەڵکی کرد هێشتا

دڵیان پڕە لێی. تا ئێستەش دەستەکانیان سەرڕێژە بە بەخشندەیی و بەخششی. وەک ڕەنگە جۆراو جۆرەکان وەهان کە پەلکەزێڕینە ڕەنگ دەکەن، دەوڵەمەندیی ئەو برایەتییە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە خوای گەورە مرۆڤایەتی خۆشدەوێت. ئێمەش کە نووری ڕوومەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان نەدیوە، دەنگە فێنکەکەی نەچووە بە گوێماندا، لە کاتێکدا کە دڵەکانمان تامەزرۆی بە خزمەت گەیشتنی ئەون بەردەوام و هەتا مردن هەر دەڵێین و دڵێینەوە: (خوایە گیان درود و سەڵەوات بنێرە بۆ سەر گیانی گەورەمان موحەممەد پێغەمبەر(ﷺ) کە چاکترینی بەدیهێنراوەکانە و لەسەر خانەوادە و هەموو شوێنکەوتووانی تا ڕۆژی قیامەت. کۆتا نزامان الحمد لله رب العالمین.

(اللّهم صلّ وسلم وبارك على سيدنا محمد خير الأنام وعلى آله وصحبه أجمعين، والحمد لله رب العالمين).




Description

بسم الله الرحمن الرحيم
🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و  بابەتی جیاواز🤍

Queen city
شاری شاژن
شارێک تایبەت بە کۆمەڵگایەکی جوان

داوای ڕیکلام مەکە نایکەین🚫

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

بۆ ڕاوبۆچون و پسیار بۆ  کتێب مەینێرە↓
@tanyahaji22

ئەکاونت↓
https://linktr.ee/tanyahaji22

t.me/tanyahaji7
Invite Link

پێغەمبەری ئازیزمان خۆر و تیشکی ڕێنیشاندانە، بەتەنها بۆ موسوڵمانان نا، بەڵکوو بۆ گشت مرۆڤایەتی پێشڕەو و نموونەی باڵایە. لەنێو گشت کورچە و گۆشەیەکی ژیانیدا جوانییەکی جیاواز حەشار دراوە، وەک خودای گەورە لە قورئاندا ئاماژەی پێ داوە: «نموونەی باڵایە سەروەرمان. هەڵبەت هەر وایش دەبێت، چوون قورئانی پیرۆز سەرچاوەی ڕاستی و دروستی و پەرستشە جوانەکانە و ڕێنیشاندەری ئازیزمان بووە و لەسەر زاری خاتوو عائیشەوە: «ئەو قورئانێکی بەرجەستەکراو بوو.»

لەم کتێبەدا هەوڵمان داوە گەشتێک بەنێو ڕەوشتی باڵایدا بکەین و ئێمەش هەمان گوتەی ئیمامی ڕەبانی دووبارە دەکەینەوە: «من بەم وتانەم هەوڵ نادەم پەسنی جوانیی موحەممەد بدەم و جوانییەکانی نیشان بدەم، بەڵکوو هەوڵم داوە بە باسکردنی ئەو وتەکانم و کتێبەکەم جوان بکەم.»

پێشنیار دەکەم هەر ڕۆژێک چیرۆکێک لەم کتێبە بخوێننەوە، گەر وا بکەن، گشت ڕۆژێکتان لەگەڵ ئەو بەسەر دەبەن! یادی ئەو دەکەن و بانگهێشتی دەکەن بۆ نێو ماڵ و دڵتان! چەند جوانە میوانداریی ئەو میوانە پیرۆزە دەکەن! هاوکات وا هەست دەکەن لە گشت ڕووداوەکاندا لەگەڵیدا بوون و هەستێکی نزیکیتان بۆ دروست دەبێت، چوون بۆ ماوەی ساڵێک بەبەردەوامی لەگەڵیدا دەبن.

هیوادارم لەگەڵ خوێندنەوەیدا بەبەردەوامی سەڵات و سەلام بنێرن بۆ گیانی سەروەر و نزای خێر و چاکەش بۆ نووسەرەکەی لەبیر نەکەن.


07501269689
07511408868

hakem1423@yahoo.com
renwen2009@yahoo.com

سلێمانی - بازاڕی ئاوباریک- نهۆمی یەکەم
بەرامبەر کاسۆمۆڵ - دوکانی ژمارە (٦٦)

ڕێنوێن

١٠٠٠٠ دینار

9 789922 626437